# کۆچ

٢٣

کۆچ بەرەو مەعریفە

وەرزە گۆڤــارێکی روونـــاکبیرییە

گرنگی بە بواری لێکۆڵینەوە دەدات


خاوەنی ئیمتیاز

عەلی عەبدوڵڵا کاکە ئەحمەد

سەرنووسەر

حەبیب محەمەد دەروێش


٠٧٧٠١٥٨٢٧٣٨ – ٠٧٥٠١١٩٩٦٩١

habeblawyer@yahoo.com
govarikoch@yahoo.com


دیزاینی ناوەڕۆک

حیکمەت مەعروف / ئالین دیزاین

دیزاینی بەرگ

هەرێم عوسمان

نرخ: ٤٠٠٠ دینار

**بۆ خوێندنەوەی سەرجەم ژمارەکانی گۆڤاری کۆچ، سەردانی ماڵپەڕی کۆچ بکە:**
www.govarikoch.com

**سەرنج:**

**هەموو ئەو بابەتانەی لەم گۆڤارەدا بڵاودەبنەوە بۆچوونی نووسەرەکانیان دەردەخەن.**

**بۆ ئەو بەڕێزانەی دەیانەوێت بابە تمان بۆ بنێرن**
**تکایە رەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەن:**

١. بابەتەکان ئەگەر دەستنووس بوون، با لەسەر لاپەڕەی (A4) بێت و لەسەر یەك دیوی بە خەتێکی جوان بنووسرێت.
٢. پەراوێزەکان لە کۆتایی بابەتەکەوە بنووسرێن.

٣. سەرچاوەکان لە کاتی پێویستدا دیاری بکرێن.
٤. ئەگەر تایپکراو بوو لە رێگەی سیدی و فلاش میمۆری، یان رێگەی ئیمایلانەوە بۆمان بنێرن.

goavrikoch@yahoo.com , arsalantofiq@yahoo.com
salam_80jornalist@yahoo.com

٥. لە کاتی تایپکردندا تکایە بۆ زمانی کوردی فۆنتی (Ali_K_Sharif) و بۆ زمانی عەرەبی (Ali_A_Sharif) بەکاربهێنن.
٦. دوای بڵاوبوونەوەی هەر بابەتێك نووسەر یان وەرگێڕ پاداشت دەکرێت.

– – –

# ناوەرۆك

## مێژوویی - سیاسی



## فەلسەفە



## ئەدەب



— — —

## فایلی ژمارە

**( لە سەلەفییەتی دەقەوە بۆ سەلەفییەتی جیهادی )**

# داڕشتنەوەی عێراق لەسەر بنەماکانی کۆنفیدرالیزم: بۆ و چۆن ؟

د. شێرکۆ کرمانج(*)
د. شەمسول خان (**)

## پێشەکی

گرژی و ململانێ بەردەوامەکانی نێوان گروپە سیاسییەکانی عێراق، شەڕ و پێکدادان و توندوتیژییەکانی نێوان نەتەوەکان (کورد و عەرەب)و مەزهەبەکان (سوننە و شیعە) لە عێراق کە رۆژ بەڕۆژ لەفراوانبووندایە و رووبەرێکی زۆری عێراقی گرتووەتەخۆ بەتایبەتی بەغدا و دەوروبەری" نارەزایی و خۆپیشاندانەکانی سوننەکان لەماوەی دوو ساڵی رابردوودا" کێشمەکێشە لەبنەهاتووەکانی نێوان کورد و عەرەبە عێراقییەکان لەسەر ناوچە کێشەلەسەرەکان و بودجە و پرسی نەوت و پێشمەرگە لە دە ساڵی رابردوو پێشووتریش" ئەمانە هەرهەموو بەسەریەکەوە سەرەڕای گرنگی و زۆریان تەنیا بەشێك لە کێشە قووڵ و ئاڵۆزەکانی عێراق پێکدێنن و جارێکیدیکە هەڕەشە لە مانەوەی عێراق وەك دەوڵەت و نقومبوونی لە گۆماوی خوێنی شەری نەتەوەیی و مەزهەبی دەکەن. هۆکاری دووبارە و چەندبارەبوونەوەی توندوتیژی و شەڕ و پێکدادانەکانی ئەم دواییە چڕبوونەوەی ململانێکانی نێوان شیعەکان و سوننەکانە. سەرەڕای ئەوەی کە ململانێکان ریشەی مێژوویيان هەیە و دەگەڕێنەوە بۆ سەدان ساڵ پێش دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق و بەدرێژایی تەمەنی هاوچەرخی دەوڵەتی عێراقیش بەردەوامبوون، پێش و پاش داگیرکردنی عێراق لە

*) زانکۆی ئوتارا مالیزیا

**) زانکۆی ساوس ئوسترالیا

ئەمریکاوەش، کەچی دوایین حەڵقە لە توندوتیژییەکان دەگەڕێتەوە بۆ هەستی پەراوێزبوونی سوننەکان و دوورخستنەوەیان لەلایەن شیعەکانەوە لە سەنتەرەکانی حوکمکردن و بڕیاردان. بەشێکی زۆر لە ئەکادیمی و توێژەرانی رۆژئاوا سیاسەت و ستراتیجییەکانی نوری مالیکی، سەرۆکوەزیرانی عێراق، هەوڵەکانی ئەو لەخۆسەپاندن و کارەکتەرە ئۆتۆریتارییەکانی بە هۆکاری سەرەکی پشت ئەو ململانێ و قەیرانانەی عێراق تێیکەوتووە دادەنێن[1] سەرەڕای ئەوەی ئەو تێگەیشتنە راستی تێدایە، بەڵام پێدەچێت کە ریشەی هۆکارەکانی ناسەقامگیری و خراپ بەڕێوەچوون و ململانێ نەتەوەیی و مەزهەبییەکان و قەیرانە سیاسییەکان لە عێراق زۆر لەوە قووڵتربن کە تەنیا سەرۆکوەزیرانێکی پێتاوانبارکرێت. سروشتی بەمەرکەزیکراوی (centralized) عێراق، لەو رۆژەی دامەزراوە لە ۱۹۲۱ تا ۲۰۰۳، لەگەڵ هەوڵەکانی هەندێك لایەن بە بەمەرکەزی هێشتنەوەی شێوازی حوکمڕانی لەو وڵاتەدا و شۆڕنەکردنەوەی دەسەڵاتەکان بۆ هەرێمەکان و پارێزگاکان و شارەوانییەکان، لەگەڵ دابەشبوونی عێراقییەکان بەسەر گروپی نەتەوەیی و مەزهەبی جیاجیا و جێکەوتەیان لە ناوچەی جوگرافیایی جیاجیا، بە ئیزافەی پەرتوبڵاوبوونی کەلتوری سیاسیی و لاوازی کۆمەڵگەی مەدەنی، بەسەریەکەوە هۆکارە سەرەکییەکانی پشت قەیران و ململانێکان پێکدێنن. ئەوەی مالیکی کردوویەتی و دەیکات خراپ کەڵکوەرگرتنە لەو دابەشدابەشبوون و ململانێ و کێشمەکێشەکانە، نەك ئەوەی کە مالیکی خۆی هۆکاربێت. راستە مالیکی دەکرێت لۆمەبکرێت، بەڵام قەتیسکردنی ئەو هەموو کێشە ئاڵۆز و قووڵەی عێراق لە کەسایەتی مالیکی یان پێش ئەو لە سەدام حسێن، سادەگۆییە و تێنەگەیشتنە لە جەوهەر و سروشتی کێشە و قەیرانەکانی عێراق.

بەبنەما لەسەر ئەو راستییانەی سەرەوە دەکرێت بڵێین کە رزگارکردنی عێراق و پێکهاتەکانی لەم زەلکاوە و هەنگاونان بۆ چارەسەرکردنی کێشە و قەیرانەکان ناکرێت ئەنجامبدرێن بەبێ ئەوەی چارەسەرییەکان رەچاوی سروشتی کۆمەڵگەی عێراقی و ئامانج و خەو و دیدێ پێکهاتەکانی نەکەن. ئەم بابەتە هەوڵێکە بۆ بەکورتی خستنەڕووی سەرچاوەی کێشە و ململانێ و قەیرانەکان دواتریش پێشنیازکردنی هەندێك رێگەچارە بۆ دەربازبوون لێیان.[2]

## پاشخانێکی مێژوویی:

بەریتانیا عێراقی لەسەر بنەمای مەرکەزییەت لە ١٩٢١ دامەزراند، ئەویش بە بەیەکەوەلکاندنی هەرەمەکییانەی چەند گروپێکی نەتەوەیی و مەزهەبی کە مێژوویان بەشێوەی جیا لەیەکدی گەشەیکردبوو. سەرەڕای هەوڵە زۆرەکانی دەسەلاّتدارانی بەریتانیا و حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق لە سەردەمی مەلەکیدا، کە راســــــتەوخۆ (١٩٢١-١٩٣٢) یان ناڕاستەوخۆ (١٩٣٢-١٩٥٨) کەوتبوونە ژێر هەژموونی بەریتانییەکان، کەچی نەیانتوانی سەرکەوتووبن لە پرۆسەی ئامێزانی (integration) پێکهاتەکان لە قازانی نیشتمانیی عێراقیدا. لەوەش زیاتر عێراق هەروەك دەوڵەتێکی دەستکرد مایەوە. یەکێك لە هۆکارەکان لەوانەیە ئەوە بێت کە هیچ کام لە حکومەتە مەرکەزییەکان نەیانتوانی شوناسێکی گشتگیر لەو شوناسە نەتەوەیی و مەزهەبی و خێڵەکییانەی ئەوکات زاڵبوون دروستبکەن یان بەرهەمبێنن کە ببێتە مایەی ئەوەی کە بێنیدێکت ئەندێرسن ناویناوە "هەڤاڵێتیی ئاسۆیی" (horizontal comradeship)، ئەمەش بەرەچاوکردنی چارەنووس و دوارۆژ و بەرژەوەندییە هاوبەشەکانی هەموو گروپ و پێکهاتەکان.(٣) دەسەلاّتدار و فەرمانبەرە بەریتانییەکان بەدڵنیاییەوە دەیانزانی بۆئەوەی دەوڵەتە دەستکردەکەیان، عێراق، بەسەقامگیریی بمێنێتەوە ئەوەدەبێت رێوشوێنی تایبەت بگرنەبەر بۆ دابەشکردنی دەسەلاّت بەسەر ناوچەکان و پێکهاتەکانی، بەلاّم لەجیاتی شۆڕکردنەوە و دابەشکردنی دەسەلاّتەکان، بەریتانییەکان پارەوپوول و دەسەلاّتیان لەسەر بنەماکانی ملکەچی بۆ ئەوان و دەسەلاّت دەبەخشی بە ئەم یان ئەو بەپێی نزیکییان و هاودێدییان لە بەریتانییەکان.(٤) لێرەدا واچاکە ئاماژە بەوەبکەین کە ئەوەی بەریتانییەکان وەك هاودێد و نزیك لە دەسەلاّتەکەی خۆیان بینییان ئەوە سوننەکان بوون وەك پێکهاتەیەکی مەزهەبی لەگەڵ سەرۆکعەشیرەتەکان وەك نوێنەری خێڵ و عەشیرەتەکان بە سەرۆکعەشیرەتە شیعە و کوردەکانیشەوە. زۆربەی فەرمانڕەواکانی عێراق، هەر لە مەلیك (فەیسەل بن حسێن بن عەلی)یەوە بگرە تادەگاتە عەبدولکەریم قاسم و عەبدولسەلام عارف و عەبدولڕەحمان

عارف، شکستیان هێنا لە بەرهەمهێنانی شوناسێکی گشتگیر کە ببێت بە چەترێك بۆ عێراقییەکان. هۆکار زۆرە بۆ ئەم شکستە، بەڵام یەکێکیان لەوانەیە ئەوەبێت کە جیهانبینی هەرهەموو ئەو سەرکردانە، بەو گروپە سیاسییانەی کە نوێنەرایەتیشیان دەکردن، نەیاندەتوانی وێنای شوناسێك بکەن بۆ عێراق کە رەنگدانەوەی فرەڕەنگی و فرەمەزهەبی و فرەکەلتوری کۆمەڵگەکەی بێت و چوارچێوە تەسکەکانی ناسیۆنالیزمی عەرەبیی- سوننی لێدەرچێت. لێرە دەبێت ئەوە بگوترێت کە عەبدولکەریم قاسم لەگەڵ ئەوەی کە ناچێتە خانەی ئەوانەی پێش خۆی و ئەوانەی دوای خۆی بەڵام هاوکات هەوڵەکانی لە دروستکردنی شوناسێکی عێراقی سەرکەتونەبوو ئەگەر نەڵێین شکستیپێهێنرا. ئەگەر ئەگەر و هەوڵێك لە قۆناغی مەلەکی و سەردەمی حوکمڕانی عەبدولکەریم قاسم بۆ شوناسێکی گشتگیر بوونی هەبووبێت ئەوە هەرهەموو ئەو ئەگەر و هەولآنە لەگەڵ هاتنی بەعس، بە سەرکردایەتی ئەحمەد حەسەن بەکر لەسەرەتاوە سەدام حسێن دواتر، پشتگوێخران، تەنانەت دەکرێت بگوترێت کە ئەگەرەکانی نەك دروستکردنی شوناسێکی گشتگیر بەڵکو وێناکردنیشی قەدەغەکران.

دوای رووخانی سەدام و گرتنەدەستی دەسەڵات لەلایەن شیعەکان بەگشتی و حیزبی دەعوەی ئیسلامی بەتایبەتی واخەریکە عێراق هەمان ئەزموونی پێشووتر دووبارەدەکاتەوە، بەڵام ئەوەی ئەمجارە زیاتر جێگەی سەرسووڕمانە ئەوەیە کە دەستورە نوێکەی عێراق کە لەدوای رووخانی بەعس نووسرایەوە پێداگری لەسەر دارشتنەوەی عێراق لەسەر بنەمای نامەرکەزییەت و فیدرالیزم دەکات. سەرەڕای ئەمە دەسەڵاتدار و فەرمانڕەوا نوێکانی عێراق رۆژ لەدوای رۆژ دژایەتیکردنی خۆیان لە نامەرکەزییەت و فیدرالیزم توندتردەکەن و خەسڵەتە ئۆریتارییەکان بە رژێمە نوێکە و مالیکی زیاتر دەردەکەون. لەوەدەچێت پشتیوانی شیعەکان لە سەرەتا بۆ فیدرالیزم و نامەرکەزییەت هەڵقولآوی ترسی گەڕانەوەی سوننەکان بووبێت بۆ دەسەڵات لە بەغدا. دوای ئەوەی تەواوی دامودەزگا سەربازی و ئەمنی و ئیدارییەکانیان کۆنترۆڵکرد و ترسەکەیان رەوییەوە ئیدی شیعەکانیش هاوتای سوننەکان لە خەم و خەونی بەمەرکەزیکردنی دەسەڵاتن بەبیانووی

ترس لە هەڵوەشانەوەی عێراق. لە سەرکوتکردنی سوننەکان حکومەتە شیعییەکەی عێراق تا ئێستا نەگەیشتۆتە دڕندەیی سەدام، بەلاّم لە کەمشتیش دەستی پاراستووە. لەبەرابەر کوردانیش تائێستا ئەو هێزەی نییە کە سەرکوتی داواکان و مافەکانیان بکات ئەگینا ئەگەری زۆری هەیە کە لە هێرشکردنەسەر کوردەکانیش پارێزیی نەدەکرد. بەکورتییەکەی ئەوەی لەدوای رووخانی بەعس لەعێراقدا گۆڕاوە جێگۆڕکێی دەسەلاّتە، واتە لاچوونی سوننەکان و جێگرتنەوەیان لەلایەن شیعەکان، دەنا لە جەوهەر و شێوازی حوکمڕانیدا، هەڵبژاردنە بێسەروبەر و پڕساختەکارییەکانی لێدەرچێت، گۆڕانکارییەکی ئەوتۆ روونەداوە.

بەگەڕانەوە بۆ ئەزموون و مێژووی سەد ساڵی رابردووی عێراق و ئەو شیکارانەی سەرەوە ئەم بابەتە پێداگری لەسەر ئەوەدەکات کە تائەوکاتەی میکانیزمی دەستوری و دامودەزگایی (institutional) گونجاو بۆ دیاریکردن و دابەشکردن و شۆڕکردنەوەی دەسەلاّتەکان لە سەرتاسەری عێراق دانەنرێت و بەزووترین کات نەخرێنە بواری جێبەجێکردنەوە ئەوە ئەگەری زۆر هەیە کە ئەو ململانێ و گرژی و پێکدادانانەی هەن تەواوی ولاّتەکە خەڵتانی خوێن بکەن و سەقامگیری ناوخۆیی عێراق بەتەواوی تێکبدەن و ناوچەکە و جیهانیش بخەنە بەر هەڕەشەی قووڵتری چەندێن شەری نەتەوەیی و مەزهەبی. هەوڵی یەکەم بۆ رەواندنەوەی ئەو هەورە رەشەی ئێستا ئاسمانی عێراقی گرتووە بە هەرێمی کوردستانیشەوە ئەوە سەرلەنوێ دارشتنەوەی عێراقە لەسەر بنەمای کۆنفیدرالییەت بەشێوەیەك کە تابکرێت دەسەلاّتەکانی مەرکەز کەمبکرێنەوە و شۆڕبکرێنەوە بۆ هەرێمە کۆنفیدرالییەکان. ئەوەی لەهەموو شتێك راستی ئەو ئارگیومێنتەی ئێمە دەسەلمێنێت ئەو واقیعەیە کە ئێستا لە عێراق دەگوزەرێ کە تێیدا هەرێمی کوردستان وەك هەرێمێکی کۆنفیدرالی نەك فیدرالی لەگەڵ عێراق مامەڵەدەکات، لەگەڵ هەوڵەکانی سوننەکان بۆ دامەزراندنی هەرێمێك یان چەند هەرێمێکی تایبەت بەخۆیان لەشێوەی ئەوەی کوردستان (تەماشای خوارەوە بکە) مەبەستی سەرەکی لە نووسینی ئەم بابەتە دانانی نەخشەرێگایەکە بۆ دارشتنەوەی سیاسییانە و دەستورییانەی دامودەزگاکانی دەوڵەتی

عێراقی لەسەر بنەماکانی کۆنفیدرالیزم وەك هەوڵێك یان هەنگاوێك بۆ چارەسەرکردنی کێشە و قەیرانە مێژوویی و هەنووکەییەکانی ئەو وڵاتە، بەڵکو وەك دەوڵەتێکی تازە بە دێموکراسی گەیشتوو کەڵکی لێوەربگیرێت نەك هەر بۆ چارەسەرکردنی پرسی شوناس و ململانێ نەتەوەیی و مەزهەبییەکان، بەڵکو بۆ دێموکراتیزەکردنی عێراق. ئەم پێشنیازە ناکرێت بەهیچ شێوەیەك بەو مانایە لێکبدرێتەوە کە ئێمە مافی جیابوونەوە و دامەزراندنی دەوڵەت بە کوردەکان رانابینین، بەڵکو مەبەست لێی ئەوەیە مادامەکی کوردەکان یان سوننەکان ئێستاکانێ لە عێراق دەژین چاکترە کە پەیوەندییەکانیان لەنێوان خۆیان و لەگەڵ شیعەکاندا لەسەر بنەمای کۆنفیدرالی رێکبخەن.

### کۆنفیدراڵی و فیدراڵی:

پێشئەوەی نەخشەرێگاکەی سەرلەنوێ دارشتنەوەی عێراق بخەنەروو واچاکە بەکورتی چەند قسەیەك لەسەر جیاوازییە سەرەکییەکانی سیستمی فیدرالی و کۆنفیدرالی بکەین. کۆنفیدرالی یان کۆنفیدێرەیشن لە یەککگرتنی خۆبەخش و ئازادانەی چەند وڵاتێك یان هەرێمێك پێکدێت کە ئامانجێکی گشتی کۆیانبکاتەوە. لە سیستمە کۆنفیدرالییەکان، لەبەرابەر لەدەستدانی یان سنووردارکردنی چەند ئازادییەك هەرێمە یان وڵاتە یەککگرتووەکان لەسەر دامەزراندنی چەند میکانیزمێك پێکدێن بۆ راوێژکردن لەگەڵ یەکدی و پرسورا گۆڕینەوە و بریاردان و بەڕێوەبردن. لە سیستمی کۆنفیدرالیدا دەسەلاتی مەرکەزی لاوازە و هەرێم یان وڵاتە ئەندامەکانی کۆنفیدرالییەتەکە دەتوانن خاوەنی سوپا و خۆیان بن و نوێنەرایەتی دیپلۆماتیکی خۆیان لە وڵاتانیدێکە راگرن. ئەندامانی کۆنفیدرالییەتەکان بەگشتی مافی یەکسانییان هەیە لە حکومەت و پەرلەمانە نیشتیمانییەکە/ مەرکەزییەکە. ئەوەی زۆر گرنگ بێت ئەوەیە کە هەرێم یان وڵاتە ئەندامەکان لە کۆنفیدرالییەکان مافی جیابوونەوەی خۆیان لە دەوڵەتە کۆنفیدرالییەتەکە هەیە. لەبەرابەر ئەمەدا فیدرالی بەو سیستمانە دەگوترێت کە وڵاتێك دابەشدەکرێت بەسەر چەند هەرێمێکدا کە حکومەتێکی مەرکەزیشی هەیە و پێچەوانەی سیستمی کۆنفیدرالی

دەسەلاتەکانی زۆر لە دەسەلاتی هەرێمەکان لە هەندێك بواردا زیاترە و لە هەندێك بواریشدا هاوتایە و لە هەندێکیدێکەش دەسەلاتی بەسەر دەسەلاتی هەرێمەکاندا ناشکێت یان لە دەرەوەی دەسەلاتەکانی حکومەتە مەرکەزییەکەدایە. مەبەستی سەرەکی لە دروستکردنی فیدرالییەت هۆکارە سیاسییەکانن بەلام دەشکرێت هۆکارە ئابوری یان سەربازییەکان رۆلببینن. هەرێمەکان، بەگشتی، لە سیستمە کۆنفیدرالییەکاندا خاوەن سەروەری (سیادە/sovereignty) خۆیان، بەلام ئەمە بەو مانایە نییە کە هەرێمە کونفیدرالییەکان دتوانن ببن بە ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکان. بەپێچەوانەوە لە سیستمە فیدرالییەکان حکومەتی مەرکەزی خاوەن سەروەرییە و هەرێمەکان دەکەونەژێر سایەی سەروەری حکومەتە مەرکەزییەکە. بەگشتی پرسەکانی بەرگری و پەیوندییەکانی دەرەوە و سیاساتی نیشتیمانی ئابوری و مالی و کۆچ و ناسنامە و گومرگ لە سیستمە فیدرالییەکاندا لە دەسەلاتەکانی حکومەتی مەرکەزین بەلام بەشێك لەو دەسەلاتانە بەگوێرەی پێکهاتن لەسەری لە سیستمە کۆنفیدرالییەکان لەنێوان هەرێمەکان و حکومەتی مەرکەزی دابەشدەکرێن.

لێرە دەکرێت بلێین کە نە سیستمە فیدرالییەکان نە سیستمە کۆنفیدرالییەکان بنەما و خسلەت و پێکهاتەکانیان لە یەك ناکەن. هەندێك سیستمی فیدرالی هەن کە حکومەتە مەرکەزییەکەی دەسەلاتەکانی کەمن، وەك ئەلمانیا بە بەراورد بە هەندێك سیستمیدیکە کە دەسەلاتەکانی حکومەتە مەرکەزییەکە چڕ و بەرفراوانن. لە ئەلمانیا هەرێمەکان لەهەندێك حالەتەدا دەسەلاتەکانیان لە دەسەلاتەکانی هەرێمە کۆنفیدرالییەکان نزیکدەبێتەوە وەك دەسەلات لە دانانی پەیوەندییە نێودەولەتییەکان.(٥) (ئیسپانیا)ش نموونەیەکیدیکەیە لەو سیستمە فیدرالییانەی کە هەرێمەکانی سوودمەندن لە کۆمەلێك دەسەلاتی سیاسی کە بەگشتی لە سیستمە فیدرالییەکان کەوتووەتە ژێردەستی حکومەتە مەرکەزییەکە.(٦)

ئەوەی لێرە دەمانەوێت روونیبکەینەوە ئەوەیە کە هەندێك سیستمی فیدرالی هەن هەلگری هەندێك بنەما و کارەکتەری سیستمی کۆنفیدرالین. دەبێت ئەوەش بلێین کە

هەندێك سیستمی فیدرالی هەن واخەریکە بەرەو کۆنفیدرالی دەڕۆن وەك ئیسپانیا و کەنەدا کەچی سیستمی ئەمریکی کە لە سەرەتا کۆنفیدرالی بوو بەرە و فیدرالی رۆیشتووە و ئێستا بووە بە فیدرالی. مەبەستی سەرەکی لەم قسانە ئەوەیە کە ئەوە راستنییە کە دەڵێن سیستمی فیدرالی یان کۆنفیدرالی وڵات بەرەو هەڵوەشانەوە دەبات، چونکە ئەوەی وڵات بەرەو هەڵوەشاندنەوە دەبێت ئەوە سیستمەکە نییە بەڵکو رادەی لێکنزیکی دید و تێگەیشتن و ئامانج و ئایدیۆلۆجیای پێکهاتەی هەرێمە فیدرالی و کۆنفیدرالییەکانە.

## عێراق: لە بەناو (فیدراڵی)یەوە بۆ کۆنفیدراڵی:

ململانێکان، جا چ ئەوانەی بەڕاستی ململانێن چ ئەوانەی وەك ململانێ دەردەکەون یان هەر ترس لە ململانێ، لە دایکبووی هەستی نیگەرانی و پەشۆکی و ترسی گروپ و نەتەوەکانی کۆمەڵگەکانن لەیەکدی. بەگوتەیەکیدێکە گروپەکان بۆیە لە ململانێن لەگەڵ ئەوانیدێکە چونکە هەست بە لەناوچوون یان لەناوبردن یان هەست بە هەڕەشەی لەناوچوون، دەکەن. دەشکرێت ململانێکان لە دایکبووی جیاوازی دێدە ناسیۆنالیستییەکان بن یان کەمی و زۆری هەژموونی (نفوزی) سیاسی گروپێك بن لەسەر ئەوانیدێکە یان چەوسانەوە و دابەشکردنی نارەواییانەی داهات و سامان بن لەنێو گروپەکان یان نایەکسانی لە دەستڕاگەیشتن بە سەرچاوەکان جا چ ماددی بن چ مەعنەوی، یان هەر پەرۆشی و حەز و ئارەزوی گەیشتن بە دەسەڵات بێت لەلایەن نوخبە سیاسییەکانەوە یان سەرکردەکانەوە. هۆکاری ململانێکان هەر چییەك بێت، ئەوانەی ئاماژەیانپێکرا یان ئیدێکە بن، چارەسەرکردنی دێموکراسییانەی لە کۆمەڵگە فرەنەتەوە و فرەمەزهەب و فرەکەلتور و فرەئایدیۆلۆجیاکان پرسگەلێکن کە ناکرێت خۆیان لێوەدووربگرین یان بپارێزین.

سیستمی فیدرالی، کۆنفیدرالی یان تێکەڵەیەك لە هەردووکیان یان هەر فۆرمێکی پێکەوەژیان و بڕیاردانی تەوافوقییانە (consociation) لەوانەیە هەلی چاك بخەنەپێش نەك هەر بۆ گەیشتن و پاراستنی ئاشتی لەنێوان ئەو گروپ و نەتەوانەی لەململانێدان، بەڵکو لەوانەیە ببێتە بەرجەستەکردنی کۆمەڵێك میکانیزم بۆ حوکمکردن و بەڕێوەچوون و

دابەشکردنی دەسەلاتەکان.[٧] ئەکادیمی و توێژەرەکان فۆرم و دیدی جیاجیان لەپەیوەند بە حوکمکردن بەرهەمهێناوە و خستووەتەڕوو بۆ مامەڵەکردن و چارەسەرکردنی کێشە و ململانێکانی سەر شوناس و شوناسی خاك (territorial identity)و دابەشکردنی دەسەلاتەکان و داهاتەکان لەنێوان گروپەکان لە عێراق. دیارە هەندێکیان لە خەمی بەیەکپارچەیی مانەوەی عێراقن و هەندێکیشیان زیاتر لەهەوڵی چارەسەری ململانێ نەتەوەیی و مەزهەبییەکانن، هەرکامێکیان بێت لەخوارەوە بەکورتی هەندێك لەو دیدانە بەسەردەکەینەوە و شیکاردەکەین و هەوڵدەدەین کورتهێنانەکانیان دەستنیشانبکەین، دواتریش نەخشەڕێگا پێشنیازکراوەکە دەخەینەڕوو.

گروپێك لە ئەکادیمی و توێژەرەکان لەو باوەڕەدان کە کێشانی سنووورەکان بەهاوتای سنووورە نەتەوەیی و مەزهەبییەکان ئەوە نەك نابێتە مایەی چارەسەری کێشە و ململانێکان لە عێراق بەڵکو پێ لەسەر ئەوەدادەگرن کە ئەم جیاکردنەوە و هەڵاواردنە کێشەکان و ململانێکان توندتر و گرژتردەکات. هاوکات دەڵێن ئەمجۆرە جیاکردنەوەیە، ئەوە بە ئیزافەی عێراق، ناوچەکەش دووچاری کۆمەڵێك کێشەی نەتەوەیی و مەزهەبی دەکات و ئاشتی و سەقامگیری ناوچەکە زیاتر تێکدەدات.[٨] بۆیە ئەوان پێشنیازی دابەشکردنی عێراق دەکەن بەسەر هەژدە هەرێمی فیدرالی و سنووورە کۆنەکانی هەژدە پارێزگاکەی سەردەمی حوکمڕانی بەعس بە بنەما بۆ هەرێمە فیدرالەکان دادەنێن.[٩] ئەم پرۆپۆزاڵە لە دیدێکی ئیدارییەوە تەماشای کێشە قوڵەکانی عێراق دەکات . کێشەو ململانێ مەزهەبییەکان نادیدە دەکات و ئەوە پشتگوێدەخات کە کێشەو ململانێ مەزهەبی و نەتەوەییەکانی عێراق لەو پارێزگایانە توندترو قوڵترو سەخترن کە گروپی نەتەوەیی و مەزهەبی (کوردو سوننەو شیعە) تێکەڵ بە یەك دەژین، وەك بەغدا، دیالە، کەرکوك، نەینەوا. ئەگەر مەبەست لە بەفیدرالی یان بەکۆنفیدرالی کردنی عێراق چارەسەری کێشە نەتەوەیی و مەزهەبییەکان بێت ئەوە ئەم پرۆپۆزاڵە هیچ بنەمایەك بۆ یەکلاکردنەوەی ئەم کێشانە راپێشناکات. باشترین نمونە کە کورتهێنانی ئەم پرۆپۆزاڵە نیشاندەدات ئەوە وەلاتانی کوردەکان بوو بۆ سوننەکان کاتێك لە هەڵبژاردنەکانی

پارێزگاکان لە ٢٠٠٥ زۆرینەی کورسییەکانی پارێزگاکەیان مسۆگەرکرد، کاتێکیش، لە هەڵبژاردنەکانی پارێزگاکان لە ٢٠٠٩ لیستە عەرەبییە سوننەکان زۆرینەی کورسییەکانیان بردەوە ئەمجارە عەرەبەکان کوردەکانیان لە دەسەڵات دوورخستەوە.(١٠) پێکنەهاتنی کوردەکان لەگەڵ عەرەبەکانی کەرکوك لە دوای هەڵبژاردنەکانی ٢٠٠٥ تا ئێستا بۆ ماوەی نۆ ساڵ بەهەمانشێوە لەرزۆکی پرۆپۆزاڵی دابەشکردنی عێراق بەسەر هەژدە هەرێم و جیانەکردنەوەی کورد و سوننە و شیعەکان دەسەلمێنێت.

وەك وەلاّمێك بۆ ئەو توندوتیژی و شەڕ و پێکدادانانەی کە لەنێوان سوننەکان و شیعەکانی عێراق لەدوای رووخانی رژێمەکەی سەدام حسێن روویانداوە لەگەڵ بەچارەسەرینەکراوەیی مانەوەی کێشە دێرۆکییەکەی نێوان کوردەکان و عەرەبەکان، هەندێك لە توێژەر و ئەکادیمی و چاودێری سیاسی و سیاسەتوان پێشنیازی "چارەسەریی سێ هەرێمی"یان بۆ عێراق کردووە.(١١) ئەم پرۆپۆزاڵە بایەخی خۆی هەیە و ناکرێت بە سوکوسانایی وەلابنرسێت، بەلاّم دەبێت ئەوە بەبیرخۆمان بهێنینەوە کە تا ٢٠١٠ کاتێك سوننەکان هاوتای کوردەکان داوای دامەزراندنی هەرێم یان چەند هەرێمێکی فیدرالییان نەکردبوو، ئەوە ئەم پرۆپۆزەڵە تەنیا وەلاّمێك بوو بۆ چارەسەرکردنی توندوتیژییەکان نەك رەچاوکردنی پرس و کێشەی شوناس و سەروەری و دانپێنان کە جەوهەری کێشەکان و ململانێکان لەنێوان گروپەکان لە عێراق پێکدێنن. ئەم پرۆپۆزاڵە لە سەرەتای هاتنی ئەمریکییەکان و داگیرکردنیان بۆ عێراق خرانەڕوو، بۆیە لە سەرەتا جێبەجێکردنی ئەم پرۆپۆزاڵە پشتیوانیی کەمبوو چونکە لە زۆر شوێنی عێراق شیعەکان و سوننەکان بەیەکەوەدەژیان، بەلاّم دوای سالاّنێك لە توندوتیژییەکان و شەڕ و پێکدادانەکان، بەتایبەتی لە ٢٠٠٥-٢٠٠٧ کە بوو بەمایەی پاکسازی مەزهەبی لە زۆرێك لەو شوێنانە ئیدی جێبەجێکردنی ئەم پرۆپۆزاڵە زیاتر گونجاوتر و قابیلی قەبوڵترە. لەڕاستیدا بێجگەلە کاریگەریی پاکسازییەکان، چ ئەوانەی شیعەکان چ ئەوانەی سوننەکان، ریفراندۆمەکەی ٢٠٠٥ و هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی عێراق لە ٢٠٠٥و ٢٠١٠دا بەڕوونی نیشاندەدەن کە عێراقییەکان لەسەر بنەمای مەزهەب و نەتەوە دەنگدەدەن و نەخشی دەنگدانەکان (

(pattern of voting) دابەشبوونی ناوچەکانی عێراق لەسەر بنەمای مەزهەبیی و نەتەوەیی بە زەقی دەخەنەڕوو.[١٢] ئەمەش ئەوەمان پێدەڵێت کە بەشی هەرەزۆری ناوچەکانی عێراق ئێستا تەنیا گروپێکی نەتەوەیی یان مەزهەبیی لێیان دەژین، واتە هۆمۆجینیەسن (homogeneous) نەخشەی نیشتجێبوونی شیعەکان و سوننەکان دوای پاکسازییە مەزهەبییەکان لەناو بەغداش وانیشاندەدەن کە سوننەکان و شیعەکان تەنانەت لەو بەغداش کە ساڵانێك بوو چەندین ناوچەی تێکەڵ بەیەکیان هەبوو ئێستا تاڕادەیەکی زۆر لە ناوچە و گەڕەکی جیاجیا دەژین و ناوچە تێکەڵەکان لە بەغدا نەماون (بۆ زانیاری زیاتر دەتوانن تەماشای نەخشەی ١و ٢و ٣ بکەن).[١٣]

| | |
|---|---|
|  |  |
| نەخشەی شوێنی نیشتەجێی شیعەکان و سوننەکان لە بەغدا لە ٢٠٠٣ | نەخشەی شوێنی نیشتەجێی شیعەکان و سوننەکان لە بەغدا لە ٢٠٠٨ |

کورتهێنانی سەرەکی ئەم پرۆپۆزاڵە لەوەدایە کە هیچ ڕەچاوی پایە و بارودۆخی بەغدای نەکردووە. باس لەوە ناکات کە لەم سێ هەرێمە بەغدا دەکەوێتە سەر کامیان، ئەمە لە کاتێکدایە کە ژمارەی دانیشتووانی بەغدا خۆی لە حەوت ملیۆن دەدا، واتە نزیکەی ٢١٪ی دانیشتووانی عێراق پێکدەهێنێت. ئەم پرۆپۆزاڵە ڕەچاوی ئەوەشینەکردووە کە ئەو فۆرمەی فیدرالیزم کە کورد و سوننە داوایدەکەن زیاتر لە کۆنفیدرالی دەچێت لەوەی لە فیدرالی بچێت (تەماشای خوارەوە بکە).

دوو ئەکادیمیدیکە پرۆپۆزاڵێکی جیاواز لەوانەی سەرەوە پێشنیازدەکەن کە دابەشکردنی عێراقە بۆ سەر پێنج هەرێم کە ئەمانەن: هەرێمی بەسرە (پێکهاتوو لە پارێزگاکانی بەسرە، میسان، زیقار و موسەنا)" هەرێمی کوفە (پێکهاتوو لە پارێزگاکانی نەجەف، کەربەلا، بابل، واسیت و قادسییە)" هەرێمی بەغدا (لە پارێزگاکانی بەغدا و دیالە)" هەرێمی موسڵ (پێکهاتوو لە پارێزگاکانی موسڵ، سەلاحەدێن و ئەنبار)" لەگەڵ هەرێمی کوردستان.(١٤) لەوەدەچێت بیرۆکەی ئەم پرۆپۆزاڵە هەڵقولاّی دابەشکردنی عێراق بێت بۆ سەر پێنج هەرێمی تاڕادەیەك یەکسان لە ژمارەی دانیشتووان و داهات. ئەوەی جێگای سەرنجە و پێویستە لێرە هەڵوەستەی لەسەربکرێت ئەوەیە کە ئەگەر عێراقییەکان لە ولاّتێکی فرەنەتەوەیی و فرەمەزهەب بەیەکەوە هەڵنەکەن، ئەوە بۆچوون لە چەند هەرێمێکی فرەنەتەوە و فرەمەزهەب بەیەکەوە ئاشتییانە دەژین. ئەم پرۆپۆزاڵە وەك ئەو پرۆپۆزاڵەی کە داوای دابەشکردنی عێراق بۆ هەژدە هەرێم دەکات کورتهێنانەکەی لەوەدایە کە پێیوایە کێشەی عێراق کێشەیەکی ئیدارییە و پەیوەندیّ بە دابەشکردنی یەکسانانەی سامان و داهاتە، بەس راستە دابەشکردنی سەروەت و سامان رەهەند و هۆکارێکی سەرەکی کێشەکانی عێراقە و خراپ بەڕێوەبردن گرفتێکە سالاّنێکە عێراق تێیئالاّوە بەلاّم هەروەك پێشتر ئاماژەمانپێکرد پرسی شوناس و شوناسی خاك و دانپێنان و سەروەری کرۆکی کێشەکانی عێراق پێکدێنن، بۆیە هەر فۆرمێك بۆ داڕشتن یان داڕشتنەوەی عێراق ئەم پرسانە لەبەرچاونەگرێت ئەوە بە مردوویی لەدایکدەبێت.

ئەم بابەتە هەوڵدەدات چارەسەرکردنی کێشەکانی عێراق بەتێپەڕبوون لەو فۆرمانەی کە چەقیان لەسەر پرسە ئیدارییەکان داناوە دەستپێبکات و پرسی شوناس و شوناسی خاك و دانپێنان و سەروەری بکات بە چەق و سەرچاوە و هەوێنی پرۆپۆزاڵەکەی بۆ چارەسەرکردنی کێشە قووڵ و ئاڵۆزەکانی عێراق. ئەوەش بەسەرلەنویّ داڕشتنەوەی عێراق لەسەر بنەمای کۆنفیدرالی پێشنیازدەکات. دیارە لێرە دەبێت ئەوە روونبکەینەوە کە ئەو فۆرمەی کۆنفیدرالی کە لێرە پێشنیازکراوە تێکەڵەیەکە لە سیستمی فیدرالی و کۆنفیدرالی، چونکە وەك پێشتر ئاماژەپێکرا سیستمە فیدرالییەکانی دنیای ئەمڕۆ

لەیەکناکەن، ئەوەی لێرە پێشنیازکراوە رەچاوی بارودۆخی تایبەتی سیاسی و ئابووری عێراق و پێکهاتەکانی کردووە.

### بۆ سیستمی کۆنفیدراڵی؟

پرسیارێك لێرە دێتەپێش ئەویش ئەوەیە بۆ سیستمی کۆنفیدرالی، بۆیە پێشئەوەی نەخشەرێگا کۆنفیدرالییەکە پێشنیازبکەین هەوڵدەدەین وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە. هۆکار زۆرن بەڵام ئێمە پێمانوایە گرنگترینیان ئەمانەن:

**یەکەم**، شوناسی نەتەوەیی و نیشتیمانیی و شوناسی خاك ناوجەرگەی پرسی کورد لە عێراق پێکدێنن،(١٥) سالآنێکیشە، لانیکەم لە ٢٠١٠ ـەوە، شوناسی مەزهەبی و شوناسی خاك گرنگی خۆی لەنێو سوننەکانی عێراق پەیداکردووە و ئێستاکە باس لە زەقبوون و دەرکەوتنی ئاشکراییانەی شوناسی سوننی لە عێراق دەکرێت.(١٦) بۆ سوننەکان دەکرێت بڵێین پرسی شوناس خۆی تەنیا وەك سوننیبوون نیشانناداتت بەڵکو وەك سوننەی- عەرەبی- عێراقیی دەردەخات. ئەوە بەو مانایە نییە کە شوناسی سوننیبوون لە عێراق دیاردەیەکی نوێبێت، چونکە بەدرێژایی مێژووی کۆن و نوێ عێراق تایفەگەرێتیی لەو وڵاتە هێزی خۆی هەبووە ئەگەر نەڵێین دینامۆی سەرەکی مێژوو و ململانێکانی عێراقی پێکهێناوە. سوننەکان، لانیکەم لەدوای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق، شوناسی سوننەیان لەژێر چەتری شوناسی عەرەبی- عێراقی شاردبووەوە و دەرکەوتەکانی لە پشتیوانی سوننەکان بۆ حیزبە ناسیۆنالیستییە عەرەبییەکانی وەك ئیستیقلال و بەعس دەبینرا.(١٧) لەبەرئەوەی کە پرسی شوناس و شوناسی خاك و دانپێنان و سەروەری جەوهەری ململانێکان پێکدێنن، بۆیە کۆنفیدرالی نەك فیدرالی باشتر و چاکتر وەڵامگۆی حەز و ئارەزوو و داوا و مافەکانی کوردەکان و سوننەکانە لە عێراق.

**دووەم**، لە ٢٠١٠ ـەوە سوننەکان داوای دامەزراندنی هەرێمێك یان چەند هەرێمێکی فیدرالی دەکەن. سوننەکان پێداگری لەسەرئەوەدەکەن کە ئەو هەرێمەی ئەوان دەیانەوێت

دەبێت هاوشێوەی هەرێمی کوردستان بێت، [١٨] بەواتایەکیدیکە هەرێمی کوردستان وەك مۆدێلێکی لاساییکردنەوە دەبینرێت لەلایەن سوننەکانەوە،[١٩] بەلاَم ئەوەی لەسەر ئەرزی واقیع دەبینرێت ئەوەیە کە پەیوەندییەکانی نێوان حکومەتی هەرێمی کوردستان و حکومەتی مەرکەزی لە بەغدا زیاتر لەسەر بنەماکانی کۆنفیدرالی رێکخراوە نەك فیدرالی. بۆ پشتڕاسترکردنەوەی ئەم راستییە تەنیا هەڵوەستە لەسەر چەند خالێك دەکەین:

١. حکومەتی هەرێم خاوەنی هێزی سەربازی خۆیەتی، پێشمەرگە، کە فەرمان لە سەرکردە کوردەکان وەردەگرن نەك سەرکردەی هێزە سەربازییەکانی عێراق کە (نوری مالیکی)یە.

٢. هەرێمی کوردستان خاوەنی دەزگا هەولگرییەکانی خۆیەتی (پاراستنی پارتی و زانیاری یەکێتی) کە پەیوەندییەکی پلەبەندیٚ (hierarchical) بە دەزگا هەوالگرییەکانی عێراقەوە نایانبەستێتەوە.

٣. هەرێمی کوردستان پەیوەندییەکانی دەرەوەی خۆی لەڕێگەی وەزارەتی دەرەوە و بالوێزخانەکانی عێراق لە ولاَتانی دەرەوە رێکناخات، بەلْکو پەیوەندییەکانی خۆی راستەوخۆ یان لەڕێگەی نوێنەرایەتییەکانی حکومەتی هەرێم لە دەرەوە رێکدەخات.

٤. فرۆکەخانەکانی هەرێم و بازگە سنوورییەکان کە پرسی ڤیزا و گومرگی تێدابەڕێوەدەچێت لەلایەن حکومەتی مەرکەزییەوە بەڕێوەنابرێن، بەلْکو حکومەتی هەرێم بەخۆی سەرپەرشتیان دەکات. هەموو ئەمانەی کە ئاماژەمانپێکردن لە سیستمە فیدرالییەکان لە دەسەلاَتەکانی حکومەتی مەرکەزین، بەلاَم لە حالْەتی هەرێمی کورستان لەلایەن حکومەتی هەرێم و دامودەزگاکانیەوە بەڕێوەدەچن. ئەوەش ئەوەمان پێدەلْێت کە پەیوەندییەکانی هەرێم و حکومەتی مەرکەزی لەڕاستیدا لەسەر ئەرزی واقیع لەسەر بنەمای کۆنفیدرالی رێکخراون. کاتێکیش سوننەکان داوای دامەزراندنی هەرێم دەکەن هاوشێوەی هەرێمی کوردستان لەڕاستیدا ناڕاستەوخۆ داوای کۆنفیدرالییەت دەکەن نەك فیدرالییەت. لەوەش زیاتر ماوەی بیست و سیٚ سالْ دەبێت، هێنانەوەی سوپای عێراق لەلایەن پارتی دێموکراتی کوردستان لە ٣١ ی ئابی ١٩٩٦ی لێدەرچێت، تاکە یەك سەربازی عێراقی لەسەر خاکی هەرێمی کوردستان نەبینراوە. جوولْەی هێزە سەربازییەکانی

عێراق نەك هەر بۆ ناو هەرێم بەڵكو بۆ ئەو ناوچە كێشەلەسەرانەش رێگەی لێدگیردرێت كە ئێستا لەژێر دەسەلاتی كوردەكانن، بۆنموونە كەركوك و مەخمور و خانەقین و شێخان.

هاوتای كوردەكان، سوننەكانیش ماوەیەكە داوای دەرچوونی هێزە سەربازییەكانی عێراق لە ناوچە سوننەنشینەكان، بەتایبەتی شارەكان، دەكەن.[٢٠] ئەو هاوارەی سوننەكان بۆ دەرچوونی هێزە سەربازییەكانی عێراق لەناو شاری رومادی لەسەروبەندی پێكدادانەكانی ناو رومادی و فەلوجە لەكۆتایی ٢٠١٣و سەرەتای ٢٠١٤دا دوو شتمان پێدەڵێن، یەكەم پشتڕاستی ئەو ئارگیومێنتە دەكەن كە ئێمە لێرە خستومانەتەڕوو، دووەم، ئەوە نیشاندەدەن كە لە دیدی سوننەكان سوپای عێراقی سوپایەكی نیشتیمانی نییە، بەڵكو وەك سوپای شیعە تەماشادەكرێت، بۆیە داوای دەرچوونی دەكرێت لە شارە سوننییەكان.

**سێیەم**، دارشتنەوەی عێراق لەسەر بنەمای كۆنفیدرالییەتێك كە سنووری هەرێمەكانی بكەوێتەسەر سنوورە نەتەوەیی و مەزهەبییەكان ئەگەرەكانی لێكجیابوونەوەی ئاشتییانەی هەرێمەكانی لێدەكەوێتە ئەگەر ئەم ئەگەرە لە دوارۆژ هاتەپێش. ئەو شەرە خوێناوییەی لە یۆگۆسلاڤیا لە نەوەتەكانی سەدەی رابروو روویدا یەكێك لە هۆكارەكانی ئەوەبوو كە سنووری هەرێمەكانی یۆگۆسلاڤیا نەدەكەوتەسەر سنووری نەتەوەیی و ئایینی پێكهاتەكانی یۆگۆسلاڤیا، بۆیە كۆنفیدرالیی نەتەوەیی و مەزهەبیی ئەگەرەكانی ئەوەی پێیدەگوترێت بەبەلقانكردنی (Balkanisation) عێراق كەمدەكاتەوە. لێكجیابوونەوەی ئاشتیانەی سلاڤەكان و چیكەكانی چیكۆسلۆفاكیا دەكرێت بۆئەوە بگێڕدرێتەوە كە سنوورەكانی هەرێمەكانی چیكۆسلۆفاكیا تاڕادەیەكی زۆر كەوتبوونەسەر سنوورە نەتەوەییەكان. دیارە دەبێت ئەوە بڵێین كە هەرچەند هەوڵبدرێت كەچی بەهیچ شێوەیەك ناكرێت كە هەرێمێك لە عێراق یان لەهەر شوێنێكیدێكە دروستبكرێت كە سەد لەسەد سنوورەكانی سنووری نەتەوەیی یان ئایینی گروپێك پێكبێنن، بەلاّم ئەوەی ئێمە باسیدەكەین هەوڵدانە بۆ نزیكبوونەوە لە سنوورە نەتەوەییەكان یان ئایینییەكان تا بكرێت.

**چوارەم**، گەشەی سیاسی لە عێراق و مێژووی كۆن و نوێی ئەو ولاّتە پڕیەتی لەو بەڵگانەی كە پێماندەڵێن دروستكردنی حیزبی سیاسیی یان هاوپەیمانیەتی حیزبیی كە سنوورەكانی

نەتەوە (کورد- عەرەب) یان مەزهەبی (سوننە- شیعە) تێپەڕاندبێت سەختە ئەگەر نەڵێین مەحاڵە. لە مێژووی عێراق دوو حیزب تاڕادەیەك ئەم سنوورانەیان تێپەڕاند ئەوانیش حیزبی شیوعی عێراقی و حیزبی بەعس بوون. حیزبی شیوعی لە نەوەتەکانی سەدەی رابردوو بوو بە دوو لەت، لەتێکی کوردی و لەتێکی عەرەبی کە ئێستاکانێ هیچکام لەم لەتانە رۆڵێکی ئەوتۆ لە گۆڕەپانی سیاسی عێراق نابینن.(٢١) بەهەمانشێوە حیزبی بەعس تا شەستەکانی سەدەی رابردوو تاڕادەیەك نوێنەرایەتی شیعە و سوننەی عێراقی دەکرد، بەڵام لە سەرەتای شەستەکان باڵی عەسکەری بەعس کە لە سوننەکان پێکهاتبوو کودەتایەکیان بەسەر باڵە مەدەنییەکەی بەعسدا کرد کە زۆربەیان شیعە بوون، ئەمەش بووە مایەی بە سوننەبوونی بەعس لەو کاتەوە.(٢٢) ئێستا بەعس نەك رۆڵی لێکنزیکبوونەوەی شیعەکان و سوننەکان نابینێت بەڵکو بووتە زیاتر لێکترازان و دوژمنایەتیکردنی یەکدی ئەو دوو گروپە، بۆیە لە غیابی حیزبی سیاسی سەرتاسەری (pan-Iraqi) لەو وڵاتەدا کۆنفیدرالی لەسەر بنەمای نەتەوەیی و مەزهەبی نەك هەر بیرۆکەیەکی چاکە بەڵکو بووە بە ئەمری واقیع.

**پێنجەم**، دارشتنەوەی عێراق لەسەر بنەماکانی کۆنفیدرالی لەوانەیە ببێتە مایەی چارەسەرکردنی کۆمەڵێك پرسی گرفتئامێز (controversial) وەك رۆڵی ئایین لە سیاسەتدا کە شیعەکان لە هەوڵی ئەوەدان رۆڵی زیاتر بکەن لەسیاسەتدا کەچی لەبەرابەر ئەم هەوڵانە لایەنە کوردی و سوننییەکان دژایەتی زیاترکردنی رۆڵی ئایین لەسیاسەتدا دەکەن. لەوەتەی شیعەکانیش باس لە جێبەجێکردنی شەریعەتی جەعفەری دەکەن ئەم پرسە گرنگی و بایەخی زیاتر پەیداکردووە.(٢٣) بۆ تێپەڕاندنی ئەم پرسە واچاکە عێراق لەسەر بنەماکانی کۆنفیدرالی رێکبخرێتەوە. ئەوکات هەر هەرێمەی بە ئارەزوی خۆی سنوورەکانی رۆڵی ئایین لەسیاسەتدا بۆ خۆی دیاریدەکات بەبێ ئەوەی لایەنێك یاساکانی خۆی بەسەر لایەنەکانیدیکە بسەپێنێت. بەواتایەکیدیکە ئەم پرسانە لە ئاستی هەرێمەکاندا مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت و چارەسەردەکرێن نەك لە ئاستی نیشتیمانیی/ مەرکەزیی.

**شەشەم**، وەك ئەوەی ئەزموونی هەرێمی کوردستان نیشانمانیدەدات، دامەزراندنی هەرێمەکان لەسەر بنەمای نەتەوەیی دەبێتە مایەی دروستبوون و بەهێزبوونی کۆمەڵگەی مەدەنی، دیارە مەبەست بەراوردە بە ناوچەکانیدێکەی عێراق. هاوکات کۆنفیدرالییەت لەوانەیە ببێتە مایەی دروستبوونی حیزبی سیاسی کە پرنسیپەکانی لەسەر دادی کۆمەلآیەتی و یەکسانی دارِشتبێت نەك پۆلیتیکی شوناس (identity politics) کۆنفیدرالی لەسەر بنەمای نەتەوەیی و مەزهەبی رکابەری سیاسی لەسەر بنەما ئایدێۆلۆجییەکان لەنێوان لایەنە سیاسییەکانی هەرێمەکە بەهێزدەکات و ئەمەش دەبێتە مایەی دروستبوونی حیزب و گروپی سیاسی لە دەرەوەی ئایدێۆلۆجییە نەتەوەیی و مەزهەبی و ئایینییەکان وەك ئەوەی کە لە دروستبوونی بزووتنەوەی گۆڕان لە هەرێمی کوردستان دەردەکەوێت. کەیسی گۆڕان لە هەرێمی کوردستان کە تائێستا لە دوو هەڵبژاردندا سەرکەوتووانە بەشداریکردووە، لە یەکەمیان ٢٥٪ دەنگەکان و لە دووەم ٢٤٪ دەنگەکانی بردەوە، ئەوەمان پێدەڵێت کە ئەگەر هەرێمیدێکە لە عێراق لەسەر بنەمای کۆنفیدرالییەتی مەزهەبی و نەتەوەیی دابمەزرێن ئەوە ئەگەری ئەوە زیاتردەکات کە حیزبی هاوتای گۆڕان لە هەرێمەکانیدێکەش دروستبن. گرنگی ئەمە لەوەدایە کە دروستبوونی حیزبی سیاسی لە دەرەوەی ئایدێۆلۆجییە نەتەوەیی و ئایینییەکان ئەگەرەکانی چارەسەرکردنی کێشە نەتەوەیی و مەزهەبییەکانی عێراق ئاسانتردەکات.

**حەفتەم**، لەکاتێکدا کە عێراق نەك لەسەر رۆخی هەڵوەشانەوەیە (break up) بەڵکو ترسی وردوخاشبوونی (break down) لەسەرە و لەوانەیە ببێتە مایەی نەك هەر لەتلەتبوونی عێراق بەڵکو دابەشبوونی هەرێمی کوردستانیش بەسەر چەند وردە-هەرێمێکدا، دروستکردنی چەند هەرێمێکی کۆنفیدرالیدێکە زۆر گرنگە بۆ پاراستنی عێراق و هەرێمی کوردستان نەك هەر لە دابەشبوون بەڵکو لە وردوخاشبوون.

لە برِگەی خوارەوە چۆنییەتی دارِشتنەوەی عێراق بۆ چەند هەرێمێکی کۆنفیدرالی دەخەینەرِوو بەلاَم وەك پێشتر ئاماژ□مانپێکرد ئەو کۆنفیدرالییەی لێرە پێشنیازدەکرێت هەڵگری کۆمەڵێك کارەکتەری سیستمە فیدرالییەکانیشە.

**داڕشتنەوەی عێراق لەسەر بنەمای چوار هەرێمی کۆنفیدراڵی:**

لەم چەند پەرەگرافەی خوارە نەخشەڕێگایەك بۆ سەرلەنوێ داڕشتنەوەی عێراق بۆ چوار هەرێمی کۆنفیدرالیی دادەڕێژین بەو هیوایە کە ببێت بە بنەمایەك بۆ رزگارکردنی عێراق لەو قەیرانە سیاسی‌یانەی کە سالآنێکە دووچاری بۆتەوە لەگەڵ دوورخستنەوەی لە لێوارەکانی شەری ناوخۆی زۆر خوێناویتر لەوەی ئێستا بەدەستییەوە دەناڵێنێت. ئەوەی ئێجگار گرنگە لێرە ئاماژەی پێبکرێت ئەوەیە کە سەرکەوتن یان شکستی پێکەوەهەڵکردن و هاوکاری هەم گروپە نەتەوەیی و مەزهەبییەکان هەم هەرێمە کۆنفیدرالییەکان وابەستەیە بە جێبەجێکردنی بنەماکانی دێموکراسی تەوافوقی ( consociational democracy)و وەلانانی دێموکراسییەتی زۆرینە ( majoritarian democracy) لە بڕیارداندا لەسەر ئاستی حکومەتی مەرکەزی و پەرلەمانەکانی عێراق، بەتایبەتی لە پەیوەند بە پرسە ستراتیجییە سیاسی و ئابورییەکان. ئەمە بەو مانایەیە کە ئیدی تاکە گروپێکی نەتەوەیی یان مەزهەبی نەتوانێت تاکلایەنانە بێگەڕانەوە بۆ پێکهاتەکانیدێکە و بنەماکانی دێموکراسییەتی تەوافوقی بڕیارە گرنگ و چارەنووسسازەکانبدات. خۆشاردنەوە لە میکانیزمەکانی دێموکراسییەتی تەوافوقی چارەنووسی عێراق بەرەو هەڵوەشانەوە یان شەری ناوخۆ دەبات. ئەم نەخشەڕێگایە سەرەتایەکە بۆ سەرلەنوێ داڕشتنەوەی سیاسییانەی عێراق بە پێشنیازکردنی دامەزراندنی چەند دەزگایەك و دەستکاریکردنو هەموارکردنی هەندێکیدێکە لەگەڵ خستنەڕووی چەند میکانیزمێك بۆ سەرەڕێخستنی راسپاردە و پێشنیازەکان، وەك لەخوارەوە هاتوون:

**یەکەم**، دروستکردنی سێ کۆنفیدرالیی کە سنوورەکانیان هاوسنووری دابەشبوونە نەتەوەیی و مەزهەبییەکان بێت لەنێو سێ پێکهاتە سەرەکییەکەی عێراق، سوننەکان و شیعەکان و کوردەکان (تەماشای نەخشەی ٤ بکە). کۆنفیدرالیی یەکەم دەکرێت ناویلێنرێت کۆنفیدرالی کوردستان، کە لەو ناوچانە پێکدێت کە ئێستا هەرێمی کوردستان پێکدێنن لەگەڵ ئەو شار و قەزا و ناحیانەی کە زۆرینەیان کوردن لە پارێزگاکانی کەرکوکو نەینەوا و دیالەو سەلاحەدێن. واچاکە ئاماژە بەوەبکەین کە چارەنووسی ئەو شار و قەزا و

ناحیانەی کە دەخرێنەسەر کۆنفیدرالی کوردستان دەبێت بەپێی ماددەی ١٤٠ لە دەستوری عێراق دیاریبکرێن کە بۆ مەبەستی یەکلاکردنەوەی چارەنووسی ناوچە کێشەلەسەرەکان خزێنراوەتەناو دەستور. کۆنفیدرالیی دووەم دەکرێت ناویلێنرێت کۆنفیدرالی رۆژئاوا کە ناوچەکانی رۆژئاوا و باکوری رۆژئاوی عێراق دەگرێتەخۆ و لە پارێزگای ئەنبار و ناوچە عەرەبنشینەکانی پارێزگاکانی کەرکوك و نەینەوا و سەلاحەدێن و دیالە پێکدێت. کۆنفیدرالیی سێیەم دەکرێت ناویلێبنرێت کۆنفیدرالی باشوور کە ناوچەکانی باشووری عێراق دەگرێتەخۆو لە پارێزگاکانی بابل و کەربەلا و نەجەف و قادسییە و واسیت و میسان و زیقار و موسەنا و بەسرە و ناوچە شیعەنشینەکانی پارێزگای دیالە پێکدێت. لەپاڵ ئەم سێ کۆنفیدرالییەتە ئەم نەخشەرێگایە پێشنیازی ئەوەدەکات کە شاری بەغدا بە سنووری شارەوانی پایتەختەوە بکرێت بە هەرێمێك هاوشێوەی هەرێمی پایتەختی ئـــــوسترالیی (*Australian Capital Territory, ACT*)لە ئوســتراليا يان واشنتن دی سی (Washington DC) لە ئەمریکا، ناویشیلێنرێت هەرێمی بەغدای پـــــایتەخـت (Baghdad Metropolitan Region)، کە هەم ببێت بە پایتەختی دەوڵەتی کۆنفیدرالی عێراق و سەنتەری حکومەتی هەرێمی بەغدای پایتەخت. بەمەش سێ کۆنفیدرالییەتەکەی کوردستان و رۆژئاوا و باشوور لەگەڵ هەرێمی بەغدای پایتەخت کۆماری عێراق پێکدێنن. هەر کۆنفیدرالیێکیش لە چەند پارێزگایەك پێکدێت و پارێزگاکانیش بۆ قەزا و ناحیە دەبەشدەکرێن وەك چۆن دەوڵەتی کۆنفیدرالی عێراق لەسەر بنەمای نامەرکەزییەت رێکخراوە بەهەمانشێوە پەیوەندێ نێوان کۆنفیدرالەکە و پارێزگا و قەزا و ناحیەکان دەبێت لەسەر بنەمای نامەرکەزییەت رێکبخرێن و دەسەڵاتەکان تابکرێت شۆڕبکرێنەوە بۆ خوارەوە.

**دووەم**، وەك ئێستا چۆن رێکخراوە، سەرۆککۆمار سەرۆکی دەوڵەت (head of state) دەبێت و نوێنەرایەتی گەلی عێراق دەکات، بەڵام دەسەڵاتەکانی تەشریفاتی دەبن. ماوەی سەرۆکایەتی سەرۆککۆمار پێنج ساڵ دەبێت و کەسی کاندێدکراو دوای وەرگرتنی رەزامەندێ لەلایەن هەردوو پەرلەمانی نیشتیمانیی عێراق (ئەنجومەنی نوێنەرانی

نیشتیمانیی و ئەنجومەنی نیشتیمانیی کۆنفیدرال) وەك سەرۆککۆمار هەڵدەبژێردرێت. پۆستی سەرۆککۆمار دەوری (rotational) دەبێت لەنێوان سێ کۆنفیدرالەکە و هەرێمی بەغدای پایتەخت. کاندێدیٚ پۆستی سەرۆککۆمار دەبێت پێش ئەوەی رەزامەندیٚ هەردوو پەرلەمانی نیشتیمانی عێراق وەرگرێت لەلایەن پەرلەمانی یەکێك لە کۆنفیدرالەکان یان هەرێمی بەغدای پایتەخت بەزۆرینەی رەها کاندێدکرابێت. کەسی کاندێدکراو بۆ پۆستی سەرۆککۆمار دەکرێت لە یەکێك لە سێ پێکهاتە گەورەکەی عێراق (شیعە، سوننە یان کورد) بێت یان کەسێك بێت لە گروپە نەتەوەیی و ئایینییەکانیدێکە (وەك تورکمان، کلدان، ئاسوری، ئەرمەنی، یەزیدیٚ، شەبەك، کاکەیی یان مەندائی). هەر کۆنفیدرالێك لەگەڵ هەرێمی بەغدای پایتەخت حوکمدارێك (Governor) ی دەبێت، دەکرێت ناویلێبنرێت سەرۆکی کۆنفیدرال یان سەرۆکی هەرێمی بەغدای پایتەخت، دەسەڵاتەکانیشی وەك دەسەڵاتەکانی سەرۆککۆمار تەشریفاتی دەبن . حوکمدار دەبێت لەنێوان چەند کاندێدێك بۆ پۆستی حوکمدار بەزۆرینەی رەها لەلایەن هەردوو پەرلمانی کۆنفیدرالەکە یان هەرێمی بەغدای پایتەخت هەڵبژێردرێت.




نەخشەی ٣




نەخشەی ٤

**سێیەم**، سەرۆکوەزیران و کابینەکەی دەسەڵاتی جێبەجێکەری حکومەتی مەرکەزی لە بەغدا پێکدێنن، بەغداش وەك پایتەختی حکومەتی مەرکەزی و مەرکەزی حکومەتی هەرێمی بەغدای پایتەخت دەمێنێتەوە. هەروەك لە دەستوری عێراقدا هاتووە ئەو حیزبە سیاسییەی کە زۆرینەی کورسییەکانی پەرلەمان (ئەنجومەنی نوێنەرانی نیشتیمانی) یان ئەو کوتلە/ هاوپەیمانییە پەرلەمانییەی کە لەپێش یان دوای هەڵبژاردنەکان پێکدێت، دوای کاندێدکردنی نوێنەرێکیان لەلایەن سەرۆککۆمارەوە، سەرۆکوەزیران دیاریدەکەنو حکومەت پێکدێنن . ئەگەر کەسە کاندێدکراوەکە لە ماوەی دیاریکراو بەپێی دەستور نەیتوانی حکومەت پێکبێنێت ئەوە سەرۆك کۆمار داوا لە کەسێك، کە بتوانێت رەزامەندیٚ زۆرینەی ئەندامانی پەرلەمان مسۆگەربکات، دەکات بۆ پێکهێنانی حکومەت. سەرۆکوەزیران ئەندامانی کابینەکەی دەستنیشاندەکات. وەك لە ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی ٢٠٠٥ و ٢٠١٠ دەردەکەوێت زۆرینەی حیزب و رێکخراو هاوپەیمانییە سیاسییەکان لە عێراق لەسەر بنەمای نەتەوەیی یان مەزهەبی دامەزراون و دەنگەکانیشان هەر لەسەر هەمان بنەما بەدەستهێناوە. بۆیە ترسی ئەوە هەیە کە هەر حکومەتێك کە لەئاستی نیشتیمانیی لە عێراق لەسەر بنەمای زۆرینەی پەرلەمانی پێکبێت ئەوە دێکتاتۆرییەتی زۆرینەی لێدەکەوێتەوە، چونکە حکومەتەکە تەنیا نوێنەرایەتی گروپێکی دیاریکراو، بەگشتی شیعەکان یان عەرەبەکان، دەکات. بۆ چارەسەرکردنی ئەم گرفتە ئەوەدەبێت پەنا بۆ بنەماکانی دێموکراسی تەوافوقی ببرێت. بۆیە ئێمە بە توندیٚ پێشنیازی ئەوە دەکەین کە لە ئاستی حکومەتی مەرکەزی، حکومەت دەبێت لە نوێنەرە براوەکانی هەموو پێکهاتە سیاسی و نەتەوەیی و مەزهەبییەکان پێکبێت. لەپاڵ ئەمەشدا دەبێت میکانیزمی دابەشکردنی دەسەڵاتەکان لەنێوان سەرۆکوەزیران و وەزیرەکان بەگشتی و بڕیارەکانی کابینە (ئەنجومەنی وەزیران)و پەرلەمان (ئەنجومەنی نوێنەرانی نیشتیمانیی و ئەنجومەنی نیشتیمانیی کۆنفیدراڵ) لە پەیوەند بە پرسە ستراتیجییەکان و ئەمنییەکان و ئابوورییەکان لەسەر ئاستی عێراق بە بنەما لەسەر پرنسیپی تەوافوق بدرێن یان دەربکرێن. حکومەتی سێ کونفیدرالەکان و حکومەتی هەرێمی بەغدای پایتەخت دەبێت لەگەڵ حکومەتی

مەرکەزی لەسەر میکانیزمەکانی دابەشکردنی دەسەلأتەکان لە پرسە پەیوەندارەکان بە بەرگری، پەیوەندییەکانی دەرەوە، دارایی و دراو پێکبێن. دەکرێت ماددەی ١١٠ لە دەستور بکرێت بە بنەمایەك کە تێیدا دەسەلأتەکانی لەم پرسانە داوە بە حکومەتی مەرکەزی، بەلأم بە رەچاوکردنی دارشتنەوەی عێراق لەسەر بنەمای کۆنفیدرالی نەك فیدرالی. دەبێت پێکهاتە نەتەوەیی و مەزهەبییەکان هەریەکەیان بە رێژەی خۆیان لەناو هێزە سەربازییەکانی عێراق نوێنەرایەتییان لە هەموو ئاستە فەرماندەییەکان هەبێت. لەپالئەمانە، فەرمانبەرانی حکومەتی مەرکەزی لەهەموو ئاستەکاندا دەبێت لە کەسانێك بن کە نوێنەرایەتی سەرتاسەری عێراق بکەن. بۆ ئەم مەبەستەش دەبێت دەزگایەکی تایبەت کە سەرپەرشتیکردنی دامەزراندنی فەرمانبەرەکان، بە بنەما لەسەر توانا و کارامەیی و لێهاتوویی و پسپۆریی، بکات، بەمەرجێك کە زەمانەتی نوێنەرایەتی پێکهاتە نەتەوەیی و مەزهەبییەکانیشی تێدامسۆگەربکات.

**چوارەم**، بۆ رێکخستنی پەیوەندییەکانی نێوان حکومەتی کۆنفیدرالییەکان و هەرێمی بەغدای پایتەخت لەگەڵ حکومەتی مەرکەزی دەبێت ئەنجومەنی هاوکاری و هەمئاهەنگی نیشتیمانیی ( (National Coordination Councilپێکبهێنرێت کە پێکبێت لە سەرۆکوەزیرانی ( (Prime Ministerعێراق، سەرۆکوەزیرانی ( (Premierهەر سێ کۆنفیدرالەکە و هەرێمی بەغدای پایتەخت. ئەنجومەنەکە دەبێت وەرزانە، واتە ساڵی چوارجار، دانیشتنی ئاسایی خۆی بکات. ئەگەریش پێویستیکرد دانیشتنی نائاسایی بکات. لە دانیشتنەکان دەبێت پرسە پەیوەندارەکان بە داهات و سەرچاوەکان و چۆنیەتی دابەشکردنیان قسەیان لەسەربکرێت لەگەڵ ئەو پرس و کێشانەی کە لەنێوان کۆنفیدرالەکان و هەرێمی بەغدای پایتەخت دێنەپێش یان ئەوانەی لەگەڵ حکومەتی مەرکەزی. لەکاتی گفتوگۆکانی ئەنجومەنی هاوکاری و هەمئاهەنگی نیشتیمانیی دەکرێت وەزیرە پەیوەندارەکان بەشداری دانیشتنەکان بکەن. بۆ ئەم مەبەستە دەکرێت سوود لە ئەزموون و مۆدێلی ئوسترالیا وەربگیردرێت. لە ئوسترالیا ئەنجومەنی حکومەتەکانی ئوسترالیی ( *Council of Australian Governments*) چوارچێوەی پەیوەندییەکانی

نێوان حکومەتی مەرکەزی و حکومەتە فیدرالی و هەرێمییەکانی رێکخستووە. [٢٤]

**پێنجەم**، سەرۆکوەزیران ((Premierو کابینەکەی لە کۆنفیدرالەکەی یان هەرێمەکەی دەسەڵاتی جێبەجێکار پێکدێنن. ئەو لایەنە سیاسییەی کە زۆرینەی کورسییەکانی پەرلەمان (ئەنجومەنی نوێنەرانی کۆنفیدرال یان هەرێم) مسۆگەردەکات لەسەر داوای حوکمدار (سەرۆکی کۆنفیدرال/ هەرێم) دەتوانێت حکومەت پێکبێنێت. لەئاستی کۆنفیدرالەکان، لەبەرئەوەی کە هەر سێکیان بەگشتی لە یەك گروپی نەتەوەیی یان مەزهەبیی پێکهاتون،[٢٥] واتە هۆمۆجینیەسن (homogeneous)، بۆیە دەکرێت هەم پێکهێنانی حکومەت هەم بڕیاردان لە پەرلەمان بەبێ گەڕانەوە بۆ پرنسیپەکانی دێموکراسییەتی تەوافوقی جێبەجێبکرێن، بەڵام ئەمە بەم مانایە نییە کە لە پرسە ستراتیجییەکان بەتایبەتی ئەوانەی کە پەیوەندیٚ کۆنفیدرالەکان لەگەڵ یەك و کۆنفیدرالەکان لەگەڵ حکومەتی مەرکەزی دیاریدەکات رەچاونەکرێن. ئەم خاڵە بەتایبەتی بۆ کونفیدرالیی کوردستان و رۆژئاوا گرنگە و واچاکە رەچاوبکرێت. لەبەرئەوەی بەغدا ئێستاشی لەگەڵدا بێت شارێکی فرەمەزهەب و فرەنەتەوەیە. راستە بەغدا ناوچەی تێکەڵی کەم تێداماوە، بەڵام رێژەی سوننەکان لە بەغدا ئێستا بە ٢٥٪ مەزەندەدەکرێت، بۆیە لە هەرێمی بەغدای پایتەخت وەك ئاستی مەرکەزی لە عێراق مەرجە کە پرنسیپەکانی دێموکراسییەتی تەوافوقی نەك هەر رەچاوبکرێن، بەڵکو جێبەجێبکرێن هەم لە پەرلەمانەکانی هەم لە کابینەی حکومەتەکەیدا. ئەمەش بەو مانایە کە هاوتای ئاستی حکومەتی مەرکەزی پێکهێنانی حکومەت و بڕیاردان لەناو پەرلەمانەکانی دەبێت لەسەر بنەماکانی دێموکراسییەتی تەوافوقی بێت (تەماشای سەرەوە بکە).

**شەشەم**، دامودەزگای یاسادانان لە کۆماری عێراق، لە ئاستی مەرکەز و کۆنفیدرالەکان و هەرێمی بەغدای پایتەخت، دەبێت لە دوو پەرلەمان پێکبێت، پەرلەمانی سەروو و پەرلەمانی خواروو. لەئاستی مەرکەز ئەمە دەبێتە ئەنجومەنی نوێنەرانی نیشتیمانیی (پەرلەمانی خواروو)و ئەنجومەنی نیشتیمانیی کۆنفیدرال (پەرلەمانی سەروو). لەئاستی کۆنفیدرالەکان و هەرێمی بەغدای پایتەخت، بۆنموونە، دەبێتە ئەنجومەنی نوێنەرانی

کۆنفیدرالی کوردستان (پەرلەمانی خواروو)و ئەنجومەنی کۆنفیدرال (پەرلەمانی سەروو).

دەستوری ئێستای عێراق رێگە بەدامەزراندنی ئەنجومەنی فیدرال دەدات کە دەکرێت بکرێتە ئەنجومەنی کۆنفیدرال. لەئاستی کۆنفیدرالەکانیش دەکرێت ئەم ماددەیە بخرێتەنێو دەستورەکانیانەوە. مۆدێلی ئەڵمانی و ئوسترالی دەکرێت بکرێنە بنەما بۆ ئەم سەرلەنوێ دامەزراندن و دارشتنەوەی دامودەزگا پەرلەمانییەکان لە عێراق لەسەر ئاستی مەرکەز و کۆنفیدرالەکان.[٢٦] لە ئەڵمانیا، بۆنموونە، پەرلەمانی سەروو(*Bundesrat*) لە نوێنەرانی هەرێمە فیدرالییەکان (*Länder*) پێکهاتووە" هەر هەرێمێك لانیکەم بە سێ ئەندامی نوێنەرایەتیدەکرێت لە پەرلەمانی سەروو، ئەو هەرێمانەی کە ژمارەی دانیشتووانیان زۆرترە ئەندامیان زیاترە، واتە دەنگیان زیاترە. ئەندامانی پەرلەمانی سەروو لە عێراق دەکرێت وەك ئەندامانی پەرلەمانی سەروو (*Bundesrat*) لە ئەڵمانیا هەڵبژێردرێن یان هەر میکانیزمێکیدێکە کە هەموو لایەك لەسەری رێکبکەون. هەمان پرنسیب دەکرێت لە عێراق کارپێبکرێت بە گۆرانکارییەکی گەورەوە، ئەوەیش ئەوەیە کە لە پەرلەمانی سەروو (ئەنجومەنی نیشتیمانیی کۆنفیدرال) لە عێراق کۆنفیدرالە نایەکسانەکان یەکسابن لە نوێنەرایەتیی ( the unequal confederations will have equal representations).مەبەست لە نایەکسانی لێرە ژمارەی دانیشتووان و رووبەری کۆنفیدرالەکان و هەرێمەکانە. ئەمەش لەبەرئەوەیە کە عێراق بەپێچەوانەی ئەڵمانیا کۆمەڵگەیەکی فرەنەتەوەیی و فرەمەزهەبە، واتە هێترۆجینیەسە. سەرلەنوێ دارشتنەوەی ستراکتۆری سیاسی لە عێراق راست بۆ ئەو مەبەستەیە کە دەسەڵاتەکان و نوێنەرایەتییەکان لەنێوان پێکهاتەکان یەکسانانە دەبەشبکرێن و زەمانەتی هاوسەنگی بکرێت لەنێوان پێکهاتەکان. مەبەست لەمەش رێگرییە لە دێکتاتۆرییەتی زۆرینە.

**حەفتەم،** دەبێت بە روونی و بێپێچوپەنا دەسەڵاتەکانی حکومەتی مەرکەزی و کۆنفیدرالەکان و هەرێمی بەغدای پایتەخت لە دەستور دیاریبکرێن و بە یاساش رێکبخرێن، بەشێوەیەك کە لەگەڵ سەرلەنوێ دارشتنەوەی عێراق لەسەر بنەمای

کۆنفیدرالی بگونجێن. دەسەلاَتەکانی حکومەتی مەرکەزی و حکومەتی کۆنفیدرالەکان و هەرێمی بەغدای پایتەخت و پارێزگاکان و قەزا و ناحیەکان یەك بەیەك دەستنیشابکرێن و سنووری نێوان دەسەلاَتەکان دیاریبکرێن و میکانیزمی چارەسەکردن لەکاتی هاتنەپێشی کەوتنەسەریەکی دەسەلاَتەکان دیاریبکرێن. بۆئەم مەبەستە هیندستان و مالیزیا دوو مۆدێلن کە دەکرێت کەلَکیان لێوەربگیردرێت.

**هەشتەم**، دەبێت چوارچێوە و رێوشوێنی روون دیاریبکرێن بۆ زەمانەتکردنی سەربەخۆیی دادگاکان لەسەر هەموو ئاستەکان بەتایبەتی دادگا بالاَکان لە کۆماری عێراق و پاراستنیان لە دەستێوەردانی سیاسی و کەسیی (شەخسی) قازی و حاکمەکان دەبێت لە دەرەوەی پرۆسە سیاسییەکان دیاربکرێن بە بنەما لەسەر پێشبڕکێ و لیهاتوویی و ئەزموون و شارەزایی بۆ ئەم مەبەستەش دەزگایەکی سەربەخۆ بۆ دامەزراندنی حاکمەکان دابمەزرێنرێت کە بە ئیزافەی دامەزراندن سەرپەرشتی سەربەخۆیی و گەشەپێدانیشیان بکات. سەرەڕای ئەوەی کە حاکمەکانی دادگای بالاَی نیشتیمانیی کۆنفیدرال (National Confederation Supreme Court) - ئەوەی ئێستا پێیدەگوترێت دادگای بالاَی فیدرال - وەك پێشتر ئاماژەپێکرا دەبێت لەسەر بنەمای لێهاتوویی و ئەزموون و شارەزایی دابمەزرێنرێن، بەلاَم لەبەر تایبەتمەندیَ کەیسی عێراق و هەستیارییە نەتەوەیی و مەزهەبییەکان و رێگرتن لە پڕوپاگەندەی 'لایەنداری' (biasness) و کاریگەرییە سیاسییەکان ئێمە پێشنیازدەکەین کە ئەندامانی/ حاکمەکانی دادگای بالاَی نیشتیمانیی کۆنفیدرال بەیەکسانی لەنێوان سێ کۆنفیدرالییەکان و هەرێمی بەغدای پایتەخت هەلَبژێردرێن، بۆنموونە ئەگەر دادگای بالاَی نیشتیمانیی کۆنفیدرال لە نۆ ئەندام پێکهاتبوو، ئەوەدەبێت هەر کۆنفیدرالییەك لەگەلَ هەرێمی بەغدای پایتەخت بە دوو ئەندام نوێنەرایەتیبکرێن. حاکمە کاندێدکراوەکە دەبێت لەلایەن هەردوو پەرلەمانی (سەروو و خواروو)ی کۆنفیدرالەکەی خۆی یان هەرێمی بەغدای پایتەخت پێشتر بە زۆرینەی رەها دەنگپێدرابێت و رەزامەندیَ سەرۆککۆماری عێراقیش دواتر وەرگرێت. کاندێدەکانی دادگای بالاَی نیشتیمانیی کۆنفیدرال دەبێت لەنێو لیستێك هەلَبژێردرابن کە

شایستەی ئەو پۆستە بن لەلایەن لیژنەیەکی پسپۆڕ. هاوکات ئێمە پێشنیازدەکەین کە پۆستی سەرۆکی دادگای باڵای نیشتیمانیی کۆنفیدراڵ ( (Chief Justice وەك پۆستی سەرۆککۆمار دەوری بێت بۆ ماوی پێنج ساڵ. هەر دەورەی نوێنەری یەکێك لە سێ کۆنفیدراڵەکە یان هەرێمی بەغدای پایتەخت سەرۆکایەتی دادگای باڵای نیشتیمانیی کۆنفیدراڵ بکات. ماوەی ئەندامەکانیدێکەی دادگای باڵای نیشتیمانیی کۆنفیدراڵ تا تەمەنی خانەنشینی حاکمەکە بێت، مەگەر تاوانبارکرا بە کەیسێك، لە توانا کەوت یان خیانەتی نیشتیمانیی کرد.

ئێمە پێمانوایە کە حکومەتێکی مەرکەزی باوەڕبەخۆو دامەزراو لەسەر ئەو بنەمایانەی کە لەسەرەوە دیاریکراون بە هاوکاری لەگەڵ سێ حکومەتی کۆنفیدراڵی و حکومەتی هەرێمی بەغدای پایتەخت، بەزەمانەتکردنی سەربەخۆیی هەموو لایەنەکان لەو دەسەڵاتانەی لەسەر بنەمای ئەم پێشنیازە دەستنیشانکراون، ئەوە دەتوانن هەنگاوی یەکەم بن لە رزگارکردنی عێراق لەو قەیرانە سیاسیی و ئەمنی و ئابووری و کۆمەڵایەتییانەی دەیان ساڵە تێیکەوتووە. عێراقێك کە لەسەر بنەمای فرەیی و دانپێنان بە شوناس و شوناسی خاك و بە مافە نەتەوەیی و مەزهەبییەکانی پێکهاتەکانی دابمەزرێنێتەوە ئەگەری هەیە کە ئەو قەیرانانە ئێستا دووچاریبووە تێپەڕبکات.

●●●

## پەراوێزەکان:

.International Crisis Group, *Make or Break: Iraq’s Sunnis and the State*, Middle East Report No. 144 (2013), pp. 1-36.

٢ . کارکردن لەسەر ئەم توێژینەوەیە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای ساڵی ٢٠١٢ کە شێرکۆ کرمانج (نووسەری یەکەمی ئەم بابەتە) خەریکی پۆست دکتۆرا بوو لە زانکۆی ساوس ئوسترالیا بە سەرپەرشتی د. شەمسول خان (نووسەری دووەمی ئەم بابەتە).

3 .Anderson, Benedict, *Imagined Communities: Reflections on the Origin and Spread of Nationalism*, Revised Edition, (London and New York: Verso, 1991), pp. 5-7.

4 .Kirmanj, Sherko, *Identity and Nation in Iraq*, (Boulder: Lynne Rienner Publishers, 2013) p. 31.

5. Uwe Leonardy, “Federation and Länder in German foreign relations: Power-sharingin treaty-making and European affairs”,*German Politics*,Vol. 1, No. 3 (1992), pp. 119–135.

6. Enrique Guillén López, “Judicial Review in Spain: The Constitutional Court”, *Loyola of Los Angeles Law Review*, Vol. 41 (2008) p. 541, 544.
7. Arend Lijphart, ‘Constitutional Design for Divided Societies’, *Journal of Democracy*, Vol. 15, No. 2 (2004), pp. 96-109; Larry Diamond, ‘Three Paradoxes of Democracy’, *Journal of Democracy*, Vol. 1, No. 3 (1990), pp. 48-60; and Ivo D.Duchacek, ‘Dyadic Federations and Confederations’, *Publius: The Journal of Federalism*, Vol. 18, No. 2 (1988), pp. 5-31.
8. Donald L.Horowitz, ‘Unifying Iraq: Partition is the path to more war--multiple wars’, *The Wall Street Journal*, (19 June 2007).
9. Kanan Makiya, ‘A Model for Post-Saddam Iraq’, *Journal of Democracy*, Vol. 14, No. 3 (2003), pp. 5-12; Adeed I.Dawisha and Karen Dawisha‘ ‹How to Build a Democratic Iraq’, *Foreign Affairs*, Vol. 82, No. 3 (2003), pp. 36-51; Andreas Wimmer, ‘Democracy and Ethno-Religious Conflict in Iraq’, *Survival*, Vol. 45, No. 4 (2004) pp. 111-134; M. Hakan Yavuz, ‘Provincial not Ethnic Federalism in Iraq’, *Middle East Policy*, Vol. XI, No. 1 (2004) pp. 126-131.
10.Van den Toorn, Christine, ‘Power, Influence, Money, God: which will Iraqi voters choose?’ *Niqash*, 18 April 2013, http://www.niqash.org/articles/?id=3204&lang=en> (last accessed 30 December 2013).
1. Kaufmann, Chaim, ‘Separating Iraqis, Saving Iraq’, *Foreign Affairs*, Vol. 85, No. 4 (2006), pp.156-160; Gelb, Leslie and Peter Galbraith, ‘Confederation of Three Entities Only Option for Iraq’, *Los Angeles Times*, (4 December 2004); Biden, Joseph R. and Leslie H. Gelb, ‘Unity through Autonomy in Iraq’, *The New York Times*, (1 May 2006).
2. Kirmanj, *Identity and Nation in Iraq*, p. 197, 199 and Appendix 7.
3.‘Columbia University Charts Sectarian Cleansing of Baghdad’, 19 November 2009, <http://musingsoniraq.blogspot.com/2009/11/blog-post.html>, (last accessed 31 December 2013);
4. Liam Anderson and Gareth Stansfield, ‘The Implications of Elections for Federalism in Iraq: Toward a Five-Region Model’, *Publius: The Journal of Federalism*, Vol. 35, No. 3 (2005), pp. 359-382.
5. Kirmanj, *Identity and Nation in Iraq*, p. 91, 94, 103, 113, 215; and Harith al-Qarawee, ‘Redefining a Nation: The Conflict of Identity and Federalism in Iraq’, *Perspectives on Federalism*, Vol. 2, No. 1 (2010), pp 32-41.
6.Al-Qarawee, Harith, ‘The Rise of Sunni Identity in Iraq’, *The National Interest*, (5 April 2013).
7. Kirmanj, *Identity and Nation in Iraq*, pp 76-77.
8. Muayid al-Taib, ‘Law kuna Eqliman laakhadhna 4 trillion Dinars wa al-fidraliya al-hal al-amthal li-mu‘anatina ma‘a Baghdad’ (If we were a region we could receive 4 trillion Dinars and

federalism is the ideal solution to our suffering with Baghdad), *Sot al-Iraq*, <http://www.sotaliraq.com/mobile-news.php?id=81741#axzz2FvC3hahx>, (last accessed 24 December 2012).

9. Daoud al-Ali, 'Last choice: is it finally time to split Iraq up?', *Niqash*, (11 April 2013); Mushreq Abbas, 'Iraqi Panel Promotes 'Biden Plan For Federal Iraq', *Al-Monitor*, (5 April 2013); *Reuters*, 'Iraq's Nineveh province takes first steps to energy independence', 23 October 2013, <http://uk.reuters.com/article/2013/10/23/iraq-energy-nineveh-idUKL5N0ID06X20131023>, (last accessed 24 December 2013).

20. Omar al-Jaffal, 'Anbar Council calls for end to military siege by Iraqi government forces', *Al-Monitor*, (9 January 2014); Mustafa Habib, 'Iraq's most wanted: a neutral mediator to resolve crisis in Anbar', *Niqash*, (16 January 2014).

2. Kirmanj, Identity and Nation in Iraq, p. 133.

22.Ibid., pp. 120-122.

23.Ali Mamouri, 'Efforts to impose Sharia law in Iraq spark controversy', *Al-Monitor*, (28 November 2013); Salem Radwan Al-Mousawi, 'Proposed personal status law will not help Iraqi Jaafaris', *Al-Monitor*, (1 November 2013); Muhannad al-Ghazi, 'Iraq's Jaafari law would violate human rights', Al-Monitor, (21 November 2013); AliTaher, 'Iraqi Shiites between secularism, sectarianism', *Al-Monitor*, (25 November 2013).

24.Painter, Martin. 'The Council of Australian Governments and Intergovernmental Relations: A Case of Cooperative Federalism' *Publius: The Journal of Federalism*, Vol. 26, No. 2 (1996), pp. 101-120.

**٢٥.** ئەوە بەو مانایە نییە کە گروپی نەتەوەیی یان ئایینیدیکە لە سێ کۆنفیدرالییەکە ناژین، بەڵکو بەو مانایەیە کە گروپە نەتەوەیی و مەزهەبییەکانیدیکە کەمینەی نەتەوەیی و مەزهەبینو ڕێژەیان لەچاو گروپە سەرەکییەکە ئێجگار کەمە، بۆیە دەکرێت لەرێگەی کۆتا پرسی بەشداریکردنیان لە حکومەت و پەرلەمان مسۆگەربکرێت.

26.Scharpf, Fritz W, *Der Bundesrat und die Kooperation auf der dritten Ebene*, (Köln: Max-Planck-Institut für Gesellschaftsforschung, 1989).

# سمکۆی شکاك ..

# وەرچەرخانێکی گرنگ لە ناسیۆنالیزمی کوردی لە رۆژهەڵاتی کوردستان

سامان مستەفا رەشید(*)

دوای کودەتای شوباتی ١٩٢١ لە ئێران کە ئەوکات هێشتا رەزاخان وەزیری جەنگ بووو دوو بیرۆکەی لەسەردابووو لەمەڕ بارودۆخی ئێران: یەکێك دامەزراندنی سوپایەکی نوێ و بەهێز. دووەم، کۆتاییهێنان بە نائارامی و ئاڵۆزییەکانی ناوچە جیاجیاکانی وڵات و گەڕانەوەی دەسەڵاتی مەرکەزی بەسەر تەواوی خاکی ئێراندا. لەم نێوەندەدا دەبووو بەتوندی لەگەڵ بزاڤی سمکۆی شکاك رووبەڕووبێت کە ئەوکات لە ناوچەی باکووری رۆژهەڵاتی کوردستان سەنگەری گرتبووو.

ژیانی سیاسی سمکۆ مێژوویەکی دێرینتری لەم بەروارەی سەرەوە هەبووو. بەچەند وێستگەیەکی گرنگدا تێپەڕیبووو. لەکاتی شۆڕشی دەستوریدا سمکۆ بە ٣٠٠ سوار رۆشتووە بۆ پەیوەندیکردن بە هێزی ئیقبال ئەلسەڵتەنەی فەرمانڕەوای ماکۆ بۆ شەڕکردن دژی ئەنجومەنی خوی.(١) لە ساڵانی دوای مەشروتە و پێش شەڕی یەکەم سمکۆ لەگەڵ عەبدولڕەزاق بەدرخان پرۆژەیەکی رۆشنبیری و رۆژنامەگەری سەر رێگەخستبووو.(٢) لەماوەی جەنگدا سمکۆ لە مەیدانی راستەقینەی جەنگ دور راوەستا ، هەوڵیدەدا هەموو دەرگاکان بەکراوەیی بهێڵێتەوە، ئەمە لەکاتێکدایە دەسەڵاتی لە کەرتەکانی سەرسنووردا لەفراوانبوووندابووو. لەم سەروبەندەدا سمکۆ لەلایەن روسیاوە دەستبەسەردەکرێت و دەنێردرێت بۆ زیندان لە تەفلیس. بەڵام رێگەیدرا بگەڕێتەوە بۆ ئازەربایجان بەو مەرجەی لە خووی بمێنێتەوە بە دڵسۆزی بۆ روسیا.(٣)

*) ماستەر لە مێژووی نوێ و هاوچەرخدا.

ئەگەرچی سمکۆ لە یەکەمین جەنگی جیهانیدا بەشدارینەکرد، بەلاّم هەولّەکانی خۆی لەفراوانکردنی دەسەلاّتی لە هەرێمەکانی ژێردەستیدا چڕکردەوە تارادەیەك لەم هەولّەیدا سەرکەوتووبووو، بوووە خاوەن چەك و چیەخانەیەکی گەورە لەنێویشیاندا تۆپی قورس کە لە سەربازانی روس جێهێلّرابووون لەکاتی کشانەوە لەئێراندا، هەروەها لەبەشەکانیتری کوردستانیشەوە چەك و چۆلّی بەدەستگەیشت. بەجۆرێك لەکۆتایی جەنگدا سمکۆ بوووە بەهێزترین سەرکردەی کوردی لەو ناوچانەدا.(٤)

سمکۆ لە مانگی ئازاری سالّی ۱۹۱۸ز مارشەمعونی بانگێشتکرد بۆ کۆنەشار بۆ گفتوگۆ لەبارەی هاوپەیمانێتی ئاشوری- کوردی هاوبەش دژی ئێرانییەکان. ناوبراو بەخۆی و ۱٤۰ کەس لە چەکدارەکانی هاتنە کۆنەشار بۆ گفتوگۆ بە پلانێکی دارێژرا دوای ئەوەی لە گفتوگۆ تەواودەبن مارشەمعون دەیەوێ سواری گالیسکەکەی بێت لەدواوە تەقەیلێدەکرێت و گولەیەك بەرپشتی دەکەوێت کە ناوبراو هێشتا زیندووە عەلی ئاغای برای سمکۆ گوللەیەکیتری لێدەدا و دەمرێت. دوای ئەو رووداوە جەنگێکی ناوخۆیی توند لە ئورومییە پەیدادەبێ.(٥)

لە شوباتی سالّی ۱۹۱۹ز سمکۆ کارگێڕییەکی حکومی لە ئازەربایجانی رۆژئاوا دادەمەزرێنێت. بەرپرسانی حکومەتەکەی لە خەلّکانی شار و گوندەکانی ژێر دەسەلاّتی لەنێویشیاندا ئورمییە دیاریدەکات. داوای کۆبوونەوەی بەرفراوانی سەرانی عەشایەر و خاوەن دەسەلاّتەکانی رۆژهەلاّتی کوردستان دەکات. ئەنجومەنی (سەرانی عەشایەری کوردستان) دادەمەزرێنێت. لەوکاتەشدا گەنگەشەی دامەزراندنی دەولّەتی کوردی سەربەخۆ دەکات، بەلاّم ئەم بیرۆکە لەسەر داوای سەیید تەهای نەهری دوادەخرێت. تا ئەوکاتەی هەلّوێستی هێزە نێودەولّەتییەکان روونددەبێتەوە. بۆئەم مەبەستە سمکۆ لە مایسی ۱۹۱۹ز سەیید تەها دەنێرێتە بەغدا بۆلای سەرانی بەریتانیا لە عێراق و داوای پشتگیری و پشتیوانی دەولّەتی کوردیان لێدەکات بۆئەو حکومەتە فیدرالّییە کوردییەی کە پێکبێت لە ویلایەتەکانی کوردستانی رۆژهەلاّت و باکووور. ئەگەر بەریتانیا پشتیوانی دارایی و سەربازی ئەو دەولّەتە ناکات کە کورد رازییە بە ماندێتی بەریتانیا لەسەر

دەوڵەتەکەی، ئەوا بەریتانیا نەبێتە کۆسپ لەبەردەم دامەزراندنیدا، بەڵام بەهۆی ئەوەی بەریتانیا ڕێکەوتننامەیەکی دۆستایەتی و هاوکاری هاوبەشی لە ١٩١٩ز لەگەڵ ئێران گرێدابوو، دەبووو پەیوەستبێت بە هاوکاری حکومەتی ئێران. ئەم هەوڵە سەرنەکەوت و سەیید تەها بە بێئومێد و دەستبەتاڵی لە بەغدا گەڕایەوە.(٦)

سمکۆ بەبێ چاوەڕێکردنی سەرۆکهۆزەکانیتر شارەکانی دیلمان، خوی، ئابلۆقەی خستەسەر ئورمییە، بەشێك لە خەڵکی ئازەری ناوچەی لەکستانی قەلاچوکرد، چونکە ئەوان ڕەتیانکردبووەوە دان بەدەسەلاتەکەی سمکۆدا بنێن و باجیپێبدەن. هەتا هەڕەشەی بۆسەر تەبرێز دروستکرد، بەڵام سەرکردەی قۆزاقی ڕوسی فیلیبۆڤ لەتارانەوە گەشتە فریای هێزەکانی ئێران. هێرشدەکەنەسەر هێزەکانی سمکۆ ناچار بەکشانەوەی دەکەن بۆ ناچە شاخاوییەکانی قەلای چەهریق، چەند سەرکەوتنێك بەسەر سمکۆ تۆماردەکەن، بەڵام لە جێگەی ئەوەی زیاتر فشاری بخەنەسەر بۆ خۆبەدەستەوەدانی بێمەرج ، فیلیبۆڤ و ئینتیسار دەکەونە دانوستاند لەگەڵ سمکۆ، سمکۆ بەڵێنیدا کە ئەوەی لە لەکستان بردوویە بیگێڕێتەوە. پاشماوەی سوپای عوسمانی لای خۆی دەربکات، دەستدرێژی نەکاتەسەر خوی و ئورمییە، چەکوچۆڵ و کەرەستەی جەنگییانەی لایەتی بیداتە دەوڵەت، برای خۆی ئەحمەد ئاغا بنێرێتە تەبرێز لە قۆزاقخانەکان لەنێو سەرکردەکان بێ.(٧)

بەڵام هیچ یەکێك لەو بەڵێنانە بەتەواوەتی نەچووە بواری جێبەجێکردنەوە. هەرزوو سمکۆ لە ماوەی ساڵی ١٩٢٠ز دەسەلاتی خۆی گەیاندەوەسەر دەشتەکانی ئورمییە، سەڵماس و بەشی باشووری ناوچەی خوی، لە ئورمییەی ئەرشەدولمولك کردە فەرمانڕەوای شار کە پیاوێکی ناوچەیی بووو. دواتر تەیمورئاغا لەسەر ناوچەی کۆنەشاردانا.(٨) بەمجۆرە لە تشرینی یەکەمی ١٩٢٠ز سمکۆ دەسەلاتی گرت بەسەر ناوچەکانی: خوی، سەڵماس و ئورمییەدا گەیشتنی سەیید تەها بە لاهیجان و ئورمییە ئەوەندەیتر دۆخەکەی ناسکتر کرد ناوبراو کەسێکی چالاکبووو داوای کوردستانی سەربەخۆی دەکرد. پرۆسەیەکی بانگەشەی لەنێو کوردەکانی ئێراندا دەبردبەڕیوە داوای (یەککگرتنی باکووری کوردستان و ڕۆژهەلاتی کوردستانی دەکرد لە دەوڵەتێکی سەربەخۆدا).(٩)

دوای داگیرکردنی دووبارەی ئورمییە لەلایەن هێزەکانی سمکۆ کە لەچەهریقەوە هاتبووون. بە تۆپ و مسەلسەل و جبەخانە و کەلوپەلی جەنگی بەرەو سابلاخ بەرێکەوتن. ئەمە لەکاتێکدایە لە سابلاخ نزیکەی ١٠٠٠جاندرمە لە لاوانی تارانی لێبووو کە لەلایەن سەرۆکی هێزەکان مەلیك زادە و ئەسەدوڵلا ئاقاخـــاندا. سمکۆ لە ساڵی ١٩٢١ز شاری سابلاخی گرت.(١٠)

دوای زنجیرەیەك سەرکەوتن سمکۆ توانی ببێتە گەورەترین هێزی ناوچەی باکووری رۆژهەلاتی کوردستان و دەستی گرت بەسەر زۆربەی ناوچە کوردییەکانی رۆژهەلاتی کوردستان: ناوچەکانی ماکۆ، خووی، قوتور، دیلمان، ورمێ، سابلاخ، سەقز، شنۆ، نەغەدە، بۆکان، بانە و سەردەشت.. تا دەهات لەشکرەکەی گەورەتردەبووو تا گەیشتە نزیکەی ١٠ هەزار چەکدار، هەروەها سمکۆ لە بەهاری ساڵی ١٩٢٢ز دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستانی لەسەر بنەمای رێکەوتنامەی سیڤەر راگەیاند و خۆی کردە شای کوردستان. رۆژنامەی (کوردستان)ی کردە ئۆرگانی فەرمی حکومەتەکەی و هەوڵی دروستکردنی پەیوەندی دبلۆماسی لەگەڵ ولاتە بیانییەکانیش دا.(١١) پێویستە ئەوەش بڵێین کە سمکۆ لە ساڵی ١٩٢١ز سابلاخی وەك پایتەختی کوردستانی سەربەخۆ دەستنیشانکرد. هەرچەند خۆیشی لەوێ نەمایەوە ، یەکێك لە باوەڕپێکراوەکانی خۆی کە هەمزەئاغای مامش بووو کردە فەرمانڕەوای ئەو شارە.(١٢)

سەبارەت بە سەرئەنجامی جوولانەوەکەی سمکۆ، خەونی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستانەکەی سمکۆ زۆری نەخایاند. دوای ئەوەی رەزاخان بە کودەتایەك لە شوباتی ساڵی ١٩٢١ بوووە وەزیری جەنگ، هەوڵەکانی خۆی بەگەڕخست بۆ دامەزراندنی سوپایەکی بەهێزی مۆدیرن. چونکە سەرکەوتنی یاخیبووونی زۆرێك لە سەرۆکخێڵەکان و لەنێویشیدا بزاڤەکەی سمکۆی بە هۆکاری لاوازی و بێدیسپلینی و لاوازی چەك و کەلوپەلی جەنگی سوپای حکومەتی ناوەندی بە هۆکاری سەرەکی دەزانی. ئەوەبووو لە ئوتی ساڵی ١٩٢٢دا لەشکرە نوێیەکەی رەزاخان وەزیری جەنگ کەوتەکار بۆ لێدانی گورزێکی گورچکبڕ لە هێزەکانی سمکۆ.(١٣) رەزاخان کە نیازی سەرکوتکردنی تەواوی بزاڤ و جوولانەوەکانی شوێنە

جیاوازەکانی ولاّت و گێڕانەوەی دەسەلاّتی مەرکەزی بۆئەو ناوچانە و لەنێویشیدا ئازەربایجانی هەبووو، لەوەش ئاگاداربووو بەجێگەیاندنی ئەم هەنگاوە بەبێ بووونی هێزێکی سەربازی بەهێزی لەژێر فەرماندەی ئێرانیدا کارێکی نەکردەیە، ئەمە بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە تا ئەوکات هێزەکانی ئێران: بریگادی قۆزاق لە شارەکان لەژێر فەرمانداری ئەفسەرانی روسی، ژاندرمە لەژێر فەرماندەی ئەفسەری سویدی و پۆلیسی باشووریش لەژێر فەرماندەی تەواوی ئێراندا نەبووو. لەسەر ئەو بنەما رەزاخان لە (چوارەمی بوورجی قەوس ١٣٠٠ هەتاوی) بنەمای سوپای نوێ ئێرانی دارِشت و هەوڵی دەرهێنانی سوپای لەبندەستی بێگانەکان و کۆتاییهێنان بە خزمەتی ئەفسەرانی بیانی، ئەم سوپایەش جێگەی ئومێدی وەزیری جەنگ بوووە بەردەوام سەردانی کردوون لە پێویستییەکانیان کۆڵیوەتەوە.(١٤)

ناردنی چەند جارێك هێز بۆ سەرکوتکردنی بزاڤەکەی سمکۆ و سەرنەکەوتن و کوژرانی چەند کەسانێك گرنگ لەونێوەندەدا، رەزاخانی خستەسەر بیری گۆڕینی پلان و ستراتیژی لەم پرسەدا و چەند گۆڕانکارییەکی تەکنیکی سەربازی ئەنجامدا. لەیەککاتدا چەندین هێزی جیاواز بە سەرکردایەتی سەربازی جیاواز ناردەسەر ئازەربایجان.. سەرەتا سەرتیپ حەبیبوولّلاّخانی شەیبانی، پاشتر سەرتیپ ئەمانولّلاّ میرزا جیهانبانی، هەروەها سەرلەشکر ئیسماعیل ئەمیر فەزڵی فەرماندەی لەشکری باکووری رۆژئاوای ئێران فەرمانیپێکرا بە هێزی پێویستەوە بەرەو چەهریق بڕوات. خالّۆ قوربانیش کە چووبوووە ریزی سوپای دەوڵەتی ئێرانەوە بەپێی فەرمانی وەزیری جەنگ لەگەڵ چوار هەزار کەس لە هۆزەکانی بندەستی خۆی بەرەو سابلاّخ بڕوات. ئەمە جیا لە فەوجی ١٤ جاندرمە. بەمشێوە سمکۆی شکاك لە هەموو لایەکەوە لەلایەن هێزەکانی دەوڵەتەوە ئابڵۆقەدرا.(١٥)

ئەمجارەش رووداوێکی کۆی رێسەکەی رەزاخانی کردەوە بەخوری، پلانەکەی شکستپێهێنا ، ئەویش رووداني چەند رووداوێك بووو لە ئازەربایجان بەتایبەتیش رووداوی جوولاّنەوەی لاهوتی (بشێوی لاهوتی) بووو. لاهوتی وەك خۆی دەیڵێ: "لەبەرئەوەی تورکیا رێگەی بە فەرمی چوونەدەرەوەی لە ولاّت پێنەدام بە گۆڕەپانی بێپایانی بیاباندا

ڕۆشتم. سەرەڕای چاودێری پۆلیس، توانیم پەیوەندی بە هاوڕێیانی پێشووی نێو سوپا ببەستم، دەست بە پڕوپاگەندە بکەم لەنێو سوپا. هێزێکی شۆڕشگێڕی نوێ کۆبکەمەوە. ئینجا لە مانگی کانونی دووەم ١٩٢٢ز لەگەڵ ئەوان بچمە نێو شاری تەبرێزەوە. وێڕای نابەرامبەری لە جۆری چەك و ژمارەی هێزەکانی ئێمە و دەوڵەت بەڵام تەنیا بەهۆی ڕاستییەوە کە خەباتکارانی ئێمە شۆڕشگێڕبووون، ئەوان تێکشکان. لە یەکەم ڕۆژی مانگی شوباتی ١٩٢٢ز دەسەڵاتی شاری تەبرێز کەوتەدەست (کۆمیتەی شۆڕشگێڕ)، بەڵام ئەم ئازادییە شاری تەبرێز تەنها یازدە ڕۆژ درێژەیکێشا."[١٦] سەرکوتکردنی ئەم جووڵانەوە بەشێکی زۆری لەو سوپایەی هاتبووو بۆ سەرکوتکردنی سمکۆی شکاك بەم ڕووداوە خەریکبووو. ئەمەش وایکرد گەمارۆکەی سەر سمکۆ بشکێت. دواتر بەهۆی ڕۆڵی سەرتیپ شەیبانی لە سەرکوتکردنی ئەم جووڵانەوە و دەستگرتن بەسەر تەبرێز، ناوبراو کرا بە سەرلەشکری باکووری ڕۆژئاوا. دواتر ڕووداوێکیتر ڕوودەدات، ئەویش کوژرانی خالۆ قوربان و پەرتەوازەبووونی هێزەکانی بووو لەسەر دەستی هێرشی هێزێکی کوردی بە سەرکردایەتی سەیید تەها نەوەی عوبێدوڵڵای نەهری. ئەم هەواڵە گەیشتە پایتەخت و وەزیری جەنگ ناچار جارێکیتر گۆڕانکاریکرد و سەرتیپ شەیبانی لە کارەکەی لادەبات و ئەمانوڵڵا میرزا جیهانبانی دەکاتە فەرماندەی لەشکری ئازەربایجان و کاری سەرکوتکردنی سمکۆی پێسپارد. ناوبراو کە زانیاری تەواوی هەبووو لەمەڕ دۆخی ئازەربایجان بۆ سەرکوتکردنی بزاڤەکەی سمکۆ پلانێکی وردی داڕشت و هێزێکی گەورەی ١٥ هەزار کەسی لە پیادە و سوارە و پارتیزان و تۆپی بیابانی و شاخستانی پلانەکەش لە سێ قۆڵەوە کورتکرابووەوە:

**یەکەم:** ستونی گارد لەژێر فەرمانده‌یی سەرتیپ فەزلولڵاخانی زاهیدی دەبووو لەلایەن بەرزاییەکانی قزل داغ و میشوداغ بەرەو قەڵای چەهریق پێشڕەویبکەن.

**دووەم:** سنووری باکووری ڕۆژئاوا لەژێر فەرماندەیی سەرتیپ حسەین مقەدەم کە دەبووو لە بەرزاییەکانی شەکریازی بەرەوە قەڵای چەهریق بڕۆن.

**سێیەم:** شەڕکەرانی نانیزامی لەژێر سەرپەرشتی ئەفسەرانی ئەرمەنی ڕێکخرابووو. دەبووو

خۆیان بگەیەننە چەهریق. لەژێر ڕۆشنایی ئەم پلانە و بەفەرمانی سەرتیپ جیهانبانی فەرماندەی هێزەکانی ئازەربایجان لە یەکی ئەیلولی ١٩٢٢ز، بەوپەڕی خێرایی و توندیی دەستپێکرد.[١٧]

چەندین پێکدادان لەنێوان هێزەکانی سمکۆی شکاك و ئەو هێزەگەورەی دەوڵەت روویدا و لەدیارترینیان شەڕەکانی شەکریازی (٢٥ / ٧ / ١٩٢٢) نزیك شاری سەڵماس، وێڕای هێرشی چەندجارەی سمکۆ بۆسەر هیزەکانی دەوڵەت، بەلاّم بەهۆی نابەرامبەری هێز لەئاکامدا هێزەکانی دەوڵەت سەرکەوتن. ئەم سەرکەوتنە بووە هۆی نائومیدبوونی هێزەکانی سمکۆ بەجۆرێ لەکۆتایی رۆژی شەڕدا هاوپەیمانەکانی سمکۆ بلاّوەیانلێکرد لەو ١٠ هەزار سەبازەی تەنها هەزار سەربازی لەگەڵ مایەوە. بەجۆرە هێزەکانی دەوڵەت دوای چوار ساڵ سەرلەنوێ شاری ئورمییەیان گرتەوە. دواتر چوونە چەهریق شوین ژیان و مانەوەی سمکۆ و ئەوێشیان گرت و وێرانیانکرد. سمکۆ ناچاربووو بۆ سنوورەکانی تورکیا بکشێتەوە، بەلاّم هێزەکانی شوێنیکەوتن تا پێشگیری لە چوونی سمکۆ بکەن بۆ تورکیا، سمکۆ لە ناوچەی قەلاّڕەش هێرشی بردەسەر ئەو هێزە و ناچار بەکشانەوەی کردن، بەلاّم هێزی یارمەتیدەری دەوڵەت سمکۆیان ناچارکرد لەپێشدا بۆ بەرزاییەکانی ساری تاش لە ئابی ١٩٢٢ز پاشەکشەبکات. لەئاکامدا پاش چەند شەڕێکی سەخت پەنای بۆ تورکیا برد. لە تورکیاش چەکدارەکانی لەلایەن هێزەکانی دەوڵەتی تورکیا چەککران و خۆشی خرایەژێر چاودێرییەوە.[١٨]

ئەگەرچی هێزی دەوڵەتی ئێرانی دوای چوار ساڵ توانی دەست بگرێتەوە سەر ئەو شوێنانەی لەسەرەوە باس کران. کۆتای بەم قۆناغەی بزاڤەکەی سمکۆی شکاك هێنا. بەلاّم ئەمە بەمانای کۆتای یەکجارەکی سمکۆ و بزاڤەکەی نەبووو ، چونکە دواتر سمکۆ دەگەڕێتەوە چەند جارێکی تر جوولاّنەوە ساز دەکات. تا ئەوکاتەی بە پیلانێکی داڕێژراوی دەستی رەزا شا لە ساڵی ١٩٣٠ دەکوژرێت.[١٩]

لەبارەی هەڵسەنگاندنی جوولاّنەوەکەی سمکۆ لە نێوان مێژوونووسان و نووسەرانی ئەم بابەتە بۆچونی جیاواز هەیە. جوولاّنەوەکەی سمکۆ هەندێ بە جوولاّنەوەیەکی

نەتەوەیی ، هەندێکی تر بە هەوڵدان بۆ خودموختاری ، یان جوولاْنەوەیەکی خێڵەکی یان ئەوەی وەك کردەی ڕێگری پەسنیان کردوە. لایەنگرانی سمکۆش جوولانەوەکەیان بەجوولاْنەوەیەکی نەتەوەی داوەتە قەلەم ، ئەمە لەکاتێکدایە دوژمنەکانی جوولانەوەکەی بە جوولاْنەوەیەکی جوداخوازی دەدەنە قەڵەم.(٢٠)

هەریەکە لە بەریتانیا و ئێران پێیان وابووو کە بزاڤەکەی سمکۆ پیلانگێڕیەکی تورکیە بۆ دروستکردنی دەوڵەتێکی کوردی لایەنگری مستەفا کەمال لە ڕۆژهەلاتی کوردستان ئەوەش بۆ سنووردانان لەبەردەم هەژموونی بەریتانی لەناوچەکە.(٢١) بەلاّم ئەم بۆچونە بۆچونێکی ورد نیە ، چونکە پاڵدەری سەرەکی پشت بزاڤەکەی سمکۆ زۆر بەڕوونی و ئاشکرای لەلایەن خودی سمکۆوە لەو گفتوگۆیەی لەگەڵ مستەفا پاشای یامولکی کە لە ساڵی ١٩٢١ز لەگەڵیدا سازی کردوە، باسی لێوەکراوە ، پاڵدەرێکی نەتەوەی و هەستێکی ناسیۆنالیستی بووە، ئامانج لێی دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی بووە کە نەك تەنها ڕۆژهەلاتی کوردستان بەڵکو کوردستانی باکووریش بگرێتەوە. ئەوەتا سمکۆ خۆی پێیوایە کە هەوڵی ڕزگارکردنی کوردەکان لەژێر دەسەلاتی فارس هەوڵێکی تەکتیکییە و وای بەباش زانیوە سەرەتا لەئێرانەوە دەستپێبکات. ئەمە وێڕای ئەوە ناوبراو ئەوەی نەشاردۆتەوە کە لەم قۆناغەدا تورکیا یارمەتی لۆجستی دەدات. سەبارەت بە ئامانجی بزاڤەکە و پەیوەندی بە دۆخی کەسی خودی خۆی سمکۆ لە وەلاّمی دوو پرسیاری جیاوازدا زۆر بەباشی وەلاّمی ئەو پرسەی داوەتەوە، جەختی لەوەکردۆتەوە گەرچی ئەو ئێستا تەنها خۆی لە کوردستانە، داوادەکات چاوەڕێبکەن تا کوردستان ڕزگاریببێت ئەوسا بزانن چۆن حکومەتێك دێتەکایەوە، گرنگنییە کێ دەبێتە فەرمانڕەوا و کاربەدەست. ئەوەش دووپاتدەکاتەوە ئەو خۆی هیچ چاوی نەبڕیوەتە پۆست و پلە. لە وەلاّمی پیرسیارێکتردا سمکۆ دەچێتەوەسەر ئەم بابەتە و رایدەگەیەنێت: "ئێرانییەکان هەموو دژی کوردبوون، چۆن باوباپیرم (عەلی خان)و زۆر کەسیتر چۆن بە دەستی ئێرانییەکان کوژرابووون، من ئێستا بۆ میللەتی کورد خەباتدەکەم و تێدەکۆشم."(٢٢)

سەبارەت بەوەی کە ئەم بزاڤە دژی ئینگلیزە دیسانەوە سمکۆ ئەم بۆچوونە توند دەخاتەژێر پرسیارەوە، لەو گفتوگۆدا زۆر بەڕوونی و راشکاوی ئەم بۆچوونە رەتدەکاتەوە، لە وەلاّمی پرسیارێکدا، رایدەگەیەنێت: "منیش زۆر رقم لە تورکە نەتەوەییەکانە بۆ کورد ئەوان لە فارس بەدوژمنتر دەزانم، من چەندجارێك نامەم بۆ ئینگلیزەکان ناردووە و ئاگادارمکردوون کە من نامەویٚ دژی سیاسەتی ئەوانبم و ئێمە هەمیشە پێویستمان بە یارمەتی بەریتانیا هەیە. با ئەوان لایەنگری کورد بکەن منیش ئامادەم بەپێی ئارەزووی ئەوان بجوولێمەوە. لەم لایەنەوە سەیید تەهام نارد بۆ بەغدا، بەلاّم هیچ ئەنجامێکی نەبووو. ئەوا من سەیید تەها ئێوە دەکەین بە وەکیل، ئەگەر حکومەتی بەریتانیا راستەوخۆ یاخود بەهۆی دۆستە دلّسۆزە پڕدەرییەکانیەوە بتوانێت یارمەتی چەك و جبەخانەمان بدات بەبیٚ ئەوەی بمانخاتە ژێر رەحمەتی ئەفسەرەکانیەوە، ئەوا دەتوانین وان، ئەرزەرۆم ، سیواس و هەکاری لە تورك پاکبکەینەوە. دەرس بە تورکەکانی رەواندز بدەین، هەتا دەتوانین (ئەنگۆرە)ش بگرین، ئەگەر ئینگلیز بیّدەنگبن لە ماوەیەکی کەمدا شاری (سنە)ش دەگرین."(٢٣)

ئەم ئامانجە نەتەوەییەی جوولاّنەوەکەی سمکۆ هەتا لەلایەن نەیارێکی جوولاّنەوەکەی کە نووسەری ئێرانی ئەحمەدی کەسرەویە نکولّی لێنەکراوە، ئاماژەی بۆئەوە کردووە سمکۆ بۆ جیابوونەوە و سەربەخۆیی کوردستانی دەویست. لەم بارەشەوە هەولّ و ئامادەکاری دەکرد کە ناوبراو پێیوایە ئەم تۆوی ئاژاوە و زیانگەیەنەرە لەلایەن ئەوروپییەکانەوە لەرۆژهەلاّتدا بلاّوکراوەتەوە.(٢٤)

ئەوەی ئێمە دەمانەویٚ جەخدی لێبکەینەوە ئەو گۆڕانە گرنگەیە کە لە سروشتی بەشداری سیاسی کوردی لە رۆژهەلاّتی کوردستاندا روویداوە، ئەویش ئەوەیە کە نەك هەر مەیلی کورد بۆ بەشداری لە پێشهاتە سیاسییەکان لە ئێران لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی کالّدەبێتەوە و باوەڕیان بە دەولّەتی ئێران لاوازدەبێت، بەلّکو ئەم جوولاّنەوە ئارەزووی جیابوونەوە و بانگی سەربەخۆخوازی دەدات بەگوێی حکومەت و ئێرانییەکاندا.

بەمجۆرە بەربنەمای ئەو راستییانەی سەرەوە، دەتوانین بزاڤی سمکۆی شکاك بە وەرچەرخانێکی گرنگ لە بەشداری سیاسی کورد لە ئێران و رەوتی ناسیۆنالیزمی کوردی لە رۆژهەلاّتی کوردستان بدەینەقەلّەم، چونکە لەدوای شۆڕشی(شێخ عوبێدوللاّی نەهری ١٨٨٠-١٨٨١) ئەم بزاڤە یەکەمین جوولاّنەوەی کوردییە کە شوناسی کوردی کردووەتە بنەما و خەباتی لەپێناودا کردووە و لە بەرواری ناوبراو بەدواوە بۆ یەکەمینجار کوردەکانی رۆژهەلاّتی کوردستان بەشێوەیەکی روون و بەرفرە دروشمی جیابوونەوەی بەرزدەکەنەوە و هەولّی خۆرزگارکردنی داوە لە بۆتەقەی ناسیۆنالیزمی ئێرانیدا. بە رۆشنیش بۆ سەربەخۆیی نەك بەتەنها رۆژهەلاّتی کوردستان، بەلّکو بۆ باکووری کوردستانیش تێکۆشاوە. سەرەڕای هەمووو ئەوانەش دەتوانرێت بگوترێت بزاڤی سمکۆ تۆوی ناسیۆنالیزمی کوردی لە باکووری رۆژهەلاّتی کوردستان بەگشتی و سابلاّخ بەتایبەت چاندووە کە دواتر لە سالّی ١٩٤٦ز لە کۆماری کوردستانی سەربەخۆ لەمەهابادا ئەو تۆوە جارێکیتر سەوزبوویەوە و گەشەیکرد.

●●●

### پەراوێزەکان:

Martin Van Bruinessen, A Kurdish Warlord on the Turkish –Persian Frountier in Early Twentieth century :Ismail Agha Simko.published in : Touraj Atabaki (ed), Iran and the First World War : Battleground of the Great powers (London _٢٠٠٦). p١٦.

٢. بڕوانە: محمد رسول هاوار، سمکۆ ( ئیسماعیل ئاغای شکاك و بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد ) بەرێوەبەرێتی گشتی چاپ و بلاّوکردنەوە، چاپی دووەم (سلیمانی – ٢٠٠٥ ) ، ل ل ٢٩١_٣١٠، عەلی تەتەر ، بزاڤا سیاسی ل کوردستانێ ١٩٠٨ –١٩٢٧، ل ل ١١٠ – ١١٨.

٣. Martin Van Bruinessen,opcit , p ١٧

٤. فەریدە کوهی کەمالی ، ناسیۆنالیزمی شوانکارە ، کۆلّینەوەیەکی راڤەکاری ئابووری کۆمەلاّیەتییانە سەبارەت بە پەرەسەندنی سیاسی کوردان لە ئێران ، و. د. یاسین سەردەشتی ( سلیمانی خانەی وەرگێران /٢٠١٢) ، ل ١٨٢.

٥. بۆ زیاتر بڕوانە:احمد کسروی ، تاریخ هجده ساله ازربایجان (بازمانده تاریخ مشروگه ایران ) موسسه انتشارات نگاه چاپ سوم (تهران/١٣٩١) ، ص ص ٥٨٥/٥٩٨، محمد رسول هاوار ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ل ٣٦٧/٤١٢.

٦. د. عیمان علی ، دراسات فی الحرکه الکوردیه المعاصره ١٨٣٣/١٩٤٦، دراسه تاریخیه و پائیقیه ، تقدیم الاستاذ الدکتور محمد هموندی ، التفسیر ، ( اربیل /٢٠٠٣ ) ، ص ص ٣٤٦/٣٤٧.

٧. ١٩ Martin Van Bruinessen,opcit , p ، احمد کسروی ، تاریخ هجده ساله ازربایجان ، ص ٦٨٧.

٨. ١٩ Martin Van Bruinessen,opcit , p ،

٩. Firoozeh Kashani_ Sabet,Frountire Fictions :Shaping the Iranian Nation ١٨٠٤_١٩٤٦(London _ I.B.Tauris Co.Ltd_ ١٩٩٩) , p.١٥٣.

١٠. بڕوانە: رحمت الله توفیق، تاریخچە اورمیە: یاداشت های از سال های جنگ اول جهانی و اشوب بعد از ان ( تهران / نشر و پژوهش شیرازه /١٣٨٢ ) ص ص ١٣٥/١٣٩.

١ د. عەزیز شەمزینی، جووڵانەوەی رزگاریی نیشتیمانی کوردستان، و. فەرید ئەسەسەرد، سەنتەری لیکۆڵینەوەی ستراتیجی، چاپی چوارەم ( سلێمانی /٢٠٠٦)، ل ٢١٥ ، جلیلی جلیل واخرون، الحرکة الکوردیة فی العصر الحدیث ، ترجمة ، د. عبدی حاجی،الطبعة الثانیة (اربیل / مؤسسة موکریانی للبحوث و النشر /٢٠١٢) ص ١٦٠.

٢ ولیام ئگلتۆن جونیۆر، حکومەتی میللی کوردستان (مەهاباد /١٩٤٦)، وەرگێڕانی، سەیید محەممەدی سەمەدی، پێداچوونەوەی ، سەیید عەبدوڵڵای سەمەدی ، (سلیمانی/ بنکەی ژین / ٢٠١٢) ل ٣٥، فەریدە کوهی کەمالی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩٤.

٣ فەریدە کوهی کەمالی، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٩٦.

٤ علی دهقان، سرزمین زردشت، اوچاع گبیعی، سیاسی، اقتصادی، فرهنگی، اجتماعی، تاریخی رچائیە انتشارات ابن سینا ( تهران /١٣٤٨)، ص ص ٥٨٥/٥٨٦.

٥ همان منبع ، ص ص ٥٨٧/٥٨٨.

٦ لاهوتی ، لەبارەی خۆمەوە، لە کتێبی: ئەنوەری سوڵتانی، لاهوتی کرماشانی شاعیری شۆڕشگێری کورد، ل ل ١٨٠/١٨١.

٧ علی دهقان، منبع پیشین، ص ص ٥٩٠/٥٩٢.

٨ د.سادقی شەرەفکەندی ، کورتەی مێژووی بزوتنەوەی نەتەوایەتی یەکانی کورد ، و. تەها عەتیقی ( سوید /ئاپیك/ ١٩٩٥) ، ل ل ٩١/٩٢ ، فاخر حەسەن گولی ،سمکۆیێ شکاك و شۆڕەشا وی د بەلگەنامەیێن ئیرانی دا ، وەرگێڕان و پێداچوون ، نزار ئەیوب گولی،

بلاوكراوەكانی ئەكادیمیای كورد ، (هەولێر /۲۱۰) ل ل ۳٦/٤۰ ، كریس كۆچێرا ، كورد لە سەدەی نۆزدە و بیستەمدا ، وەرگێڕانی لەفارسیەوە ، حەمەكەریم عارف ، لە بلاوكردنەوەكانی كتێبخانەی ئاوێر، چاپی شەشەم

( هەولێر /۲۰۱۱) ، ل ل ٦۹/۷۱.

۹ بڕوانە : محمد رسول هاوار ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ل ٥٤۷/ ٦٦۸، كریس كۆچێرا، سەرچاوەی پێشوو ، ل ل ۷۲/۷۳، نەوشیروان مستەفا ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ل ٤٥۸/٤۸٤، ۲۰ Abbass Vali, Kurds and State in Iran : The making of Kurdish Indentity ( London _ I.B.Tauris Co.Ltd _۲۰۱٤) , op.cit.p ۱۳. ، بۆ درێژەی ئەو بۆچونە جیاوازانە بڕوانە : د. عثمان علی ، المصدر السابق ،ص ۳

۲۱. د. عثمان علی ، المصدر السابق ، ص ۳٤۸.

۲۲. بۆ تەواوی گفتوگۆكە بڕوانە: محمد رسول هاوار، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ۳٥۲/۳٦۲، مصگفی باشا یامولكی فی لقاو تأریخی مع سمكو ، فی كتاب، د. عثمان علی، المصدر السابق، ص ص ۳٦۲/۳۷٤.

۲۳. محمد رسول هاوار، سەرچاوەی پێشوو ، ل ل ۲٥۹/۲٦۰ ،

۲٤. احمد كسروی، تاریخ هجده ساله ازربایجان ، ص ٦٦۷.

# باشووری کوردستان لە کاتی دوورخستنەوەی شێخ مەحمود و سەرهەڵدانی چالاکی تورکەکان بە سەرۆکایەتی ئۆزدەمیر پاشا ١٩١٩ - ١٩٢٢

ئەحمەد باوەڕ[*]

لەو ماوەیە بەدواوە کە شێخ مەحمودی ڕێبەری کوردانی باشووری کوردستان، بەرەو دادگاییکردن و دواتر ژیانی بەندی و تاراوگە دوورخرایەوە، هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا، هەلومەرجێکی نوێ و بارودۆخێکی نوێ، لە کوردستان و ناوچەکەدا بەچڕی سەرچاوەیگرت، هەرلە دەستێوەرردانی تورکە کەمالییەکان بۆ نێو کاروباری باشووری کوردستان و بەرپابوونی ڕاپەڕینی جۆربەجۆر وکوشتن و هەوڵی کوشتنی زۆرێك لە بەرپرسانی بەریتانی لە بەشێکی زۆری ناوچە کوردنشینەکاندا کە بەشێکیان بەزۆری لە چوارچێوەی ئەو ڕاپەڕینە جەماوەرییەی گەلانی عێراقدا بوو کە ئەمڕۆ بە: ((شۆڕشی ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٢٠)) ناسراوە، [١] بەڵام ئەوەی کە زیاتر پەیوەستبێت بەگۆڕانکارییەکانی عێراق و کوردستان و ناوچەکەوە، ئەویش سەرهەڵدانی کۆمەڵێك گۆڕانکاری بەرچاوی بووە، هەرلە بەرپابوونی کودەتای ڕەزاخانی مازندەرانی، بەسەر دەسەلاتی فەرمانڕەوایانی ئێرانی قاجاریدا، بەتایبەتی لە (٢١ی شوباتی ١٩٢١)دا، هەروەها دانانی میر فەیسەڵی کوڕی شەریف حوسێنی مەککە بە مەلیکی عێراق لە دەرئەنجامی بەستنی کۆنگرەی قاهیرەی (١٢- ٣٠ مارتی ١٩٢١)و تاج لەسەرنانی وەك مەلیکی عێراق لە (٢٣ی ئابی

*) زانکۆی گەرمیان، کۆلێژی پەروەردە.

١٩٢١)دا، جگەلە مەیدانخوازی و ململانێی کەمالییەکان و بزووتنەوەی کەمالی تورك و هاتنیان بۆ سەر گۆڕەپانی سیاسی تورکیا و رووبەڕووبوونەوەی راستەوخۆیان، لەگەڵ فەرمانڕەوایانی بەریتانیا لە عێراق و دەستێوەردانیان، بە شێوازێکی بەرچاو، لە کاروباری باشووری کوردستان و هێرشکردانیان بۆسەر شاری رەواندز بەرێبەرایەتی ئۆزدەمیر پاشا. هەرچەندە لەو دەمانەشدا، حاکمی شاری سلێمانی بەریتانی واتە مێجەر سۆن، کەوتە ئەوەی کەوا لە هێزەکانی بەریتانیا بکات، جۆرێك لە هاوکاری لەگەڵ سمکۆی شکاکی رێبەری کوردەکانی رۆژهەلاتی کوردستاندا بکەن، بۆئەوەی بەهەردوولایانەوە، بتوانن رووبەڕووی فراوانخوازی تورکە کەمالییەکان ببنەوە. تەنانەت حکومەتی عێراق و وەزیری بەرگرییەکەشی کە لەودەمانەدا جەعفەر پاشای عەسکەری (١٨٨٥- ١٩٣٦)[٢] بوو، ئەم هەلومەرج و بارودۆخەی ناوچە سنووریەکانی لەگەڵ تورکیادا، بەهەند وەرگرتووە و لە راپۆرتێکی نهێنی و تایبەتی خۆیدا مەلیك فەیسەڵی لێئاگادارکردووەتەوە،[٣] هەروەها لەلایەکیتریشەوە هۆزی بەناوبانگی گۆیانی ناوچەی زاخۆ کە پێشتریش لە (٦ی نیسانی ١٩١٩)دا راپەرینی خۆیان بەڕووی هێزەکانی بەریتانیادا راگەیاندبوو توانیبوویان ئەفسەرێکی سەربازی وەك: (کاپتن پێرسون A. C. Pearson)ی جێگری حاکمی سیاسی زاخۆ بکوژن.[٤] کەچی لەو دەمانە و لە سالأنی دواتریشدا وەك بەرهەڵستکار و دوژمنێکی سەرسەختی بەریتانیا دەناسران و چەندینجار چ حکومەتی بەریتانیا و دواتر عێراقیش نارەزایی خۆیان بەرانبەر بە هەڵوێستیان لای فەرمانڕەوایانی تورکیا دەربڕیووە و لە مەسەلەی هێرشە بەردەوامەکانیان و لە ناوچە سنوورییەکانی نێوانیانەوە یەکدیان بە شێوازیکی فەرمی ئاگادارکردووەتەوە.[٥]

**کورتەیەك سەبارەت بە ژیان و کەسایەتی ئۆزدەمیرپاشا:**

ئۆزدەمیر پاشا ناوی تەواوی عەلی شەفیقە و قوتابخانەی حەربییەی سەربازی لە ئەستەمبوولی پایتەختی عوسمانی تەواوکردووە.[٦] ماوەیەکی زۆر بەپلەی (سەرهەنگ) واتە (عقید) لە ریزەکانی سوپای عوسمانیدا، کاروباری سەربازیی جۆربەجۆری پێسپێردراوە و ماوەیەکیش بەرپرسیارێتی بەرەی (غازی عەنتاب)ی پێسپێردراوە کە لە تەوەری ولاتی شامەوە دژی فەرەنسییەکان جەنگاون و لەکاتی خۆیدا پلەی قائیمەقامی فەخری وەرگرتبوو، هەکە شەڕی نێوان تورکەکان و فەرەنسییەکان بڕاوەتەوە، ئیدی ئەویش لەو ناوچانەدا کاروبارێکی ئەوتۆی نەماوە و لەبەرئەوە بەخۆی و هێزەکەیەوە کە زۆربەیان لە کوردەکانی ناوچەی کەرکووك و هەولێر بوون دەنێردرێتە بەرەی ناوچەی رەواندز و دەبێتە فەرماندەی هەموو هێزەکانی تورك لەم سنوورەدا کە پێشتر کەسایەتییەك بەناوی (محێدین بەگ)ەوە کاروباری بەڕێوەبردبوو،[٧] بەلاّم لەڕووی رەسەنایەتی و رەگەزەوە لە چەرکەسییە (شرکس)ەکانی ولاتی میسر بووە و پاش شکستی ولاتانی ناوەند و دەوڵەتی عوسمانی بەرانبەر بە ولاتانی هاوپەیمان، لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا، ئۆزدەمیر پاشا لە ساڵی ١٩١٩دا، پەیوەندیکردووە، بە رێکخستنەکانی بزووتنەوەی کەمالییەوە و نازناوی ئۆزدەمیر (Euz Demir) ی بەبەردابڕاوە. ئەمەش بۆ خۆی دەلالەتی لەلێهاتوویی، بەتوانایی و هێزی ئۆزدەمیر پاشاکردووە لەو دەمانەدا کە بە زمانی تورکی عوسمانلی بەواتای خوێی ئاسن یان (گیان پۆلاّ) یان رۆبیتەنی کوردی هاتووە.[٨] هاوکات هاملّتنیش وەك کەسایەتییەکی سەرکێش واتە (مغامر) باسیلێوەکردووە.[٩] بە یەك دوو ساڵێك، دوای پەیوەندیکردنی بە بزووتنەوەی کەمالییەوە، لەلایەن سەرکردایەتی و کاربەدەستانی بالاّی تورکەکانەوە راسپێردراوە، بەوەی کە بە هێزێکی سەربازییانەوە بەرەو باشووری کوردستان و شاری رەواندز بێتەوە و دەستی بەسەردابگرێت و لەوێشەوە بکەوێتە راوەدوونان و رووبەڕووبوونەوەی هێزە سەربازییەکانی بەریتانیا لەناوچەکەدا، وەك ئەوەی لە (٩ی مارتی ١٩٢٢)دا، بە هێزێکی تۆکمەی سەربازییەوە، هەرچەندە ژمارەیان کەمبووە توانیویەتی لە شاری ئەنقەرەوە بەرەو رەواندز بکەوێتەڕێ و لە (٢٢ی حوزەیرانی ١٩٢٢)دا

گەیشتۆتەجێ.(١٠) تەنانەت یەکێکبووە لەو ئەفسەرە گەورە و لێهاتووانەی ماوەی عوسمانی و دواتر تورکە کەمالییەکانی شارەزا لە کاروباری ناوچەکوردنشینەکان و چۆنێتی پێکهێنانی پەیوەندی لەگەڵ ژمارەیەك لە سەرۆکهۆزەکانی شار و ناوچەکانی: ڕەواندز، کۆیە، هەولێر، رانیە، کەرکوك و سلێمانی(١١) لەڕووی سەربازیی و توانای سەربازیشەوە، شارەزاییەکی گەورەی هەبووە، هەروەها لە بواری کاروباری خێڵەکاندا بەگشتی وەك کەسایەتییەکی بێهاوتا باسیلێوەکراوە و شان بەشانی هەموو ئەوانەش: ((پیاوێکی چالاك و زیرەك و خوێندەوارێکی باشبووە شارەزاییەکی تەواوی، لە رەوشت و خووی کوردەکاندا هەبووە و لە دەستووری عەشایەردا کەسێکی شارەزا و قسەخۆش و قسەزان و وریابووە بەشێوازێکی زۆر ئاقلانە توانیویەتی لەگەڵ هۆزە کوردییەکاندا بجوولێتەوە و بەپێچەوانەی حاکمە ئینگلیزییەکان، هەموویانی کردووەتە ئەمووستیلە و کردوونی بەپەنجەی خۆیەوە)).(١٢) هەرئەمەش وایلێکردبوو کە بەئاسانی بتوانێت، لە رووبەڕووبوونەوەی سەربازیی و پرۆسە جەنگییەکانی کوردستان و ناوچە کوردنشینەکاندا، سەرکەوتنی گەورە بەدەستبهێنێت.

هاوکات توانیویەتی ژمارەیەکی زۆر لەهەموو ئەوکەسایەتی و نەیارە کوردییانەی کە لەگەڵ کاربەدەستان و فەرمانڕەویانی بەریتانیادا نەدەگونجاون لەناوچەکەدا، لە دەوری رێکخستنە سەربازی و ئیدارییەکانی خۆی کۆیانبکاتەوە و بەبەردەوامی لەڕووی چالاکی سەربازییەوە سوودیان لێوەربگرێت، سەرەڕای پەیوەندی و نامەگۆڕینەوە و سەردانەکانی بۆلای شێخ مەحمود و پێشوازیکردنی لە رێوڕەسمی فەرمی و بە سرودی سوپایی و نیشتمانییەوە.(١٣) هەر لەو دەمانەشەوە کە هاتبووە باشووری کوردستان، بەقەولی مامۆستایان ئەحمەد خواجە و رەفیق حیلمی بۆ چەواشەکردنی کۆمەڵانی خەڵك شەووڕۆژ لەسەر بەرماڵی نوێژ بووە کە بەلای کوردەکانەوە زۆر پەسەندبووە،(١٤) بەڵام لەکۆتاییدا هێزە سەربازییەکانی بەریتانیا، دوای ئەوەی کە توانیان لەڕووی پرۆسەی سەربازییەوە لەناوچەکەدا سەرکەوتن بەدەستبهێنن و فەرمانڕەوایەتی سەربازی راستەوخۆیان لەکوردستاندا جێگای تەواوی خۆی بکاتەوە، هاوکات توانیویانە بەسەر تورکەکان و نفوزی

تورکەکانیشدا چ لەڕووی دیبلۆماسی ولە چوارچێوەی چارەسەرکردنی کێشەی ویلایەتی مووسڵ چ لەڕووی پرۆسەی سەربازییەوە، سەرکەوتن بەدەستبهێنن و لەهەمانکاتیشدا توانیویانە لە رێکەوتی (٢٤ی نیسانی ١٩٢٣)دا، بەیەکجاری دەست بەسەر شاری رەواندزدا بگرنەوە و ئۆزدەمیر و هێزەکانی تورك لەناوچەکەدا دەرپبەڕێنن و دووبارە لەرێگای ولاتی ئێرانەوە خۆی گەیاندووەتەوە تورکیا.(١٥)

## درێژەی بارودۆخی ناوچەکە و هەلومەرجی رووداوەکان:

لە سەروبەندی دوورخستنەوی شێخ مەحمود و شێخ محەمەد غەریبی زاوایدا، بۆ دوورگەی ئەندامانی ولاتی هیندستان و دەسەلاتگرتنەدەستی راستەوخۆی فەرمانڕەوایانی بەریتانیا لە باشووری کوردستاندا، هەروەها لەسەر ئاستی نێودەولەتیش، مۆرکردنی رێککەوتنامەی سیڤەری Sevre Treaty of (١٠ی ئابی ١٩٢٠)و ئەو مادانەی کە بەندەکانی (٦٢، ٦٣، ٦٤)ی رێککەوتنامەی ناوبراو کە پەیوەستبوون بە چارەسەرکردنی مەسەلەی کوردەوە و دوایی شتێکی ئەوتۆیان لێجێبەجێنەکرا. بەسەریەکەوە هەموو ئەمانە نەبوونە مایەی ئەوەی کە جۆرێك لە ئارامی و هێمنی باڵ بەسەر ناوچەکانی باشووری کوردستاندا بکێشێت، بەلکو بەپێچەوانەوە، تادەهات ناوچەکە نائارامی و بشێوی و راپەڕینی زیاتری بەخۆوەدەبینی، هەر لە رەواندز، زاخۆ، بارزان، ئاکرێ، سلێمانی، کفری و دەوروبەری.. تاد، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا هەریەك لە هۆزەکانی سورچی، زێباری و خۆشناوەکانیش لەوانەبوون کە نەیاندەویست ملکەچی سیاسەتی فەرمانڕەوایانی بەریتانیابن، کەچی لەو لاشەوە سەرهەلدان و چالاکی بەردەوامی تورکە کەمالییەکان و قۆرخکردنی باروۆخەکە وایکردبوو کە زیاتر لەڕووی چەك و تەقەمەنییەوە بکەونە یارمەتی و دەسگرۆییکردنی هێزە راپەڕیوەکان دژبە نفوزی بەریتانیا لە باشووری کوردستان و میسۆپۆتامیای عەرەبیدا،(١٦) هەروەها دوابەدوای بڕیاردان لەسەر دانانی میر فەیسەڵی کوڕی شەریف حسێنی مەککە بە مەلیکی عێراق لە سەروبەندی کۆنگرەی قاهیرە و داواکاری بەردەوامی حکومەتی تورکیا بە ویلایەتی مووسڵ، ئەوەبوو لەم ماوەیە

بەدواوە ئەفسەرێکی تورك بەناوی (فازیل ئەفەندی)ەوە، بەهێزێکی سەربازییەوە توانی لە ولاّتی تورکیاوە و بەتایبەتی بە ناوچەکانی رۆژ هەلاّتی کوردستانی ژێر دەسەلاّتی ئیسماعیل ئاغای (سمکۆ)دا، خۆی بگەیەنێتە شاری رەواندز، هەروەها فەرمانڕەوایانی بەریتانیاش لای خۆیانەوە کەوتوونەتە گەڕان و تاقیبی ئەوەی کە چۆن لەڕێگای هێزە ئاسمانیەکانیانەوە کە لەوەدەمانەدا لەلایەن جێگری مارشاڵی بەریتانی (سێر جۆن سالمۆند Sir Johon Salmon)ەوە سەرکردایەتیدەکرا بکەونە سۆسەکردن و بۆمبا بارانکردنی شارەکە و ئەو هێز و مەفرەزە تورکانەی کە توانیبوویان دزەبکەنە ناوچەکەوە..[١٧]

لەلایەکیتریشەوە، هەر لەنزیکی شاری رەواندزەوە، هۆزێکی گەورەی وەك سورچییەکان بە سەرۆکایەتی شێخ عوبێدوڵلاّی سورچی و بەپاڵپشتی هێزێکی وەك ئۆزدەمیرەوە،[١٨] بەرامبەر بە هێزەکانی حکومەتی بەریتانیا راپەڕیوون و بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەمەش لە (رۆژی لەدایکبوونی ١٩٢١)دا بە هێزێکی (١٠٠٠) کەسی لیڤی بەریتانی و بە هاوکاریکردنی بەردەوامی هێزە ئاسمانییەکانی بەریتانیا هێرشێکی چڕوپڕ و بەرفراوانیان کردووەتەسەر هێزە راپەڕیوەکانی شێخ عوبێدوڵلاّی سورچی، ئەوەبوو دوای بەرپابوونی شەرێکی خوێناوی و سووتاندنی ژمارەیەك گوند و دێهاتەکانی هۆزی سورچی و هەروەها کوژرانی دوو ئەفسەری بەریتانی، سورچییەکان بەناچارییەوە بەرەوناوچە شاخاوییەکان کشاونەتەوە و وەکتریش کاربەدەستان و فەرمانڕەوایانی بەریتانیا، فەرەنسییەکانیان تاوانبارکردووە، بەوەی کە ئەوان پشتگیری لە هێرش و داواکاری تورکەکان دەکەن، سەبارەت بە مووسڵ و نەوتی ویلایەتی مووسڵ،[١٩] چونکە تورکە کەمالییەکان لای خۆیانەوە بەردەوام تینووی داهاتی چاوەڕوانکراوی نەوتی ویلایەتی مووسڵ بوون، بۆئەوەی رۆژێك زووتر بتوانن ولاّتەکەی خۆیانی پێببوژێننەوە،[٢٠] هەروەها لەلایەکیدیشەوە راپەڕین و ناڕەزایی زۆرێك لە دانیشتووانی کوردستان و ناوچەکە دژبە سیاسەتی سەرکوتکەرانەی بەریتانیا و شێوازی ناڕەزایی دەربڕینیان بەرامبەر بەدوورخستنەوەی شێخ مەحمودی رێبەری بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد لەکوردستاندا، دستیپێکردووە و بۆنموونە هەریەك لە: تایەر ئەفەندی باوێڵ ئاغا،

حەمەشینی سەرچیا و خدر ئاغای کوڕی لەگەڵ شێخانی بچێلی ناوچەی ئاکرێ و عەشیرەتی سورچی و شێخ کاکە ئەمینی سندۆلاَن هێرشدەکەنەسەر ڕەواندز و داگیریدەکەن. ئەمەش وا لە حاکمی سیاسی شار و ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی (١٩٠٠ - ١٩٣٣)[٢١] دەکات کە لەڕێگای ناودەشتەوە خۆیان بگەیەننە شاری هەولێر، هەر لەودەمانەشدا غەفورخانی ناودەشت (١٨٩٠- ١٩٥٣)[٢٢] کە لەدەست بابەکر ئاغای کوڕی سەلیم ئاغای پشدەری و حاکمی شاری ڕەواندز هەلاَتبوو، دووبارە دەگەڕێتەوە شاری ڕەواندز و پەیوەندیان بە هێزەکانی تورکەوە کردووە..[٢٣] هەرچەندە لەولاشەوە واتە لە تەوەری باکوورەوە فەرمانڕەوایانی تورکیای کەمالی، هێشتا زۆر نەبووە کە هاتبوونەسەر گۆڕەپانی سیاسی ناوچەکە و بووبوونە میراتگری دەسەلاَتی هەرەسبردووی دەوڵەتی عوسمانی، بۆیە ئەمانیش لای خۆیانەوە بارودۆخی لاوازی باشووری کوردستان و تەنانەت ئینگلیزەکانیان بەهەلزانیبووە، بۆ دەستێوەردان، بەهۆی ڕاپەڕین و شۆڕشی بەردەوامی کوردەکانەوە بە ماوەیەك و پێش هاتنی هێزەکەی ئۆزدەمیر پاشای تورك و پێکەوەنانی دەسەلاَتەکەی لە ڕەواندز و دەوروبەریدا، هاوکات هەر لەڕێگای هێز و دەستەیەکیتری سەربازی گەورەیانەوە، لە ڕێکەوتی (٢- ٣ی ئابی ١٩٢١)دا، بەپێی ناوەڕۆکی بەڵگەنامەکانی بەریتانیا خۆیان، ژمارەیان لەودەمانەدا خۆی داوە لە نزیکەی (٦٠- ٣٠٠) ئەفسەر و سەربازی تورك و ڕاستەوخۆش توانیویانە دەست بەسەر شاری ڕەواندزی ئەوکاتەدا بگرن و داگیریبکەن. لەمەشیاندا و وەك لەدرێژەی ڕاپۆرتەکەی بەریتانیای گەورەدا هاتووە، هەمیسان هۆز و خێڵە ڕاپەڕیوەکانی ئەو ناوچەیە، بەتایبەتی هۆزی گەورە و بەناوبانگی سورچی و دواتر میرانییەکانیش لەگەڵیاندا، ڕۆڵێکی کارا و بەرچاویان هەبووە لە هاوکاری و ڕێخۆشکردنیاندا، تەنانەت تورکەکانیش دەسگرۆیی و هاوکاری بەردەوامیان کردوون. بۆ دژایەتیکردن و فراوانخوازی نفوزی هێزەکانی بەریتانیا و سەپاندنی دەسەلاَتی بەردەوامیان بەسەر ناوچەکەدا.[٢٤]

بەجۆرێك ئەم هێرش وداگیرکارییەی تورکەکان وای لە هێزەکانی بەریتانیا لە ناوچەکانی هەولێر و سلێمانیدا کردووە، کە ئەمانیش لە (١٢ی ئابی ١٩٢١)ەوە

بەهێزێکەوە بەرەو رانیەش بینەوە، تەنانەت گۆڵدسمیسی حاکمی بەریتانی لە شاری سلێمانی خۆیشی گەیشتووەتە شوێنی مەبەست و بۆئەوەی بتوانن هێزێکی ئەوتۆ لە خێڵ و هۆزەکانی ناوچەکە، بەتایبەتی بڵباس و پشدەر بۆ رووبەڕووبوونەوەی تورکەکان پێکەوەبنێن. تەنانەت لەم ماوەیەشدا هێزە ئاسمانییەکانی بەریتانیا بەبەردەوامی کەوتوونەتە بۆمبابارانکردنی بەردەوامی ناوچەکە، وەك ئەوەی لە (١٨ی تشرینی یەکەمی ١٩٢١) دا، سێر برسی کۆکسی نوێنەری بالأی بەریتانیا لە عێراق، لە راگەیەنراوێکی تایبەتی خۆیدا کە بۆ وینستۆن چەرچڵی وەزیری ولأتانی داگیرکراوی بەریتانیا بەرزیکردووەتەوە نووسیویەتی: ((هێزی ئاسمانی بەریتانیا لەسەر ئۆردوگاکانی تورك لە رانیە و رەواندز کارێکی باشی هەبووە، فەرماندەی تورك عەلی شەفیقی میسری ناسراو بە ئۆزدەمیر پاشا، ناچاربووە لە ١٧ی تشرینی یەکەمدا رانیە و قەلأدزێ چۆڵبکات و کۆیەش داگیرکراوەتەوە..))[٢٥] سەرەڕای هەموو ئەوانەش کەچی هێزەکانی تورك بەوەشەوە نەوەستاون و بەبەردوامی لەرێگاوی نێردراوی تایبەتی خۆیانەوە هاتوونەتە ناوچەکە و قاوی ئەوەیان بەناو کۆمەلأنی خەڵکدا بلأوکردووەتەوە کە هێزەکانی تورك بەم نزیکانە دەگەن، ئەمەش بۆئەوەی وا لە خێڵ و هۆزەکانی ناوچەکە بکەن، پشتگیریانلێبکەن و هاوکاریانبن دژبە دەسەلأتی داگیرکارانەی بەریتانیا لەناوچەکەدا، بۆنموونە پێش گەیشتنی ئۆزدەمیر پاشا کەمالییەکان بۆئەوەی جێپێی خۆیان بەتەواوی و زیاتر بەهێزبکەن لە شاری رەواندزدا، لە (١٧ی مارتی ١٩٢٢)ەوە، هاوکارێکی خۆیان بەناوی رەمزی بەگەوە راسپاردووە بۆئەوەی لە بەرژەوەندی ئەوان کاربکات و هاوکات لەهەمان ماوەشەوە لەلایەن حکومەتی ئەنقەرە و ئەنجوومەنی نیشتمانی گەورەی (بویوك میللەت مجلسی - المجلس الوطنی الکبیر) تورکەوە فەرمانی ئەوەیان بۆدەرکردووە کە وەك قائمقامی شاری رەواندز دای بمەزرێنن..[٢٦] هەرچەندە رەمزی بەگ وەك نێردراوێکی تورکەکان لە کۆتایی ئایاری ١٩٢٢ دا، گەیشتووەتە شاری رەواندز و لەهەمانکاتیشدا وەك قاو و پڕوپاگەندەیەکی پێشوەخت، کەوتووەتە ئەوەی کەوا لە هۆز و سەرۆکهۆزەکانی ناوچەکە بکات پشتگیری لە هێزەکانی تورك بکەن و هاوکات وای بە کۆمەلأنی خەڵکیش راگەیاندووە کە هێزێکی

سەربازی تورکە کەمالییەکان لەم نزیکانەدا دەگەنە ناوچەکە و لەوێشەوە هێرشدەکەنەسەر شارەکانی کەرکوك و هەولێر و سلێمانی و داگیریاندەکەن.(٢٧)

کەچی لەلایەکیتریشەوە والی شاری (دیاربەکر)ی ئەوکاتەش بەهەمان تەرزی ڕێبەرانی تورکانی کەمالی، پەیوەندی دەکاتە کەسایەتییە ناسراوەکانی باشووری کوردستانەوە و لەدرێژەی نامەیەکیدا کە بۆ هەریەك لە شێخ عەبدولسەمەد زادە و کەسایەتی ناسراوی دۆڵی ئاکۆیان شێخ عەبدولڕەحمانی سەران (١٨٨٠- ١٩٦٠)(٢٨) ی نووسیوە، داوای ئەوەی لێکردوون کە هێزێکی تورکەکان بەڕێبەرایەتی ئۆزدەمیر هاتوونەتە ناوچەکە و تکایانلێدەکات، بۆ سەرخستنی موسڵمانان، بەسەر خاچپەرستاندا هاوکاریانبن وەك ئەوەی دەنووسێت: ((بزانن بە زانینێکی یەقین کە سەرکەوتنی کۆتایی هەر بۆ موسڵمانان دەبێت و رزگارتاندەبێت لە سەلیبییەکان و بەکرێگیراوە تێکشکاوەکانیان، لەپێناوی ئەوەدا ئۆزدەمیر بەگی قائمقام و ئەوانەی کە لەگەڵیدان دەنێرین بۆ لاتان و لەدوایشدا هێزیتر رەوانەدەکەین، بۆئەوەی بەشداریتانبکەن و تەنسیقی لەگەڵدابکەن لە خودای بەرز دەپاڕێمەوە سەرتانبخات))،(٢٩) هەروەها بەماوەیەکی دواتر و دوای کشانەوی تەواوی هێزەکانی بەریتانیا لە شاری رەواندز لەساڵی (١٩٢٠)دا کە بەزۆری لەوەدەمانەدا ئەفسەری سەربازی لیڤی ناسراو (کاپتن لتڵ دیڵ Captain C. E. Little Dale) ڕێبەرایەتی کردوون، تورکەکان: ((بەسەرکردایەتی ئۆزدەمیری سەرکێشەوە..))و بەمەبەستی ڕووبەڕووبوونەوەی زیاتری هێزەکانی بەریتانیا، کەوتوونەتە ئەوەی کە هێزێکی سەربازی زیاتری خۆیان بنێرنەسەر شاری رەواندز و بەیەکجاری داگیریبکەن.(٣٠) بەو مەبەستەی لەوێوە بتوانن بنکەیەکی سەربازی تۆکمەی خۆیان لەناوچەکەدا دابمەزرێنن و هاوکات تەواوی ویلایەتی مووسڵ کە ئەوان خۆیان بە میراتگری رەوا و شەرعی دەزانن، بکرێتەوە بە ویلایەتێکی تورکی و بخرێتەوەسەر وڵاتی تورکیا. هاوکات ئەو داگیرکردنەش زیاتر لەو لایەنەوە نزیکیان دەکاتەوە و ویست و ئاواتەکانیان زووتر بۆ دەهێنێتەدی. هەرچەندە بەریتانییەکانیش تووشی کۆمەڵێك بەرەنگاربوونەوەی سەربازی تورکەکان بوونەوە بەتایبەتی لە دۆڵی باتاسەوە، بەڵام لەم ماوەیەدا هیچ هەوڵێکی ئەوتۆیاننەداوە،

بۆ دەرپەڕاندنی تورکەکان لە ڕەواندز تا ئەوکاتەی هەریەك لە شێخ مەحمود و نوری باوێڵ ئاغا (١٨٩٢- ١٩٦٣)[٣١] بوونەتە هاوکاریان بۆ دژایەتیکردن و دەرپەڕاندنی تورکەکان لەم ناوچەیەدا.[٣٢] بەڕادەیەك ئەم هەوڵ و جموجووڵەی هێزەکانی تورکیای کەمالی لەم هەلومەرجە و لەمکاتەدا زیاتر حکومەتی بەریتانیا و دەسەڵاتدارانی بەریتانیای دەترسان و کەوتنە ئەوەی کە بەهەرجۆرێك بووە، بتوانن دەروازە و ڕێگەچارەیەکی خێرا بدۆزنەوە. بۆئەوەی بتوانن جێپێی تەواوی خۆیان لە کوردستاندا بهێڵنەوە و لەنزیکەوە لە بارودۆخی ناوچەکە و بەرژەوەندییەکانی خۆیان لە ناوچەکەدا بڕوانن. هەرچەندە شارێکی وەك ڕەواندز لەو هەلومەرجەدا و بەچەند ساڵێك پێشتریش: ((بەهۆی داگیرکردن و هاتنەپێشەوەی رووس و تورکەوە کە وڵاتی کردبووە چۆڵەوانییەکی زۆر بەرچاو لە حاڵوبارێکی پڕمەترسی برسێتیدابوو، لەکاتێکدا ناوشاری ڕەواندز لە کۆی (٢٠٠٠) خانوو تەنها (٦٠) خانووی بەپێوەمابوو، کشتوکاڵ بەتەواوی وەستابوو، دانیشتووان بەڕێژەی (٧٥٪) کەمیکردبوو، قاتوقڕییەکە ئەوەندە خراپبوو، بەڕادەیەك دانیشتووانەکەی لەسەر گژوگیا و چەند بەڕوویەکی بەجێماو دەژیان و لەبرساندا زۆر بەناچارییەوە پشیلە و سەگ، تەنانەت لەهەندێ حاڵەتدا گۆشتی لاشەی مردووشیان خواردبوو)).[٣٣] ئەوەبوو لەدوای هەلومەرجێکی ئەوتۆ و وەك قۆناغیکی سەرەتا تورکەکان بەڕێبەرایەتی ئۆزدەمیر پاشا بەنزیکەی: ((سەد سەرباز و چوار پێنچ ئەفسەر و جبەخانەوە))ی پێویستەوە گەیشتبوونە شار و ناوچەکە،[٣٤] هەروەها دواتر ئۆزدەمیر توانی ژمارەی هێزەکانی خۆی زۆر لەوە زیاتربکات کە لەگەڵ خۆیدا هێنابوونی وەك ئەوەی هەندێك سەرچاوە ژمارەیانیان بەنزیکەی (٨٠) هەزار خەملاندووە، جگەلەوەش چەند کەسایەتییەکی کوردی ئەو دەمانەش کە وایانزانیوە، تورکەکان لەداهاتوودا پشتگیریکەر و دۆستی بەردەوامی کورد دەبن، بۆئەم مەبەستە ئەوانیش لەگەڵ هێزەکانی تورکدا هاتوونەتە شاری ڕەواندزەوە و خستوویانەتە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە. دوایی کەوتوونەتە ئەوەی، سەرنجی گەلێك کەسایەتی و سەرۆکخێڵێتری کوردیان بۆلای خۆیان ڕاکێشکردووە و وردەوردە کردوونیان، بە دۆست و هاوپەیمانی تورك لەناوچەکەدا، هەرچەندە ئینگلیزەکانیش لای خۆیانەوە، بە

هاتن و ئەم داگیرکارییەی تورك رازینەبوون و کەوتوونەتە دژایەتیکردنیانەوە، بەڵام دوای ئەوەی کە تورکەکان و سەر لەشکری هێزی تورك کەوتنە سیاسەتی زەبروزەنگ و بۆمبابارانکردنی هەموو ئەوانەی کە رووبەڕوویاندەبوونەوە، ناچاریانکردوون کە واز لە شارەکە بهێنن و بکەوێتەژێر دەسەڵاتی تورکەوە. هەرکە تەواوی هێزەکەشیان گەیشتە شاری رەواندزی ئەودەمانە و جێپێی خۆیان بەتەواوی بەهێزکرد، بەپێی دەستوری ئەوکاتەی کەمالییەکان، حکومەتێك یاخود بڵێین: ئەنجومەنێکی میللییان لەڕەواندزدا پێکهێنا، بەسەرۆکایەتی شێخ رەقیبی سورچی کە دواتریش کرایە حاکمی ناوچەی هەریر لەلایەن تورکەکانەوە و بەمەبەستی بەڕێوەبردنی کاروباری شار و بەمشێوەیەی لای خوارەوە:

| | |
|---|---|
| شێخ رەقیبی سورچی | سەرۆکی ئەنجومەن |
| ئەحمەد تەقی | جێگری سەرۆکی ئەنجومەن |
| شێخ ئەمینی سەلان | ئەندامی ئەنجومەن |
| شێخ جەوادی سەلان | ئەندامی ئەنجومەن |
| غەفور خانی سەرچیا | ئەندامی ئەنجومەن |
| خدر ئاغای سەرچیا | ئەندامی ئەنجومەن |
| ئەحمەد بەگی بگۆگ | قائمقامی رەواندز |
| نووری باوێڵ ئاغا | قوماندانی ژاندرمە |
| شەوکەت ئەفەندی | سەرۆکی شارەوانی |

هاوکات هەموو تەشکیلاتی هێزی میللی رێکخراو، چەك و جبەخانەشیان بەسەردا دابەشکراوە..[٣٥] هەرچەندە لەهەمان ماوەشدا چەند کەسایەتییەکی دیاری ناوچەکەی وەك: شێخ محەممەدی باڵەك و محەممەد عەلی ئاغای جوندیانی بەهانی ئینگلیزەکان لەسەر ئەم هاتنەی تورك بۆ ناوچەکە رازینەبوون،[٣٦] بەڵام دواتر ئەمانیش شتێکی ئەوتۆیان

پێنەکراوە و تورکەکانیش بەزۆری و بۆ پشتگیریکردن و بەردەوامبوونی کارەکانیان، پشتیان بەدانیشتوانی ناوچەکە بەستووە. بەڕادەیەك هەر لەم ماوەیە بەدواوە ئینگلیزەکان، بەتەواوی کەوتوونەتە ترسەوە، بەتایبەتی دوای ئەوەی هێزەکانی تورك پەیوەندیان بە زۆر کەسایەتی ئەوده‌مەی کوردەوە کردووە و تارادەیەکی باش پشتگیرییان بۆ دروستبووە، لەمە بەدواوە کەوتنە سیاسەتی فراوانخوازی و تەنها بەداگیرکردنی شاری ڕەواندزەوە نەوەستان، بەڵکو دەسەڵاتیان گەیشتە دەوروبەری هەریر و باتاس، سەرەرای ئەوەش زۆرێك لەو سەرۆکهۆز و خێڵە کوردانەی کە لای ئینگلیزەکان جێیان نەدبووەوە. یاخود خۆیان بەنەیاری ئەوان دەزانی، پەنایاندەهێنایەبەر شاری ڕەواندز و لێرەوە و لەپەنای تورکەکانەوە دەکەوتنە دژایەتیکردنی فەرمانڕوایانی ئینگلیز. بەتایبەتی بەشێك لەو کەسایەتییانەی کە پاش لەناوچوونی حکومدارییەتی یەکەمی شێخ مەحمود، لەتاو ڕاوەدوونانی ئینگلیزەکان شاری ڕەواندز بووبووە مەڵبەندی نیشتەجێبوون و گیرسانەوەیان، هەروەها ئینگلیزەکانیش بۆئەوەی بەرپەرچی ئەم سیاسەتە ترسناکەی تورکەکان بدەنەوە و بەردەوام جێپێی خۆیان لەناوچەکەدا بهێڵنەوە. کەوتنە ئەوەی کە چۆن کۆمەڵانی خەڵك ڕازیبکەن بەوەی کە ئەوان دەیانەوێت بۆ جارێکیتر ڕێگە بە شێخ مەحمودی حەفید بدەن بۆئەوەی لە شوێنی تاراوگە و ژیانی دوورخراوەیی لە وڵاتی هیندستانەوە بگەڕێننەوە کوردستان و حوکمدارییەتێکیدی لە شاری سلێمانیدا پێکبهێنێتەوە،[٣٧] چونکە لەم ماوەیە بەدواوە تورکەکان ڕۆژ بەرۆژ بەتەواوی دەسەڵاتیان زیاتر برەوی پەیدادەکرد و زۆر کەسایەتیری کوردیش دەیاندایە پاڵیانەوە. بەوەی ماوەیەك بوو سەرکردەی تورکەکان کە عەلی شەفیق بوو لە: مانگی حوزەیرانی (١٩٢٢)دا، بە نازناوی ئۆزدەمیرەوە هاتبووە کودستانەوە و بەبەردەوامی سەرگەرمی دروستکردنی پەیوەندی بوون و جێپێی خۆیان زیاتر بەهێزتردەکرد،[٣٨] بەڕادەیەك لێرە بەدواوە بوونی ئۆزدەمیر و: (پڕوپاگەندەکانی ئۆزدەمیر تەنها لەکوردستاندا نەبوو، بەڵکو زۆر بەگەرمی کەوتەناو عەرەبستان و بەتایبەتی شارەکانی مووسڵ و بەغداشەوە)،[٣٩] هەروەها لەوده‌مانەشدا کەسایەتییەکی وەك: کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند کە لەوکاتەدا لەگەڵ ئینگلیزەکاندا نێوانی تێکچووبوو. پاش ئەوەی توانی زۆر

بوێرانە فەرماندەی دەرەك و حاكمی سیاسی شاری چەمچەماڵی بەریتانی (كاپتن بۆند .Bond L)و ئەفسەرێكیتریان كە جێگری حاكمی سیاسی هەمان شاربوو، بەناوی (كابتن ماكانت R.K.Makant)[٤٠] بكوژێت و دواتر لەگەڵ كەسایەتی ناسراوی كورد سەیید **محەممەد**ی جەباری و (١٨٧٨- ١٩٣٥)[٤١] فەقێ **محەممەد** ناوێكدا، پێكەوە لەڕێگەی هەریرەوە و بەنزیكەی (٣٠٠) سوارەوە، توانیویانە هەڵبێن و خۆیان بگەیەننە لای ئۆزدەمیر پاشای فەرماندەی هێزەكانی تورك لە شاری ڕەواندز.[٤٢] بەجۆرێك هەڵاتن و ڕۆیشتنی ئەمانە سەرەڕای ئەوەی كە دەنگدانەوەیەكی گەورەی هەبووە لە تەواوی ناوچەكە و تەنانەت لە وڵاتانی دەرەوەشدا، هاوكات بووەتە هۆی پاڵپشتی و پەرەسەندنێكی گەورە بۆ دەسەڵاتی ئۆزدەمیر پاشا و هێزەكانی تورك لە ڕەواندز و ناوچەكەدا.[٤٣] هەندێك سەرچاوەش وایدەگێڕنەوە كە گوایە كەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند بەهاوكاری كوڕەكانی واتە سابیر و عەبدوڵڵا، توانیویانە لای گوندی (مۆرتكە)ی ناوچەی چەمچەمال، هەریەك لە (كابتن بۆند)و (ماكانت) بكوژن، ئەمەش لەكاتێكدابووە كە هەریەك لە بۆند و ماكانت سوارە و بەسەرپشتی ئەسپەكانیانەوە بوون، كاتێك كوڕانی كەریم بەگی هەمەوەند لەسەر ڕاسپاردەی باوكیان لەپشتەوە تەقەیانلێكردوون.[٤٤] دواتریش هەر بەپێی لێدانەوەی ئینگلیزەكان خۆیان، لە (٩ی ئابی ١٩٢٢)ەوە، كەریم بەگ توانیویەتی لە ناوچەی كۆیەوە نەك هەریر هەڵبێ و خۆی بگەیەنێتە شاری ڕەواندزی ژێر دەسەڵاتی ئۆزدەمیر،[٤٥] بەڕادەیەك فەرمانڕەوایانی بەریتانیا و بەتایبەتی حاكمی سیاسی ئەوكاتەی شاری سلێمانی گۆڵدسمیس، پارەیەكی خەیاڵیان تەرخانكردووە بۆ هەركەسێك كە بتوانێت شوێنیان بدۆزێتەوە یان ئاشكرایانبكات، وەك ئەوەی لە دەقی بەیاننامەكەیاندا هاتووە:

(شەخسێك وەیان چەند شەخسێك ئەگەر خەبەر و ئیتلاعبدەن، ئەو خەبەر و ئیتلاعە ببێت بەسەبەبی تەوقیف و گرتنی كەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند، لەلایەن حكومەتەوە دەهەزار ڕوپیە ئینعام و بەخشیشی دەدرێتێ، دیسان هەروەها ئیتلاعبدرێت و ببێت بەسەبەبی گرتنی سەیید **محەممەد**ی جەباری بۆئەمەش دووهەزار ڕوپیە ئینعام و بەخشش دەدرێت - ئیمزا حاكمی سیاسی گوڵد سمیس).[٤٦]

هەروەها هەموو ئەوانەشی کە نەیانتوانیووە لەگەڵ ئینگلیزدا بگونجێن و ((چارەی ئینگلیزیان نەدەویست)) یان ((تووشی داوی جاسووسەکانی ئینگلیز دەبوون و دەکەوتنە تەنگوچەڵەمەوە لە سلێمانی، لە کەرکوك و هەولێر و کفری و شارەکانیترەوە تەنانەت لە موسڵ و بەغداوە هەڵدەهاتن و روویاندەکردە رەواندز و لای ئۆزدەمیر دەحەسانەوە..).[٤٧] جگەلە هەموو ئەوانەشی کە فەرمانڕەوایانی بەریتانیا و عێراق بەتایبەتی کەسێکی وەك: (مێجەر سۆن رقی لێیانئەبووەوە)، بەرەو لای ئۆزدمیر و رەواندز هەڵدەهاتن و ئەوێیانکردووەتە: ((پەنا و.. هێلانەی هیوا)) لەوانە: ماجد مستەفا، قالەی ئایشەخان.[٤٨] هەموو ئەمانەش وایانکردبوو، تادەهات دەسەلاتی ئۆزدەمیر پاشا بەهێزتربێت، بەوەی رۆژ بەرۆژ زیاتر خەڵکی لەدەور کۆدەبووەوە ، هەرچەندە خۆشی تابڵێی کەسایەتییەکی: ((زیرەك و خوێندەوارێکی وریابوو، تەبیات و سروشتی کوردەکانی دەزانی و لە دەستووری عەشایەردا ئاگاداری هەبوو. کابرایەکی بالاّ نزیك بەکەڵەگەت و بەشەوکەتبوو، بە بەرگی عەسکەرییەوە بە وێنەیەکی مومتازی زابتی تورك و بەدوان و گفتوگۆی ئەدیبانە یان بەچەشنی خوێندەوارە بەرزەکان دەهاتەبەرچاو..))[٤٩] سەرەڕای ئەوەش لە سیاسەت و هەڵسوڕانی کاروباری عەشایەردا گەلێك لە حاکمە سیاسییەکانی ئینگلیز باشتر سەرکەوتووتربوو. بەتەواوی تەبیعەت و میزاجی سەرەك عەشیرەتەکان تێگەیشتبوو، بەزۆری هەموو ئەو سەرۆکانەی کردبوو بە (ئەنگوستیلەی دەستی.. هاوکات وەك ئەوەی کە کەسایەتییەکی زۆر شارەزای کاروباری ئیداری بووە، لەگەڵ ئەوەشدا توانیویەتی بەئاسانی کارێکی وابکات، دوور لە دەسەلاتی توورکەکان خۆیان کۆمەك و ئازوخە و جبەخانە و پارەی پێویست بۆ هێزەکانی کۆبکاتەوە.[٥٠]

**فراوانبوونی دەسەلاتی تورك و نامەکانی ئۆزدەمیر بۆ سەرۆکهۆزەکانی کورد:**

زۆری پێنەچوو ئۆزدەمیر توانی پشتیوانی بەشێکی گرنگی هۆز و سەرۆکهۆزە گەورەکانی کورد و ناوچەکەی وەدەستخست بەتایبەتی: هۆزەکانی سورچی، خۆشناو، هەمەوند و پشدەر هەروەها لە ناوچەکانی هەولێر، کەرکووك، سلێمانی و دەوروبەری نفوزێکی زۆری پەیداکرد و بەزۆری هۆزەکان حوکمی بەریتانیایان پشتگوێخست و سەرەتا

تورکەکانیش بەبێ رووبەڕووبوونەوە شاری رانیەیان گرت و هەڕەشەیان لە ئاکرێ کرد.کاروانێکی ئینگلیز کە بۆ هاواری رانیە رەوانەکرابوون، بێئەوەی بگەنە شوێنی مەبەست زیانێکی زۆریان بەرکەوت و لەوێشەوە ئۆزدەمیر خۆی بۆ داگیرکردنی کۆیەش ئامادەکرد.[٥١] ئەوەبوو بەماوەیەك دواتریش کەسایەتییەکی وەك سمکۆی شکاکی رێبەری کوردەکانی رۆژهەلاتی کوردستان لە رانیە پەیوەندی بە ئۆزدەمیر پاشاوە کرد،[٥٢] بەلاّم وەك پێشتریش قسەمان لەسەرکرد ئۆزدەمیر بە رەگەز و بە رەسەن تورك نەبوو، بەڵکو وەك دکتۆر کەمال مەزهەر لەبارەیەوە نووسیویەتی: ئۆزدەمیر پاشا ئەفسەرێکی گەورە و لێهاتووی تورك و لایەنگیری مستەفا کەمال (١٨٨١- ١٩٣٨)[٥٣] بوو. ئۆزدەمیر نازناوی بوو، ئەگینا خۆی ناوی عەلی شەفیقە و بە رەگەز میسری بوو. لە حوزەیرانی (١٩٢٢)دا، کەمالییەکان لەگەڵ سەربازەکانیاندا ناردیانە رەواندز، ئۆزدەمیر توانی لەنزیکەوە پەیوەندی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە سەردارانی کورد دامەزرێنی و هەزار و یەك گفتی شیرینی درۆی دانێ، چالاکییەکانی ئۆزدەمیر و هاریکاری لەگەڵ سەردارانی کوردا، بەتایبەتی لەگەڵ شێخ مەحمودی حەفید بەتەواوی ئینگلیزەکانی بێزارکردبوو[٥٤] بەو واتایەی ئۆزدەمیر پاشا یەکێکبووە لەو ئەفسەر و کەسایەتی ە سیاسی ە بەفرۆفێڵانەی نێو کەمالییەکان و هێزە سەربازییەکانی بزووتەوەی کەمالی کە تەنانەت مامۆستا رەفیق حیلمیش لە یاداشتەکانی خۆیدا و لەبارەیەوە دەنووسێت: ((پێنج فەرزە بە بەرچاوی خەڵکەوە)) قامەتی نوێژی دەبەست و نوێژیدەکرد یان ((گەلێك ئایەت و حەدیسی لەبەرکردبوو لەناو گفتوگۆدا بەکاریدەهێنان، بەناو خەڵکدا دەگەڕا و ئەوانەی جەوهەرێکیان تیابوایە لەخۆی نزیکی دەخستنەوە..))، هەر بۆئەوەی ئەو خەڵکە بێدەرەتانە بۆلای خۆی و تورکەکاندا پەلکێشبکات و بۆ مەرامی خۆیان و خزمەتی تورکە کەمالییەکان هەڵیانبخەڵەتێنێ و هاوکات دەسەلاّتی خۆیانی پێفراوان و پتەوتر بکات لەناوچەکەدا، تەنانەت بە حوکمی ئەوەی لە ریزەکانی سوپای عوسمانیشدا ئەفسەربووە و قوتابخانەی جەنگی ئەستەمبوولّی تەواوکردبوو ئەوەبوو بووە، مایەی ئەوەی کە زۆرێك لەو ئەفسەرانەی کورد بناسێت کە لەودەمانەدا لەگەڵیدابوون، بۆنموونە ئاشنایەتی و ناسیاری

نزیکی لەگەڵ عیزەت تۆپچی کوردا دەگەڕایەوە بۆ ئەودەمانەی کە لە ئەستەمبوول پێکەوە هاوکار و هاوپۆلی یەکدیبوون لە خوێندنی سەربازیدا.(٥٥) بەڕادەیەك هێندە کەسێکی لێزان و سەرنجڕاکێشبووە، لەکاتی خۆیدا بووەتە مایەی ئەوەی تەنانەت رەفیق حیلمی خۆیشی لەنزیکەوە پێی سەرسامبووە و لەمبارەیەوە دەنووسێت: ((کە چاوم بە ئۆزدەمیر کەوت خۆمانم بیرکەوتەوە، داخی ئەوەم تازەبووەوە کە لەسلێمانیدا سەرکردەیەکی وەکو ئۆزدەمیرمان پێویستبوو و دەستماننەدەکەوت..)). کەسایەتیەك، کە ئاوابێت ئیدی چۆن نابێتە مایەی ئەوەی کاتێك شاندی دانووستانکاری کورد و بەڕاسپاردەیی شێخ مەحمودی مەلیکی کوردان کە دەچنە شاری رەواندز بۆ بینینی ئۆزدەمیر لەلایەن: ((ماڵی شێخ مەحمودەوە و بۆ خانمی ژنی ئۆزدەمیر دیاری زێڕینی بۆ دەبرێ و.. تەنانەت لەلایەن مەلیك خۆشیەوە و بۆ ناودارەکانی ئەوکاتەی رەواندز تۆپە تاقە و چەفتەی سورمەیی نایابیان..)) بۆدەنێرێت، هەروەها پێش هاتن و گەیشتنی ئۆزدەمیر پاشا بۆ ناوچەکەکانی باشووری کوردستان و لەدرێژەی نامەیەکیدا، کە لە رێکەوتی (٥ی حوزەیرانی ١٩٢٢)دا کە بەناوی فەرماندەیی بزووتنەوە نیشتمانییەکانی عوسمانی لە سوریا و فەلەستین (قیادە الحرکات الوگنیە العپمانیە فی سوریا وفلسگین)، بۆ ئەحمەد شاکر ئاغای سەرۆکی (دارهینی) باکووری کوردستانی نووسیوە، بەهەمانشێوە، وەك کەسێکی موسڵمان و لەخواترس خۆی ئەخاتەبەرچاو و: ((بەناوی یەزدانەوە – باسم الله))ەوە، دەستپێدەکات و پڕوپاگەندە و قاوی ئەوەی بۆ لێدەدات کە ئەو کەسێکە لەپێناوی خوا و بەناوی جیهادکردنەوە هاتووەتە کوردستان و دەیەوێت ئەو هەموو ناوچانەی ژێردەسەڵاتی عوسمانی پێشوو لە وڵاتانی بێیانی و داگیرکەرانی وەربگرێتەوە.

وەك لە دەقی نامەکەیدا دەنووسێت: ((ۆ خزمەتی نیشتمان ەروەری بەغیرەت و بەڕێز ئەحمەد شاکر ئاغای سەرۆکی دارهینی: دوای سڵاوو رێز، بە جەنابت رادەگەیەنم کە ئێمە بەمەبەستی جیهاد لەڕێگای خودا و وتەکانی بەرگری لە خۆمان و وەدەستخستنەوەی چەند ناوچەیەك لە خاکی عوسمانی کە ئێستا بەدەست بێگانەوەیە، بۆ ئێرە هاتووین. خودا دەفەرموێت: (ان الدین عند الله الاسلام) سەرکەوتن و پشتگیری لەلایەن خوا و پێغەمبەری

ئەوە و ئیماندار پشتئەستورە. (ئەی پێغەمبەر، موسڵمانان بۆ جیهاد بانگبکە).(گفتەکانی خودا راستن و خوداوەند موجاهدین بەسەر خەڵکیدا زاڵدەکات) من هەموو رێگاکانی ئامادەکردنی نەتەوەپەروەر و بزووتنەوە نەتەوەییەکانم بۆ عومەر ئاغای سەرۆکی هۆزی جەلیان روونکردۆتەوە، تکایە سەردانیبکەن، ئەو شتە پێویستەکانت پێدەڵێ. خودا بەسەر دوژمندا سەرکەوتوتدەکا.. ئۆزدەمیر.. سەرۆکی تەشکیلاتی نیشتمانی)).[٥٦]

دوابەدوای ئەوەش لە دەقی نامەیەکیتریدا، کە دواتر و لە (١٦ی حوزەیرانی ١٩٢٢)دا (لە کتێبەکەی ئۆڵسندا ٢٦ی حوزەیران هاتووە ا- ب)،[٥٧] بۆ رەسول ئاغای سەرۆکی بەناوبانگی هۆزی دزەیی لە باشووری کوردستانی نووسیوە، بەڵام ئەم نامەیانی لەکاتێکدا نووسیوە کە خۆی و هێزەکەی تورك ماوەیەکە گەیشتوونەتە ناوچەکە و بەتایبەتی شاری رەواندزی ئەوکاتە، بەجۆرێك لەو سەروبەندەدا، ئۆزدەمیر پاشا وەکو خۆی لە دەقی نامەکەیدا، ئاماژەی بۆکردووە پلەی سەربازی و لێپرسراوێتی بریتیبووەلە: (فەرماندەی گشتی ناوچەی جەزیرەو عێراق و حەرەکاتی گشتی)، وەك لە دەقە عەرەبییەکەیدا نووسراوە (قائد منطقة الجزيرة والعراق والحركات العامة - اوزدمير)، هاوکات لەبەشێکیتری نامەکەیدا زۆر بەرقەوە باس لە بەریتانیای داگیرکەر و شێوازی دەستدرێژی و داگیرکارییان دەکات بۆ ناوچەکە بەتایبەتی کە چۆن شاری ئەستەمبووڵی پیرۆزی پایتەختی خەلافەتی ئیسلامیان داگیرکردووە و (خەلیفەی فەخری بەشەرییەتیان) لێدوورخستووەتەوە، هەروەها چۆن بەزۆر وایانلێکردووە کە ملکەچی فەرمانە گلاوەکانیان بێت و دواتریش کەوتوونەتە ئەوەی کە چۆن تۆوی دووبەرەکایەتی و دوژمنایەتی لەنێوان برا موسڵمانەکاندا بچێنن، جگەلەوەش لەبەشێکیتری نامەکەیدا دەکەوێتە تانەلێدان و زەمکردنی تەواوی فەرمانڕەوایەتییەکەی شا فەیسەڵی یەکەم لە عێراق و لەبارەیەوە دەنووسێت: (کەسێك نییە حەقیقەتی حکومەتەکەی فەیسەڵ نەزانێت کە چۆن ئامێرێکە بەدەستی فەرمانڕەوایانی بەریتانییەوە)و بەڵام وەکتر و بەپێچەوانەوە دەکەوێتە پیاهەڵدان و ستایشی بزووتنەوەی کەمالییەکان و بەتایبەتی مستەفا کەمال ئەتاتۆرکی باوکی تورکان و دواتر دەنووسێت: (ئەو داگیرکەرانەی کە بەشێکی گرنگی وڵاتەکەمانیان داگیرکردووە،

پشت بەخوا ولاّت سەربەخۆیی خۆی بەدەستدەهێنێتەوە و هەر ئەم هۆکارش بووە کەوا لە حکومەتی کەمالی بکات کە نەتوانێت دەسگرۆیی و یارمەتی: ((باشووری کوردستان))و ویلایەتی مووسڵ بدات، بەلاّم ئێستا سوپاس بۆ خوا وا ئێمە هاتووین بۆئەم ناوچەیە و لەپێناوی ئەوەی لاقی ئەو داگیرکەرانە بشکێنین کە حوکمی ئێرە دەکەن..). لە کۆتایی نامەکەشیدا دەکەوێتە ڕێنمایی و تەمێکردنی (انصحك..) ڕەسول ئاغای دزەیی کە ئەو ئەبێت لەمەوبەدوا بەخۆی و ئەندامانی هۆزەکەیەوە لە پرۆسە سەربازییەکانیاندا، هاوکاریانبکات و بەخۆی و ئەندامانی هۆزەکەیەوە هێرشبکەنەسەر دوژمنان..).(٥٨) بەهەموو ئەمانەشیدا و بەناوی داگیرکاری و داکۆکیکردن لە ئیسلام و یارمەتیدانی ناوچە کوردنشینەکان کە بە دەق نووسیویەتی: (باشووری کوردستان- كردستان الجنوبية)کە دەقی تەواوی نامەکە بەمشێوەیە:

(بۆ ڕەسول ئاغا سەرۆکی هۆزی دزەیی، سەرۆکی خۆشەویست: هیچ موسوڵمانێك نییە کە گەورەیی و توندی ئەو کارەساتەی لە شەڕی گەورەوە و هەروەها لەماوەی دوای شەڕراوەستان بەسەر ولاّتەکەماندا تێدەپەڕێت، دەرکنەکردبێت. موسوڵمانێك نییە کە لەو ئامانج و مەبەستە ڕاستەقینەیەی بەریتانیا نەگەیشتبێت کە بووەهۆی داگیرکردنی شاری ئەستەمبوڵی پیرۆز و پایتەختی خەلافەت، لەلایەن بەکرێگیراوانی دوژمنی ئیسلام و لادانی خەلیفەکەی کە فەخری بەشەریەتە (سلاّوی خوای لێبێت)، ملکەچ و بەندکردووە. بەریتانیاش بە ئامرازی ڕەزیلانەی ئەوی ناچارکردووە، سەر بۆ فەرمانەکانی کەچبکات و سەرئەنجام بۆ چاندنی دووبەرەکایەتی و دوژمنایەتی لەنێوان موسڵمانان. لەکۆتاییدا و بەمەبەستی دووبەرەکی و لێکجوداکردنەوەیان، ئەم بارودۆخەی لە باشووری کوردستاندا خولڤاندووە. هەتا کەسێك نییە کە لە گەوهەری حکومەتی فەیسەڵ، ئەم ئامرازە بێزراوەی دەستی بەریتانیا نەگەیشتبێت، بەلاّم ئەم بارە نالەبارە تووڕەیی خودای ورووژاندووە و بۆ سەلماندنی موعجیزەکانی پێغەمبەر لە قورئانی پیرۆزدا فەرمووی کە ئیسلام تا ڕۆژی قیامەت دەمێنێتەوە، مستەفا کەمالی هێنایە مەیدانی خەبات تا سەرزەوییەکانی عوسمانی لە چەنگاڵی دوژمنان ئازادبکات و ئەوان لە بێحورمەتی ڕزگاربکات و بێگانەکان

لەو بەشە زۆرانەی خاکی وڵاتەکەمان کە چنگیان لێگیرکردبوو، دەربکات، سوپاس بۆ خودا، وڵات سەربەخۆیی خۆی بەدەستدەهێنێتەوە. لەبەرهەندێ حکومەتی کەمالی نەیدەتوانی یارمەتییەکی وا پێشکەش بە باشووری کوردستان و ویلایەتی مووسڵ بکات، بەلاّم ئێستا سوپاس بۆ خوا کە ئێمە هاتووینەتەوە بۆئەم ناوچەیە لەپێناوی ئەوەی لاقی ئەو بێگانانە بشکێنین کە لێرە حوکمدەکەن، لەپێناوی ئەوەی وڵاتە پیرۆزەکەمان بەپشتیوانی خودا بپارێزین. ئێمەش لەم نزیکانەدا دەکەوینە رێکخستنەوەی خەڵك و بۆ بەشداریکردن لە راپەرینێکی گشتیدا. ئێستاش ئێوە رادەسپێرم (بە رەسول ئاغادەڵێ) هەرکە ئێمە پرۆسە سەربازییەکانمان لای باکوورەوە دەستپێکرد ئێوەش لەناوەوەو لەگەڵ هۆزەکەتاندا هێرشبکەنەسەر دوژمن. مادام کە ئێوەش هەر سەرۆکی هۆزبن، ئەوا بەبێ هیچ راڕایی و دواکەوتنێك، ئەوپەڕی هەوڵی خۆمان دەخەینەگەڕ بۆ رزگارکردنی ویلایەتی مووسڵ، من وای بۆدەچم کە ئێوە هاوکارمانبن لەپرۆسەکەماندا و لەکاتێکی گونجاودا، یارمەتییەکیش لەکاتی خۆیدا نەبێت سوودێکی ئەوتۆی نابێ و منیش لەمبارەیەوە هیچ بەڵێنێکم لە ئێوە ناوێت.

پێشنیاریشدەکەم لەگەڵ نێراوماندا کە راسپێردراوە بێتەخزمەتان لە هەرشوێنێك کە ئێوە دەتانەوێت و ئارەزوویدەکەن یەکتر ببینن. بۆئەوەی ئامانج و پلانەکانمان راشکاوانە و بەڕوونی بۆتان باسبکات.. ئۆزدەمیر.. فەرماندەی ناوچەی جەزیرە و عێراق و حەرەکاتی گشتی)).[٥٩]

ناوچەی جەزیرەش وەك دکتۆر ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر (٢١ / ١ / ١٩٣٠ - ٢١ / ١ / ٢٠١٤)[٦٠] باسیلێوەکردووە، بریتییەلە جەزیرەی ئیبن عومەر و ناوچەی بۆتان و جەزیرەی فوراتی جگەلەوەش فەرماندەیی بزووتەوەکەی لە عێراق و ناوچەی رەواندز و باشووری کوردستان هەموو لە چوارچێوەی بەرپرسیارتییەکەیدا بوون.[٦١]

دوابەدوای ئەوانەش لە بەشێکی نامەیەکییتریدا کە بۆ شێخ مەحمودی مەلیکی کوردانی ناردووە بەتایبەتی دوای گەڕانەوەی لە تاراوگەی و تیایدا چالاکانە روویکردووەتە شێخ مەحمود و ئایێندەی رووناکی تورکەکان و بەدەستهێنانی ئامانجەکانی کوردی بۆ

دەنووسێت تائەو ئاستەی بەناوی ئەتاتۆرکەوە بەڵێن بە شێخ مەحمود دەدات کەوەك سەردەمی محەممەد عەلی پاشا (١٧٦٩- ١٨٤٩)ی گەورەی میسر دەکرێتە خدێوی کوردستان و وەك والییەکی سەربەخۆ دادەنرێت.[٦٢] جگەلەوەش لە کورتەی نامەیەکیتریدا بۆیدەنووسێت: ((دەستان ماچدەکەم ئارەزووی بینینتانم هەیە چاوەڕوانی فەرمانتانم)).[٦٣] وێڕای ناردنی نامە و نوێنەری تایبەت بۆ لای شێخ مەحمود چەند جارێکیش چ لە شاری سلێمانی و چ لەکاتی چۆڵکردنی سلێمانیدا و لە (شێخ باخ ا- ب) نەك سێباخ [٦٤]ی ناوچەی سورداش و (ئەشکەوتی جاسنە)ش لەگەڵ شاندی تورکی و دەستوپێوەندەکانیدا سەردانی شێخ مەحمودی کردووە و بەستایشەوە و بە: ((سرودی سوپایی و نیشتمانییەوە خۆشهاتنی لێکراوە))و بیروڕای لەگەڵدا گۆڕاوەتەوە، سەبارەت بە رەوش و بارودۆخی ناوچەکە و نفوزی هێزەکانی بەریتانیا لە باشووری کوردستاندا.[٦٥] هاوکات زۆر چاك لەوەیش گەیشتووە کە کورد گەلێکی موسڵمانە و چۆن و بەچ جۆرێك زیاتر سەرنجیانڕادەکێشرێ و خاڵی وەرچەرخان و دەستەمۆکردنیان لەکوێدایە، هەروەها پێش گەڕانەوەی شێخ مەحمود لە تاراوگە و ژیانی دوورخراوەیی، ئۆزدەمیر نامەیەك بۆ شێخ قادری حەفید دەنووسێت و تیایدا بەزۆری ئامانجی خۆیانی بۆ گرتنەوەی ویلایەتی مووسڵ و هوشیارکردنەوەی برا کوردە موسڵمانەکان تانەبنە قوربانی ئینگلیزە خائینەکان.. جگەلەوەش دەقی نامەکە ستایشێکی زۆری شێخ مەحمود و جەوری ئینگلیز لێی و بەدیلگرتنی. بەرزبوونەوەی ناوی شێخ مەحمود لە عالەمی ئیسلامدا و پێخۆشبوونیان بۆ رزگارکرن و گەڕانەوەی تیایە..سەرەڕای هێرشکرنەسەر (نەمرود) کە مەبەستی لە کەسایەتی ناسراوی کورد مستەفاپاشای یامولکی بووە.[٦٦]

سەبارەت بەشێوازی پەیوەندی و ئەو نامەگۆڕینەوانەش کە بەزۆری لەنێوان مەلیکی کوردان شێخ مەحمود و ئۆزدەمیر پاشادا ئاڵوگۆڕکراون، شێخ رەئوفی کوڕی شێخ مەحمودی حەفید لە یاداشتە دەستنووسەکانی خۆیدا کە تائێستا چاپنەکراون و بەزۆری مامۆستا محەممەد رەسول هاوار (١٩٢٤- ٢٠٠٦)[٦٧] سوودی زۆری لێوەرگرتوون، نووسیویەتی: ((لەکاتی شەڕی دووەمی جیهانیدا کە کابتن لاین W.A. Lyon(١٨٩٢- ١٩٧٧)[٦٨]

مودیری ئیستخباراتی بەریتانیا بوو لە شیمالی عێراق رۆژێك لە سلێمانی بۆیگێڕامەوە، ئەو نامانەی کە وەختی خۆی لەنێوان باوکت و ئۆزدەمیردا ئالۆگۆڕدەکران ئێستا کۆپی ئەو نامانە لە شەریکەی نەوتی کەرکووکدا هەیە و پارێزراوە، هەروەها نووسیویەتی: پێیوتم ئەو نامانەمان بەهۆی ئەو پۆستەچییەوە دەستدەکەوت کە لەپێشدا نامەکانی دەهێنا بۆئێمە و ئێمەش کۆپیماندەکرد ئەوسا پۆستەچییەکە دەیبرد بۆلای ئۆزدەمیر کە هەموو جارێك بۆ هەرنامەیەك (٥٠) روپیەمان دەدایە و بەوجۆرە ئاگاداری پەیوەندی و کاروباری باوکت و ئۆزدەمیر بووین..)).[٦٩] هاوکات شێخ رەئوفی کوڕی شێخ مەحمود گومان لەوقسانەی کابتن لاین دەکات و دەنووسێت: ((ئۆزدەمیر خۆی وێنەی ئەو نامانەی باوکمی ناردووە بۆ ئینگلیزەکان، بۆئەوەی زۆرتر لەبەرچاوی ئینگلیزەکانی بخەن..))و تورکەکانیش وایانلێکداوەتەوە هانی ئینگلیزە، کەوا لە شێخ مەحمود دەکات شەڕی تورکەکان بکا.[٧٠] بەڵکو شێخ مەحمود هەرزوو لەوەگەیشتبوو کە ئەو کەوتووەتە نێوان دوو بەرداشی ئینگلیز و تورکەوە و هەریەکەشیان بەجۆرێك لە پیلان و نەخشەی ئەوەدابوون کە چۆن شێخ مەحمود تەفرەبدەن و بیکەنە داشی بردنەوەی ململانێکەیان لەناوچەکەدا تا ئەوکاتەی لە چوارچێوەی دانیشتنەکانیاندا چارەنووسی کێشەی ویلایەتی مووسڵ و دەرئەنجامەکانی بەکوێ دەگات. لەگەڵ ئەوەشدا بەشێك لە خەڵکی باشووری کوردستان یاخود بڵێین: ئەوانەی کە بەزۆری قاوی ئەوەیان بۆ تورکەکان بڵاودەکردەوە لەنێو کۆمەڵانی خەڵکدا لەبارەی: ((گەیشتنی هێزی تورکییەوە لەم نزیکانەدا و پێکەوەگرێدانی ویلایەتی موسڵ بەتورکیاوە)).[٧١] بەزۆری ئەمانەش لەناو کورد و کۆمەڵگای کوردەواریدا بە (جلخوارەکان) یان بە دەستوپێوەندی تورك ناسرابوون، بەڵام ئەم هاتنی تورکانەش بۆ شاری رەواندز و داگیرکردنی دەوروبەری وەك بەتەماشبوون کە دەستبەسەر شاری سلێمانی و هەولێر و کەرکوکیشدا بگرن، سەرەتا یەك لایەنی زۆر باشی تیاداهەبوو. بەتایبەتی بۆئەو رۆژگارەی کورد کە جارێکیتر کەوتنەوە راپەڕین و داواکاری ئەوەی کە دەبێت: (شێخ مەحمودی حوکمداری کوردستان) لە بەندی و ژیانی دوورخراوەیی ئازادبکرێت و بگەڕێتەوە کوردستان و شاری سلێمانی و هێزەکانی بەریتانیاش لە سەرەتاکانی مانگی ئەیلولی

١٩٢٢دا، له شاری رانیه و دەوروبەری کشاونەتەوه و ئەوەشی که زیاتر بووبێتەهۆی کشانەوه و هەلاّتنی ئینگلیزەکان له شاری ڕ انیه هاوکاریکردنی بەشێك له کۆمەلاّنی خەلّك و هۆز و خێلّەکانی ئەو ناوچەیە بووه لەگەلّ تورکەکاندا، بەوەی جێگری حاکمی شاری رانیەی بەریتانی کاپتن کووك (Kaptn Kook) که دواتریش کراوەته حاکمی (دەربەند) هەر له ژوورەکەی خۆیدا و بەشێوازێکی زۆر ناشرین و ئاشکرا (فەتاح بەگ) که کەسایەتی ناسراو و له خێزانێکی ناودار و بەقۆناغی ناوچەی رانیه بوو کوشتووه و تەنانەت ئەحمەد تەقی له یاداشتەکانی خۆیدا به: ((فەتاح بەگی شەهید)و کەسێکی موعاریزی ئینگلیز و بابەکر ئاغای پشدەری باسیلێوەکردووه،[٧٢] بەلاّم سەبارەت به شاری کۆیه که ماوەیەك بوو، ئەویش لەلایەن تورکەکانەوه و بەرێخۆشکردنی بەشێك له کەسایەتییه ناسراوەکانی شار و لایەنگیری و چاوساغییان بۆ هێزەکانی تورك دەستیبەسەرداگیراوه، لەوانه: کەریم ئاغای حەوێزی و حەوێز ئاغای غەفوری هەتا دەوروبەری (سەرخمە)و نزیکی (هەیبەت سولّتان) بەپیریانەوەچوون، تەنانەت رازی بەگی قائمقامی رەواندزیش وەك کاربەدەستێکی فەرمی تورك سەردانی شار و ناوچەکەی کردووه و کاروباری شاریان رێکخستووەتەوه، هەر لەدانانی قائمقام، مەئموری مەرکەز و بەرپرسی جەندرمه بەسەر کەسایەتییه ناسراوەکانیدا، دابەشکردووه و بەرپرسیارێتیان خستوونەته ئەستۆ، دواتر هەر لەلایەن تورکەکانیشەوه عەبدولفەتاح ئاغای کوڕی عەبدوللاّ ئاغایان به بەڕێوەبەری ناحیەی (تەقتەق) دامەزراندووه،[٧٣] بەجۆرێك تا ئەوکاتەشی لەلایەن ئینگلیزەکانەوه دووباره دەستی بەسەرداگیراوەتەوه ناوبەناو لەرێگای هێزی ئاسمانیانەوه هێرشیانکردووەتەسەر و ژمارەیەك له هاولاتییانی کوژران و برینداربوون، تا ئەوکاتەی له (١ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢)دا، لەرێگای هێرشی بەردەوامی ئاسمانیانەوه، توانیویانه تەنگ به تورکەکان و هاوکارەکانیان هەلّبچنن و تەنانەت له شاری کۆیه و قەلاّدزه و رانیەش دەریانکردوون و زۆرێك له هۆز و ئەو کوردانەشی که لایەنگیرییانکردوون شاریان بەجێهێشتووه و بەرەو ولاّتی ئێران و تورکیا هەلاّتوون.[٧٤]

لەهەمانکاتدا ئەم هاتنەی تورکەکان بۆ رەواندز و ناوچەکانیتری باشووری کوردستان، وای لە فەرمانڕەوایانی ئینگلیزکرد، خۆیان راستەخۆ هەوڵی ئەوەبدەن بۆ جارێکیتر شێخ مەحمودی حکومداری کوردستان لەتاراوگەوە بگەڕێتەوە کوردستان و شاری سلێمانی. ئەمەشیان زیاتر لەبەرئەوەبوو کە بتوانن وا لە شێخ مەحمود بکەن کە دەمکوتی هێزەکەی تورکی پێبکەن لەناوچەکەدا، وەك ئەحمەد خواجە (١٩٠٣- ١٩٩٧)[٧٥] لەمبارەیەوە دەنووسێت بۆئەوەی: ((زۆر بەپەلە ئۆزدەمیر دەربکات و بە لەشکری کوردەوە جەنگ لەگەڵ تورکەکاندا دابمەزرێنێت)) بەتایبەتی لە دەوروبەری رەواندز و هەریر و باتاس و هەموو ئەو شوێنانەیدی کە تا ئەوکاتانە کەوتبووەنەژێر دەسەلاتیانەوە، بەلام لەمەیاندا تورکەکان زۆر بەخێرایی دەستپێشخەرییانکرد و کەوتنە پێشکەوتنی بەردەوام بەرەو ناوچەکانی قوولایی باشووری کوردستان و دەستیان بەسەر تەواوی شاری رەواندزدا گرت و دامودەزگای کارگێڕی خۆیانیان، تیادامەزراند، لەگەڵ ئەوەشدا هێزەکانی تورك کەوتنە تالانکردن و بلاوکردنەوەی ترس و تۆقاندن لەنێو دانیشتوانەکەیدا[٧٦] لەکاتێکیشدا زیاتر ئەم هەلەیان قۆستەوە، بارودۆخی باشووری کوردستان و دووبارە دەستپێکردنەوەی شۆڕشەکانی شێخ مەحمود لەلایەك و باری ئالۆزی ئینگلیزەکانیان بە هەلی خۆیان زانی، وەك ئەوەی لە ئەیلولی (١٩٢٢)دا، بەرەتای هێزەکانیان گەیشتە دەوروبەری سلێمانی و ئینگلیزەکانیش جێگای خۆیان چۆلکرد و گەڕانەوە بۆ شارەکانی هەولێر و کەرکوك، ئەمەش وەك جۆرە هەڵهاتنێك بوو کە ناو و ناوبانگی بەریتانیای گەورەی لەکەدار دەکرد، ئەمەش بەگوێرەی ئەو دانپیانانەی کە مێجەر ئیدمۆنس C.j.Edmonds(١٨٨٩-١٩٧٩)[٧٧] خۆی پێی لەسەردادەگرت.[٧٨]

●●●

**پەراوێزەکان:**

١. لەبارەی رۆڵی کوردەوە بڕوانە: کمال مظهر احمد، دور الشعب الکردی فی ثورة العشرین العراقیة، مطبعة الحوادث، ط١، (بغداد: ١٩٧٨)، ص ٧٧ – ١٧١.

٢. جەعفەر عەسکەری: ناوی تەواوی جەعفەر مستەفای کوڕی عەبدولرحمان ئەفەندی کوڕی عومەری کوڕی فەتاحی عەسکەرییە و باوکی ئەفسەربووە لە سوپای عوسمانیدا، نازناوی (عەسکەری) دەگەڕێتەوە بۆ ئەوگوندەی کە

بنەچەوباب وباپیرانی لێیەوە سەرچاوەیان گرتووە، کەسەربە ناحیەی (ئاغجلەر) ی نزیك چەمچەماڵە، بەلاّم خۆی واتە جەعفەر عەسکەری لە ساڵی (١٨٨٥)دا، لە شاری بەغدا لەدایکبووە، قوتابخانەی سەربازی لە شاری بەغدا و لە ساڵی (١٩٠١)ەوە روویکردووەتە شاری ئەستەمبووڵ و لەوێش کۆلێژی سەربازی لە ساڵی (١٩٠٤)دا تەواوکردوە، دواتر لە سوپای شەشەمی عوسمانیدا، لە شاری بەغدا دامەزراوە، لە ساڵی (١٩٠٦) ەوە، کراوەتە مامۆستای قوتابخانەی سەربازی لە شاری بەغدا و لە ساڵی (١٩١٠)دا لەگەڵ خوشکێکی نوری سەعیددا کە ناوی (فەخریە) بووە، ژیانی هاوسەری پێکەوەناوە، دواتریش زانستی سەربازی لە ولاّتی ئەڵمانیا خوێندووە و جگەلە زمانی عەرەبی زمانەکانی: تورکی، فارسی، کوردی، ئینگلیزی، فەرەنسی و تاڕادەیەك رووسی و ئوردوشی بەباشی زانیوە، لەدوای هەڵوەشانەوەی دەوڵەتی عوسمانییەوە، کراوەتە یەکەم وەزیری بەرگری عێراق، لە حکومەتە کاتییەکەی عەبدولڕەحمان نەقیبدا کە لە ساڵی (١٩٢٠)دا پێکیهێناوە، جگەلەوەی کە چەندینجار پلەی وەزاری وەرگرتووە لە عێراقی سەردەمی پاشایەتیدا، هاوکات دووجاریش هەر لەعێراقدا بووەتە سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران لە (٢٢/ ١١ / ١٩٢٣ – ٢/٨ / ١٩٢٤)و لە (٢١/ ١١ / ١٩٢٦ – ٨ / ١ / ١٩٢٨)، لە سەروبەندی کودەتای بەکر سدقی (١٩٣٦)دا لەلایەن کودەتاچییەکانی سەر بە بەکر سدقییەوە کوژراوە و لە گۆڕستانی شاهانەی عێراق لە شاری بەغدا نێژراوە، علی کمال، مذکرات علی کمال عبدالرحمن ١٩٠٠ – ١٩٩٨، تقدیم و تحقیق: جمال بابان، (بغداد: ٢٠٠١)، ص ١٥١- ١٥٢.

٣. دار الکتب والوثائق، ملفات البلاط الملکی، رقم الملفة Z /٤ / ٥١، ع، ترکیا وقضیة الموصل والحدود، تقریر وزیر الدفاع العراقی السری، ذی الرقم (٦١٨)، فی (٦شباط ١٩٢٢)، الی الملك فیصل الاول، ص٤. نقلا عن: عبدالرحمن ادریس صالح البیاتی، الشیخ محمود الحفید، ص ٢٦١.

٤. کمال مظهر احمد، دور الشعب الکردی فی ثورة العشرین، ص ٨٠، عثمان علی، دراسات فی الحرکة الکردیة المعاصرة ١٨٣٣- ١٩٤٦، ص ٣٠٧.

٥. دار الکتب والوثائق، ملفات البلاط الملکی، رئاسة الدیوان الدیوان الملکی، دیوان المجلس الوزراء، بغداد، رقم الملف ٨١٩ / ٣١١، سری، الرقم ١٩٢٢، الی وزارة الخارجیة، مایس ١٩٣١، رقم الوثیقة (١٢)، ص ١٦.

٦. ئەحمەد خواجە، چیم دی، ل ١٢٥.

٧. ئەحمەدی تەقی، خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی، ل ٦٢.

٨. رەفیق حیلمی، یاداشت، چاپی سێیەم، ل ١٥١.

٩. ا. م. هاملتن، رێگایەك بەکوردستاندا، وەرگێڕانی لەئینگلیزییەوە: دکتۆر عەلی عەبدولڕەحمان عەسکەری، (هەولێر: ٢٠١٣)، ل ٨١.

١٠. عبدالرحمن ادریس صالح البیاتی، الشیخ محمود الحفید، ص ٢٦٢.

١١. کمال مظهر احمد، دور الشعب الکردی فی ثورة العشرین العراقیة، ص ١٥٤.

١٢. ئەحمەدی تەقی، خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی، ل ٦٢ – ٦٣.

١٣. ئەحمەد خواجە، چیم دی، چ٣، ل ١٢٥.

١٤. ئەحمەد خواجە، چیم دی، چ٣، ل ٦٥.

١٥. عبدالرحمن ادریس البیاتی، الشیخ محمود الحفید، ص ١٩٦.

١٦. سعد بشير اسكندر، من التخطيط الى التجزئة، سياسة بريطانيا العظمى تجاه مستقبل كردستان ١٩١٥- ١٩٢٣، (السليمانية: ٢٠٠٧)، ص ٢٦٥.

١٧. ا. م. هاملتن، ڕێگایەك بەکوردستاندا، س. پ، ل ٨٢.

١٨. ا. م. هاملتن، س. پ، ل ٨١.

١٩. ايوب بارزانی، المقاومة الكردية للاحتلال ١٩١٤- ١٩٥٨، دار نشر حقائق المشرق،(جنيف: ٢٠٠٢)، ص ٣٠- ٣١.

٢٠. فاضل حسين، مشكلة الموصل، دراسة فی الدبلوماسية العراقية – الانگليزيه – التركية وفی الرای العام (بغداد: ١٩٥٥)، ص٣٠١- ٣١١، کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، ب ٢، ل ٨٥.

٢١. ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی: کوڕی سەعید بەگی کوڕی عەبدوڵلا پاشای کوڕی بەکربەگی کوڕی باییز بەگی باپشتییە، بەکر بەگ دەبێتە مامی میرمحەمەد پاشای ڕەواندز، ئیسماعیل بەگ ساڵی (١٩٠٠) هەر لە ڕەواندز لەدایکبووە و لە تەمەنی (١٩) ساڵییەوە کراوەتە حاکمی شاری ڕەواندز و ماوەیەکیش لە سەردەمی پاشایەتیدا ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق بووە، لە (٨ی حوزەیرانی ١٩٣٣) بەهۆی دوژمنارییەوە لەلایەن بنەماڵەی باوێل ئاغاوە دەکوژرێت.بڕوانە: ئەحمەد حەمەد ئەمین، ڕەواندز، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی، س. پ، ل ٤٥- ٤٦.

٢٢. غەفور خانی نادەشت: کوڕی ئیسماعیل ئاغای کوڕی ڕەسول ئاغایە، ساڵی (١٨٩٠) لە گوندی (لێوژێ)ی بناری قەندیل لەدایکبووە، زمانەکانی تورکی و فارسی و عەرەبی زانیوە. لە یەکەم حکومدارییەتی شێخ مەحموودا کراوەتە بەڕێوەبەری ناحیەی (ناودەشت)و ڕۆڵێکی دیاری هەبووە لە گۆڕانە سیاسییەکانی ناوچەکەدا، لە ساڵی (١٩٥٣) دا کۆچیدواییکردووە. بڕوانە: دارا تۆفیق کاکە ئەمین، ناوچەی پشدەر لە سەردەمی پاشایەتیدا ١٩٢١- ١٩٥٨، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان،(سلێمانی: ٢٠١١)، ل ٣٩.

٢٣. ئەحمەد تەقی، خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی، ل ٤٢- ٤٣.

٢٤. العراق فی سجلات الوثائق البريطانية ١٩١٤ – ١٩٦٦، المجلد الثانی، ١٩١٨ -١٩٢١، المحرر الاستشاری: الف دی ل. رش، محرر البحوث: جين بريشو، ترجمة: كاظم سعد الدين، (بغداد: ٢٠١٣)، ص ٦٩٦.

٢٥. ڕۆبەرت ئۆلسن، ڕاپەڕینی شێخ سەعیدی پیران، کوردستان ١٨٨٠- ١٩٢٥، و: ئەبوبەکر خۆشناو، چ٢، ل ١١٥.

٢٦. عثمان علی، دراسات فی الحركة الكردية المعاصرة ١٨٣٣- ١٩٤٦، (اربيل: ٢٠٠٣)، ص ٣٨٨، بيار مصطفى سيف الدين، السياسة البريطانية تجاه تركيا واثرها فی كوردستان ١٩٢٣- ١٩٢٦، مطبعة وزارة التربية، (اربيل: ٢٠٠٤)، ص ٨٣، قادر سليم شمو، موقف الكرد، ص ١١٢.

٢٧. تلار علی امين، موقف تركيا من القضية الكردية فی العراق ١٩٣٧- ١٩٧٥(السليمانية: ٢٠١١)، ص ٧١- ٧٢، عبدالرحمن ادريس صالح البياتی، الشيخ محمود، ص ٢٦٢، ڕەفیق حیلمی، یاداشت، چ٣، ل ٣٠٣.

٢٨. شێخ عەبدولڕەحمانی سەرانی: ساڵی (١٨٨٠) لە بنەماڵەیەکی بە ناوبانگی دۆڵی ئاکۆیان لەدایك بووە، بەشداری ئەوشەڕانەی کردووە، کە لەلایەن ڕووسەکان و دواتریش ئینگلیزەکانەوە کراوەتە سەرناوچەکە و لە ساڵی (١٩٦٠) دا کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: ئەحمەد حەمەدئەمین، ڕەواندز، س.پ، ل ٦٧.

٢٩. ئەحمەد حەمەدئەمین، س.پ، ل ٦٧- ٦٨.

۳۰. ا. م. هاملتن، ڕێگایەك بە کوردستاندا، س. پ، ل ۸۱.

۳۱. نوری باوێڵ ئاغا: کوڕی باوێڵ ئاغای کوڕی مەلا عەزیزە، ساڵی (۱۸۹۲) لە ڕەواندز لەدایکبووە، ماوەیەك لە حوجرە و دواتر لە روشدییەی ڕەواندزەوە دەستی بەخوێندن کردووە، لەگەڵ داگیرکردنی شاری ڕەواندز، لەلایەن ئینگلیزەکانەوە کراوتە بەڕێوەبەری پۆلیسی ئەم شارە، بەلاّم دواتر نێوانی لەگەڵیاندا تێکدەچێت و لە ساڵی (۱۹٦۳)دا هەر لە شاری ڕەواندز کۆچیدواییکردووە.بڕوانە: ئەحمەد حەمەد ئەمین، س.پ، ل ٤١.

۳۲. ا. م. هاملتن، ڕێگایەك بەکوردستاندا، س. پ، ل ۸۱.

۳۳. ئی. جەی. ئاڕ، پوختەی کاروباری کاتی جەنگی جیهانی لە کوردستانی جنووبی، س. پ، ل ٤۹.

۳٤. ئەحمەد تەقی ، خەباتی گەلی کورد لە یادداشتەکانی، ل ٥۱.

۳٥. ئەحمەد تەقی، خەباتلی گەلی کود لە یاداشتەکانی، ل ٥٥ – ٥٦.

۳٦. ئەحمەد تەقی، س. پ، ل ٥٥.

۳۷. بيار مصطفى سيف الدين، السياسة البريطانية تجاه تركيا واثرها فی كوردستان ۱۹۲۳- ۱۹۲٦، ص ۸٤.

۳۸. السيد عبد الرزاق الحسنى، تأريخ العراق السياسى الحديث، ج۲، (بغداد: ۱۹۸۹)، ص ۳۰٦.

۳۹. ئەحمەد خواجە، چیم دی، ل ۱۰۸

٤۰. ئەحمەد خواجە، چیم دی، ل ٦٦، سعد بشير اسكندر، من التخطيط الى التجزئة.. ص ۲٦۹، قادر سليم شمو، موقف الكرد من الحرب الاستقلال التركية ۱۹۱۹ – ۱۹۲۲، ص ۱۱۳.

٤۱. سەیید محەممەدی جەباری: ساڵی (۱۸۷۸) لە گوندی مەحمود پەریزای ناوچەی جەباری لەدایکبووە. خوێندنگە ئایینییەکانی شاری کەرکوکی تەواوکردووە. جگەلە زمانی کوردی عەرەبی فارسی بەباشی زانیوە و یەکێکبووە لە هاوڕێ نزیکەکانی شێخ مەحمودی و لە شەڕی شوعێبەی (۱۹۱٥)، شەڕی تاسڵوجەی (۱۹۱۹)و ئاوباریکی (۱۹۳۱) دا، بەشداریکردووە، ئەندامی کۆمەڵەی ئازادی کوردستان بووە و لە ساڵی (۱۹۳٥)دا وەفاتیکردووە. بڕوانە: محەممەد فاتح، پەرەسەندنی ژیانی حیزبایەتی لە کوردستانی باشوور، (هەولێر: ۲۰۱٤)، ل ٤۱٥- ٤۱٦.

٤۲. ئەحمەد تەقی، خەباتی گەلی کورد لە، ل ٦۳، عثمان علی، دراسات فی الحركة الكردية، ص ۳۹۰

٤۳. ڕەفیق حیلمی ، یادداشت، کوردستانی عێراق و شۆرشەکانی شێخ مەحمود، بەشی یەکەم، (هەولێر: ۱۹۸۸)، ب۲، ل ۲٦، ستيفن همسلى لونكريك، العراق الحديث، من سنة ۱۹۰۰- ۱۹٥۰، تاريخ سياسى، اجتماعى واقتصادى، ترجمة: سليم طه التكريتى، ج۱، ط۱،(بغداد: ۱۹۸۸)، ص ۲۳۸.

٤٤. جى. كيلبرت براون، قوات الليفى العراقية ۱۹۱٥- ۱۹۳۲، الترجمة والتحقيق: مؤيد ابراهيم الونداوى، مراجعة: رفيق صالح، (السليمانية: ۲۰۰٦)، ص ۹٥.

٤٥. جى. كيلبرت براون، قوات الليفى العراقية ۱۹۱٥- ۱۹۳، ص ۹٦.

٤٦. دارا ئەحمەد کەریم بەگ، کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند، (هەولێر: ۲۰۰۱)، ل ۱۳۸.

٤۷. ڕەفیق حیلمی، یاداشت، چ۳، ل ۳۰۲.

٤۸. ئەحمەد تەقی، خەباتی گەلی کورد، ل ٥۷.

٤۹. ڕەفیق حیلمی، بەشی یەکەم، چ۲، ل ۲٦.

٥٠. رەفیق حیلمی، هەمان سەرچاوە ، ل ٥٢٦.

٥١. دیڤید ماكداول، مێژووی هاوچەرخی كورد، ب١، و: ئەبوبەكر خۆشناو،(سلێمانی: ٢٠١٢)، ل ٢٩٦.

٥٢. دیڤید ماكداول، مێژووی هاوچەرخی كورد، ب١، ٣٤١.

٥٣. مستەفا كەمال ئەتاتۆرك: ساڵی (١٨٨١) لە شاری سالۆنیك لەدایكبووە، عەلی رەزای باوكی ماوەیەك، فەرمانبەربووە لە یەكێك لە فەرمانگەكانی دەوڵەتی عوسمانیدا و دواتر دەستیكردووەتە بازرگانی تەختەفرۆشی. ئارەزووی لەوەش هەبووە كورەكەی هەمان پیشەی ئەو بگرێتەوەدەست، بەلاّم زوبێدەی دایكی بەوەی ئافرەتێكی خواناسبووە، لەگەڵ ئەوەدابووە، ببێتە وتاردەر و پیاوێكی ئایینی، ئەوەبوو سەرەتا ئارەزووی دایكی سەركەوت و پەیوەندیكردە قوتابخانەیەكی ئایینییەوە، بەلاّم دواترو لە تەمەنی (٩) ساڵیدا كە باوكی وەفاتیكرد. دایكی ناچاربوو بە كور و كچەكەیەوە پەناببنەبەر گوندێكی نزیك سالۆنیك كە ماڵی برایەكی جووتیاری لێبوو. لەوێ ماوەیەك دەستیكردە شوانی، تا ئەوكاتەی لە ( ١٨٩٣)دا، لە قوتابخانەی سەربازی سالۆنیك وەرگیرا و وەك خوێندكارێكی سەركەوتوو هاتەپێشچاو. بەتایبەتی لە بابەتی بیركاریدا، بەرادەیەك بووە جێی سەرنجی مامۆستاكانی و لەبەر لێهاتوویی نازناوی كەمالیان بۆ ناوەكەی زیادكرد، لەوكاتەوە بە: (مستەفا كەمال) ناسرا، لە (١٨٩٥)ەوە لە ئامادەیی سەربازی موناستیر وەرگیرا و دوای سێ ساڵ و تەواوكردنی، لە كۆلێژی سەربازی ئەستەمبوول وەرگیراو لە ( ١٩٠٥)دا ئەم قۆناغەشی بە پلەی (یوزباشی- نقیب) تەواوكرد. لێرەبەدواوە كەوتەناو كاروباری سیاسییەوە و لەگەڵ چەند هاوەڵێكیدا، كۆمەڵەیەكی نهێنیان پێكەوەنا بەناوی: (نیشتمان)ەوە. هەركە لەلایەن شۆفارەكانی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمەوە ئاشكرابوون، بۆ ماوەی سێ مانگ لەژێر چاودێریدا هێڵرانەوە و پاشان دوورخرایەوە بۆ دیمەشق و دواتر نەقڵی (سالۆنیك) كرا، لێرەوە پەیوەندیكردە ریزەكانی كۆمەڵەی: (یەكێتی و سەركەوتن)ەوە و لە ( ١٩١٠)ەوە لەگەڵ نێرژەیەكی سەربازیدا، بە سەرۆكایەتی عەلی رەزا نێردرایە فەرەنسا بۆ بینینی ئەو مانۆرە سەربازییەی كە سوپای فەرەنسا لە (بیكاردی) ئەنجامیاندا. دوای هاتنەوەی گواسترایەوە بۆ لیبیا و لەوماوەیەوە كە ولاّتانی بەلقان شەریان دژی دەوڵەتی عوسمانی راگەیاند مستەفا كەمال، گەرایەوە ئەستەمیووڵ و كرایە سەرۆكی ئەركانی فەیلەقی (بولایر) و لە ئازادكردنی ئەدرنەدا بەشداریكرد، هەروەها لە (١٩١٦)دا كرایە فەرماندەی تیپی شازدەیەمی ئەم شارە و لە ساڵی (١٩١٧)دا، كرایە فەرماندەی سووپای حەوتەم لە بەرەی سینا و لە ساڵی (١٩١٨) دا، سەرۆكایەتی بزووتنەوەی نیشتمانی توركی كرد، تا راگەیاندنی سیستەمی كۆماری لە (١٩٢٣)دا و وەك سەرۆك مایەوە تا ئەوكاتەی لە (١٠ی تشرینی دووەمی ١٩٣٨) لە كۆشكی دۆڵمە باخچە (Dolmabahce) كۆچیدواییكرد. بروانە: منصور عبد الحكیم، مصطفى كمال اتاتورك الذئب الطورانیة الاغبر، (القاهرة: ٢٠١٠)، ص ٤٠٤- ٤٠٦.

٥٤. كەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەرەیەك لە مێژووی گەلی كورد، ب١، (بەغدا: ١٩٨٥) ل ١٢٠.

٥٥. ئەحمەد خواجە، چیم دی، چ٢، ل ١٢٥.

٥٦. احمد عثمان ابوبكر، صحیفة (خە بات)، العدد(٨٢٤)،٢٥/ ٧/ ١٩٩٧، رۆبەرت ئۆلسن، راپەرینی شێخ سەعیدی پیران،كوردستان ١٨٨٠- ١٩٢٥، ل ٢٨٢.

٥٧. احمد عثمان ابوبكر، صحیفة (خە بات)، المصدر السابق .

٥٨. احمد عثمان ابوبكر، صحيفة (خه بات)، العدد(٨٢٤)،٢٥/ ٧/ ١٩٩٧، تلار على امين، موقف تركيا من القضية الكردية فى العراق، ص ٧٢- ٧٣.

٥٩. احمد عثمان ابوبكر، المصدر السابق، رۆبەرت ئۆڵسن، راپەڕینی شێخ سەعیدی پیران، ل ٢٨٣ - ٢٨٤.

٦٠. دکتۆر ئەحمەد عوسمان ئەبو بەکر: لە ساڵی (١٩٣٠)و بەپێی شوناسنامەی باری کەسێتییەکەی لە گوندی (پیرداود)ی سەربە شاری هەلێر لەدایکبووە و دایکی ناوی (فاتمە جەرجیس)ە، بەرەسەن دەچنەوەسەر بنەماڵەی (پیرەبابی) بەناوبانگ، قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی، ناوەندی و دواناوەندی لە شاری هەولێر و هەروەها قۆناغی زانکۆیی لە: (زانکۆی ئەمەریکی لە بەیروت)ی وڵاتی لوبنان لە (١٩٥٥)دا تەواوکردووە، پاشان بۆ تەواوکردنی خوێندنی باڵا چووەتە یەکێتی سۆڤێتی پێشوو و قۆناغی دکتۆرای لە (ئەکادیمای علومی سۆڤێتی لە مۆسکۆ)، لە ساڵی (١٩٦٥)دا تەواوکردووە و ماوەیەکی زۆریش لە (کۆلێژی ئەدەبیاتی - زانکۆی بەغدا- بەشی مێژوو) مامۆستا بووە، بەزۆری بابەتی (تێکستی مێژوویی) بە زمانی ئینگلیزی دەوتەوە، سەرەڕای هاوکاریکردنی بەردەوامی خوێندکارانی خوێندنی باڵای ماستەر و دکتۆرا لەڕووی کاری وەرگێڕان و سەرپەرشتیکردنەوە، بە یەك دوو ساڵێك دوای راپەڕینی ساڵی (١٩٩١) لە شاری بەغداوە گەڕایەوە کوردستان لە بەشی مێژووی، کۆلێژی ئەدەبیاتی، زانکۆی سەلاحەدین، بوو بە مامۆستا و لەم قۆناغەشدا چ وەك وانەوتنەوە و چ وەك سەرپەرشتیکردن لە کاروباری خوێندنی باڵادا بەردەوامبوو، جگەلەوەش لە زۆربەی زۆری گۆڤار و رۆژنامە کوردی و عێراقییەکاندا نووسینێکی زۆری بە: زمانەکانی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی بڵاوکردووەتەوە و لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵێك بەرهەمی وەرگێڕان و چاپکراوی دانسقەی هەیە، سەرەڕای هەندێ دەستنووس و بابەتی تایبەت کە لای نووسەری ئەم کتێبە پارێزراون و لەفورسەتێکدا وەك کتێبێکی سەربەخۆ بڵاویاندەکەینەوە، بەداخەوە تا لەژیاندابوو بەرەبەنی ژیا و ژیانی هاوسەری پێکەوەنەنا، بۆ دواکاتیش لە تەمەنی (٨٤) ساڵیدا و لەڕێکەوتی (٢١ / ١ / ٢٠١٤)، لە شاری هەولێر زۆر بە بێدەنگی وەفاتیکرد و لە گۆڕستانی ڕێگای (مەخموور) ئەسپەردەی خاککرا، دیارترین بەرهەمە چاپکراوەکانی بریتینلە: اكراد الملى وابراهيم باشا، الصراع على كوردستان (وەرگێڕان لەڕووسیەوە)، كوردستان فى عهد السلام بعد الحرب العالميه الاولى (بەزنجیرە لە گۆڤاری (الثقافة)ی سەلاح خالیسدا بڵاویکردەوە)، الانسان الجديد - العاقل (بە زمانی ئینگلیزی)، هەروەها لەم ساڵانەی دوایشدا کاك دکتۆر ئازاد عوبێد ساڵح، زۆربەی زۆری بەرهەمەکانی بەسەریەکەوە و لە (دووبەرگ) ی سەربەخۆدا، بەناونیشانی: (الاثار الكاملة للدكتور احمد عثمان ابوبكر) بەدوای یەکدا و لە ساڵانی (٢٠٠٩) و (٢٠١٠)دا بڵاویکردوونەوە.

٦١. احمد عثمان ابوبكر، المصدر السابق.

٦٢. مەحمود مەلا عیزەت، حکومەتی کوردستان لەناو مەتەڵی سیاسەتی بەریتانیادا ١٩١٨ - ١٩٢٤، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی و سیاسییە، بنکەی ژین (سلێمانی: ٢٠٠٦)، ل ٢٤٢.

٦٣. ئەحمەد خواجە، چیم دی، چ٢، ل ١٢٤.

٦٤. مەحمود مەلا عیزەت، حکومەتی کوردستان، س. پ، ل ٢٤٢.

٦٥. ئەحمەد خواجە، چ٢، ل ١٢٥.

٦٦. مەحمود مەلا عیزەت، حکومەتی کوردستان، س. پ، ل ٢٤٥- ٢٤٦.

٦٧. محەممەد رەسول هاوار: لە ساڵی (١٩٢٤)دا، لە شاری سلێمانی لەدایکبووە، قۆناغەکانی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی خوێندنی هەر لە شاری سلێمانی و کۆلێژی (یاسا)ی لە شاری بەغدا تەواوکردووە، لەماوەی ژیانیدا هاوعەسری زۆربەی رووداوەکانی کوردستان بووە و ماوەیەکی زۆریش لە شاری بەغدا ژیاوە، دواتر و لە ساڵی ( ١٩٧٤)ەوە، پەیوەندی بە شۆڕشی کوردستانەوە کردووە، لە ساڵی (١٩٨٠) بەماڵەوە بەیەکجاری چووەتە شاری (لەندەن)و لەوێ ژیاوە، ئەدیب و نووسەرێکی چالاکی کوردە و کۆمەڵێك بەرهەمی چاپکراوی لە بوارەکانی: شیعر، مێژوو، بیرەوەری و رووناکبیری کوردیدا بلاْوکردووەتەوە، لە ساڵی (٢٠٠٦)دا، لە شاری لەندەن وەفاتیکردووە. بڕوانە: محەممەد رەسول هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، ب٢، (لەندەن: ١٩٩١)، دوالاپەڕە.

٦٨. کابتن لاین: والاْس لاین لە بنەماڵەیەکی ئایینی سکۆتلەندی لە ئێرلەندە هاتووەتەدونیاوە. کوڕی ناوەنجی باوکیەتی، خوێندن و نووسینی لە قوتابخانەی کلێسایی لە (دوبلن)ەوە دەستپێکردووە و پاشان چووەتە زانکۆی نیشتمانی و بەلاْم لەباری دارایی هەر لەسەرەتاوە وازیهێناوە، لە (١٩١٢) چووەتە هیند و لەوێ بووەتە بەڕێوەبەری لقێکی کۆمپانیای توتنی (بەریتانی – ئەمەریکی)و لەگەڵ بەرپابوونی جەنگی یەکەمی جیهانیدا خۆبەخشانە چووەتە ریزەکانی سوپای بەریتانییەوە لە هیند و بووەتە ئەفسەر، ماوەیەك لە بەرەکانی جەنگدا لە ولاْتی فەرەنسا جەنگاوە و تەنانەت برا بچووکەکەشی هەر لە ریزی سوپای بەریتانی و لەوێ کوژراوە. لە ساڵی (١٩١٨)ەوە رەوانەی میسۆپۆتامیا کراوە و لەرێگای ئاسنی نێوان (بەسرە – بەغدا) دانراوە، کاپتن لاین یەکێکە لەو ئەفسەرانەی بەریتانیا کە زۆرترین ماوە لەم ناوچەیەدا ماوەتەوە، تا کۆتایی (١٩٤٤)، لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵێك پلە و پۆستی جیاوازی خراوەتەئەستۆ لەوانە: ئەفسەری سیاسی، موفەتیشی ئیداری، ئەفسەری یەکالاکردنەوەی موڵکایەتی، راوێژکاری سیاسی لەشکر، لە ساڵی (١٩٤٤) بەدواوە قۆنسوڵی بەریتانیا بووە لە ئەسیوبیا و لە ساڵی (١٩٤٩)ەوە بە پلەی (کۆلۆنیل – مقدم) خانەنشینکراوە. بڕوانە: کاپتن لاین، کورد و عەرەب و بەریتانییەکان، بیرەوەرییەکانی کاپتن لاین لەمەڕ رووداوەکانی باشووری کوردستان ١٩١٩ – ١٩٢٩، وەرگێڕانی: یاسین سەردەشتی، (سلێمانی: ٢٠٠٧)، ل ١٤- ١٥.

٦٩. محەمەد ڕەسول هاوار، شێخ مەحموودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، ب٢،(لەندەن: ١٩٩١)، ل ٤١٢.

٧٠. محەمەد ڕەسول هاوار، س. پ، ل ٤١٢.

٧١. جلیلی جلیل ، م.س حسرتیان و اخرون ، الحرکة الکردیة فی العصر الحدیث ، ت: عبدی حاجی ، (بیروت: ١٩٩٢) ، ص ١٢٦.

٧٢. سروە اسعد صابر، کوردستان من بدایة الحرب العالمیة الاولی الی نهایة مشکلة الموصل ١٩١٤ – ١٩٢٦، دراسة تاریخیة سیاسیة وثائقیة، الطبعة الاولی، (اربیل: ٢٠٠١)، ص ٢٣٩، ئەحمەد خواجە، چیم دی، چ٣، ل ٦٧، ئەحمەد تەقی، خەباتی گەلی کورد، ل ٤٢ – ٥٨.

٧٣. تاهیر ئەحمەد حوێزی، مێژووی کۆیە، ب٢، ب١، چاپخانەی (نمیر)، (بەغدا: ١٩٨٤)، ل ١٤٩.

٧٤. جەمال فەتحوڵلاْ تەیب، کۆیە ١٩١٨ – ١٩٥٨، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە، چ٢، (هەولێر: ٢٠٠٨)، ل ٨٥ – ٨٦.

٧٥. ئەحمەد خواجە: کوڕی عەزیز عوسمان ئاغای ئەردەڵانییە،کە باوکی لە نێوەندی پەروەردە و خوێندنا و لە باشووری کوردستاندا بە خواجە ئەفەندی ناسراوە، ساڵی (١٩٠٣) لە شاری سلێمانی لەدایکبووە و سەرتاکانی خوێندنی لای باوکیەوە دەستپێکردووە و دواتر پلەکانی خوێندنی لە قوتابخانە فەرمییەکاندا درێژەپێداوە و هاوچەرخی بزوتنەوەکانی شێخ مەحمودی حەفید بووە و تەنانەت وەك سکرتێر و نووسەری تایبەتی شێخ مەحمود کاریکردووەو زۆرێك لە نامەکانی ئەو گەیاندوویەتییە بەرپرسانی ئێران و رووس و ماوەیەکیش سەرنووسەری رۆژنامەی (ئومێدی ئیستقلال) بووە و لە کۆی چوار بەرگی سەربەخۆشدا مێژووی شۆڕشەکانی شێخ مەحمودی نووسیوەتەوە بەناونیشانی: (چیم دی) یەوە و لە (١٩٩٧)دا کۆچیدواییکردووە. بڕوانە: جمال بابان، اعلام الکرد، ج١، (اربیل: ٢٠١٢)، ص ٤٤.

٧٦. جلیلی جلیل واخرون ، المصدر السابق ، ص ١٢٧.

٧٧. سیسیل جۆن ئیدمۆندس: ئەفسەری سەربازی و دیبلۆماتمات کار و رۆژهەلاتناسێکی ناسراوی بەریتانیای گەورەیە لە (٢٦ی تشرینی یەکەمی ١٨٨٩) دا لە ئۆساکای ولاتی یابان لەدایکبووە. بەوەی هەر لەودەمانەدا باوکی لەوێ کاربەدەستبووە و خاوەنی بڕوانامەی بەکالۆریوس بووە لە زمانەکانی: عەرەبی، تورکی و فارسیدا، لە (١٩١٠)ەوە بووەتە کۆنسوڵی بەریتانی لە شاری بوشەهری باشووری ئێرانی قاجاری و، دواتر کار و بەرپرسیارێتی گواستراوەتەوە بۆ ئەستەمبوول و لە ساڵی (١٩١٣)دا بووەتە جێگری حاکمی سیاسی لە عێراق و لە ساڵی (١٩١٩)ەوە رۆڵێکی گرنگی گێڕاوە لە باشووری کوردستاندا، بەتایبەتی لە کۆتاییهێنان و سەرکوتکردنی بزووتنەوەکانی شێخ مەحموودا، هەروەها لە (١٩٢٢)ەوە، کراوەتە سەرپەرشتیاری کارگێڕی پارێزگاکانی کەرکوك و سلێمانی و لە ( ١٩٢٥)ەوە وەك ئەفسەری پەیوەندییەکانی بەریتانی لەگەڵ ئەو لیژنە نێودەوڵەتییەدا کاریکردووە کە بۆ یەکلاییکردنەوەی کێشەی ویلایەتی مووسڵ لەلایەن رێکخراوی نێودەوڵەتی (کۆمەڵەی گەلان)ەوە پێك هێنرا. لەوەبەدوا ماوەیەك، راوێژکاری وەزارەتی ناوخۆی عێراق بووە. پاشان کراوەتە کۆنسوڵی بەریتانی لەعێراقدا، هەروەها لە سالانی پێش و لەنێوان سالانی ( ١٩٣٥ – ١٩٤٥)دا راوێژکاری وەزارەتی ناوخۆی عێراق بووە و لە(١٩٣٧)دا، ویسامی رافیدەینی دراوەتێ، لە ساڵی ( ١٩٥٠)ەوە خانەنشینکراوە. لەوماوەیەشیدا کە لە عێراق و کوردستاندا بووە، کۆمەڵێك لێکۆڵینەوەی وردی لەسەر بارودۆخی دانیشتووانی ناوچە جۆربەجۆرەکانی کردووە، بەتایبەتی لە چوارچێوەی ئەو کتێبە گرنگەی کە بەناوی: (کورد، تورك و عەرەب)ەوە و لە ساڵی (١٩٥٧)دا بلاویکردووەتەوە سەرەڕای دانانی فەرهەنگی (کوردی – ئینگلیزی) لەگەڵ رووناکبیرو کەسایەتی سیاسی کورد تۆفیق وەهبی بەگدا.جگەلە کۆمەڵێك نووسین و بلاوکردنەوەی دی لەسەر بارودۆخی کورد و زمانی کوردی. بڕوانە: جلال زنگابادی، سیسیل جون ادموندز ٢٦ تشرین الاول ١٨٨٩- ١١حزیران ١٩٧٩، العراق فی رسائل المس بیل، ت: جعفر الخیاط، دار حریة للطباعة والنشر، (بغداد: ١٩٧٧)، ص ٤٤٣.

٧٨. جلیلی جلیل، المصدر السابق ، ص ١٢٧.

# نهێنیکاری له بونیادنانی دەوڵەتێکی بەهێزدا
# سیاسەتی نهێنکاری ئەتۆمی ئیسرائیل

و: حەبیب محەمەد دەروێش

ئەم بابەتە بریتییەلە لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی و زانستی لەپرۆژەی ئەتۆمی ئیسرائیل و چۆنییەتی بیرکردنەوە لەو پرۆژەیە و سەرەتاکانی دەستپێکردنی و چۆنییەتی پارێزگاریکردن لە نهێنی ئەنجامدانی پرۆژەکە لەسەرەتاوە، تاتەواوبوونی پرۆژەکە و تا هەنووکەش وەك فاکتەرێکی گرنگ لەپێکهاتنی دەوڵەتێکی بەهێزدا کە گەرەنتی پارێزراوی و مانەوەی پێببەخشێ، هەروەها لەم لێکۆڵینەوەیەدا دەردەکەوێت، ئیسرائیل بە ململانێیەکی سەختدا تێپەڕیوە بەتایبەت لە سەرەتای دەستپێکردنی پرۆژەکە و چیرۆکی سەرکەوتنی سەرکردە ئیسرائیلییەکان لە فەرزکردنی ئەجێندای ئەتۆمی دەوڵەتەکەیان بە سەر وڵاتە یەکگرتووەکان و تەواوی جیهانیشدا، ئەمانجمان لە بەکوردیکردنی ئەم بابەتە بۆئەوەیە بزانین ئێمەش وەکو کورد و دەسەڵاتداری کوردی کە زیاتر لە دوو دەیەیە حوکمڕانی ئەم هەرێمە دەکەن، چەندێك هەوڵی گرنگیانداوە بۆ فەرزکردنی خەباتی بە دەوڵەتکردنی گەلێکی بێدەوڵەت کە زیاتر لە سەدەیەکە سەخاوەتمەندانە قوربانی لەپێناوی ئازادی و بەدیهێنانی چارەنووسی خۆی دەدات، ئایا ئەم سەرکردانە هەولەکانیان لەپێناو گەل و نەتەوەکەیاندایە یان تێکەڵ بە حەز و بەرژەوەندییەکانیان بووە، ئایا دەکرێت بەرژەوەندییە ستراتیژییەکانی نەتەوەیەك تێکەڵ بە بەرژەوەندییەکانیتر بکرێت و رێژەی سەرکەوتنی ئەم سیاسەتە چەندە لە مێژووی گەلاندا؟ ئایا سیاسەتی نەوتی هەرێم وەك چەکێکی ستراتیژی سیاسی کە تائیستا موعەممایەکە و نهێنیکاری زۆری تێداکراوە لە بەرژەوەندی گەلی کوردستاندا یان پەردەپۆشکردنییەتی بۆ بەرژەوەندی حیزبی و شەخسی، واتە نهێنیکاری نەوت بۆ بنیادنانی دەوڵەتە یان بزنسە بۆ سیاسییەکان، دیارە ئەمە

زەمەنێکی پێویستە بۆئەوەی راستییەکان دەرکەون هەروەك چۆن ئێستا راستگۆیی سەرکردە ئیسرائیلییەکان دەرکەوتووە لە بونیادنانی دەوڵەتێکی بەهێزدا و چارەنووسی گەلی ئیسرائیلیان خستەپێش هەموو شتێکەوە و سەروەرییەکی مێژوویی گەورەیان بۆخۆیان تۆمارکرد، ئومێدەوارم سەرکردەکانی کوردیش سەروەری بۆ خۆیان تۆماربکەن و مێژووی گەلێکی ستەمدیدە نەفەرەتیان لێنەکات و گەلەکەیان بگەیەنن بە کەناری ئارامی و سەربەخۆیی و سەرفرازی.

رەگ و ریشەی سیاسەتی نهێنیکاری ئەتۆمی ئیسرائیل لە سەرەتای بیرکردنەوە لە پرۆژەی ئەتۆمی ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٤٨ هەتاوەکو دوای تەواوکردنی بونیادنانی کوورە ئەتۆمییەکان لە دەیمونە لە کۆتایی ١٩٦٣، سەرۆکوەزیرانی حکومەتی ئیسرائیل دیڤد بن گۆریۆن هەستا بە دروستکردنی بەربەستێکی نهێنی بەهێز بە دەوری ئەو پرۆژەیەدا، ئەم نهێنیکارییە هاوئاهەنگ بوو لەگەڵ داپۆشین و بێدەنگییەکی تەواو سەبارەت بە پرۆژەکە و ئامانجەکانیشی نهێنی شێوازی دروستکردنی پرۆسەی بڕیارەکانی ئاسایشی نەتەوەیی ئیسرائیل بەشێوەیەکی گشتی. ئەم نهێنیکارییە ئەوەندە قووڵکرایەوە نەك تەنیا لەنێو بڕیاردەرەکانی ئاسایشی نەتەوەیدا پیادەدەکرا، بەڵکو کرا بە بەشێك لە ئاکاری کۆمەڵگای ئیسرائیلیش و کلتوورێك سەبارەت بەهەموو شتێك کە پەیوەندی بە ئاسایشی نەتەوەییەوە هەبێت. ئەم ئاکاری نهێنیپارێزییە توندکرا بە کۆمەڵێ سزای یاسایی دژ بەهەرکەسێك بەپێچەوانەوە هەڵسوکەوتبکات، سەرەڕای ئەمەش سروشتی کاری بن گۆریۆن لە دروستکردنی بڕیارەکانی تایبەت بە ئاسایشی نەتەوەییەوە، بەوەدەناسرێتەوە کە تاکڕەوانەیە، بەجۆرێك بڕیارە گرنگەکان لە دەرەوەی دامودەزگا رەسمییەکان فۆرمەلە دەکات و تەنیا لەکاتی پێویستدا دەخرایەبەردەم دامودەزگا رەسمییەکان بۆئەوەی رەزامەندی لەسەر دەرببڕن، بەڵام لە حالەتی پرۆژە ئەتۆمییەکەی ئیسرائیلدا، بن گۆریۆن سووربوو لەسەر نهێنیکارییەکی تەواو، بۆئەوەی بە نهێنی بەرەو پێشەوەی بەرێت و بیگەنێتە ئەو ئامانجەی خۆی دەیەوێت ئەمەش بۆئەوەی ناڕەزایی ناوخۆیی ئیسرائیلی یان نێودەوڵەتی دەرەوەی لێنەکەوێتەوە، بەتایبەتی نارەزایی ئیدارەی ئەمەریکی.

سوربوونێکی توند لەسەر پابەندییەکی لەڕادەبەدەر بە نهێنیکاری و تەمومژاوی پرۆژەکە گەیشتە ئاستێك کە بن گۆریۆن و ئەو گروپە، بچووکەی کە کاری بونیادنانی پرۆژەکەیان لەئەستۆدابوو هیچ شتێك لەسەر کاغەز نەنووسن سەبارەت بە ئامانجەکانی پرۆژەکە و هۆکارەکانی بونیادنانی و سیاسەتی ئەتۆمی ئیسرائیلی، شەمعون پێریز ئەندازیاری پرۆژە ئەتۆمییەکە کە سەرتیمی پرۆژەی بونیادنانی کووره ئەتۆمییەکان بوو لە دەیمونە جەختی لەسەر ئەوەدەکردەوە کە سیاسەتی نهێنیکاری سەبارەت بەهەموو شتێك کە پەیوەندی بە پرۆژە ئەتۆمییەکە ببوو بە بەشێك لەپێکهاتەی خودی پرۆژەکە، هەروەها دەیوت: بن گۆریۆن نەیویستووە هیچ تێزێك یان راڤەکارییەك بکات بۆ تێڕوانینی ئەتۆمییانەی خۆی چونکە ئەوە دەبوو بەپەلەکردن لە باسکردنی ئامانجگەلێکی دیاریکراو پێش ساتەوەختی خۆی.

ئامانجە ئەتۆمییەکان بەدرێژایی دەسەلاتی بن گۆریۆن تەمومژاوی و دیارینەکراوبوون، لە سەرەتای پرۆژەکەشەوە سەرەڕای سیاسەتی نهێنیکارییەکە هیچ بڕیارێکی گرنگ سەبارەت بە پرۆژەکە نەخرایەسەر کاغەز، هەرکاتێکیش بڕیارەکان بنووسرایەتەوە بەشێوەی کۆمەڵێ دەستەواژەی گشتی و تەمومژای و دیارینەکراو دەنووسرایەوە. بەم نهێنیکارییە ئیسرائیل توانی دەستبکات بە بونیادنانی کووره ئەتۆمییەکان لە دەیمونە لە ساڵی ١٩٥٨و بەردەوامبوو بۆ ماوەی سێ ساڵ بەبێ هیچ نارازایەتییەکی ناوخۆیی یان دەرەکی، جیهانیش هیچ شتێکی لەسەر ئەم پرۆژەیە نەدەزانی.

**فۆرمەلەبوونی سیاسەتی نهێنیکاری ئەتۆمی ئیسرائیلی – بە دانووساندن لەگەڵ ئەمەریکادا**

لەشەستەکاندا سیاسەتی نهێنی ئەتۆمی ئیسرائیلی فۆرمەلەبوو و تەواوی ئەو سیاسەتە و گەشەسەندنی پرۆژە ئەتۆمییەکە کەوتەژێر کاریگەری ئەو دانووساندنەی کەسێ لەسەر سەرۆکحکومەتەکانی ئیسرائیل (بن گۆریۆن و ئەسکۆڵ و مائیر) لەگەڵ سێ لە سەرۆکەکانی ئەمریکا (جۆرج کەنەدی و لیندن جۆنسن و ریچارد نیکسۆن) ئەنجامیدا.

بەمەبەستی گەیشتن بە لێکگەیشتنێك لەگەڵ ئیدارەی ئەمریکا سەبارەت بە پرۆژەی ئەتۆمی دەیمونە، بن گۆریۆن لە سەرەتای ساڵی ١٩٦١هەوڵیدا کۆبوونەوەیەك لەگەڵ سەرۆکی ئەمریکا کەنەدی ئەنجامبدا، بن گۆریۆن بڕوای وابوو بەتێپەڕبوونی کات و بەبێ گەیشتن بە لانیکەمی لێکتێگەیشتن لەگەڵ ئیدارەی ئەمریکیدا خزمەت بە ئیسرائیل ناکات، بەتایبەتی زانیارییەکان سەبارەت بە پرۆژەکە بە بەردەوامی دەگەیشت بە ئیدارەی ئەمریکی کە کۆمەڵێ زانیاری زۆر و سەرنجڕاکێش بوون.

لە چوارچێوەی هەوڵی یەکخستنی کۆبوونەوەی نێوان بن گۆریۆن و کەنەدی، ئیدارەی ئەمریکی داوایکرد لە ئیسرائیل ڕێگەبدات بە دوو زانای ئەتۆمی ئەمریکی سەردانی کوورە ئەتۆمییەکانی دەیمونە بکەن، ئەو دوو زانایەش بەڕێکەوتن بۆ ئیسرائیل، لەئەرکێکدا لە ٨ تا ٢٢ی ئایاری ١٩٦١ بەردەوامبوون، سەردانی کوورە ئەتۆمییەکانی دەیمونەیان کرد، بەلاّم تەنیا شەش کاژێر تیایدامانەوە و نەشچوونە هەموو بەشەکانی کۆمەڵگای ئەتۆمی دەیمونە، سەردانی شوێنە گرنگ و هەستیارەکانیان نەکرد، بەلاّم ڕاپۆرتێکیان پێشکەشکرد کە نەرمنواندنێکی زۆری تێدابوو بەرامبەر بە ئیسرائیل. لەڕاپۆرتەکەدا هاتبوو کە هیچ بەڵگەیەك نییە ئاماژەبێت بۆئەوەی پرۆژەیەك لەناو کوورە ئەتۆمییەکاندا هەبێت بۆ پێشخستنی توانا ئەتۆمییەکانی ئیسرائیل و ئەو کورانەی کە هەن تەنیا ئامادەن بۆ مەبەستی ئاشتی، لەو ڕاپۆرتەدا هاتبوو کە لە توانای ئیسرائیلدایە لەناو ئەو کورانەدا گەشە بە توانای بەرهەمهێنانی چەکی ئەتۆمی بدات.

زەکی شەلوم سەبارەت بەم ڕاپۆرتە و چۆنیەتی مامەلەکردنی ئیدارەی ئەمریکی لەگەڵیدا دەڵێت: ئەم مەسەلەیە چەندین نیشانەی پرسیار و سەرسوڕمان دەخاتەڕوو، مەسەلەکە پەیوەندی نییە بە قەبارەی ئەو چەکەی کە ئیسرائیل دەیەوێت پێشیبخات، چونکە هەرچەندێك بچووکبێت، ئەوا کاریگەری و دەرئەنجامی ستراتیژی زۆرگرنگ دەهێنێتەئاراوە ئەگەر ئەو دوو زانایەی سەردانی کوورەکانیان کرد باوەڕیانوابێ کە لە توانای ئیسرائیلدا هەیە با لەڕووی تیۆریشەوە بێت چەکێکی بچووك بەرهەمبێنێت، ئەی بۆچی پێشنیاری سەردانی دووەمیان خستە دوای ساڵێك لە سەردانی یەکەم، وادیارە

درکیان بەوەنەکرد کە دەکرێت بارودۆخێکی نویٚ لە پرۆژەی دەیمونە بخولقێ کە نەکرێت دوای ساڵێك پاشەکشەی لێبکرێت؟ پاشان زیاتر دەڵێت، پرسیاری گرنگ ئەوەیە بۆچی ئەمە گلۆپی سووری دانەگیرساند لای ولاٚتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا؟[٣]

ئەوەی روونە سەرۆکی ئەمریکا (کەنەدی) لە کۆبوونەوەی ٣٠ی ئایاری ١٩٦١ لەگەڵ بن گۆریۆن بڕیاریدا بەنەرمی و ئاسایی مامەلەی لەگەڵدابکات و لەم قۆناغەدا بەئاشکرا ناکۆکی نەکەوێتە نێوانیانەوە سەبارەت بە پرۆژەی ئەتۆمی دەیمونە، کۆبوونەوەکەش بۆ بن گۆریۆن مایەی خۆشحاڵیبوو.

بەشی زۆری کۆبوونەوەکەش تایبەتبوو بە پرۆژەی ئەتۆمی دەیمونە و لەسەرەتادا کەنەدی وتی راپۆرتی ئەو دوو زانایە (باش و بەسوودە)و داوای لە بن گۆریۆن کرد شەرحی پرۆژەی ئەتۆمی کۆمەڵگای دەیمونە بکات و ئەمانجەکانی روونبکاتەوە، بێگومان بن گۆریۆن چاوەڕوانی ئەم پرسیارەی دەکرد و خۆشی بەباشی بۆ ئامادەکردبوو، بۆیە باسێکی درێژی سەبارەت بەگرنگیی هێنانەکایەی سەرچاوەی وزەی نویٚ بۆ ئیسرائیل کرد کە بەهۆیەوە چارەسەری کێشەیەکی مەرکەزی لەئیسرائیلدا دەکات، ئەویش کێشەی کەمئاویە، تاکە رێگای چارەسەری ئەم کێشەیەش بریتییەلە سازگارکردنی ئاوی دەریایە، بۆ بەدەستهێنانی ئەم مەبەستەش دەستخستنی سەرچاوەکانی وزەی هەرزانە، ئەوەش بە پرۆژەی دەیمونە دێتەدی.

لەپاش پاساوی ئەوەی پرۆژەی ئەتۆمی دەیمونە کە پرۆژەیەکی زانستی- توێژینەوەیی- پیشەسازییە، بن گۆریۆن جەغتی لەسەر نیگەرانییە ئەمنییەکانی دەکردەوە لەژێر رۆشنایی تەشەنەسەندنی هێزی جیهانی عەرەبیی بەتایبەت گەورەبوونی هیزی میسر، لەسەر ئەم بنەمایە بن گۆریۆن دەیوت ئامانجی ئەم قۆناغەی ئیسرائیل تەرخانکردنی پرۆژەکەیە بۆ ئامانجی ئاشتی، بەلاٚم ئەوەشی روونکردەوە کە پێدەچێت ئیسرائیل دوای چوارساڵێتر کاربکات بۆ پێشخستنی پرۆژەکە بەجۆرێك لەتوانایدا بێت پلۆتۆنیۆمی پێویست جیابکاتەوە بۆ وزەی ئەتۆمی. ئەمەش ئاماژەیەکبوو لەلایەن بن گۆریۆنەوە بەوەی لەئاییندەدا پابەندنابێت کە ئامانجە ئەتۆمییەکەی نەگۆڕێت بۆ

پێویستییە ئەمنییەکان.

کەنەدی لە وەلاّمی قسەکانی بن گۆریۆندا باسی لە گرنگی روونکاری (شەفافیـەت) کرد لەو چالاکییانەی لە کۆمەڵگای ئەتۆمی دەیمونە ئەنجامدەدرێت. دوای ساڵ و نیوێك لە کۆبوونەوەی بن گۆریۆن و کەنەدیدا کۆمەڵێك فاکتەر هاتەئاراوە کـاریگـەریـیـان لـەسـەر گۆڕینی سیاسەتی کەنەدی هەبوو بەرامبەر بە پرۆژە ئـەتـۆمـیـیـەکـەی ئـیـسـرائـیـل لـە نەرمینواندن و ئاسانکارییەوە بۆ سیاسەتێکی توند و یەکلاکەرەوە. ئەویش بـەهـۆی ئـەو زانیارییە جۆراوجۆر و سەرنجڕاکێشانەی کە دەگەیشتە ئیدارەی ئەمریـکـی و ئـامـاژەیـان بەوەدەکرد کە ڕێرەوی پرۆژەی ئەتۆمی دەیمونە بەرەوپێـشـخـسـتـنی تـوانـا ئـەتـۆمـیـیـە سەربازییەکان دەڕوات، ئیسرائیلیش لەئەوپەڕی توانادایە کە ئەمە لە ئیدارەی ئـەمـریـکـا بشارێتەوە. ئەمەش ناکۆکبوو بەو باپەندییەی کە بن گـۆریـۆن لـە کـۆبـوونـەوەی سـاڵـی ١٩٦١ بەرامبەر سەرۆك کەنەدی دابووی سەبارەت بە دوو مەسەلە کە کەنەدی بە گرنگی لە قەڵەمدابوو، ئەوەش بریتیبوولە روونکاری و پـێـشـنـەخـسـتـنی تـوانـا ئـەتـۆمـیـیـە سەربازییەکانی ئیسرائیل لە ئایندەیەکی دیاردا، بەلاّم ئـیـسـرائـیـل بـەردەوامـبـوو لـە دەورەدانی کۆمەڵگای ئەتۆمی دەیمونە بە دیوارێك لە نهێنی و بەتەواوی خـۆی دوورگـرت لەپیادەکردنی سیاسەتی روونکاری بەرامبەر بە ئیدارەی ئـەمـریـکـی و سـەردانـی زانـا ئەمریکییەکانیشی بۆ کوورەکان دوادەخست، تا لە مانگی ئەیلولی ١٩٦٢ ڕێگەپێـدان، بەلاّم بۆیاننەبوو زیاتر لە ٤٠ دەقیقە لە کوورەکانی دەیمونە بمێننەوە و ڕێگەیشینەدان هیچ دامەزراوەیەکیتری کۆمەڵگاکە بگەڕێن.

لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٣دا سەرۆك کەنەدی سیاسەتی خۆی بەرامبەر بە پـرۆژەی ئەتۆمی دەیمونە گۆڕی و دەستیکرد بە زیادکردنی فشارەکانی ئیدارەی ئەمریکی بەرامبـەر بە ئیسرائیل و لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٦٣ فشارەکانی ئیدارەی ئـەمـریـکـی گـەیشـتـە بەرزترین ئاست و لە چوارچێوەی ئەم فشارەدا سەرۆك کـەنـەدی ڕێـنـمـایـی دەرکـرد بـۆ راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی ماك جۆرج باندی کە دەبێت بەزوترین کـات هـەمـوو ئـەو ڕێگایانە بگرێتەبەر کە لەتوانادایە بەمەبەستی دەستخـسـتـنی زانـیـاری سـەبـارەت بـە

چالاکییە ئەتۆمییەکەی ئیسرائیل و هەروەها هەڵسەنگاندێکیش بۆ قورسایی و گرنگیی پرۆژەی ئەتۆمی ئیسرائیل لە تێڕوانینی دروستکەرانی بڕیار لەئیسرئیلدا بکات، لەهەمانکاتدا سەرۆك داوای لە وەزارەتی دەرەوە کرد کۆمەڵێك پلان ئامادەبکات بەمەبەستی راگرتنی پرۆژەکە.(٧)

سەرۆك کەنەدی درکی بەوەکردبوو کە بن گۆریۆن لەم قۆناغەدا فێڵەگێجە دەکات بەمەبەستی بەدەستهێنانی کات بۆ بەردەوامبوون لە پرۆژەکە و بۆئەوەی ئەمریکا و جیهان بخاتەبەردەم ئەمری واقیع. سەرۆك کەنەدی بەمەبەستی بەدیهێنانی دوو ئامانجی سەرەکی فشارەکانی بۆ سەر بن گۆریۆن چڕکردەوە:

**یەکەم:** بەدەستهێنانی پابەندێتی ئیسرائیل بەوەی پرۆژەی ئەتۆمی دەیمونە تەنیا بۆ مەبەستی ئاشتییە.

**دووەم:** کردنەوەی کۆمەڵگاکە بەهەموو دامەزراوەکانیەوە لەبەردەم چاودێری کارای ئەمریکیدا.

لە ئەنجامی ئەم فشارانەدا بن گۆریۆن لەنامەیەکیدا لە ٢٧ی ئایاری ١٩٦٣ بۆ سەرۆك کەنەدی پابەندیی خۆی دەربڕی بەوەی کوورە ئەتۆمییەکە تەنیا بۆ مەبەستی ئاشتی بەکاردێت، بەڵام بن گۆریۆن دەستی دەستی دەکرد سەبارەت بەخستنەژێر چاودێری کۆمەڵگاکەوە لەلایەن چاودێریی کارای ئەمریکییەوە.

دەرئەنجامی سووربوونی سەرۆك کەنەدی بەوەی دەبێت بەزووترین کات و بەبێ هیچ دواخستنێك کووره ئەتۆمییەکانی دەیمونە بخرێتەژێر چاودێری توندی ئەمریکا و بەردەوامبوونی لەسەر فێڵەگێجە ناکۆکی و جیاوازی هەردوولای گەیاندە ئاستێك، بن گۆریۆن و دەستەبژێری سیاسی ئیسرائیل گەیشتنە ئەو بڕوایەی کە سەرۆك کەنەدی کار لەسەر دانانی سنوورێك بۆ پرۆژە ئەتۆمییەکەی ئیسرائیل دەکات لە دەیمونە.

لە ١٥ی حوزەیرانی ١٩٦٣ سەرۆك کەنەدی نامەیەکی توندی ئاراستەی بن گۆریۆن کرد کە ناوەڕۆکی سەرەکی نامەکە بریتیبوولە کۆمەڵگا ئەتۆمییەکەی ئیسرائیل و

خستنەژێر چاودێری کاراتری ئەمریکا لەنزیکترین کاتدا.

هەر لەنامەکەدا داوای لە بن گۆریۆن کرد بەزووترین کات وادەیەك لە هاوینی ئەو ساڵەدا دابنێ بۆ سەردانی زانا ئەمریکییەکان بۆ کۆمەڵگاکە، رێگەشیان پێبدات هەموو بەشەکانی کۆمەڵگاکە بگەڕێن و چاودێرییبکەن و کاتی پێویستیشیان پێبدرێت بۆ مانەوە لە کۆمەڵگاکە بۆ راپەڕاندنی ئەرکەکانیان و دەبێت سەردانی زاناکانیش بەشێوەیەکی دەوری بێت.

هەروەها کەنەدی بن گۆریۆن لەوە ئاگادارکردەوە کە پابەندێتی ولاٌتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە پشتگیریکردنی ئیسرائیل تووشی زەرەری زۆر دەبێت، ئەگەر ئەمریکا بگاتە ئەو بڕوایەی کە ناتوانێت زانیاری باوەڕپێکراو سەبارەت بە مەسەلەیەکی گرنگی وا دەستناکەوێت کە هەوڵەکانی ئیسرائیلە لەبواری ئەتۆمیدا چونکە پەیوەندی بە ئاشتییەوە هەیە.

کەنەدی نامەکەی بە هەڕەشەیەك کۆتاییپێهێنا و وتی، ئەگەر ئیسرائیل وەلاٌمی داواکارییەکان نەداتەوە ئەوا لەئاییندەدا ئازار بە ئیسرائیل و خۆشگوزەرانییەکەی دەگەیێنێت.

لە رۆژی یەك شەمە ١٦ی حوزەیرانی ١٩٦٣ نامەکەی سەرۆك کەنەدی گەیشتە سەفارەتی ئەمریکا لە ئیسرائیل، بەلاٌم سەفیری ئەمریکا لە ئیسرائیل نامەکەی نەگەیاندە دەست بن کوریون، لەبەرئەوەی زانیاری پێگەیشتبوو کە ناوبراو لەو رۆژەدا بڕیاریداوە واز لە سەرۆکی حکومەت بهێنێت. دوای ئەوەی ئەشکۆڵ هاتە شوێنی بن گۆریۆن و کابینەی حکومەتی ئیسرائیلی پێکهێنا و وەزارەتی بەرگریشی لە دەستی خۆیدا هێشتەوە، سەرۆك (کەنەدی) لە ٥ی تەموزی ١٩٦٣ هەمان نامەی پێشتری کە بۆ بن گۆریۆن ناردبوو ئاراستەی ئەمیشی کرد، بەلاٌم لە نامەگۆڕینەوە و پەیوەندی نێوان ئەشکۆڵ و سەرۆك کەنەدی دەردەکەوێت کە ئەمیش لە بن گۆریۆن کەمترنەبووە لە دەستگرتن بە پرۆژە ئەتۆمییەکەی دەیمونە و لەویش کەللەڕەقتر بووە، سەبارەت بە سەردانیکردنی زانا ئەمریکاییەکان بۆ کۆمەڵگاکە، بەلاٌم ئەشکۆڵ زیاتر دیپلۆماسی و کەمتر

ڕووبەڕووبوونەوەی هەبوو. ئەشکۆڵ لەڕێگای پەیوەندی و نامەگۆڕینەوەکانیەوە جەختی لەسەر هەمان قسەکانی بن گۆریۆن دەکردەوە کە کوورە ئەتۆمییەکانی دەیمونە بۆ مەبەستی ئاشتییە. لەهەمانکاتدا داواکەی سەرۆك کەنەدی ڕەتکردەوە کە سەرۆك سوربوو لەسەری ئەویش سەردانی زاناکان بوو بۆ کۆمەڵگاکە لەهاویندا و پێشنیاریکرد کە سەردانەکە بخرێتە کۆتایی ساڵی ١٩٦٣.

لە تەموزی ١٩٦٣ دەرکەوت بۆ ئیدارەی ئەمریکی کە کۆمەڵگای ئەتۆمییەکە بەرەوە بەدەستهێنانی چەکی ئەتۆمی دەڕوات [١١] و لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٣ یان سەرەتای ١٩٦٤ کوورەکان دەکەونەکار لەگەڵ ئەوەشدا سەرۆك کەنەدی نەیتوانی ئامانجەکەی بەدیبێنێت بەوەی کۆمەڵگاکە بخاتەژێر چاودێری ئەمریکاوە و نەیشیتوانی ئەو داوایەش بەدیبێنێ کە بەردەوام داوایدەکرد لە بن گۆریۆن و ئەشکۆڵ کە دیاریکردنی وادەیەك بوو لە هاوینی ١٩٦٣ بۆ سەردانی زانا ئەمریکییەکان. لە ١٢ی تشرینی ١٩٦٤ لە قۆناغێکی زۆر هەستیاریدا لەبەرەوپێشچوونی پرۆژە ئەتۆمییەکەی ئیسرائیل و نزیکبوونەوەی وادەی ئیشپێکردنی کوورە ئەتۆمییەکانی کۆمەڵگای دەیمونە و وەستانی دانووسانەکانی دیارینەکردنی کاتێك بۆ سەردانی زانا ئەمریکییەکان بۆ کۆمەڵگاکە سەرۆك (جۆن کەنەدی) تیرۆرکرا. دەستبەژێری سیاسی و ئەمنی ئیسرائیل هەناسەیەکی قووڵیان هەڵکێشا کە ئەم موعجیزەیە لەگونجاوترین کاتدا بوو بۆ ئیسرائیل.

چونکە سەرۆکێکی ئەمریکی لە شانۆی ڕووداوەکاندا نەما کە نەك تەنیا هەوڵی دەدا لە ساڵی ١٩٦٣ چاودێری بۆ پرۆژە ئەتۆمییەکە دابنێ بەڵکو ئیسرائیل دەترسا بەهۆی فشارەکانیەوە تەواوی پرۆژەکە رابگرێ، یان بەتەواوی هەڵیبوەشێنێتەوە ئەوەی زیاتر دەستەبژێری ئیسرائیلی دڵخۆشدەکرد جێگرەکەی کەنەدی (لیندن جۆنسون) بوو کە دەبوو بە جێگرەوەی کەنەدی لە سەرۆکایەتی وڵاتە یەکگرتووەکان لەبەرئەوەی بەوەناسرابوو پشتگیری و سۆزداریەکی زۆری بۆ ئیسرائیل هەیە، هاوکات پەیوەندییەکی بەهێزیشی لەگەڵ لۆبی ئیسرائیلیدا هەیە لە وڵاتە یەکگرتووەکان.

**یاداشتی لێکتێگەیشتنی نێوان ئەشکۆڵ و جۆنسون:**

قۆناغی گواستنەوە و خۆسازاندنی سەرۆك جۆنسون لەگەڵ پلەوپایە تازەکەیدا پێویستی بە کات هەبوو، بۆئەوەی ئاگاداری دۆسیەی ئەتۆمی ئیسرائیل بێت، ئەو ماوەیە کاتێکی گرنگی رەخساند بۆ سەرۆکوەزیران ئەشکۆڵ بۆئەوەی بەردەوامبێت لە بونیادنانی پرۆژە ئەتۆمییەکە و رێکخستنی کارەکانی خۆشی لەگەڵ سەرۆکە تازەکەدا. هەردوو سەرۆك نامە گۆڕینەوە و پەیوەندییان هەبوو پێش ئەوەی جۆنسون داواتنامەیەکی فەرمی ئەمریکی ئاراستەی سەرۆکوەزیرانی ئیسرائیل بکات بۆ سەردانی واشنتۆن.

نەرمینواندن و لێکتێگەیشتن شەقڵی نامەکانی جۆنسۆن بوو سەبارەت بە پرۆژەی ئەتۆمی ئیسرائیل، بۆیە زۆر جیاواز بوو لە نامە و هەڵوێستەکانی سەرۆك کەنەدی.

لە ١ی حوزەیرانی ١٩٦٣ لە یەکەم کۆبوونەوەی لەگەڵ ئەشکۆڵ لە واشنتۆن، جۆنسون نەرمییەکی زۆری نواند بەرامبەر پرۆژە ئەتۆمییەکەی ئیسرائیل و هیچ جۆرە فشارێکی لەورووەوە بەرامبەر میوانەکەی نەنواند، سەرەڕای بەردەوامیی دانووسانەکانی نێوان ئیدارەی ئەمریکی و ئیسرائیل سەبارەت بە پرۆژەکە و خستنەژێر چاودێری ئەمریکی و سەردانی زانا ئەمریکییەکان بۆ کۆمەڵگاکە، بەلاّم ئەشکۆڵ سووربوو لەسەر هەڵوێستەکانی ئیسرائیل و رایگەیاند گەورەترین شتێك کە ئیسرائیل پێیبکرێت ئەوەیە ئیسرائیل یەکەم دەوڵەت نابێت چەکی ئەتۆمی بێنێتە ناوچەکەوە.

لە ١٠ی ئازاری ١٩٦٥ ئیسرائیل و ولاّتە یەکگرتووەکان یاداشتنامەیەکی لێکتێگەیشتنیان ئیمزاکرد، هەردوولا رێکەوتن لەسەر پاراستنی ناوەڕۆکی یاداشتەکە بەنهێنی، یاداشتەکە کە پێکهاتبوو لە پەیوەندییەکانی نێوان ئیسرائیل و ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و پابەندیی ئەمنی ولاّتە یەکگرتووەکان بەرامبەر بە ئیسرائیل، بەلاّم گرنگترین شتێك کە تیایداهاتبوو بریتیبوولە چۆنیەتی لێکتێگەیشتن سەبارەت بە پرۆژە ئەتۆمییەکەی ئیسرائیل، کە ئیسرائیل پابەندیی خۆی راگەیاند بەوەی دەستپێشخەرنابێت لەهێنانەناوەوەی چەکی ئەتۆمی بۆ ناوچەکە.

بەمشێوازە ڕێکەوتنەکە ئیسرائیلی ئاسوودەکرد و گەیشت بەو ئامانجەی کە لەو قۆناغەدا ئارەزوویدەکرد، بەتایبەتی ڕێکەوتنەکە هاوپێچکرابوو بە نامەیەکی ئیسرائیل بۆ ئیدارەی ئەمریکا کە پێکهاتبوو لە کۆمەڵێ دەستەواژەی گشتی کە هیچ پابەندییەکی ئیسرائیلی تیادانەبوو سەبارەت بە پرۆژە ئەتۆمییەکە.

بەمچەشنە ئیسرائیل ڕێگەی بۆ کرایەوە بۆ بەردەوامبوون لەپێشخستنی پرۆژە ئەتۆمییەکە و لەهەمانکاتدا ڕێگاینەدا بەوەی کە کۆمەڵگاکە بخرێتەژێر چاودێری ئەمریکی یان نێودەوڵەتی، تەنیا ڕێگەی بەوەدا زانا ئەمریکییەکان ناوبەناو سەردانی کۆمەڵگاکە بکەن بێئەوەی ڕێگەیان پێبدرێ لەبەشەکاندا زۆر بمێننەوە، و ڕێگەشیان پێنەدرابوو هەموو دامەزراوەکانی کۆمەڵگاکە بگەڕێن.

### تێگەیشتنی نێوان گۆڵدا مائیر و نیکسۆن:

دوای بونیادنانی کۆمەڵگای ئەتۆمی دەیمونە، ئەو پرسیارەی ساڵەکانی شەستەکان کۆتاییهات کە سەرکردایەتی ئیسرائیل هەوڵی چارەسەرکردنیدەدا کە بریتیبوولەوەی ئایا ئیسرائیل چەکی ئەتۆمی بەرهەمدەهێنێت؟

ئەم پرسیارە پەیوەندییەکی توندی هەبوو بە دانووسانەکانی سەرۆکی حکومەتی ئیسرائیل ئەشکۆڵ لەگەڵ ئیدارەی ئەمریکاو ئەو لێکتێگەیشتنە نهێنییانەی کە دەکرا لەنێوان هەردوو سەرکردایەتیدا.

لە ساڵی ١٩٦٥ ئەشکۆڵ ئەوەی درکاندبوو لای کەسە نزیکەکانی خۆی کە سێ ئەگەر سەبارەت بە بارودۆخی ئەتۆمی ئیسرائیل لەئارادایە:

**یەکەم:** بۆمبێکی ئەتۆمی لەگەنجینەدایە و ئامادەیە بۆ بەکارهێنان.

**دووەم:** پێکهاتەکانی بۆمبێکی ئەتۆمی ئامادەیە بۆ بەستن.

**سێیەم:** بەردەوامبوون لە گەشەپێدانی پرۆژە ئەتۆمییەکەی لەبواری توێژینەوە وەك سەرەتایەك بۆ هەر بڕیارێکی ئایندەیی.

بەلاّم وادەرکەوت دانووسانەکانی ئەشکۆلّ لەگەلّ جۆنسون بوو بەهۆی دواخستنی بڕیاری ئیسرائیل بۆ دروستکردنی چەکی ئەتۆمی لەبەرامبەر ئامادەیی ولاّتە یەکگرتووەکان بەپێدانی چەکی هێرشبەری نوێی تەقلیدی بە ئیسرائیل، لەم رووەوە ئیسرائیل (٤٨) فرۆکەی جۆری (سکای هۆك)ی لە ئەمریکا وەرگرت کە توانای هەلّگرتنی بۆمبی ئەتۆمی هەبوو(١٣) لە حوزەیرانی ١٩٦٨ کاتێك هەوری جەنگ ناوچەکەی داپۆشیبوو ئیسرائیل بۆمبی ئەتۆمی سەرەتایی حازرکرد بۆ بەکارهێنان، وەك دوابژاردە ئەگەر ئیسرائیل رووبەڕووی شکستهێنانی سەربازی بووەوە لەو جەنگەدا.[١٤]

دوای سەرکەوتنی ئیسرائیل لەجەنگەکەدا و بەهێزبوونی پێگەی هەرێمی و نێودەولّەتی و رەوینەوەی ئەو بەناو مەترسییەی کە لەسەری بوو، لە سەرەتای سالّی ١٩٦٨ دەستیکرد بەخستنەکاری کۆمەلّگای دەیمونە بەتەواوی تواناکانیەوە بۆ دروستکردنی چەکی ئەتۆمی، هەر لەو سالّەدا توانی ٤- ٥ بۆمبی ئەتۆمی دروستبکات. لە ٢٠ی کانونی دووەمی ١٩٦٩نیکسۆن وەك سەرۆکی ولاّتە یەکگرتووەکان هەلّبژێردرا بۆ شوێنەکەی جۆنسون، هینری کسنجەریش دامەزرا بە راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی، لە ئیسرائیلیش دوای دوو مانگ مائیر هاتەشوێنی ئەشکۆلّ لە سەرۆکایەتی حکومەتدا، هەلّوێستی ولاّتە یەکگرتووەکانیش سەبارەت بە مەسەلەی دەستخستنی چەکی ئەتۆمی لەلایەن ئیسرائیلەوە بەتەواوی فۆرمەلە بوو و سەرۆك نیکسۆن رەزامەندی لەسەر پیشاندا. کیسنجەریش پێش ئەوەی ببێت بە راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی پشتگیری خۆی بۆ بەدەستهێنانی چەکی ئەتۆمی لەلایەن ئیسرائیلەوە دەربڕیبوو.

پشتگیرییەکەی کیسنجەر لای دەستەبژێری سیاسی و ئەمنی ئیسرائیل زانراوبوو، چونکە پێشتر سەردانی ئیسرائیلی دەکرد و چەندینجار وانەی لە کۆلێژی ئاسایشی نەتەوەیی سەربازی ئیسرائیلی وتبووەوە، لە یەکێك لە یاداشتەکانی کیسنجەر بۆ سەرۆك ئاماژەی بەوە دەدات[١٦] کە لەکاتی دانووسانەکانی نێوان ئیسرائیل و ئیدارەی جۆنسون لە تشرینی دووەمی ١٩٦٨ سەبارەت بە فرۆشتنی فرۆکەی (فانتۆم) بە ئیسرائیل سەفیری ئیسرائیل لە واشنتۆن (ئیسحاق رابین) جەختی لەپابەندێتی ئیسرائیل کردەوە بەوەی یەکەم

دەوڵەت نابێت چەکی ئەتۆمی بهێنێتە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و زیاتر دەڵێت:

بەپێی ئەو زانیارییانەی لای ئیدارەی ئەمریکی هەبوو پرۆژەکەی ئیسرائیل پابەندێتی ئیسرائیل بەنەخستنە ناوەوەی چەکی ئەتۆمی بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست تێپەڕاندبوو، بۆیە دەبوو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمیرکا بڕیاربدات، ئایا ڕێکەوتنی (فانتۆم) هەڵوەشێنێتەوە یان جێبەجێیبکات، بە کۆمەڵێ مەرجی دیاریکراوەوە ئەگەرچی ئیسرائیل پابەندییەکەی شکاندبوو بەوەی یەکەم دەوڵەت نابێت کە چەکی ئەتۆمی بهێنێتە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.(١٧)

لەڕاستیدا ئەو بڕیارەی پێویستبوو ئەمریکا بیدات سەبارەت بە ئیسرائیل گەورەتر بوو لە ڕێکەوتنی پێدانی (فانتۆم)، بۆیە پێویستبوو ئیدارەی ئەمریکا بە سیاسەتی خۆیدا بچێتەوە سەبارەت بە پرۆژە ئەتۆمییەکەی ئیسرائیل، ئەمەش ناوەڕۆکی یاداشتەکەی کیسنجەر بوو بۆ سەرۆك نیکسۆن.

کیسنجەر لەیاداشتەکەیدا ئەوەی خستەڕوو کە وڵاتە یەکگرتووەکان ناتوانێت ئیسرائیل ناچاربکات پرۆژە ئەتۆمییەکە ڕاگرێت، هەروەها ناشتوانێت ناچاریبکات بۆمبە ئەتۆمییەکانی پووچەڵبکاتەوە لەسەر ئەم بنەمایە کیسنجەر پێشنیاری ئەوەی کرد کە سیاسەتی وڵاتە یەکگرتووەکان سەبارەت بەم مەسەلەیە بریتیبێتلە جیاکاری لەنێوان خاوەندارێتی ئیسرائیل بۆ چەکی ئەتۆمی بەشێوەیەکی ئاشکرا و خاوەندارییەکەی بەشێوەیەکی نهێنی و ئاماژەشی بۆئەوەکرد کە بەدەستهێنانی چەکی ئەتۆمی لەلایەن ئیسرائیلەوە مەترسییەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست گەورەتردەکات، بەڵام وڵاتە یەکگرتووەکان ناتوانێت ئیسرائیل لە چەك دابماڵێت و ناشتوانێت پرۆژە ئەتۆمییەکەی پێڕابگرێت، بۆیە پێویستە سیاسەتی ئەمریکا سەبارەت بەم مەسەلەیە بریتیبێتلە پارێزگاریکردن لە نهێنی بەدەستهێنانی چەکی ئەتۆمی لەلایەن ئیسرائیلەوە، ئەم جیاکارییە کە کیسنجەر دایهێنا لە بەدەستهێنانی چەکی ئەتۆمی بەئاشکرا و بەدەستهێنانی بە نهێنی، زەمینەی لێکتێگەیشتنی مێژووی ڕەخساند لەنێوان سەرۆك نیکسۆن و سەرۆکی حکومەتی ئیسرائیل(مائیر).(١٨)

له ٢٥-٢٦ی ئەیلول ١٩٦٩ له کۆشکی سپی گولْدا مائیر و نیکسۆن کۆبوونەوه،و پرۆژه ئەتۆمییەکەی ئیسرائیل لایەنێکی گرنگی کۆبوونەوەکه بوو، لەو کۆبوونەوەیەدا مائیر فاکتەرەکانی ئیسرائیل بۆ گەشەپێدانی پرۆژه ئەتۆمییەکەی روونکردەوه و رایگەیاندا ئیسرائیل خاوەنی چەکی ئەتۆمییه. هۆکارەکانی رەدکردنەوەی واژۆکردنی پەیماننامەی قەدەغەکردنی بلاْوکردنەوەی چەکی ئەتۆمی NPTی خستەڕوو، کۆبوونەوەکه به تێگەیشتننامەیەکی نهێنی زارەکی زۆر گرنگ کۆتاییهات، تیایدا سەرۆك نیکسون پابەندی خۆی له وەستاندنی فشارەکانی لەسەر ئیسرائیل راگەیاند لەبەرامبەر هاندانی ئیسرائیل بۆ واژۆکردنی پەیماننامەی قەدەغەکردن و هەروەها وەستاندنی سەردانی زانا ئەمریکییەکان بۆ چاودێری کۆمەڵگای دەیمونه، لەبەرامبەردا ئیسرائیل پابەندبوو به رانەگەیاندنی بەدەستهێنانی چەکی ئەتۆمی و ئەنجامنەدانی تاقیکردنەوه ئەتۆمییەکان.(١٩)

## تازەکردنەوەی لێکتێگەشتنی ئەتۆمی – لەگەڵ هەموو سەرۆکێکی هەڵبژێراوی ئەمریکادا

هەمیشه ئیسرائیل لەو ئیدارەیه دەترسا که شوێنگرەوەی ئیدارەی نیکسۆن دەبێت و پابەندنەبێت به لێکتێگەیشتنەکەی مائیر- نیکسۆنەوه سەبارەت به هەلومەرجی ئەتۆمی ئیسرائیل، بەتایبەتی ئەم لێکتێگەیشتنه لەڕووی یاساییەوه مولزەمنەبوو بۆ ئیدارەی دواتر، سەرەڕای ئەوەش بەشێکی زۆری ئەو سەرۆکانەی پاشتر دەهاتنەسەر ئیدارەی ئەمریکی بەرنامه و ئامانجی سنووردارکردنی چەکی ئەتۆمیان لەجیهاندا هەبوو، ئەمەش لەناواخنیدا ئەگەری کردنەوەی مەسەلەی ئەتۆمی ئیسرائیلی دەهێنایەئاراوه، بۆیه هەموو سەرۆك حکومەتەکانی ئیسرائیل راهاتبوون لەسەر تازەکردنەوەی ئەو لێکتێگەیشتنه لەگەڵ هەموو سەرۆکه تازەکاندا و بەردەوامبوون لەسەر سیاسەتی شاردنەوەی ئەتۆمی.

له چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەگەریدا (عۆزی ئارا) سەرۆکی پێشووتری ئەنجومەنی

ئاسایشی ئیسرائیلی و راوێژکاری سەرۆکی حکومەتی ئیسرائیل (بنیامین ئەتەنیاهۆ) ئەوەی روونکردووەتەوە کە چۆن ئیسرائیل راهاتبوو لەسەر تازەکردنەوەی ئەو لێکتێگەیشتنە لەگەڵ هەموو سەرۆکەکانی ئەمریکادا لە سەردەمی جیراڵ فۆردەوە تا سەردەمی باراك ئۆباما [٢٠]، عۆزی ئارا دەڵێت: کاتێك سەرۆك فۆرد هاتەشوێنەکەی نیکسۆن هیچ کێشەیەك لەئارادانەبوو لەبەردەوامبوون لەسەر ئەم لێکتێگەیشتنە، بەلاّم ساتەوەختێك سەرۆك جێمی کارتەر هاتەشوێنی سەرۆك فۆرد و بریجنسکی دامەزرا بە راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی دڕدۆنگییەکی زۆری لەئیسرائیلدا هەبوو سەبارەت بەپارێزگاریکردن لەم لێکتێگەیشتنە، بەلاّم گومانەکان لە شوێنی خۆیدا نەبوون، هەروەها هیچ کێشەیەك نەهاتەپێش لە سەردەمی رۆناڵد ریگاندا.

بەلاّم بە هەڵبژاردنی سەرۆك جۆرج بۆشی باوك و دەستپێشخەرییەکەی سەبارەت بە چەك داماڵینی ئەتۆمی لە رۆژهەلاّتی ناوەڕاستدا، جارێکیتر گومانەکان گەڕایەوە بۆ ئیسرائیلییەکان. بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەم مەسەلەیە حکومەتی ئیسرائیل لیژنەیەکی وەزاری لە نوێنەری دەزگا ئەمنییەکانی ئیسرائیل بە سەرۆکایەتی جەنەراڵ داڤید عەفری پێکهێنا دوای هەوڵێکی زۆر توانییان شکست بەو دەستپێشخەرییەی سەرۆك بۆش بهێنن کە تایبەتبوو بە چەکداماڵینی ئەتۆمی لە رۆژهەلاّتی ناوەڕاستدا، بەلاّم کێشەکە کۆتاییپێنەهاتبوو، چونکە رێککەوتنەکە زارەکیبوو، لە تشرینی ١٩٨٨و لە سەروبەندی کۆنگرەی وای بلانش سەرۆکی حکومەتی ئیسرائیل بنیامین نەتنیاهۆ دانووسان و سازشەکانی لەگەڵ سەرۆك کلینتۆن و رازیبوونی بە واژۆکردنی رێکەوتن لەگەڵ فەلەستینییەکانی قۆستەوە لەپێناو بەدەستهێنانی دەستکەوتێکیتر لە بەرژەوەندی ئیسرائیل کە راستەوخۆ پەیوەندی بە مەسەلەی فەلەستینەوە نەبوو، ئەویش مەسەلە ئەتۆمییەکەی ئیسرائیل بوو. لەڕاستیدا نەتەنیاهۆ توانی بەڵێنێکی نووسراوی ئەمریکی بەدەستبهێنێت کە تیایداهاتبوو ولاّتە یەکگرتووەکان لەهەر دەستپێشخەرییەك پەیوەندی بە داماڵینی چەکی ئەتۆمییەوە هەبێت لە رۆژهەلاّتی ناوەڕاست توانای بەرپەچدانەوەی ئیسرائیل لاوازناکات.. شتێکی دیاریشبوو مەبەست لە توانای بەرپەچدانەوەی ئیسرائیل، چەکی

ئەتۆمی ئیسرائیله.

لەوڕووەوە و لە ئایاری ٢٠٠٨ دوای وەرگرتنی دەسەڵات لەلایەن هەردوولاوە چەندین پەیوەندی لەنێوان سەرۆکی حکومەتی ئیسرائیل بنیامین نەتەنیاهۆ و سەرۆك ئۆباما ئەنجامدرا سەبارەت بە لێکتێگەیشتنی هەردوولا، لە ئەنجامی چەندین مانگ لە پەیوەندی و دانووسان سەرۆك ئۆباما دیکۆمێنتێکی نووسراوی لە ٢٠١٠دا واژۆکرد بەوەی ولاّتە یەکگرتووەکان هیچ هەنگاوێکی سیاسی نانێت ببێتەهۆی زیانگەیاندن بە توانای بەرپەچدانەوەی ئیسرائیلی.[٢١]

**گەنگەشەی ناوخۆیی سەبارەت بە سیاسەتی نهێنیکاری ئەتۆمی:**

بۆ پێنج دەیە دەچێت حکومەتەکانی ئیسرائیل دەستیانهەڵنەگرتووە لە سیاسەتی ئەتۆمی و تائیستاش نیمچە کۆدەنگییەك لە ناوەندی سیاسی و عەسکەریدا هەیە لەسەر پێویستی بەردەوامبوون لەدەستگرتن بەم سیاسەتەوە تائاییندەیەکی دیار، لەبەرئەوەی تەنیا ئیسرائیلە لەناوچەکەدا قۆرغی چەکی ئەتۆمی کردووە. لەگەڵ ئەوەشدا لەئیستادا و رابردووشدا چەندینساڵیشە لەئیسرائیلدا گەنگەشەیەکی زۆر دەکرێت لە ناوەندە ئەکادیمییەکان و لەنێوان شارەزایان و توێژەران و گەورە رۆژنامەنووسەکانی ئیسرائیل سەبارەت بەو سیاسەتە.

لەم گەنگەشەیەدا پشتگیری و بەرگری لە سیاسەتی نهێنیکاری ئەتۆمی دەکات. تێڕوانینی هەردوو دامەزراوەی سیاسی و سەربازی ئیسرائیل بەتوندی پشتگیری لێدەکەن و رەخنەش لە تێڕوانینەکانیتریش دەگرن کە تەنیا پشتگیری ژمارەیەکی کەم لە توێژەران و لێکۆڵەرانی هەیە کە داوادەکەن سیاسەتی بەرپەچدانەوەی ئاشکرا شوێنی سیاسەتی نهێنی بگرێتەوە.

**١. هەڵوێستی لایەنگرانی سیاسەتی بەرپەچدانەوەی ئاشکرای ئەتۆمی ئیسرائیلی**

باشترین کەسێك کە گوزارشتی لە تێڕوانینی گرتنەبەری سیاسەتی بەرپەچدانەوەی

ئەتۆمی ئیسرائیل کردبێت، توێژەری ئیسرائیلی شای فیلدمانە لە کتێبی (بەرپەچدانەوەی ئەتۆمی ئیسرائیل).(٢٢)

فیلدمان لەکتێبەکەیدا داوای دوو کاری بنەڕەتی دەکات:

**یەکەم:** وازهێنان لە سیاسەتی شاردنەوەی ئەتۆمی و گرتنەبەری سیاسەتی بەرپەچدانەوەی ئەتۆمی.

**دووەم:** داوادەکات سیاسەتی بەرپەچدانەوەی ئاشکرای ئەتۆمی ئیسرئیل بکرێتە پێکهاتەی مەرکەزی لە تیۆریای ئاسایشی ئیسرائیل وەك ئەلتەرناتیڤی چەکی سەربازی تەقلیدی، فیلدمان پێشنیاریکرد سیاسەتی بەرپەچدانەوەی ئاشکرای ئەتۆمی پشتبەستوویێت بەهەڕەشەکردن بەلێدانی کۆمەلە ئامانجێك کە بەهایەکی بالایان هەیە، واتە هەڕەشەکردن بەوێرانکردنی شارە عەرەبییە گەورەکان لە ولاتە عەرەبییەکاندا و سەرەڕای وێرانکردنی بەنداوە گەورەکانیش لەو ولاتانەدا. ئەمەش بەمەبەستی بەرپەرچدانەوەی ولاتە عەرەبییەکان کە نەتوانن شەڕ دژ بە ئیسرائیل هەلگیرسێنن یان بەرپەچدانەوەیان لە ئەنجامدانی پرۆسەی سەربازی بەرفراوان دژ بە ئیسرائیل.

ئەگەر ولاتێکی عەرەبیی یان چەند ولاتێکی عەرەبیی بیر لەهێرشکردنەسەر ئیسرائیل بکەنەوە یان هەستن بەئەنجامدانی پرۆسەگەلی بەرفراوان دژ بە ئیسرائیل، ئەوە بیشوەخت دەزانن خۆیان رووبەڕووی توندترین سزای ئەتۆمی دەکەنەوە. فیلدمان بەلگە بەو بۆمبە ئەتۆمیيانە دەهێنێتەوە کە لە کۆتایی حەفتاکاندا لە دەستی ئیسرائیلدا بوو کە نزیکەی ٤٠ بۆمی ئەتۆمی بوو و لەتوانایدابوو کۆمەلە ئامانجێکی مەدەنی بەها و بالا لەو ولاتە عەرەبییانە وێرانبکا. لەهەر ولاتێکی عەرەبیدا ٣-٤ شاری گەورە هەیە کە بەهای ئیستراتیژی بالایان هەیە، وێرانکردنی ئەو شارانە دەبووە هۆی قەلاچۆکردنی لە ٣٠٪ کۆی دانیشتوانی هەریەك لەو ولاتانە.

فیلدمان ئەو شارانەشی دیاریکردبوو کە رووبەڕووی لێدانی بۆمبی ئەتۆمی دەبنەوە بەمشێوەیە:

لە میسر: قاهیرە و ئەسکەندەرییە، جیزە، ئەسوان.

لە سوریا: دیمەشق و حەلەب و حمس.

لە عێراق: بەغداد و بەسرە و موسڵ.

لە سعودییە: ریاز، جەدە، مەککە، تائیف.

لە ئوردن: عەمان، زەرقا، ئیربد.

لە لیبیا: تەرابلوس و بەنگازی.

پاشان فیلدمان باسی کارە لەپێشینەکانی ئیسرائیل دەکات و دەڵێت: ئەم شارانە زۆر گرنگە بۆئەو وڵاتانە، چونکە دەستەبژێری بازرگانی و پیشەسازی و تەکنەلۆژی و فیکری و سەربازی و سیاسی دەکەونە گەڕەکە تایبەتەکانی ئەو شارە گەورانەوە و لەتواناشدا هەیە بەئاسانی ئەو گەڕەکانە دیاریبکرێت و بخرێنە لوتکەی ئامانجە بنەڕەتییەکانی بۆمبە ئەتۆمییەکان بۆئەوەی بەتەواوی وێرانبکرێن، ئەوەش نەك تەنیا دەبێتەهۆی قەلاچۆکردنی ٣٠٪ کۆی دانیشتووانی ئەو وڵاتانە، بەڵکو دەبێتە هۆی وێرانکردنی هەموو ئەو شتانەی پەیوەندییان بە پێشکەوتن و جیهانی نوێوە هەیە.(٢٣)

پاشان فیلدمان باسی باشیی سیاسەتی بەرپەچدانەوەی ئاشکرای ئەتۆمی دەکات:

**یەکەم: ئەم سیاسەتە راستگۆتر و روونترە و کاریگەرترە لە سیاسەتی پەنهانی.**

**دووەم:** ئەم سیاسەتە بیروباوەڕی بەکارهێنانی چەکی ئەتۆمی دەهێنێتەئاراوە، ئەوەش رووبەڕووی بەکارهێنانی چەکی ئەتۆمی بەشێوەیەکی نەگونجاو حیساب بۆنەکراو تەسکدەکاتەوە.

**سێیەم:** دەبێتەهۆی هاندانی دەستەبژێری دەسەڵاتدار لە وڵاتە عەرەبییەکان بۆئەوەی دایەلۆگێکی ستراتیژی لەگەڵ ئیسرائیلدا ئەنجامبدەن. ئەمەش دەبێتەهۆی گەیشتن بە کۆمەلە لێکتێگەیشتنێك بۆئەوەی دەستەبژێری دەسەڵاتدار هەنگاوبنێت بۆ خۆپاراستن لە گورزی ئەتۆمی.

**چوارەم:** بەرپەرچدانەوەی ئاشکرای ئەتۆمی رۆڵیدەبێت لە رۆشنبیریکردنی دەستەبژێری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بۆ چۆنیەتی ژیانکردن لە ژینگەیەکی ئەتۆمیدا، یارمەتیدەریش

دەبێت بۆ دروستکردنی ڕێگری لەبەردەم ئامانجە سیاسییەکانی لایەنی بەرامبەر و لە ئەگەری بەجێهێنانی.

بۆیە داوایکرد و بەردەوامیش داوا لە توێژەرانی ئیسرائیل دەکات بۆ گۆڕینی سیاسەتی نهێنی ئەتۆمی بۆ سیاسەتی ئاشکرای ئەتۆمی، ئەمەش لەچەند ڕوویەکەوە جیاوازە، هەندێك هۆکارەکان ئابوریيە، هەندێکیتر پەیوەندیدارە بە بەرنامەی ئەتۆمییەکەی ئێرانەوە و ئەگەری دەستختنی چەکی ئەتۆمی لە زەمەنێکی چاوەڕواننەکراودا. هەندێکیتریش لە هۆکارەکان دەگەڕێنێتەوە بۆ مەسەلەی لانیکەمی شەفافییەت و چاودێری پرۆژە ئەتۆمییەکە و دیاریکردنی بەرپرسیارێتی لەو پرۆژەیە و چۆنیەتی دروستکردنی بڕیار سەبارەت بەو مەسەلەیە.

**بە کورتی دەکرێت هۆکارەکان ئەمانەی خوارەوە بێت:**

* سەرەڕای سیاسەتی نهێنیکاری ئەتۆمی ئیسرائیل، ولاَتانی ڕۆژهەلاَتی ناوەڕاست و جیهان وەك ولاَتێکی ئەتۆمی لە ئیسرائیل دەڕوانن، لەبەرئەوە گرتنەبەری سیاسەتی ئاشکرای ئەتۆمی هیچ شتێك لە مەسەلەکە سەبارەت بە ئیسرائیل ناگۆڕێت.

* گرتنەبەری سیاسەتی ئاشکرای ئەتۆمی دەبێتە هۆی بەهێزکردنی بەرگری ناوخۆی لەئیسرائیلدا، کەمکردنەوەی قەیرانی نیگەرانی ئیسرائیل بەوەی ڕۆژێك لەڕۆژان عەرەبەکان بە چەکی تەقلیدی هێرشدەکەنەسەر ئیسرائیل.

* سیاسەتی ئاشکرای ئەتۆمی نەبوو بەهۆی ڕێگرتن لە هەولّەکانی زۆرێك لە ولاَتانی ڕۆژهەلاَتی ناوەڕاست بۆ بەدەستهێنانی چەکی ئەتۆمی.

* سیاسەتی ئاشکرای ئەتۆمی ڕۆلّیدەبێت لە سووکردنی قورسایی ئەو بودجە زەبەلاحەی ئاسایش کە ئاراستەدەکرێت بۆ بەرزکردنەوەی تواناى سەربازی ئیسرائیلی بە چەکی تەقلیدی، ئەمەش دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی پشتبەستن بە چەك و پشتگیریی دارایی ئەمریکا.

* گرتنەبەری سیاسەتی ئاشکرای ئەتۆمی سەردەکێشێت بۆ دانانی یاسا و سیستمی

ئاشکرای پەیوەندیدار بە مەسەلەی ئەتۆمی لەهەموو روویەکەوە لەئیسرائیلدا، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە پرۆسەی دروستکردنی بڕیارەوە هەیە سەبارەت بە بەکارهێنانی چەکی ئەتۆمی.[٢٦]

**هەڵوێستی لایەنگرانی سیاسەتی نهێنیکاری ئەتۆمی ئیسرائیل:**

ئەوانەی پشتگیری سیاسەتی نهێنیکاری ئەتۆمی ئیسرائیل دەکەن و داوای دەستگرتن دەکەن بەو سیاسەتەوە، لەبەرئەوەی تەنیا ئیسرائیل لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست قۆرغی چەکی ئەتۆمی کردووە.

دەکرێت بەکورتی هۆکارەکانی هەوادارانی سیاسەتی نهێنیکاری لەم خاڵانەی خوارەوەدا بخەینەڕوو.[٢٧]

* سیاسەتی پەنهانی ئەتۆمی پێگەیەکی تایبەت دەبەخشێتە ئیسرائیل لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی، هەتاوەکو ئیسرائیل دەستبەرداری ئەم سیاسەتە نەبێت و خۆی رانەگەیەنێت وەك دەوڵەتێکی ئەتۆمی، تاقیکردنەوەی ئاشکرای ئەتۆمی ئەنجامنەدات، بە دەوڵەتێکی ئەتۆمی ناژمێردرێت.

بەلاّم ئەگەر سیاسەتی ئەتۆمی ئاشکرا سەلمێنرا، بەبێ هەماهەنگی تەواو لەگەڵ ولاّتەیە کگرتووەکانی ئەمریکا و بەبێ رەزامەندی ئەمریکا، ئەوا زیانێکی گەورە بە پەیوەندییەکانی ئیسرائیل و ئەمریکا دەگەیێنێت، ئەوکاتە وادەردەکەوێت ئیسرائیل سووکایەتی بە سیاسەتی ولاّتە ئەکگرتووەکان دەکات، سەبارەت بەرێگەگرتن لە بلاّوبوونەوەی چەکی ئەتۆمی، هەروەها زیان دەگەیەنێت بە هەوڵە نێودەوڵەتییەکان سەبارەت بە سنووردارکردنی بلاّوبوونەوەی چەکی ئەتۆمی، بەتایبەت لە رۆژهەلاّتی ناوەڕاستدا.

* پارێزگاریکردن لە پەنهانی سیاسەتی ئەتۆمی یارمەتیدەر دەبێت بۆ ئیسرائیل خۆی وادەردەخات بەرهەڵستی بلاّوبوونەوەی چەکی ئەتۆمی دەکات لە رۆژهەلاّتی ناوەڕاست، بەلاّم لەکاتی وازهێنانی ئیسرائیل لە سیاسەتی نهێنی ئەتۆمی و گرتنەبەری سیاسەتی

ئەتۆمی ئاشکرا، ئەوا دەرگا ئاوەڵادەبێت لەبەردەم دەستپێکردنی پێشبڕکێی خۆپڕچەککردنی ئەتۆمی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

* سیاسەتی نهێنی ئەتۆمی تواناکانی ئیسرائیلی بەهێزدەکات لە رووبەڕووبوونەوەی ئەو ولاتانەی رۆژهەلاتی ناوەڕاست کە لە هەوڵی بەدەستهێنانی چەکی ئەتۆمیدان، و ئاسانکاریکردن لەسەر بڕیاردانی زۆرێك لە ولاتە عەرەبییەکان بەتایبەت میسر کە بەرەو سیاسەتی پێشخستنی ئەتۆمی هەنگاوەنێن. لەبەرئەوە ئەو سیاسەتە کاریگەری هەبوو لەسەر گەنگەشەی ناوخۆیی لە بەرژەوەندی نوخبەی دەسەلاتدار کە بەرهەڵستی سیاسەتی گەشەپێدانی ئەتۆمیان دەکرد، بەلاَم ئەگەر ئیسرائیل سیاسەتی ئاشکرای ئەتۆمی بگرێتەبەر دەبێتەهۆی لاوازکردنی دەسەلاتی عەرەبی کە بەرهەڵستی بەدەستهێنانی چەکی ئەتۆمی دەکات و بەهێزکردنی فشاری ناوخۆیی عەرەبی بۆ بەدەستهێنانی چەکی ئەتۆمی بەجۆرێك نوخبەی دەسەلاتدار نەتوانێت بەرگەی بگرێت بەتایبەتی لەمیسردا.

* سیاسەتی بەرپەرچدانەوەی ئاشکرای ئەتۆمی ئەلتەرناتیڤی بالادەستی سەربازی ئیسرائیلی نییە لەبواری چەکی ئەتۆمیدا و نابێتەهۆی کەمکردنەوەی خەرجییە داراییەکان لەسەر چەکە تەقلیدییەکان و نابێتە رێگر لەبەردەم هەڵگیرسانی جەنگی تەقلیدی و رێگریشنابێت لە ئەنجامدانی پرۆسەی سەربازی سنووردار و پرۆسە تیرۆریستییەکان. لەبەرئەوە پێویستە ئیسرائیل بەردەوام پارێزگاریبکات لە بالادەستی خۆی لەبواری چەکی تەقلیدیدا لەبەرامبەر ولاتە عەرەبییەکاندا و ئامادەباشیش بکات بۆ هەر جەنگێك کە بە چەکی تەقلیدی دەکرێت.

* گرتنەبەری سیاسەتی بەرپەرچدانەوەی ئاشکرای ئەتۆمی، ئیسرائیل والیدەکات بەردەوام لە چاوەڕوانی یارمەتییە سەربازییە داراییەکانی ولاتە یەکگرتووەکاندا بێت، چونکە پێویستە هەمیشە پارێزگاری لە توانا بالاکانی خۆی بکات لەبواری چەکی سەربازی تەقلیدیدا ئەمەشی بۆنایەتەدی بەبێ یارمەتی سەخاوەتمەندانەی ئەمریکا لەبواری ئابوری و سەربازیدا.

* گرتنەبەری سیاسەتی بەرپەرچدانەوەی ئاشکرای ئەتۆمی فشارێکی زیاتر بەئاراستەی

تەرخانکردنی داهات و بودجەیەکی زیاتر بۆ بەردەوامبوون لەپێشخستنی چەکی ئەتۆمی و نوێکردنەوەیان و زۆرکردنیان بەتایبەتی ئەگەر یەکێك لە ولاّتەکانی ناوچەکە چەکی ئەتۆمی بەدەستهێنا.

* سیاسەتی ئاشکرای ئەتۆمی دەرگای خۆچەکدارکردنی ئەتۆمی لە ناوچەکە دەخاتەسەرپشت بۆ پارێزگاریکردن لە کاریگەرییەکەی دەبێت بەردەوام گەشە بەهەموو بوارە پێویستییەکان بدات کە بریتییەلە بەدواداچوونی بەردەوامی پێشکەوتنی تەکنەلۆژی و پێشخستنی هۆیەکانی بەرپەرچدانەوەی ئەتۆمی و پێشخستن و بەهێزکردنی تواناکانی گورزوەشاندنی دووەم.

* سەرەڕای سیاسەتی نهێنی ئەتۆمی ئیسرائیل، هەموو ولاّتە عەرەبییەکانی ناوچەکە درکیان بەوەکردووە کە ناتوانن ئەگەر لەتواناشیاندابێت شکستێکی گەورە بە چەکی تەقلیدی بەسەر ئیسرائیلیدا بهێنن، چونکە ئەم شکستە پالّ بەئیسرائیلەوە دەنێت چەکی ئەتۆمی بەکاربهێنیّ، ئەمەش گەورەترین پالّنەربوو بۆ ولاّتە عەرەبییەکان بۆئەوەی بەدوای رێگای ناسەربازیدا بگەڕێن بۆ گەیشتن بە رێکەوتن لەگەلّ ئیسرائیلدا.

* سیاسەتی نهێنی ئەتۆمی، ئەو بژاردەیەی داوە بە ئیسرائیل کە لەکاتی گونجاودا خۆی وەك دەولّەتێکی ئەتۆمی رابگەیێنێت، ئەوەش ئەگەر بۆیدەرکەوت تەرازووی هێزی سەربازی لە چەکی تەقلیدیدا بەشێوەیەکی خراپ دژ بە ئیسرائیلە و لە بەرژەوەندی ولاّتە عەرەبییەکانە و دەرگاش کراوەیە لەبەردەم ئیسرائیلدا بۆ خۆراگەیاندنی وەك دەولّەتێکی ئەتۆمی ئەگەر یەکێك لە دەولّەتەکانی ناوچەکە بوون بە دەولّەتی ئەتۆمی.

* سیاسەتی نهێنی ئەتۆمی تواناکانی (گورزوەشاندنی دووەم)ی ئیسرائیل بەهێزدەکات، لەکاتی رووبەڕووبوونەوەی هێرشێکی ئەتۆمی لەلایەن ئێرانەوە یان یەکێك لە ولاّتە عەرەبییەکانە و ئاشکراشە ئیسرائیل لە (گورزوەشاندنی ئەتۆمی دووەمدا) هەلّدەستێت بەلەناوبردنی ئەو دەولّەتەی یان ئەو دەولّەتانەی هێرشی ئەتۆمیان کردووەتەسەری.[٢٨]

**تواناکانی ئیسرائیل لە وەشاندنی گورزی ئەتۆمی دووەمدا:**

لەبەرئەوەی تەنیا ئیسرائیل لەناوچەکەدا قۆرغی چەکی ئەتۆمی کردوە و لەماوەیەکی چاوەڕوانکراودا هیچ شتێك لەئاسۆوە دەرنەکەوتوە دەوڵەتێکیتری رۆژهەلاتی ناوەڕاست بتوانێت چەکی ئەتۆمی بەدەستبهێنێت، بۆیە ئیسرائیل هەولێکی زۆری نەدابوو بۆ گەشەپێدانی تواناکانی لە وەشاندنی گورزی ئەتۆمی دووەمدا.

لە قۆناغی هەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی رابردوودا ئیسرائیل گرنگیدەدا بە جبەخانە ئەتۆمییەکەی و زیادکردنی بۆمبەکان و نوێکردنەوەی هۆکارەکانی گەیاندنی بۆمبە ئەتۆمییەکان بە ئامانجەکانیان لە ولأتە عەرەبییەکان لە رۆکێتی دوورهاوێژ، ئیسرائیل زیاتر سەرقاڵی قایمکردنی رۆکێتە دوورهاوێژەکان بوو کە لەتوانایدابوو کلاوەی ئەتۆمی هەڵبگرن، هەروەها قایمکردنی فرۆکەخانەکانی سەرەڕای زیادکردنی بەرهەمە ئەتۆمییەکان دژ بە هەر هێرشێك کە بە چەکی تەقلیدی بکرێتەسەری، بەلأم وەختێك ئیسرائیل بۆیدەرکەوت لەتوانادا هەیە یەکێك لە دەوڵەتاکانی ناوچەکە بەتایبەتی ئێران گەشە بە توانا ئەتۆمییەکانی بدات دەستیکرد بە بەهێزکردنی هەموو تواناکانی لەبواری وەشاندنی گورزی دووەمدا.

ئیسرائیل ئەو گریمانەیەی دانا کە نابێت لەوەشاندنی گورزی دووەمدا پشت ببەستێت بەبەرهەمە ئەتۆمییەکانی و رۆکێتەکانی و ئەو فرۆکانەش کە توانای وەشاندنی گورزی ئەتۆمیان هەیە، هەموو ئەمانە دەکرێت بەگورزێکی ئەتۆمی یان چەند گورزێکی ئەتۆمی جولەبڕ بکرێن، و توانای وەشاندنی گورزی ئەتۆمی دووەمی ئیسرائیل پەکبخرێت، بۆیە ئیسرائیل هەولی بەدەستهێنانی کەشتی ژێرئاوگریدا (غواصات) کە ئامادە و گونجاوبێت بۆ هەڵدانی رۆکێتی ئەتۆمی، لە کۆتایی نەوەدەکانی سەدەکانی رابردوو ئیسرائیل توانی بە پارەیەکی زۆر کە ئەلمانیا بەشی زۆری گرتەئەستۆ، سێ ژێر ئاوی گەورەی ئەلمانی بەدەستبهێنێت، لەجۆری دۆلفین تایبەت بەهەڵدانی ئەو رۆکێتانەی توانای هەڵگرتنی کلاوەی ئەتۆمییان هەیە.(٢٩)

لە سەروەختی سەرۆکایەتی هەریەك لە ئیرێل شارون و یەهود ئۆلمرت ئیسرائیل لەگەڵ ئەڵمانیا ڕێکەوت لەسەر کڕینی دوو ژێرئاوگری تازە و پێشەکەوتووتر کە لەتوانایداهەبوو ماوەیەکی زۆر لەو سێ ژێرئاوگرە بمێنێتەوە کە پێشتر لە ئەڵمانیای کڕیبوو. حکومەتی ئەڵمانیاش پابەندبوو بە دانی سێیەکی نرخی ئەو دو ژێرئاوگرە.

لە سەرەتای ئایاری ٢٠١٢ ئیسرائیل ژێرئاوگری چوارەمی ئەڵمانی وەرگرت، چاوەڕواندەکرێت ژێرئاوگری پێنجەم لە ساڵی ٢٠١٤ وەربگرێت.(٣٠) لە ئازاری ٢٠١٢ وەزیری بەرگری ئیسرائیل ڕێکەوتنێکی لەگەڵ هاوتا ئەڵمانییەکەی واژۆکرد، تیایدا ئەڵمانیا پابەندبوو بەپێدانی ژێرئاوگرێکی پێشکەوتوو لە ساڵی ٢٠١٨، هەروەها باپەندبوو بەپێدانی سێیەکی نرخی ئەو ژێر ئاوگرە کە دەکاتە ٤٠٠ملیۆن یۆرۆ.[٣١]

سەرچاوە ئیسرائیلییەکان ئەوەیان بلاْوکردەوە کە ئەو ژێرئاوگرانەی ئیسرائیل لە ئەڵمانیا بەدەستیهێناوە چەندین دەمەلوولەیان هەیە کە تیرەی هەریەکەیان ٦٥٠ میلم و گونجاوە بۆ هەڵدانی ڕۆکێتی ئەتۆمی ئاراستەکراوی ئیسرائیلی لەجۆری (بۆبای) کە ١٥٠٠ کم دووری دەبڕێت.[٣٢]

لە ژمارەی ٣ حوزەیرانی٢٠١٢و لە لێکۆڵینەوەیەکی دوورودرێژی هەفتەنامەی (دێرشبیگل)و بەپشتبەستن بەچەنین سەرچاوەی باوەڕپێکراوی ئەڵمانی جەختی لەسەرئەوەکردەوە کە ئەو ژێرئاوگرانەی ئەڵمانیا فرۆشتوویەتی بە ئیسرائیل سازوئامادەن بۆ هەڵدانی ڕۆکێتی ئەتۆمی ئاراستەکراو، ئەوەش بۆ بەهێزکردنی توانای ئیسرائیل لە وەشاندنی گورزی ئەتۆمی دووەمدا.[٣٣]

لەلایەکیترەوە لە ڕاپۆرتێکی دەزگایەکی سەربەخۆی بەریتانی تایبەت بەدواداچوونی پڕچەککردنی ئەتۆمی لەجیهاندا جەخت لەوەکراوەتەوە کە ئیسرائیل گەشەی بەو ڕۆکێتانەیداوە لەژێرئاوگرەکانەوە هەڵدەدرێت کە لە ئەڵمانیا کڕیویەتی و مەوداکانیشی زۆر زیادکردووە.

ڕاپۆرتەکە زیاتر دەڵێت: ئیسرائیل مەودای ڕۆکێتی جۆری (بریجۆ) زیادکردووە و کراوە بە کیشوەربڕ و مەوداکەی دەگاتە ٥٠٠٠کم.[٣٤]

**سەنتەرێکی قایم و پارێزراو لە چەکی ئەتۆمی:**

لە چوارچێوەی ئامادەکاری تەواو بۆ گورزی دووەم و لەسەر راسپاردەی (ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئیسرائیل)و لە کۆتایی ٢٠٠٢ ئیسرائیل دەستیکرد بە دروستکردنی سەنتەرێك لەناو شاخێك لە قودسی رۆژئاوادا بۆ سەرکردایەتی و کۆنترۆڵکردن، بەشێوەیەك قایم و پارێزراوبێت لە چەکی ئەتۆمی و چەکە کۆکوژەکانیتر.(٣٥)

ماوەی دروستکردنی ئەم سەنتەرە چەندین ساڵی پێچوو و ناونرا (سەنتەری نەتەوەیی بۆ ئیدارەدانی قەیرانەکان)، وەك لە لێدوانەکانی هەندێك بەرپرس و پسپۆرانی ئیسرائیلدا دەردەکەوێت ئامانجی بنەڕەتی لە دروستکردنی ئەم کۆمەڵگا فراوانە لەشاخدا رەخساندنی بارەگایەکی قایمە بۆ سەرۆکی حکومەت و حکومەتی ئیسرائیل و فەرماندە ئەمنییەکان و دامو دەزگاکانیترە، لە بارودۆخی کتوپڕ و ناکاودا کە هەڵگیرساندنی چەکی ئەتۆمی و بایەلۆجی و کیمیایی دەگرێتەوە بۆ بەکارهێنانی وەك سەنتەرێکی سەرکردایەتی و کۆنترۆڵکردن بۆئەوەی بتوانن لەوێوە فەرمانی وەشاندنی گورزی ئەتۆمی دووەم دەربکەن، ئەمەش لەکاتێکدا ئەگەر ئیسرائیل رووبەڕووی هێرشێکی ئەتۆمی بوەوە.(٣٦)

هەندێك لە پسپۆرانی ئیسرائیلی لەوباوەڕەدان تەنیا لە توانای ئەم سەنتەری سەرکردایەتییەدایە بەردەوامیبدات بە سەرکردایەتیکردنی ئیسرائیل دوای رووبەڕووبونەوەی گورزێکی ئەتۆمی یان چەند گورزێکی ئەتۆمی، ئەمەش متمانەبەخشە بۆ بەهێزیی بەرپەچدانەوەی ئەتۆمی ئیسرائیل، بەشێوەیەك حکومەتی ئیسرائیل لەتوانایدا دەبێت پارێزگاری لە پەیوەندییەکانی خۆی بکات لەگەڵ پێکهاتەکانی گورزی ئەتۆمی دوەم، بەتایبەت ژێرئاوگرە ئەتۆمییەکانی و فرمانی وەشاندنی گورزی ئەتۆمی دووەمیان بۆ دەربکات دژ بەو دەوڵەتانەی هێرشی ئەتۆمیان ئەنجامداوە، سەرەڕای ئەمانەش دەکرێت ئەم گۆمەڵگا قایمە لە جەنگە تەقلیدییەکانیشدا بەکاربهێنێ لە ئەگەری هەڵگیرساندنی جەنگ لەنێوان ئیسرائیل و دەوڵەتە عەرەبییەکاندا، چونکە حکومەتی ئیسرائیل پێویستی بە بارەگایەکی سەرکردایەتی هەیە، تایبەت بەخۆی بۆئەوەی لەوێوە راستەوخۆ چاودێری بارودۆخی جەنگەکە بکات بەبێ رۆشتن بۆ بارەگا قایمەکەی سەرکردایەتی سوپای ئیسرائیل

لە قوولاَیی زەویدا لە (کریاە) لە تەلئەبێت.

کۆتایی سیاسەتی نهێنی ئەتۆمی ئیسرائیل لە چوارچێوەی هەولەکانی ئیسرائیلدا فۆرمەلەبوو بۆ گەشەپێدانی پرۆژە ئەتۆمییەکە بەبێ ورووژاندنی هیچ بەرهەڵستییەکی نێودەوڵەتی یان ناوخۆیی.

ئەم سیاسەتەش بەتەواوی گەشەیکرد و چەسپا لە سایەی ئەو دانووسان و لێکتێگەیشتنانەی کە ئیسرائیل لە شەستەکانی سەدەی رابردووە لەگەڵ ولاَتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەنجامیدا و تاگەیشت بە رێکەوتنی مائیر نیکسون لە ساڵی ١٩٦٩ سەبارەت بە پێگەی ئەتۆمی ئیسرائیل بەپێی ئەم رێکەوتنە ئیدارەی ئەمریکی دانینا بەدەستهێنانی چەکی ئەتۆمییەوە لەلایەن ئیسرائیلەوە و ناردنی زانا ئەمریکییەکانیش بۆ چاودێری کۆمەڵگای ئەتۆمی دەیمونە راگرت. وازیشیهێنا لەو داواکارییەی کە بەردەوام لە ئیسرائیلی دەکرد بۆئەوەی رێکەوتننامەی رێگرتن لە بلاَوکردنەوەی چەکی ئەتۆمی واژۆبکات، لەبەرامبەر ئەوەی ئیسرائیل خۆی وەك دەوڵەتێکی ئەتۆمی رانەگەیەنێ و تاقیکردنەوەی ئەتۆمی ئەنجامنەدا.

لەژێر پەردەی سیاسەتی نهێنی ئەتۆمیدا، ئیسرائیل پرۆژە ئەتۆمییەکەی پێشخست و زۆربەی سەرچاوە بیانییەکان جەخت لەوەدەکەنەوە کە ئیسرائیل خاوەن جبەخانەیەکی گەورەی ئەتۆمییە کە زیاترە لە ٤٠٠ بۆمی ئەتۆمی و هایدرۆجینی و نیترۆنی، سەرەڕای چەندین چەکی ئەتۆمی تەکتیکیتر لەوانە گولەتۆپ و کلاَوەی ئەتۆمی بچووك کە دەکرێت بە تۆپ و راجیمە و رۆکێتەکانەوە بەکاربهێنرێت لەجەنگدا دژ بە تابوری تانك و زرێپۆش و سوپای نەیار.

سیاسەتی نهێنی ئەتۆمی ئیسرائیل وایلێهاتووە ببێت بە بەشێك لە پێکهاتەی کەلتوری ئەتۆمی ئیسرائیل و ببێتە هەژموونێکی زاڵ لە کۆمەڵگای ئیسرائیلیدا، ئەمەش بەپشتبەستن بەچەند گریمانەیەکی بنەرەتی، گرنگترین گریمانە جەخت لەسەر بەردەوامی ئیسرائیل دەکاتەوە لەپێکەوەنانی جبەخانەیەك لە چەکی ئەتۆمی و لەناویشیاندا تواناکانی ئیسرائیل لە وەشاندنی گورزی دووەمی ئەتۆمی بۆئەوەی پارێزگاری لە ئیسرائیل بکات

وەك بەهێزترین و بەهەژمونترین دەوڵەتی ناوچەکە.

ئەم گریمانانە جەغتیش لەسەرئەوەدەکەنەوە کە دەبێت ئیسرائیل ئەوپەڕی توانای خۆی بخاتەکارەوە بۆئەوەی نەهێڵێت هیچ دەوڵەتێکی عەرەبیی و ئێرانیش نەبن بە خاوەنی چەکی ئەتۆمی، بۆئەوەی ئیسرئیل زۆرترین ماوە بەتەنیا لەناوچەکەدا بمێنێتەوە و دەستبەسەر چەکی ئەتۆمیدا بگرێت.

●●●

## پەراوێزەکان:

١ـ امين كوهين: التابو الاخبر: سر الوضع النووي الاسرائيلي و ماذا نيبغي العمل به (هاطابو هأحرون؟ سودةامستاف هاجر عيني ثل ئيسرائيل فماء تسريخ لصوت بو)، (اور بهودا: كيشرت و زصورا اربيتان و ودفير، ٢٠٠٥) لا. ١٤٨

٢. زكي ثلوم: بية ديمونة وواشنطن: الصراع علي تطوير الخيار النووي الاسرائيلي ١٩٦٠-١٩٦٨(هاما فاك عال بستواع هاويشعا هام عينيت ثل اسرائيل ١٩٦٠-١٩٦٨، تەلئەبیت پەیمانگای بن گۆریۆن بۆ توێژینەوە، ئیسرائیل و زایۆنیزم و کەلەپوری بن گۆریۆن، سەنتەری یافە بۆ توێژینەوە ستراتیژییەکان ٢٠٠٤ لا٦٢.)

٣. هەمان سەرچاوە.

٤. هەمان سەرچاوە لا٢٦-٦٦ بۆ زیاتر لەبارەی بن گۆریۆن و جۆن کنیدی سەیری.

Seymou m.hersh The samson option
.Newyork Yitage books, palol-103)

٥. لەو زانیارییانە بۆنموونە کڕینی دە تەن یۆرانیۆم لەلایەن ئیسرائیلەوە لە باشووری ئەفریقا لە تشرینی دووەم/ نۆڤەمبەر ١٩٦٢ سەرەڕای ئەوەی ئیسرائیل دەستیدەکەوت لەفەرەنساوە بەپێی ڕێکەوتنی هەردوولا لە ساڵی ١٩٥٧.

٦. راپۆرتی سەفارەتی ئەمریکا لە تەلەئەبیب کە نێردراوە بۆ ئیدارەی ئەمریکا لە کانونی دووەم ١٩٦٣ ئەوەی دەریدەخات کە ئیسرائیل هەڵساوە بەپێشخستنی پرۆژە ئەتۆمییەکەی لە دەیمونە بۆ بەدەستهێنانی زانست و توانای پێویست بۆئەوەی ئایندە بتوانێت لەبواری ئابووری و سەربازیدا بەکاریبهێنێت. هەروەها راپۆرتەکە پێشبینی ئەوەشیکردبوو لە توانای ئیسرائیلدایە کە تاقیکردنەوەی ئەتۆمی سەربازی لەنێوان شەش ساڵ تا هەشت ساڵ ئەنجامبدات بۆ زیاتر سەیری (سلوم، بيه ديمونه وواشنگنه، لا ٧١-٧٢).

٧. ديومونه وواشنگنه.. لا ٧٣-٧٤.

٨. هەمان سەرچاوە. لا ١٠٥-١٠٨.

٩. هەمان سەرچاوە.

١٠. هەمان سەرچاوە.

١١. لەکۆبوونەوەی ئیدارەی ئەمریکیدا دەردەکەوێت کە هەریەك لە سەرۆك جۆن کەندی و جۆن مالکویم بەڕێوەبەری ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی ئەمریکی کە پێگەی سەرۆکی لیژنەی وزەی ئەتۆمی ئەمریکی بوو پێش ئەوەی دابنرێت بە سەرۆکی ئاژانس، بەپێی ئەو زانیارییانەی لای ئیدارەی ئەمریکی بوو لەو ماوەیەدا، جەغت لەوەدەکەنەوە کە لە توانای ئیسرائیلدایە دوای ساڵێك لەخستنەگەڕی کوورە ئەتۆمییەکەی کۆمەڵگای دەیمونە چەکی ئەتۆمی بەرهەمبهێنێت. مالکۆم وتبووی:

About ane year after Dimona gose cretical Israel will be able to wake a unclear device thereather they can build up two or three year our estimate is that Dimona will go critical latein 1963 or eavly 1964

بۆ زیاتر بروانە: هەمان سەرچاوە لا. ١١٧-١٢٠.

١٢. دەقە ئەسڵییەکە بەم شێوەیە.

The government Israel has reeffirmed that Israel will not the first to intrdouce unclear weapons .Israel avea-in to the avab

بۆ زیاتر سەیری سەرچاوەی پێشوو بکە لا. ١٩٠-١٩١.
١٣. Hersh. Thesamson optin p13q.
سەیری وتاری سمحا فلابان بکە، چەکدامالْینی ئەتۆمی لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست تاکە چارەسەر لە کتێبی امینز کوهین (الانسانیـة في ظـل الـذرة) (النوثوت بنسیل هاتوم ) تەلئەبیت: الکیبوتس الحد ١٩٨٧
١٤. کوهین (التابولاخیر) لا ١-٤.
١٥. hersh the samson option p 179.
١٦. ibid. p 177.
١٧. Avner cohen. Worst Kept secret; Israel bargain with the Bomb(New york columbia University press 2010 p 1319
١٨. Ibid
١٩. Ibid p24-28
٢٠. ناصوم بارتیاع و سمعون سیغر (وثیقة اراد) ملحة السبت لصعیضة ید لعیوت احرونوت (چاپی کاغەز) ٢/٣/ ٢٠١٢.
٢١. سەرچاوەی پێشوو.
٢٢. شای فیلدمان ئەم کتێبەی نووسیوە کاتێك توێژەر لە سەنتەری توێژینەوەی ستراتیژی کە لەسەر زانکۆی تەلئەبیب بەم ناونیشانە نووسیویەتی.
Sha; Feldman , Israel; Nadear Delerren ce; strategy for the 1980 C NEWYORK; Colobia Vniversity press 1982.
٢٣. شای فیلدمان الردع النووی لاسرائیل، سەنتەری توێژینەوەی ستراتیژی لە زانکۆی ئەلتەبیب ١٩٨٣ ص ٦٤-٦٥
٢٤. هەمان سەرچاوە لا ١٩.
٢٥. آدم راز (ازاء ایران نوویة.. مزایا سیاسة الغموض الاسرائیلیة) عدکان ستراتیجي جەلدی ١٤- ژمارە ٣تشربی دووەم ٢٠١١.
٢٦. ئەفینر کوهمە چەندین لێکۆڵینەوە و کتێبی بلاْوکردنەوە کە تیایدا داوای کۆتایهێنانی سیاسەتی نهێنیکاری ئەتۆمی ئیسرائیل دەکـات لـەوانـە وتارێك (کۆنتۆڵی ئەتۆمی لە دەستی یاسادا" کاتی ئەوە هاتووە ئیسرائیل بیر لەدانانی یاساگەلێك تایبەت بـەبـواری ئـەتـۆمـی بـکـاتـەوە" عـدکـان استراتیجی جلد ١٢ ژمارە ( ١)ئایاری ٢٠٠٩ هەروەها لە کتێبی (دوا تابۆ)
٢٧. سەیری ینیر عفرون کێشەی ئەتۆمی ئیسرائ.(ها دیلیمە هاج عینیت پل اسرائیل) (تەلئەبیب یەگبنکین و الکسیوتس او حد ١٩٨٧ هـەروەهـا وتارێکی (دەستبەردارنەبوونی پەردەپۆشکردن هاریش ١.٦/٢٠١٠.
.http//www.haaretz co.il/ missc/ artide-print-page 11. 1204513
٢٨. بۆ زیاتر سەیری وتاری یجز میثل درور (مواجهة ضد ایران ذات السلاح النووي إ منتسقي و آخردن محاکات بشان ایران " الیوم لاتاي" الا دراك و توصیات سیاسیة (هرتسلیا اعزکر متعدد التخصص ٢٠١١ لا ١٣-١٩ هەروەها سەیری توندی سزمتیل درو بکە کە داوای پێویست لەناوبردنی ئـێران بەتەواوی لەگوزەرەوە شاندی ئەتۆمی دژ بە ئیسرائیل کتێبی یجزفتیل درور، کن لناق تەلئەبیب میسکال ویدیعوت احرونوت ٢٠١١ لا ١٩٦.
٢٩. باراك رفید"ها هي الغواصة تأتي"هآرتس ٢٣/٢/٢٠١٢
٣. جیلی کوهن (ئەلْمانیا چوارەم کەشتی ژێر ئاوگری لەجۆری دۆلفین تەسلیم بە ئیسرائیل کرد) هێ ریتس ٣/٥/٢٠١٢
٣١. رمنید(هآهي الغواصه تأتي
٣٢. رۆوفین بدهستور الجبزال (الوزیر و الغواصة) سەرچاوەی پێشوو.
٣٣. عوفر ادیرت"دیر شبیگل: ئەلْمانیا ئاستی ژێرئاوگری بەرزکردەوە کە لە توانای ئەتۆمی هەبێت هێ رتش ٣/٦/٢٠١٢
٣٤. یوسی میلمان(ڕاپۆرت: ئیسرائیل تواناکانی چەکی ئەتۆمی خۆی بەرزکردوەتەوە) هآرهي ٣١/١٠/٢٠١١
٣٥. أگیلە شومبلی و ایلان مرسیانو کوتیك لەقودسدا لەکاتی ئائاساییدا لێرەوە ئیدارەی دەوڵەت دەدرێ وای نێت ٧/١٢/٢٠٠٣
٣٦. عوفری ایلانی "ئەمە کۆتایی جیهان نییە" هێر٧/٩/٢٠١٠
٣٧. شوهبلی و وسیانو (کوتیك لە قودسدا).

ئەم بابەتە لە نووسینی. مەحمود محارب
سە رچاوە مجلە سیاسات عربیە العدد ٢، ایار/ مایو ٢٠١٣

# هەرێمی کوردستان و ئەنجومەنی هاریکاری کەنداوی عەرەب لە تەرازووی هێزدا

نەجمەدین فارس حەسەن

**پێشەکی:**

بۆئەوەی بتوانین لە توانایی هێز و کاریگەرییەکانی لەسەر ئاستی ناوخۆیی و نێودەوڵەتی تێبگەین دەبێت لەهەر سێ رووەکەوە واتە ناوخۆیی و ناوچەیی و نێودەوڵەتی شیکاری لەسەر تواناییەکانی دەوڵەت بکەین لەهەر سێ ئاستەکەیدا بەتایبەت بۆ وڵاتانی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداوی عەرەب پێکهاتەکانی ناوخۆی وڵات و توانا ئابووری و سیاسی و سەربازییەکانیان بزانین و لەڕووی توانا مرۆییەکەیەوە و هەروەها لەڕووی پێکهاتەی ئابووری بەرهەمهێنان و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی لەلامان روون و لەبەرچاوبێت. چەند بڕوا و بۆچوون و مەزهەبی جیاواز لەخۆیدەگرێت و هەروەها ئەو سیستەمەی دەوڵەتانی کەنداوی لەسەر بنیاتنراوە تا ئاستێك ئاڵۆز و جێگای مشتومڕ و تێڕامانە، بێگومان توانا لۆجستییەکان و هێزە سەربازییەکانیان بەشێکی هەرە گرنگن لەدەستنیشانکردنیان لە تەرازووی هێزدا، لەئێستایی سیستەمی سیاسی و سەربازی و ئابووری دەوڵەتانی دنیادا و لە پێگە و بوونی بەناو یەکجەمسەری دنیا کە لەلایەکەوە و لەناوەڕۆکیدا ناتوانین بڵێین تاکجەمسەرییە. ئەنجومەنی هاریکاری کەنداوی عەرەبی ناتوانێت جێگا و پێگەیەکی بەرچاو و کاریگەری هەبێت.

" کراوپر، وەکو یەکێك لە محافەزەکارە نوێیەکان، بەجۆرەی خوارەوە گوزارشت لە جیهانبینی رەوتەکەی خۆی سەبارەت بەم قۆناغە مێژووییەی کە لەگەڵ هەرەسهێنانە

گەورەکەی یەکێتی سۆڤیەتدا دەستپێکرد، دەکات: " کۆتایی هەموو شتێك بوو، کۆتایی کۆمۆنیزم، کۆتایی سۆسیالیزم، کۆتایی جەنگی سارد، کۆتایی جەنگەکانی ئەوروپا بوو، بەڵام کۆتایی هەموو شتێك، لەهەمانکاتدا سەرەتاشە "[١]. هەڵبەتە (کراوپمر) هەڵەیە کەوا دەزانێ کۆتایی هەموو شتێکە. نە کۆتایی هەمو شتێکە و نە کۆتایی کۆمۆنیزمیشە، بەڵکو کۆتایی جەنگی سارد بوو، چونکە کۆتایی ئەو جەنگە کۆتایی هەموو شتێك نەبوو، بۆیە کۆتایی کۆمۆنیزم نییە، چونکە کۆمۆنیزم لەناو ژیان و پەیوەندییەکانی خەڵکدا، خۆبەخۆ گەشەدەکات، سیستەمەکە خۆی زەمینەیەکە بۆ سەرهەڵدانی کۆمۆنیزم و هەلومەرجێك خۆشدەکات وەکو شێوازێکی لەبار بۆ ژیانی مرۆڤایەتی، راستە کە کۆتایی هەرشتێك لەهەمانکاتدا سەرەتایەکی نوێ دەهێنێتەئاراوە.

هەروەکو (میر شایمر) دەڵێت: "هەموومان وا قەناعەتمان نییە کە سیستەمی نێودەوڵەتی سەردەم وەسفیبکەین بە تاکجەمسەری و لە کرداریی بوونی دەسترۆیشتوویی ئەمریکادا"[٢] ئەو درێژە بە قسەکانی دەدات و دەڵێت ئێمە ناتوانین بڵێین یان هاوڕانین لەگەڵ ئەوەدا کە بڵێین ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زۆر بەهێزە لەڕووی سەربازییەوە و دەتوانێت باڵادەستی بکێشێت بەسەر هەموو دەوڵەتانیتردا لەکاتی بوونی سیستەمێکی ئاوا لەجیهاندا. لەبەرئەوەی ناتوانێت رێگەبگرێت لە دروستبوون گەشەی هێز لە وڵاتانیتر لەجیهاندا، لەگەڵ ئەوەی زلهێزێکە لەدنیادا، بەڵام ناتوانین بڵێین کە چین و روسیا ناتوانن رووبەڕووی ئەمریکا ببنەوە. " ئەوان لەهەموو لایەك زیاتر ئەوە دەزانن (ئەمریکا) لەو جیهانە فرەجەمسەرییەی کە دەرکەوتووە لەسەر رووی زەوی هەڕەشە لە باڵادەستی تەواویان دەکات لەئێستادا هێزی چین دەبێتە زۆرترین مەترسی بۆیان لە ساڵانی داهاتوودا لەبەرئەوە چین دەوڵەتێك دەبێت کە زۆرترین حیسابی بۆبکرێت لەپێش هەر هێزێکیتری جیهانەوە تەنانەت لەپێش ئەوروپاشدا کە بەرەو یەکگرتن دەڕوات"[٣]، هەروەها ئەمەش سەردەکێشێت بۆ "لەجیهاندا کە فرەجەمسەرە بەبێ شك چین بووەتە یەکەم هێزی گشتگیر، هەتا لەپێش ئەوروپادا کە هەنگاوی بەرەو یەکبوون ناوە ئەمەش دژ بە هەلومەرجی ئێستای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە کە وەك تاکە هێزی گەورەی جیهانە"[٤]،

نزیکترین رووداو و سەلماندنی ئەو راستییە دەور و کاریگەری روسیایە لە کێشەی سووریا و لەنزیکترین کاتیشدا دەور و کاریگەری لەسەر قرم و پەیوەستکردنی بە ولاتی روسیاوە و کردنی بە یەکێك لە ناوچە فیدراڵییەکانیتری رووسیا، سەرەڕای هەموو ئەو هەڕەشانەی گەمارۆی ئابووری و دیبلوماسی و هەڵپەساردنی لە کۆبوونەوەی هەشت دەوڵەتە ئابوورییەکەی دنیا، بەلاّم روسیا و چین کاریگەرییان لەسەر ئابووری ئەورووپا و جیهان هەیە لەڕووی هەناردەکردنی نەوت و غاز و هەروەها دانەوێڵە وەکو گەنم و پیشەسازی و سەربازییەوە کاریگەری لەسەر نرخی جیهانی کالاّ بەرهەمهاتووەکان دادەنێت، هەروەها رووسیا لەڕووی سەربازییەوە بەهێزە و توانیویەتی ئەو سیستەمە موشەکییە کە ئەمریکا هەیەتی لە ولاّتانی دەوروبەری روسیا دایمەزراندووە روسیا سیحری توانا و کاریگەرییەکانی لەسەر خۆی نەهێشتووە بە دروستکردنی موشەکی بەرگری و هێرشکردن ( S 300)و هەروەها (S 400) توانای لێدانی ئامانجەکانی هەیە لەفەزادا (لەبۆشاییدا)، هەروەها رووسیا کاریگەری هەیە لە ئاستی سیاسەتی نێودەوڵەتیدا، بۆئەوەی چارەسەری کێشەی سیاسی و سەربازی ولاّتان بکرێت ناتوانن دەستی رووسیای لێدەربهێنن هەروەها زلهێزە ئابوورییەکانی دنیا خۆشیان دانیپێدادەنێن. "سەبارەت بە رووسیای سەردەمی پۆتین، لەگەڵ رێڕەوی سیستەمی تاکجەمسەریدا ناڕوات، (خەلیل زادە) پێیوایە کە دەبێ لەلایەکەوە ئەم خولیا و کەڵکەڵەیە کۆنترۆڵبکرێ و لەلایەکیترەوە لەهەندێ دۆز و مەسەلەی نێودەوڵەتیدا (پوتین) شەریکبکرێت بۆئەوەی هەندێ لەو زێدە کەڵکەلاّنەی خۆی بەتاڵبکاتەوە، بەلاّم دەبێ چاودێری ئەمریکاشی لەسەربێ".

"ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەسەرێتی کار بۆ تەحجیمی عەماری چەکی ئەتۆمی رووسیا بکرێت و سنوورێکی بۆدابنرێت، سنوور بۆ ریفۆرمی ناوخۆی سوپایی رووسی دابنرێت و لەبواری بلاّوبوونەوەی چەکی ئەتۆمی و هەرجۆرە چەکێکیدیکەی کۆمەڵکوژدا هیچ دەرفەت و رۆڵێك بۆ رووسیا نەهێڵرێت". (٥)

دیارە چەکی ئەتۆمی کۆسپێکی یەجگار گرینگ و ئاڵۆزە لەبەردەم سیستەمی تاکجەمسەریدا. جا روسیا چونکە خاوەنی چەکی ئەتۆمییە و بە هەزاران کلاّوەی ئەتۆمی

هەیە، بۆیە لە ستراتیژی سیاسی و سەربازی ئەمریکادا حیسابی وردی بۆدەکرێت و تا ئەو کۆسپە تەختنەکات، خەونی تاکجەمسەرییەکەی نایەتەدی، ئەمەش ململانێیەکی پڕ خەتەرە و بەهۆی ئەو چەکەشەوەیە کە رووسیا لە سیستەمی نێودەوڵەتی ئەمڕۆدا سەنگێکی حاشاهەڵنەگری هەیە و ئەمریکاش زۆر پێی پەست و نیگەرانە.

لەبەرئەوە ئەو بڕوا و بۆچوونانەی ئەوانم لە سەرەوە باسکرد، چونکە بڕوام نییە بەوەی کە سیستەمی نێودەوڵەتی ئێستا تاکجەمسەری بێت بە مانا فەرمییەکەی.

لێرەوە دەمەوێت بەپێی چەند قوتابخانەیەکی شیتەڵکاری و تیۆری سیاسەتی نێودەوڵەتی باس و خواسەکان لەسەر تەرازووی هێز و شوێن و پێگەی دەوڵەتانی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداوی عەرەبی لە تەرازووی هێزدا شیتەڵبکەم.

با ئەوەشمان لەبیرنەچێت سەرەتایەکی فەرمی بۆ باسوخواس لەسەر تەرازووی هێز لەدوای کۆنگرەی ڤییەنای ساڵی (١٨١٥ز)یەوە سەرچاوەیگرتووە و گۆڕانکاری گەورەبووە لە سیاسەتی نێودەوڵەتیدا لەسەر ئاستی جیهان و دەرەوەی کیشوەری ئەورووپا هەروەکو (**محەمەد** سەیید سەلیم) دەڵێت: "گرنگترین رووداو رووخانی هەردوو ئیمپراتۆرییەتی ئیسپانی و پرتوغالی بوو لە ئەمریکای لاتیندا و گەڕانەوەی تەرازووی هێزی ئەورووپا بوو و دەرکەوتنی سەرەتا یەکەم دامەزراوەی نێودەوڵەتی سەردەم بوو، ئەمەش بەزیادەی کۆمەڵێك کرداری سیاسی نێودەوڵەتی، وەکو ئەزمەی ئیمبراتۆرییەتی عوسمانی و سەرەتایی فراوانبوونی داگیرکاری نوێ"(٦)

ئەم کۆنگرەیەش نەخشەی بناغەیی تەرازووی هێزی کێشا لە ئەورووپا هەتا ڕوودانی جەنگی قرم لە ساڵی (١٨٥٣)دا.

نامەوێت درێژە بەو پێشەکییە بدەم لە ناوەڕۆکی لێتوێژینەوەکەدا ئەوە زیاتر ڕووندەکەینەوە کە تەرازووی هێز زیاتر پێویستی بەچی هەیە و چۆن کاریگەری دروستدەکات لەسەر هێزەکانیتر.. پێویستە ئەوە بۆ خوێنەر ئاشکرابێت بۆ ئەم توێژینەوەیە هەردوو (مەنهەجی شیتەڵکاری سیستەم و مەنهەجی بەراوردکاری)م بەکارهێناوە، یەکەمیان بۆ شیتەڵکاری سیستەمی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و سەربازی

دەوڵەتانی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداوی عەرەبی بەکارهێناوە، هەروەها مەنهەجی بەراوردکاریم بەکارهێناوە لە بەراوردکردنی هێزەکانی ئەو ئەنجومەنە، لەگەڵ هێزە ناوچەیی و نێودەوڵەتییەکان کە هەردوو مەنهەجەکە گرنگی خۆیان هەبووە بۆ ئەم توێژینەوەیە بۆیە بەکارمهێناون.

## بەشی یەکەم

## ئەنجومەنی هاریکاری کەنداوی عەرەبی و پێگەی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی و ناوچەکە

لە زانستی سیاسەتی نێودەوڵەتی و پەیوەندی نێودەوڵەتیدا، یەکێك لەلایەنە گرنگەکان و توێژینەوە و تێڕوانینەکانی سەدەی بیست و ئێستاشی لەگەڵدابێت باس و شیتەڵکاری سیاسەتی تەرازووی هێز لەسەر ئاستی گۆڕەپانی سیاسی و ئابووری و سەربازی لەجیهاندایە. کێشە و ململانێی ناوچەیی و نێودەوڵەتی بووەتە هۆی ئەوەی چەندین کتێب و لێکۆڵینەوەی ورد و پڕ لە کێشمەکێشی فکری و ئایدۆلۆجی لەسەر ئەنجامبدرێت و لەشیکارییەکاندا دەستی بۆ ببرێت. بە بڕوای من تەرازووی هێز هەندێکجار لەڕێگەی توانایی سەربازییەوە جێبەجێدەکرێت و هەندێکجاریش ئابووری و کۆمەڵایەتی و کەلتوری و رۆشنبیری و زانستی کاریگەری راستەوخۆی لەسەر تەرازووی هێز دەبێت و سەرچاوەدەبێت بۆ بەرامبەرکێ و ململانێی یەکتری، بێئەوەی بگاتە ئاستی بەرپابوونی جەنگ هەروەکو ئەوەی لە سەردەمی جەنگی ساردا بەخۆیەوە بینی و لەسەر ئاستی سیاسەتی نێودەوڵەتی دووجەمسەری لە جیهاندا ئەرك و فرمانێکی جیاوازی هەبوو لەچاو سەردەمی جەمسەرە جیاوازەکاندا. تەرازووی هێز لە بوونی بنیاتی نێودەوڵەتی فرەجەمسەریدا جیاوازە لە دووجەمسەری و یان تاکجەمسەریدا، چونکە بەپێی سیستەمی نێودەوڵەتی جەمسەرەکان ئاستی پەیوەندی نێودەوڵەتی و سیاسەتی نێودەوڵەتیش گۆڕانکاری بەسەردادێت.

دووجەمسەری تا ئاستێك لە هەردوو جۆرەکەیتری جەمسەرگیری لەسەر ئاستی پەیوەندی نێودەوڵەتی لەجیهاندا باشترە بەنسبەت هەندێك لەدەوڵەتانەوە، چونکە لەوانەیە

ببێتە چەترێك یان لەژێر سایەیی جەمسەرێکیاندا تۆزێك دڵنیایی دروستبکات. بێجگەلەوەی کە خاوەنی جەمسەرەکە هەندێك ئەرکی زۆر گەورە دەخاتەسەر شانی هێزە هاوپەیمانەکانی. تەرازووی هێز هەندێکجار لەڕێگەی هاوپەیمانی و هەندێکجار دەوڵەتان خۆیان بەتەنها دەبێتە جەمسەر و رابەرایەتی تاکجەمسەرییەکە دەکات، هەروەها فرەجەمسەری و تاکجەمسەری زۆرترین کات لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی و پەیوەندی سیاسی نێودەوڵەتی سیستەمێکی ئانارشیستیانە بەرهەمدەهێنێت، چونکە زۆرترین کات پەیماننامە و یاسا نێودەوڵەتییەکانی تیادا جێبەجێناکرێت و گوێی پێنادرێت خۆی بەتەنها لەڕێگەی هێزەوە بڕیار و یاسا نێودەوڵەتییەکان پێشێلدەکات و ئاراستەی سیاسەتی خۆی بالادەست دەکات. لێرەدا هەندێك پێناسە و تێڕوانین لەبارەی ئامانج و سیاسەتی تەرازووی هێز لەسەر ئاستی جیهان و ناوچەکە دەخەینە بەرچاو و بۆ شرۆڤەیی باسەکەی خۆمان سوودیان لێوەردەگرین.

"بەکارهێنانی ئەم واتایەی تەرازووی هێز بەڕێگەیەکی بابەتییانە یان پیاداهەڵدادانە لەسەر دابەشبوونی هێز لەنێوان دەوڵەتان بەشێوەیکی یەکسان یا نایەکسان و ئەمەش دەلالەت لەو حاڵەتە دەکات کە هیچ دەوڵەتێك سەرکەوتوونییە بەسەر ئەویتردا و لەلایەنی گریمانەوە (فرچیات) ئەو دەربڕینەیە کە دەربڕی سیاسەتێکی تەرویجییە بۆ یەکسانی هێز، ئەمەش رادەوەستێت لەسەر ئەوەی ئەم گریمانە کە تەرازووی نەبوو کارێکی مەترسیدارە" (٧)

ئەم پێناسە و روونکردنەوەیە هەندێك دەلالەت و گریمانەی جۆراوجۆری لەخۆگرتووە و جۆرێك شیکارییانەی فیکری و فەلسەفییانەی لەخۆگرتووە کە کەمتر جیاوازی هەیە لەگەڵ پێناسەکانیتردا و بەڵکو دەتوانین بڵێین هەتا ئاستێکی زۆر زۆر لەگەڵ پێناسەکانیتردا جیاوازی نییە. نووسەکان و بیرمەندەکانی جیاواز لەیەکتری و زۆر نزیك لەیەکتری پێناسە و تێڕوانینیان بۆ تەرازووی هێز هەیە، بەلام ناتوانین بڵێین یەك جیهانبینییان هەیە، هەروەها ناتوانرێت بڵێین یەك پێناسەشیان هەیە. لەلایەکیترەوە تەرازوی هێز تێورییەکە لەسەر ئەوە رادەوەستێت و هەڵدەستێت بە شیکردنەوەی سیاسەتی دەوڵەتان و هاوپەیمانێتییەکانیان

لەحاڵەتێکیدا کە تیایدا یەکسانبن لە هێزی سەربازییاندا ئەو توانایەش لەهێز ئەگەر سەربازی یان ئابووری یان کەلتوری بێت سەرناکێشێت بۆ روودانی ململانێی سەربازی.

سەرباری ئەم تێڕوانینانە کە چەندین نووسەری بەناوبانگی ئەو بوارە هەیە کە شیکارییان کردووە و دیدوبۆچوونی خۆیان بڵاوکردووەتەوە لەدواتردا بەوردتر دەیانبەستمەوە بە رەوشی هێز لە ناوچەی وڵاتانی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداوی عەرەبیدا.

تیورەکانی تەرازووی هێزەکان، یەکێکە لە رەکیزەکان و بناغەیەکی بنەڕەتی تێوری واقیعی کلاسیکییەکانە لە تێڕوانین و شیکردنەوەکانیان لەسەر ئاستی سیاسەتی نێودەوڵەتی و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان بەکاریدەهێنن، هەروەها هەوڵێکیانە بۆ روونکردنەوە و دامەزراندنی شێوەی هاوپەیمانێتییەکانیان، هەروەها تێڕوانینێکە بۆ ئایدیای ئانارشیستییانەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و تێوری واقیعە نوێکان دایانمەزراندووە.

لێرەوە نامەوێت زیاتر لەسەر پێناسەکان بدوێین، چونکە لەشیکردنەوەکانیتردا دەچینەسەر تیورەکانیتر بۆ شیکردنەوەی توانا و هێزی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداوی عەرەبی بەکارمەهێناون، هەروەها چەند دەتوانن رۆڵ و کاریگەرییان هەبێت  یان بەجۆرێکیتر رۆڵگێڕی بکەن و بەشێك و لایەنێکی تەرازووی هێز بن لە ناوچەکەیان و لەسەر ئاستی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کۆمەڵگای نێودەوڵەتیدا.

شیکردنەوەی پرسێکی لەوجۆرە و باس و توێژینەوەی زانستییانە لە تواناییەکانی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداوی عەرەبی پێویستە تواناییە ناوخۆییەکان و هەروەها پەیوەندییەکانیان لەسەر ئاستی ناوچەیی و ئاستی نێودەوڵەتیش دەستنیشانبکەین، توانایی هێز و کاریگەری لەڕووی ئەرێنی و نەرێنی لەسەر هێزی ناوچەکە و جیهان بخرێتەڕوو.

لە کۆنگرەی دەوحەی ساڵی (٢٠٠٤) دا کە پەیوەستبوو بەچۆنێتی گەشەپێدانی پەیوەندیی کەنداو و هاوپەیمانی ناتۆ هاوکارییەك بێت رۆڵبگێڕێت لە ئاسایش و ئارامی ناوچەی کەنداودا. ئەوکات (عەبدولڕەحمان عەتییە) کە سکرتێری گشتی ئەنجومەنی هاریکاری دەوڵەتانی کەنداوی عەرەبی بوو سێ دووررِوونی (بعد) دیاریکرد کە سەرچاوەن لە دروستکردنی ئاسایشی کەنداودا ئەویش لایەنی ناوخۆی وڵاتانی کەنداو هەروەها لایەنی

پەیوەندی هەرێمایەتی و سیاسەت و سیستەمی نێودەوڵەتی و پەیوەندییەکانی، هەروەها ئەو مەودا زۆر ترسناکەشی دیاریکردووە کە خۆی لە توانا و هێزی سەربازیدا دەبینێتەوە کە خۆی لە کەمی توانای مرۆیدا دەردەکەوێت.*

بە بۆچوونی من سعودییە، لەڕووی سەربازیشەوە، ئەگەرچی پارەیەکی یەجگار زۆر لەو مەیدانەشدا خەرجدەکات، هەر لەئاستی ئێراندا نییە، چونکە لەڕووی توانایی و رێژەی مرۆییەوە هاوتا و ئاستی نییە و ئەمەش لایەنێکی گرنگەلەڕووی بەرقەرارکردنی توانا و هێزی سەربازییەوە.

"بەگوێرەی ئەو گرێبەستەی کە بایی شەست ملیار دۆلارە کە ئەمە گەورەترین گرێبەستە لە مێژووی گرێبەستی سوپاییدا لە سەرانسەری دنیا، جا بەگوێرەی ئەو گرێبەستە عەرەبستانی سعودی هەشتا و چوار فڕۆکەی (F.15)و نۆژەنکردنەوەی هەفتا فڕۆکەی شەرڤانیدیکە و هەفتا هەلیکۆپتەری ئەپاچی و سەد و هەفتا و دوو هەلیکۆپتەری جۆری (بلاك هۆکس)و شەست و سێ فڕۆکەی جۆری (لیتل بێردس) وەردەگرێت. شایەنی باسە کە عەرەبستانی سعودی گەورەترین کڕیاری تەکنۆلۆژیای سوپایی ئەمریکا بووە لەنێوان ساڵانی (٢٠٠٥ - ٢٠١٠)دا. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە سەرچاوەی ئەلیکترۆنی تۆڕی هەواڵی ئەورووپی (www.euronews.net) لە (١٤/ ٩ / ٢٠١٠) بەشی عەرەبی". (٨)

راستە ئەمە چەکێکی یەجگار زۆرە، بەڵام لەهەنبەر موشەکی (S-300)ی روسیدا، کە ئێران لە رووسیای دەکڕێت، نە لەڕووی بەرگرییەوە و نە لەڕووی هێرشبەرییەوە ناکاتە چەکی ستراتیژی، بۆیە ئەو گرێبەستە بە قازانجی ئەمریکایە و پارەکێشانەوەیە لە عەرەبستانی سعودی، "چونکە ئەو گرێبەستە لەهەمانکاتدا دوو مەبەست و ئامانجی هەیە. ئامانجی یەکەمی بریتییەلە پتەوکردنی توانا بەرگرییەکانی عەرەبستانی سعودی تا بتوانێ ئاسایش و بەرگری کەنداو لە هەڕەشە گریمانییەکانی ئێران بپارێزێت کە ئەمە لە خزمەتی بەرژەوەندی ئەمریکاشە (زامنی هەناردەکردنی نەوتە بۆ بازاڕەکانی جیهان). ئامانجی دووەم ئەوەیە کە ئابووری ئەمریکی لە سایەی قەیرانە داراییە جیهانییەکاندا،

دەبوژێتەوە. سەرۆك (ئۆباما) دەربارەی ئەم گرێبەستە باسی لەوەکردووە کە ئەم گرێبەستە پەنجا و حەوت هەزار دەرفەتی کار، لەماوەی چوار ساڵدا بۆ ئەمریکاییەکان دەرەخسێنێ. شایانی باسە دەسەڵاتی سیاسی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بەمە پەیوەندییەکی راستەوانە (طردی) لەگەڵ ئاستی گشتی کۆمەکە دەرەکییەکاندا پەیدادەکات" [٩] دیارە ئەمریکا لەو جۆرە سەوا و مامەڵەیەدا، لە خەمی سوود و قازانجی خۆیدایە، چونکە سوور دەزانێت ئەو گرێبەستە سەربازییە ئەوەنییە کە بەتەواوەتی توانای بەرگری عەرەبستانی سعودی دابین و زامنبکات، چونکە ئێرانیش دەسەوئەژنۆ دانەنیشتووە، جگەلە بەرهەمهێنانی خۆماڵی چەك، هەستیارترین چەکی رووسیش دەکرێت.

لەسەر ئاستی ناوخۆیی ئەو وڵاتانە دەبێت لە پێکهاتەی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانیان بڕوانین کە پێکهاتەیەکی پاشایەتی خێڵەکییە و سیستمەکەیان بە پلەیەك نارِوونە (تا ئاستێك سیستەمێکی پاتریارکییە) نەیانتوانیوە رابردوویەکی زۆر کۆنی خۆیان تێپەڕێنن، پێکهاتەیەکی کۆنە لەنوێدا، هەروەها ئابوورییەکەیان کاریگەری تەواوی نەکردووەتەسەر بیرکردنەوەیان لەئاستی پەیوەندی ناوخۆیی و ناوچەییدا کەم کاریگەرن، سیستەمە سیاسییەکەشیان، بێجگەلەو پێکهاتە مەزهەبییە پڕ کێشە و جیاوازانەی کە لەچەندین وڵاتیاندا هەیە و لەئیستادا بووەتە بەشێك لە کێشە ناوخۆییەکانیان و هەروەها لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی و ناوچەیی ئارامی ناوخۆییانی خستووەتە مەترسییەوە، چونکە ئانوساتی تەقینەوەی بارووتی کێشەی مەزهەبی نێوانیان مەترسییەکە لەسەریان و لەپێشیاندایە، روودانی توندوتیژی زیاتر و لێکهەڵپچڕانیان لەیەکتری لێدەکەوێتەوە، ئەمە لەلایەك و لەلایەکیتریشەوە ئاستی توانایی ئابوورییان و سەرچاوەکانیان کەمتر پیشەسازییە و وەکو دەوڵەتانێکی بەرهەمهێنی نەوت و غاز و دەوڵەتانی ملکانەسێنن و کەمتر پەنایانبردووەتە بەر بەرهەمهێنانی کەلوپەل و پێویستییە رۆژانەییەکانیان، هەروەها نەیانتوانیوە ئابوورییەکی تۆکمە دروستبکەن و ژێرخانێکی تۆکمەبێت، بۆ لەسەرپێوەستانی خۆیان و ئاسایشی نەتەوەییان پارێزراوبکات، هەر شتێك رووبەڕوویاندەبێتەوە لەڕووی سیاسی و ئابوورییەوە بتوانن خۆیانی لێبپارێزن و بەرگری لە

خۆیانی پێبکەن. ئەوەیان بۆ جێبەجێنەکراوە و یان نەیانکردووە. پێویستی ولاّتانی کەنداو لەڕووی مواردی مرۆڤییەوە و هەروەها ئاو و خواردنی سەرەکی دانەوێڵە و پێداویستییە خۆراکییە سەرەکییەکانی خۆیان پڕبکەنەوە و چاو لەدەستی دەرەکی نەبن. کاریگەری سیاسەتی دەرەکییان لەسەرنەبێت لەڕووی ئابووری و سیاسی و سەربازییەوە. هەر لەبەرئەوەی لەڕووی سەربازی و توانا لۆجستییەکانیانەوە ناتوانن ببنە لایەنێك لەلایەنەکانی تەرازووی هێز لەناوچەکەدا. ئەمە بێجگەلەوەی کە لەڕووی ناوچەییشەوە هەروەکو (مستەفا عەلەوی سیف) دەڵێت: "سەرکەوتنی هەر سیستەمێکی ئاسایشی ناوچەیی نێودەوڵەتی بۆ ئاسایش لەکەنداودا پێویستی بەوەیە کە ئەومەنزومەیە هەستێت بە سازانی (توافق) ئەوەبگرێتەوە کە هەموو دەوڵەتانی ناوچەکە لەخۆبگرێت، لەگەڵیدا ئێران و عێراق و یەمەن یان بەلایەنیکەمەوە هەموو دەوڵەتانی ئەنجومەنی هاریکاری دەوڵەتانی کەنداوی عەرەبی لەخۆ بگرێت"(١٠)

بەپێی ئەم تێڕوانینەی (مستەفا عەلەوی سیف) بێت، ئەنجومەنی هاریکاری کەنداوی عەرەبی وەك پارسەنگی هێز لەناوچەکەدا نایەتە هەژمارکردن و کاریگەری ئەوتۆیان لەسەر ڕەووتی سیاسی و سەربازی هەبێت لەناوچەکەدا سەرەڕای هەندێ دەست تیوەردانیان لەهەندێك ولاّتانی ناوچەکە و هەروەها هەوەکو ئەوەی لە بەهاری عەرەبیشدا کە بەرهەمەکەی بۆ خۆیان نەبوو. لەبەرئەوەی لەڕووی پەیوەندی ناوچەییەوە و هەتا بوونی دەوڵەتانێك لەسەر ئاستی ئەنجومەنەکەش و هەروەها لەبەرئەوەی سیستەمەکانیان دیموکراسی نین و عەقڵییەتی پاشایەتی ناتوانێت عەقڵییەتی هاوپەیمانی و هاوسۆزی و هاوکاری بێت لەگەڵ ولاّتانیتردا. ئەمەش عەقڵییەتی خۆسەپێنی بێقەید و شەرتی بیرکردنەوەی ئەوانە کە زیاتر لەگەڵ تاکڕەویدا دەگونجێت نەك لەگەڵ هاوپەیمانی بێجگەلەوەی کە هاوپەیمانی خۆسەپاندنی تێدایە، بەلاّم شێوەیەکیتری پەیوەندی تێدا پرۆسیسدەکرێت، هەروەها بوونی عێراقێکی جیاواز لەڕووی دەسەلاّت و سیستەم و ئایدۆلۆجیای دەوڵەت، جیاوازی و بەرژەوەندی مەزهەبی و سیاسی و ئابووری خۆی هەیە لەناوچەکەدا. لەلایەکیتریش دەوڵەتی یەمەن کە لە ناوخۆی خۆیدا بەشی باشوور و

باکوورەکەی جیاوازی ئایدۆلۆجی و سیاسی و کۆمەڵایەتیشیان هەیە، بێجگەلەو کێشەیەی کە دەرگیریبووە لەڕووی مەزهەبیشەوە بزووتنەوەی حوسییەکان و جەنگە چەکدارییەکەیان کە ئیستا کێشەی توندوتیژی و کوشتاری جۆراوجۆریشی لێدەکەوێتەوە سەرباری هەموو ئەمانەش سیستەمی حوکمڕانی لە دەوڵەتی یەمەندا جیاوازە لە سیستەمی حوکمڕانی لە وڵاتانی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداودا.

"پشتیوانی ئێران لە ڕێکخراوانی تیرۆریستی لەبەرە جۆراوجۆرەکانی وەکو (لوبنان، غەزە، ناوچەی یەهودا و سامیرە، عێراق و شوێنانیدیکە) سەرچاوەیەکیدیکەی ئەو مەترسییەیە کە پێویستە لە هەردوو لایەنی ئەمنی و سیاسیشەوە بەرپەرچبدرێتەوە، لەدوای هەڵگیرسانی شەڕی (٢٠٠٣)ی عێراقەوە، ئەمریکا و بەریتانا و وڵاتانیدیکە زیاتر پەییان بەم ڕەهەندەی مەترسی ئێرانی برد، بەڵام گەلێك لە وڵاتانیدیکە وەکو پێویست ئەم کارەی ئێران بەهەندناگرن، چونکە بەهەندگرتن و بەهەندنەگرتنی ئەم کارەی ئێران وەستاوەتەسەر ڕێژەی ئەو مەترسییە ئێرانییە لەسەر بەرژەوەندی ئەو دەوڵەتانە.

وەزارەتی دەرەوەی ئیسرائیل، لەڕێگەی بڕیاری ژمارە (١٧٤٧)ی ئەنجومەنی ئاسایشەوە کار بۆ ئەوەدەکات ئەم بابەتە بخاتە بەرنامەی کاری نێودەوڵەتیبەوە. ئەو بڕیاری (١٧٤٧) یەکێك لە بەندەکانی قەدەغەکردنی ناردنی چەکە بۆ ئێران"[(١١)]

هەروەها ئێرانیش ئیستا دەور و کاریگەری خۆی هەیە بەپێی ئاست و پێگەیشتوویی سیاسی و ئابووری و سەربازی لەناوچەکەدا بووەتە خاڵێکی نەگەتیڤی سیاسی لەبەرامبەر ئاڕاستەی سیاسی و سەربازی کەنداو و ناوچەکەدا و زیاتر هەوڵ بۆ سەپاندنی توانا سیاسی و ئایدۆلۆجییەکەی خۆی دەدات بەسەر ناوچەکەدا. هەموو ئەو فاکتەرانەی سەرەوە کە باسمکرد هەر هەموویان خاڵی نەگەتیڤی دروستبوونی هێز و توانایە کە ئەنجومەنی کەنداو بتوانێت دەور و کاریگەری هەبێت بەسەر ناوچەکەدا، لەلایەکیترەوە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و سیاسەتی ئەمریکا و حیلفی ناتۆ، لەلایەك وەك (مستەفا عەلەوی سیف) باسی کردووە " پەیوەندی دوو قۆڵی لەنێوان ناتۆ و هەریەك لە بەحرین و کوێت و قەتەر و ئیماراتی عەرەبی یەکگرتوو، هۆیەکە بۆئەوەی کە دەوڵەتانی ئەنجومەنی

کەنداوی عەرەبی هەست بە دڵەڕاوکێ بکەن و.." [١٢].

ئەمە لە ئاستی پەیوەندی ناوچەیی و نێودەوڵەتی و هەروەها لەلایەکیترەوە لەبەرئەوەی زۆرترین بڕی نەوت لەجیهاندا لەم ناوچەیەدایە و ئەمەش ناکرێت ئەم هێزانە لە ناوچەکە وەکو هێزێك دەربکەوێت و بیانەوێت لەو ڕێگەیەوە بەرامبەر بە وڵاتانی زلهێز و پیشەسازی دنیا بتوانن کاریگەری لەسەر بەشێکی کەمیش بێت دابنێن بۆئەوەی نەتوانن ئەو رۆڵە ببینن، ئەمریکا دەیەوێت ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لەڕێگەی هاوپەیمانییەوە ئامادەیی خۆی بسەپێنێ لەناوچەکەدا، بەتایبەت ئەمریکا دەیەوێت ئەو رۆڵە ببینێت کە لەئێستادا وەك یەکجەمسەر دەبینرێت لە رووکاری دەرەوەیدا، بەڵام بەکردەوە فرەجەمسەرییە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ. ئەمریکا لەم ناوچەیەدا بەتایبەت و لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەرژەوەندی تایبەتی و سیاسی و ئابووری هەیە.

**"ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سێ بەرژەوەندی ستراتیژی هەیە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا:**

**یەکەم:** پابەندبوونی بەردەوامی بە هەڵئینجان و ناردنی نەوت و غاز لەکەنداودا بۆ جیهان، لەبەرئەوەی هەر ڕێگریکردنێك لە ناردنی وزە لەکەنداودا دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی نرخی نەوت لەجیهاندا ئەمەش کارێکی خراپ دەکاتەسەر ناتۆ و ئابووری جیهانی.

**دووەم:** خواستی ئەمریکا لەپەشیمانکردنەوەی وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە گەشەپێدانی چەکی کۆکوژ و تێکشکێنەر و بەشێوەیەکی تایبەتتر چەکی ئەتۆمی، لەمڕووەوە ئەمریکا وایدەبینێت کە ڕێگریبکات لە ئیسرائیل لە گەشەپێدانی بۆمبی ئەتۆمی.

**سێیەم:** هەروەها خواستی ئەوەشی هەیە ئاستێك بۆ توندوتیژی دابنێت کە چوارچێوەیەکی تیرۆریستییانەی بەخۆوەگرێداوە لەناوچەکەدا "[١٣]، هەروەها بۆ جێبەجێکردنی ئەم بەرژەوەندییە کە (هاوڕێی بەردەوامی نییە، بەرژەوەندی بەردەوامی هەیە) پێویستی بەوەهەیە پارێزگاری لە تەرازووی هێز بکات لە ناوچەکە، ئەویش تاکڕەوی سیاسییانە و سەربازییانەی خۆیەتی لەناوچەکەدا و هەروەها بوون و بڵاوەپێکردنی هێزە سەربازییەکان و

دانانی بنکەی سەربازی لە ناوچەی کەنداودا لەپێناو ڕێگەگرتن لەهەر هەژموونی هێزێکی گەورەی دەرەوەی ئەنجومەنی هاریکاری دوورگەی عەرەبی کە چاوی بڕیبێت لە ناوچەی زۆر و زەبەندی وزەی جیهان بەم هۆیەوە دەیەوێت هیچ هێزێك نەتوانێت کاریگەری لەسەر سیاسەت و ئامانجی ئابووری و سەربازی ئەمریکا دابنێت لەناوچەکەدا. "سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکی پابەندی هیچ پرەنسیپ و ستراتیژ و تاکتیکێکی دیاریکراو نییە، بەڵکو بەهەموو ئەو ڕەهەندانەیەوە، بەگوێرەی پێگەی بابەتەکە لە مەیدانی نێودەوڵەتیدا، بەگوێرەی زروفی (هەلومەرجی واقیعی) بابەتەکە و بەپێی ئەو ساتە مێژوویی و سیاسی و بەپێی پلان و ستراتیژی بەرژەوەندی خۆی کە تیایەتی، سیاسەتی ئابووری و سەربازی دادەڕێژێ و پیادەیدەکات. کەواتە بەو پێودانگە دەتوانرێ بگوترێ کە واقیعییەت، مانای ئەخلاقییەت ناگەیەنێ، بەڵکو ڕێك پێچەوانەکەیەتی، هەروەها مانای نەرمونیانیش ناگەیەنێ، بەڵکو زەبروزەنگ دەگەیەنێ، بەڵام مانای ریسکنەکردن دەگەیەنێ، واقیعییەت ئەوەیە چۆن ئامانجی خۆت بەدیدێنی، ئیدی بەهەر ڕێگا و لەهەر ڕێگایەکەوە بێ"(١٤)

خواستی خۆی زاڵبکات بەسەر هەناردەکردن و نەکردنی نەوت بۆ دەرەوەی کەنداو و بازاڕەکانی جیهان بەو شێوەیەی کە خۆی بەباشی دەزانێت، بۆئەوەی کار لەسەر نرخی نەوت نەکات لە بازاڕی جیهانی نەوتدا، هەروەها هێزە نەیارەکانی لەسەر ئاستی نێودوڵەتی پێسزابدات وەکو دابەزینی نرخی نەوت لە ئیستای جیهان.. ئەمریکا لە کۆن و لەئیستاشدا، "بەگوێرەی بۆچوونی (جوزیف نای) مامۆستای پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان لە زانکۆی هارفارد، بەپێی زروف و هەلومەرجی دیاردە و ڕووداوەکان، پەنای وەبەر هێزی نەرم، هێزی ڕەق و هێزی زیرەك بردووە.

هێزی نەرم: بریتییەلە بەکارهێنانی دبلوماسییەت و ئیغرائات و ڕازیکردن و سزای ئابووری و جواننواندنی کەلتوور و بەها ئەمریکییەکان.

هێزی ڕەق: بریتییەلە بەکارهێنانی هێزی سوپایی و هەواڵگری (ئۆپەراسۆنی تایبەتی).

هێزی زیرەك: بەگوێرەی بۆچوونی (نای) بریتییەلە تێکەڵکردنی هەردوو هێزی نەرم و

رەق، بە هەمئاهەنگی لە رای دروستکردنی هێزێکی گوشاری ئەوتۆ کە هەردوو لایەنی ترساندن و تەماح وەبەرخستن لەخۆبگرێت لەپێناوی وەدیهاتنی ئامانجەکانی سیاسەتی دەرەوە، لە بارودۆخێکی نێودەوڵەتی دیاریکراودا"(١٥)

لەلایەکیترەوە بوونی هێزە سەربازییەکانی لە ناوچەکە و بەتایبەتی لە کەنداوی عەرەبیدا لەپێناوی ئەوەی بتوانێت هێز و تواناییەکان و سەرەڕۆییەکانی و باڵادەستی ئێران لەناوچەکەدا سنوورداربکات. بوونی هێزی سەربازی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی لە ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و بەتایبەتی لەچەند وڵاتێکی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداوی عەرەبی واتایی لەدەستدانی تەرازووی هێزە لەلایەن ئەو ئەنجومەنەوە لە بەرامبەر هێزەکانی دەرەوەی خۆیدا، وادێتە بەرچاو بەشێوەیەکی حاشاهەڵنەگر ئەم ناوچانە لە سەردەمەکانی فرەجەمسەری و دووجەمسەری و هەروەها یەکجەمسەریدا هیچ وەختێك نەیانتوانیبێت هێزی فشار و هاوتا هێزی سەربازی و سیاسی و ئابووری بن لە ناوچەکە و جیهاندا، لەبەرئەوەی سیستەمی بەرهەم هێنان و سیستەمە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکەیان ناتوانێت سەرمەشقی دروستکردنی هێزی ئابووری و سیاسی و سەربازی بێت لەناوچەکەدا، لێرەوە دەمەوێت لە روانگەی چەند بیرمەندێکی بواری تەرازووی هێز شرۆڤەی سیاسەتی هێز بکەین لە ناوچەی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداوی عەرەبی، بەشێکن لە دەوڵەتانی عەرەبی و هەروەها بەشێکیشە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی گەورە. ئەو نموونانەی کە باسیاندەکەین هەریەکە و بۆ تەرازوی هێز دید و تێڕوانینێکی هەیە کە لە پەیوەندی نێودەوڵەتیدا شوێن و جێگەی خۆی هەیە.

**باسی یەکەم: تەرازووی هێز لەلای هانز ج. مورجینپاو:**

تێڕوانینەکانی (مورجینپاو) دەکەینە یەکەم نموونەی شیکردنەوەی تواناییەکانی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداوی عەرەبی لە تەرازوی هێزەکاندا و جێگە و شوێنی لە ناوچەکە و کۆمەڵگای نێودەوڵەتیدا دیاریدەکەین. لە کتێبی (سیاسەت لەنێوان نەتەوەکاندا) (السیاسه بین الامم) نووسەر زیاتر بە باوکی تیۆری سیاسەتی واقیعی سەردەم دادەنرێت و بە سەرمەشقی سیاسەتی واقیعی کلاسیکی نوێگەرا ناوزەنددەکرێت. بەپێی

تیۆروانینەکانی (ریتشارد لیتل) بێت بۆ شیکارییەکانی (مورجینپاو) زیاتر لە سیاسەتی نێودەوڵەتیدا ئینتیقائییە و وورد نییە بەشێوەیەکی فراوان. ئەمەش زیاتر سوودمەندی (مورجینپاو) نییە لەمڕووەوە بۆ تەرازووی هێز، پێیوایە بۆئەوەی شیتەڵکاری بکەیت بۆ تەرازووی هێز (مورجینپاو) دەڵێت دەبێت لەڕێگەی "دوو کرداری دینامیکی تەواو جیاوازەوە، یەکەمیان پەیوەندی هەیە بە تەرازووی هێزەوە بەهۆی ئەنجامێکی پەیوەستدار کە خواستی نییە لە بەشدارپێکردنی هێزە گەورەکان لەو ئالییەتەی کە دەیبات بەرەو خۆزاڵکردن، بەڵام دووەمیان پەیوەندی بە کۆمەڵێك هۆکارەوە هەیە کە هۆکاری کۆمەڵایەتی زۆر خەیاڵی و ماددییەکی ئاڵۆزن "[١٦] لەڕێگەی ئەم شیکارییەوە ئەوەدەردەکەوێت کە ئەو دوو هۆکارە میکانیکییەیە کە دینامیکییەتی تەرازووی هێز هیچکاتێك بەلای دەوڵەتانی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداوی عەرەبییەوە نییە و ناتوانێت لە تەرازووی هێزەکاندا رۆڵ و کاریگەری خۆی بنوێنێت، هەروەکو ئەوەی کە لەپێشتردا روونمانکردووەتەوە. دینامیکییەتی پەیوەندییەکانی ئەو دەوڵەتانە بەهێزەکانیترەوە یان پێوەرەکانیان بەپێی پێوەری سیاسەتی نێودەوڵەتی و سیستەمەکەی بە هێز و تەرازوو بپێورێت ئەوا ناتوانێت دەور و کاریگەری بگێڕن یان زلهێزەکان نایەڵن بیگێڕن لەسەر ئاستی ناوچەکە و بازاڕی جیهانی نەوت و لەسەر ئاستی سیاسەتی ئابووری لەجیهاندا. لێرەدا نامەوێت زۆرتر و دووبارە روونکردنەوەی لەسەر بکەم، چونکە لەپێشتردا روونکردنەوەی زیاتری بۆکراوە.

**باسی دووەم: تەرازووی هێز لەلای هیدلی بول:**

یەکێکیتر لە نموونەکانی بیرمەندی تیۆری سیاسەتی تەرازووی هێز روونکردنەوەی بۆکردووە، ئەویش (هیدلی بول)ە کە لە کتێبی (کۆمەڵگای ئانارشیستی) (المجتمع الفوضوي) چۆن (مورجینپاو) جیاوازینەدەکرد لەنێوان سیستەمی نێودەوڵەتی و کۆمەڵگای نێودەوڵەتی. ئاوا (هیدلی بول)ش نەیکردووە "ئەو دینامیکییەتەی تەرازووی هێزەی کە هەردووکیان دیاریکران لەپێشەوەدا پەیوەندییان هەیە پەیوەندییەکی توندوتۆڵ بەو

جیاوازییە کە (بول) دیاریکردووە لەنێوان تەرازووی هێز دەرخەر (العرضي)و مەبەستدار (المقصود)، بەڵام لەڕاستیدا (بول) تەرازووی هێزی دەرخراو (العرضي) نابەستێتەوە بە سیستەمی جیهانییەوە، بەشێوەیەکی تەواو و مەحکەم (پتەو)و هەروەها تەرازووی هێزی مەبەستدار (المقصود) نابەستێتەوە بە کۆمەڵگای نێودەوڵەتی" (١٧)

بەمپێیەش بێت کاتێك کە غیابی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی هەبێت سیستەمی نێودەوڵەتی تەرازووی هێزەکەی (عرضي) دەبێت ئەوا نیزامە نێودەوڵەتییەکەش نیزامی ئانارشیستانە دەبێت. لەو سیستەمە بێسەروبەرەدا کە یاسای نێودەوڵەتی هیچ جێگا و شوێنێکی نابێت لە دیاریکردنی پەیوەندی نێودەوڵەتیدا و بەمپێیەش هەموو شتێك لە توانای و هێزی سەربازییەوە سەرچاوەدەگرێت ئەوکاتەش ناتوانێت یان نایەڵێت ئەگەر بۆیبکرێت هیچ هێز و دەوڵەتێك سەرچاوەی مەترسی بێت بۆی یان بیەوێت لەکاتێکی گونجاو و هەلکەوتوودا کاریگەرییەکی ئەگەر بچووکیش بێت لەسەریان دابنێت.

ئەمەش بەبەردەوامی لە کۆمەڵگایەکی نێودەوڵەتی ئاوادا ئارامی و سەقامگیری دروستنابێت لەو کۆمەڵگایانەدا. لەوکاتانەدا تەرازووی هێزی دامەزراوەییانەی نێودەوڵەتی لەدەست هێزێکی گەورەدا کۆدەبێتەوە و سەرچاوەیەکی زۆروزەوەندی زیندووی بۆ ئەو سیستەمە دەکەوێتەدەست لە کۆمەڵگای نێودەوڵەتیدا. ئەمەش چوار سەرچاوەی هەیە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی، ئەو دامەزراوانەش بریتییەلە یاسا نێودەوڵەتییەکان، جەنگ، دبلوماسییەت و هێزدارێکی گەورە. کاتێك ئەم هێزانە بەدەستی زلهێزێکەوە بێت ئەوا حیسابکردنی بۆ هیچ لایەکیتر نامێنێتەوە و ئەو لایەش لەناوچەکەدا و بەتایبەتتر لایەنی دەوڵەتانی کەنداو لە توانای مرۆییەوە و هەروەها سەربازی و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوورییەوە، ناتوانێت هیچ شتێکی ئەوتۆبێت بێجگەلە کۆمەڵێك دەوڵەتانی خێڵ و پاشا هەوەسباز و هەزیل و بێئامانجەکان، هەروەها بەمپێیەش و نموونەیەی (هیدلی بول) دەوڵەتانی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداوی عەرەبی بتوانن لە تەرازوی هێزداربن، بەمانای هێز تەرازوویی، هەروەها بەپێی ئەو شیکارییەی کە بۆ تەرازووی هێزی مەبەستدار (المقصود) کردوویەتی لەوکاتەدا جێبەجێدەبێت کە سیستەمی نێودەوڵەتی بە پەیوەستی بە

کۆمەڵگای نێودەوڵەتییەوە دەبێتە ئامانج ئەمەش نە بەرگەی تەرازووی هێزی تەوافوقی و تەرازووی هێز کە لەسەر پێگەی دژایەتی وەستاوە دەگرن، ئەم هێزانەی لەکەنداودا هەن وەکو ئەو تیۆرەی لەسەرەوە روونمان کردووەتەوە و بەپێی سێ لایەنەکەی ناوخۆیی و هەرێمایەتی و نێودەوڵەتی ناتوانن پارسەنگبن لەبەرامبەر هێزە ناوچەیی و نێودەوڵەتییەکان لەدنیادا. (بول) ئەوەی دەستنیشانکردووە لە کتێبی (کۆمەڵگای ئانارشیستی) کە (ریتشارد لیتل) پێشاندانێکی بۆ کردووە (لیتل) دەڵێت: (بول) وەسفێکی بۆ تەرازووی هێز کردووە کە "تەرازوی هێزی سادە (بسیط) بەرامبەری تەرازووی هێزی ئاڵۆز (مرکب) تەرازووی هێزی پیشاندەر (عرضي) بەرامبەر تەرازووی هێزی ناوخۆیی و تەرازووی هێزی زاتی بەرامبەر تەرازووی هێزی بابەتی و تەرازووی هێزی عەرەزی بەرامبەر تەراوزووی هێزی مەبەستدار (مقصود)"(١٨)

**باسی سێهەم: تەرازووی هێز لەلای کینیس ن. والتز:**

لێرەوە دەچینەناو بۆچوونەکانی (والتز) کە دەربڕیوون لەسەر تەرازووی هێز لە کتێبی (تیۆری سیاسی نێودەوڵەتی). (والتز) بەشێوەیەکی گشتی تەرازووی هێزەکان وادەبینێت کە "سیاسەت لەنێوان هێزە گەورەکانی ئەوروپادا" نزیکە لەیارییەوە، لێرە کەمدەکات و لەوێ زیاددەکات " واتە دەوڵەتانی ئەورووپی کاردەکەن لەسەر ئەوەی لە هەلومەرجێکی جیاوازدا هەر بەدەست هاتوویەکی ماددی لەلای یەکێك لە زلهێزەکان لەسەر حیسابی هێزێکیتر بەدەستدێت"(١٩)

هەروەها بۆ زیاتر روونکردنەوەی ئەمەی سەرەوە (والتز) دەڵێت هەڵبەت زیاتر مەبەستی لە سیستەمی فرەجەمسەرییە لە تەرازووی هێزەکاندا "لەگەڵ زیادبوونی ژمارەی هێزە گەورەکان (زلهێزەکان)، بە بڕوای (والتز) دەبێتە هۆی زیادبوونی ئاستێك لە نەبوونی بڕوایی وەك ئەوەی هەیە، هەروەها نابێتە هۆی ئاڵوگۆڕکردنی کۆتوبەندی بنییەوییانەی کە بەشێوەیەکی بنەڕەتی پەیوەستە بە ئەو ئانارشیستییەی کە پەیوەندە بە فرەجەمسەرییەوە "(٢٠)

کاتێك سیستەمی نێودەوڵەتی فرەجەمسەری بوو ئەوا فەوزا دروستدەبێت و هیچ لایەك بە بەرژەوەندی هاوبەش کار و چالاکی نێودەوڵەتی ئەنجامنادات، بەڵکو بەپێی بەرژەوەندییەکانی خۆی ئەو سەوداسەری و مامەڵەیە دەکات. لێرەشدا ئەگەینە ئەو دەرەنجامەی کە دەوڵەتانی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداوی عەرەبی لە سیستەمێکی وادا ناتوانێت تەرازووی هێز بنوێنن، هەروەکو ئەو سێ هۆکارە ناوخۆ و هەرێمایەتی و نێودەوڵەتییە دەیسەپێنێت بەسەریاندا. چونکە هێزە گەورەکان لەوجۆرە سیستەمە نێودەوڵەتییانەدا هیچ هاوکارییەك ناکەن بەلایەنێکیتر ئەگەر بێتو نەیەتە بەرەکەیەوە، چونکە هیچ هاوکارییەکی لایەنێکیتر ناکات کە ببێتە لەمپەر لەبەردەم بەرژەوەندییەکانیاندا تێڕوانینی (والتز) بۆ دووجەمسەری سیستەمی نێودەوڵەتی "هەموو دەوڵەتان لەناو هەمان بەلەمی کونبوودان، بەڵام یەکێکیان بەتەنها خاوەنی گەورەترین زانیاری بەتاڵکەرن لەو ئاوەی کە دزەیکردووەتە ناو بەلەمەکەیان"[(٢١)]

جارێکیتر بەپێی ئەم پێوەرەش بێت و بەپێی ئەو پێکهاتە ناوخۆیی و ناوچەیی و نێودەوڵەتییەی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداوی عەرەبی بێت. ناتوانن لەئێستایی بەشێوە تاکجەمسەریشدا کاریگەرییان هەبێت هەروەها ناتوانن ببنە جەمسەرەکەیتری ناوچەکە لە سیستەمی دووجەمسەری لە تەرازوی هێزەکاندا. لەگەڵ ئەوەی کە دووجەمسەری بەشێوەیەك لەشێوەکان باشترە لە سیستەمی نێودەوڵەتی فرەجەمسەری و تاکجەمسەری لەڕووی جێبەجێکردنی بڕیار و یاسا نێودەوڵەتییەکاندا.

هەروەها بەپێی بڕوای (والتز) تاکجەمسەری "کرداری تاکجەمسەری لە هەندێ بواردا، نوێنەری سیستەمێکی باشترە لە فرەجەمسەری بۆ چارەسەری هەندێ کێشە"[(٢٢)] وەکو بڕوای (والتز) تاکجەمسەری گرنگترە لە فرەجەمسەری و دەتوانین بڵێین دووجەمسەری باشترە لە هەردوو جۆرەکەیتری جەمسەرگیری، هەروەها بەهۆی ئەوەی کە هەندێکجار ئەنجامی خراپی لێ دەکەوێتەوە، چونکە وەك تاکجەمسەری مامەڵە دەکەن، لەبەرئەوەی هەندێك هاوکاری دەکەوێتە نێوانیانەوە، لەگەڵ ئەوەی کە بە بەردەوامی لە بۆسەدان بۆ یەکتری و هەڵکەندنی چاڵ تا بەزیندوویی بتوانن بەهەر شێوەیەك بێت یەکتری بنێژن. لەگەڵ

ئەوەی کە ڕێکەوتن لەسەر شتێك دەکەن و بەسوود بۆ خۆیان و بەدۆڕاندن و زیانگەیاندن بە ئەوانیتر.

**بەشی دووەم:**

**باسی یەکەم: کاریگەری ڕەوتی ئیسلامی سیاسی لەسەر هەرێمی کوردستان:**

دیارە ڕەوتی ئیسلامی سیاسی، کاریگەری زیاتری لەسەر ئەو ناوچانە هەیە کە زۆری دانیشتوانەکانیان موسوڵمانن و کەلتووری ئیسلامی تیادا باڵادەست و زاڵە و تێکەڵ بە ژیانیان بووە. ئەوجۆرە وڵاتانە لە واری ئابووری و جڤاکی و سیاسییەوە پڕە لە پاشاگەردانی و بێسەروبەری و نایەکسانی. زۆربەی هەرە زۆریان وڵاتی ناپیشەسازین و ئەگەر جۆرە پیشەسازییەکیشیان تیادابێ ئەوا لەئاستێکی هێندە نزمدایە، لە نرخی نەبوودایە. ئەو وڵاتانە تاڕادەیەك وڵاتی کشتوکاڵین و شێوازی کشتوکاڵەکەشیان کۆنە و مۆدێرنیتە نەکراوە، بۆیە لەوڕووەشەوە بە وڵاتی کشتوکاڵی پاشکەوتوو دەژمێردرێن و لەڕووی بەرهەمهێنانی ناوخۆییەوە، پێداویستییەکانی ژیانی ڕۆژانەی جەماوەری خەڵکیان پێدابیناکرێت.. بۆیە ژیان لەوچەشنە وڵاتانەدا دوورە لەهەر پرەنسیپ و ئاکارێکی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و گەیوەتە ئاستی بەکۆیلەکردن و کۆیلاندنی کۆمەڵگە و بێبەشکردنی لەهەر ئازادییەکی بەشەری، لە زۆربەی ئەم وڵاتانەدا ئایین نەك هەر لە دەوڵەت و دەسەڵات جیانەکراوەتەوە، بەڵکو کراوە بە سەرچاوەی هەرە سەرەکی داڕشتنی یاسا و ڕێسا مەدەنییەکانیش. هەڵبەتە پاشکەوتنی ئابووری و هەرەس و نائومێدی دەروونی، باشترین زەمینەیە بۆ گەشەکردن و پەرەسەندنی باوەڕی سیاسی ئایینی، چونکە وەختێ ئینسان لەباری ئابووری و دەروونییەوە دادەڕووخێت و دەکەوێتە گێژاوێکی ئابووری و دەروونی ترسناك و لەچارەسەرنەهاتووەوە، بەدوای فریادرەسدا دەگەڕێت و ئەم فریادرەسەش زیاتر خۆی لە ئایین و سیاسەتی ئایینیدا دەنوێنێ وەکو ئەمە بەزەقی لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا دیار و ئاشکرایە کە زۆربەی هەرە زۆریان وڵاتانی سەرانەسێن و بەرهەمهێنی نەوتن یان خاوەنی سیستەمێکی ئابووری بێسەروبەرن و لەجێی خۆدا

گێرەدەکەن و نەك گرێی هیچ کێشەیەکی حەیاتییان پێناکرێتەوە، بەڵکو لە خەڵکەکەشی دەکەن بە گرێکوێرەی لەکرانەوەنەهاتوو. بۆیە لەوجۆرە وڵاتانەدا لەپاڵ شێوازی زەبروزەنگ و چەوسانەوە و سەرکوتکردندا، دەرگا لە رەوتە ئیسلامییە سیاسییەکان دەخرێتەسەر گازی پشت، تا جەماوەری خەڵك بەجۆرێ بەنج و گەوج بکرێ، کە لەئاسمانا بۆ چارەسەری کێشە حەیاتییەکانیان بگەڕێن و تاماون بە قەرز بژین و خەون بە رێگای هات و نەهاتی ئەو دنیاوە بدینن و خۆشی و لەزەتەکانی ئەم دنیایە بۆ دسەڵاتداران بەجێبێڵن، تا بێکێشە و سەریەشە، لەسەر حیسابی گەوجێتی ئەوان بژین.

جا هەرێمی کوردستان، نموونەیەکی زەقی ئەم پاشاگەردانییەیە، جگەلەوەی نموونەی پاشکەوتنی پیشەسازی و کشتوکاڵییە، لەڕووی سیستەمی سیاسی و ئابووری کۆمەڵایەتیشەوە نەك مایەی حەسوودییە، بگرە مایەی بەزەییە. جەماوەری خەڵکی هەرێم بەڕادەیەك چەواشەدەکرێت کە کەمترین متمانەی بە خۆی نەماوە، قەڵەمی دەستوپێی شکاوە، وەکو چۆن خنکاو پەنا بۆ پوشکەش دەبات، بەو ئاوایە چاوی بڕیوەتە دەستی بێگانە و لەو سەردەمی گلۆبالیزە و ئەقڵگەراییە چڕ و چوغووردەدا، تازە بەتازە بەتەمایە بەپشتیوانی هێزی غەیبانی و لەڕێگای رەوتی ئیسلامی سیاسییەوە، بەهەموو شێوە و شێوازە جیاوازەکانییەوە، رزگاری و ئازادی خۆی بەدەستبێنێ، غافڵە لەوەی کە ئەمە ئاو لەدنگا کوتانە، نەك رزگاری ناکات، نەك ئازادی پێنابەخشێ، نەك پێویستییە مرۆڤایەتییەکانی بۆ دابیننناکات، بەڵکو سەری لەقوڕدەنێ و زیاتر دەستەمۆ و کۆیلەیدەکات، دەیکات بە دەروێش و شۆرباخۆری دەسەڵات.

دیارە لە زۆربەی وڵاتە ئیسلامییەکانیدیکەی دەرێی هەرێمی کوردستانیشدا، رەوتە ئیسلامیە سیاسییەکان، لەژێر ناوی جیاواز جیاوازدا کاری خۆ دەکەن و بەجۆرەها گوتاری مەزەبی جەماوەری خەڵك دەدوێنن و ئەم دنیا لەبەرچاوی خەڵك سووکدەکەن و بۆ ئەو دنیایان ئامادەدەکەن و بۆئەوەی هیچ زەرەرێکیان بۆ بەرژەوەندی و ستراتیژییەتی دەسەڵات نەبێ. دیارە ئەم هێز و رەوتە ئیسلامییە سیاسییانە زیاتر پارێزەری بەرژەوەندی مادی و مەعنەوی کۆمەڵێك هێزی سیاسی ناوچەیی و جیهانین. ئەمە یەکێکە لە دەرهاویشتەکانی

گلۆبالیزە و پەرەسەندنی خەیاڵی تەکنولوژیا و سیستەمی راگەیاندنەوانی دنیا، کە گۆڕانکارییەکی گەورەی لەهەموو کایە حەیاتییەکانی ژیاندا دروستکرد و هەر گۆڕانکارییەکی گەورە لەسەرەتاوە جۆرە پاشاگەردانی و ئەنارشیزمێك لەگەڵ خۆیدا دێنێ، بۆیە گلۆبالیزە تا قاڵبی خۆی وەرنەگرێت، ئەم پاشاگەردانییە بەئاسانی نانیشێتەوە و یەکێك لە نموونە و دەرهاویشتەکانی ئەم دیاردەیە راپەڕین و داپەڕینی هەندێ لە وڵاتە عەرەبییەکانە کە مەڵبەندی ئیسلامگەرایین.

هەڵبەتە، لە کەس شاراوە نییە کە هەوڵی ئەوە دراوە و دەدرێ ئەم دیاردەی ئیسلامی سیاسییە، لە هەرێمی کوردستانیشدا ریشاژۆ بکرێت و ویستراوە لەڕێگەی پشتیوانیکردنی مادی و مەعنەوی چەند حیزب و حیزبۆکە و رەوتی مەزەبییەوە کۆمەڵی کوردەواری چەواشەبکرێت و دۆزە سەرەکییەکەی خۆی کە دەوڵەتی کوردی و ئینسانییانە ژیانە، لەبیرببەنەوە، دیارە ئەم حیزبە ئیسلامییانە زادەی زەرورەتی پێداویستییە مادی و مەعنەوییەکانی کوردەواری نین، بەڵکو نوێنەری هەندێ هێزی بیانی نەیاری کوردن. ئەوەتا بۆ نموونە شانشینی سعودییە، لەڕێگەی وەهابییەتەوە دژایەتی بڵاوبوونەوەی دەسەڵاتی ئێران لە هەرێمی کوردستاندا دەکات، واتە کوردستان بمانەوێ و نەمانەوێ، کراوە بە مەیدانێك لە مەیدانەکانی ململانێی دوو هێزی ئیسلامی هاودژ و هەرگیز بەقازانجی ستراتیژی کورد نییە. هەڵبەتە ئەم ململانییە، زۆر بەزەقی لە هەرێمی کوردستاندا، نەك هەر لەنێو حیزب و حیزبۆکە سیاسییە ئیسلامییەکاندا، بەڵکو لەناو حیزبەکانیدیکەشدا رەنگدانەوە و کاریگەریی خۆی هەیە. زیادبوونی هەژموونی سیاسی هەر لایەك لەلایەنەکانی ئەم ململانێ سیاسییە، هاوسەنگی هاوکێشە سیاسییەکە لەسەرانسەری دەڤەرەکەدا سەنگەلا دەکات، بۆ نموونە (ی.ن.ك) بەگوێرەی لێکدانەوە سیاسییەکانی خۆی بەرژەوەندی حیزبی خۆی لەوەدادەبینێ کە بەلای ئێراندا رایبکێشێت، بۆیە زیاتر پشتیوانی لەو رەوتە سیاسییە ئایینییە دەکات کە بەلای ئێراندا مایلە. (پارتی) زیاتر بەلای رەوتی ئیسلامی سەر بە سعودییەدا رایدەکێشێت، بەوحیسابەی کە بەرژەوەندی حیزبی خۆیدا زیاتر لەوهەڵوێستەدا دەبینێ. زەقترین نموونەش لەم بارەیەوە هەڵبژاردنەکانی کابینەی

هەشتەمی حکومەتی هەرێمی کردستانە، کە ئێران بەقازانجی (ی.ن.ك) هاتبووەسەر خەت و سعودییەش لەڕێگەی رەوتی سەلەفی وەهابییەکانەوە بەقازانجی پارتی هاتبووەسەر خەت.. یانی سعودییە، کار بۆ نزیککردنەوەی سەلەفییەکان لەگەڵ پارتیدا دەکات، تا لەم رێگەیەوە، رێگەلە گەشەکردنی دەسەڵات و هەژموونی سیاسی ئێران بگرێت و هاوکێشە سیاسییەکە لەم ناوچەیەدا سەنگەلا نەبێت و تەرازووی هێزی دەسەڵاتی سیاسی بەلای ئێراندا قورسنەبێت.. سعودییە لەڕێگەی رەوتە سەلەفییەکانی هەرێمی کودستانەوە لە دەرگای ناکۆکی هاودژی بەینی (ی.ن.ك)و (پ.د.ك)ەوە خۆی بە هەرێمی کوردستاندا کردووە.

لە هەڵبژاردنی ناوبراودا ئێران دەنگی بۆ یەکێتی کۆکردەوە و سەلەفییەکانیش دەنگیان بەپارتیدا، بۆیە سەیردەکەین یەکێتی و پارتی لە روانگەی بەرژەوەندی تەسکی حیزبایەتی خۆیانەوە، بۆرە نوێنەرایەتییەکی ئەو دوو هێزە بیانییە هاودژە دەکەن و بەدەگمەن بە نەفەس و هەڵوێستی هاوبەشەوە مامەڵە لەگەڵ حکومەتی ناوەندی بەغدادا دەکەن.

هەڵبەتە دەبێ لێرەدا ئاماژە بەوەشبکرێت کە پێکهاتەی خێڵەکییانەی پارتی و رژێمی سعودییە، خاڵێکیدیکەی هاوبەشی نێوان هەردوو یانە، سەرۆك، باوکی رەمزییە، لە سیستەمی خێڵایەتیدا باوك پیرۆزە، دەبێ رێزیبگیرێت و کەس لە قسەیدەرنەچێت!

لەسعودییەشدا هەمان تاس و حەمام بەرقەرارە. وەهابییەکان لەلایەنی رۆحی و ئایینی بەرپرسن و ماڵباتی سعودیش لە دەسەڵاتی سیاسی بەرپرسن کە ئەمە بۆ خۆی جۆرە دابەشکردنێکی دوورە و بەڵام نابێ ئەوەش لەبیربکەین کە دین و دەسەڵات لێرەدا دوو رووی یەکپارچە دراون، تەواوکەر و تەواوکراوی یەکترن و بەشەریکی وڵات بەڕێوەدەبەن، بۆیە مامەڵەی ئەوان لەگەڵ پارتیدا، دەنگدانی رەوتە ئیسلامییەکانی سەر بەوان، بە پارتی، لەوپێودانگەوەیە کە دژایەتی ئێران و مەزەبی شیعە و شیعەگەراییە، واتە کەمکردنەوەی دەنگی یەکێتی، خۆی لەخۆیدا هەوڵدانە بۆ کەمکردنەوەی تەشەنەکردنی دەسەڵات و هەژموونی سیاسی ئێران لە عێراق و لەناوچەکەدا. سوننەش، لایەنێکیدیکەی

ئەم ستراتیژییەتەی سعودییەن بەرانبەر بە رەوتی شیعەگەرایی، چەکێکیدیکەی دەستی سعودییە، داعش و پشتیوانییە لە داعش! داعش داشەهارەی سعودییەیە، ئەمڕۆکە لە مەیدانی عێراقدا دژایەتییەکی خوێناوی شیعە (واتە ئێران)ی پێدەکات.. کێ دەڵێ لەگەڵ یەکەمین وەچەرخانی سیاسیدا، هەمان داشەهارە ناکات بەگژ کوردا، لە هەولێر و دهۆك و سلێمانیشدا! بەهەرحاڵ ئیدی سعودییەش وەکو هەر وڵاتێکیدیکە و بەشێوازی تایبەتی خۆی و بەگوێرەی توانای خۆی هەوڵدەدات شەڕ لە سنوور و ئاقاری خۆی دووربخاتەوە و هێندەی بکرێ شەڕی خۆی بەرێتە ئەو شوێنانەی کە مایەی مەترسین بۆ ئەو.

داعش لەعێرقدا، پراکتیزەکردنێکی مەیدانی و پراکتیکی ئەو سیاسەتەیە. لەلایەکەوە دژایەتی هەڵکشانی توانا سیاسی و سوپاییەکانی شیعەی پێدەکات و لەلایەکیترەوە ئاژاوەیەکی فرەڕەهەندی کۆمەڵایەتی، مەزەبی، نەتەوەیی ئەوتۆی لەعێراقدا پێدروست دەکات کە عێراق نەتوانێ ببێ بەودەرگایەی کە ئێران لەوێوە زەفەر لە سعودییە بێنێ. دیارە سعودییە لە پێگەی گرنگی سیاسی هەرێمی کوردستانیش غافڵنییە، بۆیە هەمان گەمەی لێرەش لەڕێگەی رەوتە ئیسلامییەکانەوە و بەشێوازێکی برێك هێدیتر پیادەکردووە و قەتەریش شان بەشانی سعودییە، لە هەرێمی کوردستاندا و لەڕێگەی ئیخوانەکانەوە، گەمەی سیاسی خۆی دەکات و هەرێمی کوردستان بە خاڵێکی گرینگی یەکانگیری سیاسی سێکوچکەکەی تورکیا و سعودییە وقەتەر دەزانێت و بەونەفەسەشەوە مامەڵە لەگەڵ واقیعی هەرێم و دەڤەرەکەدا دەکات.

یەکگرتووی ئیسلامی گوایە رەوتێکی میانڕەوە، نوێنەری ئەو سێکوچکە خەتەرناکەیە و لەوەدەچێ کورد لەگوێی گادا نووستبێ!! هەڵبەتە ئەگەر ئەم بایە لەم کونەوە بێت و حیزبەکانی کوردستان بەردەوامبن لەسەر ئەم گەمە ناکامەی خۆیان، ئەوا کورد لەئاستی نەتەوەییدا زەرەرێکی یەجگار زۆر دەکات و بە قۆناغان پاشدەکەوێت.. ئەگەر سەلەفییەکان سووکە قازانجێکی کاتی و رەوتەنیان بۆ پارتی هەبێت، ئەوا زیانێکی درێژخایەنیان بۆ جەماوەری خەڵکی هەرێم دەبێت و پارتیش بەبێ وەی لەوزیانە ناخەلەسێت.. جا هەر لەم پێودانگەوە دەشێت بگوترێ ئیسلامی سیاسی بەهەموو

ڕەوتەکانیەوە، میانڕەو، توندڕەو و سەلەفییانەوە، ڕەگیان دەچێتەوەسەر یەك سەرچاوە و هیچ خێرێك بۆ هەرێم نادەنەوە و کار بۆ ئەوەدەکەن هەرێم بکەن بەپاشکۆیەکی پووچەڵی بێشەخسییەتی، سیاسەت و ئەجندایەکی لەبنەڕەتدا دژ بە خەڵکی هەرێم و هیچ سەنگ و کێشێکی لە هاوکێشە سیاسییەکانی ناوچەکەدا نەبێت.

**باسی دووەم: هەرێم لە پارسەنگی هێزە ناوچەییەکاندا:**

جوگرافیای سیاسی هەرێمی کوردستان، لەوجوگرافیایانەیە کە پێیدەگوترێ جوگرافیای داخراو، یانی نە لەسەر دەریایە و نە بەسەر دەریادا دەکرێتەوە. جا کاریگەری ئەمجۆرە وڵاتانە لەڕووی پەیوەندییە نێودەوڵەتی و ناوچەییەکانەوە، بەزۆری سست و لاوازە و زیاتر دەکەوێتەژێر کاریگەرییە هەمە جۆرەکانەوە تا کاریگەری بەسەر دەوروبەرەوە هەبێ. واتە زیاتر دەوری بەرکار دەبینێ تا دەوری بکەر، بۆ نموونە وڵاتانی ئێران و وڵاتە عەرەبیەکان و تورکیا و سوریاش کە هەرهەموویان کێشەی کوردیان هەیە، هەرهەموویان سنووری دەریایی گرینگ یان بەلای کەمەوە گوزەرگە و بەندەری ئاویان هەیە و ئەمەش کردوویەتییە کارێك کە لەڕووی پەیوەندییە ئابووری و سیاسییەکانەوە ئاسانتر بەسەر جیهاندا بکرێنەوە و کاریگەرانەتر بێنەناو کایە ئابووری و سیاسییەکانەوە و لە هاوکێشە جۆراوجۆرە نێودەوڵەتییەکاندا، ڕۆڵێکی زۆر کاراتر لە وڵاتە داخراوەکان ببینن.. جا هەریمی کوردستان بە حوکمی ئەوەی دەڤەرێکی داخراوە و لەڕووی ئابووری و سیستەمی ئابوورییەوە زۆر پاشکەوتووە و هەڤرکی کەسادترین بازاڕی پێناکرێت و تاقە دەروازەش بۆ کرانەوە بەسەر دنیا و دروستکردنی پەیوەندی نێودەوڵەتی دەبێ لەڕێگەی ئەو دەوڵەتانەوە بێ کە ئاماژەمان بۆکردن، بۆیە ئەگەر ببێ بە خاوەنی نەوت و غازی خۆیشی و بگاتە ئاستی هەناردەکردنیان، دەبێ لەووڵاتانەوە و بە خاکی ئەو وڵاتانەدا ڕەوانەی بازاڕەکانی جیهانی بکات.. دیارە بۆ هاوردەکردنی هەموو کەلوپەل و کالآیەکیش، هەر پەنا وەبەر هەمان ئەو وڵاتانە بدرێت. یانی بەمپێیە دەکەوێتەژێر کاریگەری و باندۆری سیاسەتی ئابووری ئەو وڵاتانەوە. هەم هەڵکەوتەی سیاسی هەرێم و هەم پاشکەوتووی باری

پیشەسازی و کشتوکاڵی هەرێم ناچاریدەکات پشت بە هاوردەکردنی هەموو پێداویستییەکی ژیان ببەستێت، ئەمە جگەلە خاڵێکی لاوازیدیکە، کە لایەنی سوپایی هەرێمە، هەرێم نەك سوپاییەکی مۆدێرنی سەردەمیانەی نیشتمانی و نەتەوەیی نییە، بەڵکو کۆمەڵێك میلیشای جیاواز و ناکۆکی حیزبی هەیە کە نەك هەڤرکی ولاَتانی دەوروبەری پێناکرێت، بەڵکو زۆر بەئاسانی بەفیتی ئەو ولاَتانە دەکرێن بەگژیەکدا و دەکرێن بە دەستەچیلەی شەڕی ناوخۆ و شەڕی ئەهلی. جا بۆ کەمکردنەوە و نەهێشتنی ئەو خاڵە لاوازانە و بۆئەوەی هەرێمی کوردستان سەنگی خۆی لە هاوکێشە جیۆپۆلەتیکەکانی دەڤەرەکەدا هەبێ و بپارێزێت پێویستە لە چوارچێوەی گەمە سیاسییەکاندا، پشتیوانی مادی و مەعنەوی، لە بزاڤ و تەڤگەری رزگاریخوای کوردی بەشەکانیدیکەی کوردستانی گەورە بکات و وەکو کارتی گوشار، لەڕووی سوپایی و سیاسی و ئابوورییەوە بەقازانجی خۆی بەکاریبەرێت و دیبلوماسییانە رەوشێکی ئابووری، رامیاری سوپایی ئەوتۆ لەوولاَتانەدا دروستبکات کە نەیانپەرژێتەسەر ئەوەی دەستبنەنە بینی هەرێمی کوردستان و هەرێم لەژێر گوشاری سیاسی و هەڕەشەی سوپایی ئەواندا، لەپەلوپۆبکەوێ.

جا باپێکەوە، لەبەر رۆشنایی ئەو بۆچوونانەی سەرێڕا، سووکە هەڵوەستەیەك لەئاستی پەیوەندی جیوپۆڵەتێکی کورد لەگەڵ هەریەکێك لەوولاَتانەدا بکەین:

**باسی دووەم:**

**١. عێـــــراق:**

عێراق هەرکاتێ دەرگای گواستنەوەی نەوتی لە قۆڵی کەنداوی فارسەوە لێبگیرێت یان لە ئەردەن و سوریاوە رێگەینەدرێت، ئەوسا مەجبوری هەرێم دەبێتەوە و نەوتی عێراق لەڕێگەی هەرێمەوە دەگاتە بەندرەی جیهانی تورکی و لەوێوە بۆ بازاڕەکانی نەوتی جیهان رەوانەدەکرێت. دیارە ئەمجۆرە پەیوەندییە بازرگانییە، جۆرە بەرژەوەندییەکی هاوبەش دابیندەکات، ئەمە جگەلەوەی کە راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆش هەرێم دێنێتەناو هاوکێشە ئابووری و سیاسییەکانەوە، کە ئەمە لە هەردوو رووی مادی و مەعنەوییەوە بەقازانجی

هەرێمە. بەڵام عێراق لە هەوڵی دروستبوونییەوە تاکو ئیستا بەگومان و دوودڵییەوە مامەڵەی لەگەڵ کوردا کردووە. بەهەرحاڵ لە هەلومەرج و بارودۆخی ئاساییدا عێراق زۆر کەناڵیدیکەی وەکو کەنداوی فارس، ئەردەن و سوریای بەدەستەوەیە و زۆر منەتی بە هەرێمی کوردستان نابێت. ئەردەن بەحوکمی ئەوەی بەخۆی پێویستی بە نەوت و غازی عێراقە و بەندەر و کەناری ئاوی هەیە، مامەڵەکردن لەگەڵ ئەردەندا بۆ دەوڵەتی عێراق زۆر مسۆگەرترە لەڕێگەی هەرێم، ئەمە جگەلەوەی کە عێراق لەڕووی نەژادییەوە زیاتر حەزدەکات ئەو خێرە بۆ ئەردەن بێت نەك بۆ هەرێم، چونکە هەرێم، بەلای دەوڵەتی عێراقییەوە هەمیشە لەسەرێیە بۆ جیابوونەوە لە عێراق.. سعودییەش دندەی عێراق دەدات کە هیچ هەڵوێستێکی ئەرێنی بەرانبەر بە هەرێم نەبێت، واتە هەموو ئەو وڵاتانە چەندیش ناکۆکی نێوانیان قووڵبێت کە مەسەلە بێتەسەر دۆزی کورد و خەفەکردنی دۆزی کورد، بەئاسانی یەکدیدەگرنەوە. جا بەم پێودانگە کارتی هەرە کاریگەری دەستی کورد، کارتی هاوپەیمانییە لەگەڵ سوننەدا، کە ئەمەش هیچ دیارنییە کە بەقازانجی کورد بشکێتەوە و کورد لەڕابردوودا ئەزموونی تاڵی لەگەڵ سوننەشدا هەبووە. بۆیە ئەگەر سوننە ئەمڕۆکە هەندێك نەوازشی کورد بکات، لە خۆشی چاوی کاڵی کورد نییە، بەڵکو تەکتیکێکە بۆ خۆ بەهێزکردنە لەبەرانبەر شیعەدا و هەرکە داشی سواربوو، لە ململانێی شیعە دەربازبوو، جارێکیدی بادەداتەوەسەر کورد.

**باسی دووەم:**

**٢. ســوریـــا:**

لە کەس شاراوەنییە کە سوریا ئەمڕۆ بۆ پێنج ساڵ دەچێت لە شەڕێکی ناوخۆی یەجگار دژوار و ماڵوێرنکەردایە. رژێمی سوری لە لایەك و هێزە سەلەفی و رەوتە ئیسلامی و بەناو ئۆپۆزیسیۆنەکان لەلایەکیترەوە، سوریایان کردووە بە گۆڕەپانی جەنگێکی خوێناوی و ترسناك، وڵات لەهەموو بوارە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانەوە، رۆژ بەڕۆژ وێرانتر و کاولتر دەبێت و خەریکە لە هاوکێشەی سیاسیدا هیچ سەنگێکی ئەوتۆی نامێنێ.

ئەمە دەرفەتێکی لەبارە بۆ کورد کە لەم مەیدانەدا گەمەی خۆی بکات و لەم کێشماکێشەدا ئەگەر هەموو مافە نەتەوەییەکانیشی بەدەستنەیەنێت، ئەوا هەندێ مافی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی.. سوریا بەرەو هەرەس و هەڵوەشانەوە دەبرێت، بەبەرچاوی هەموو دنیاوە، هەموو هێزە سیاسییەکانی ناو سوریا و دەرێی سوریا، بە ئیسلامی و بەناو عەلمانی و تەنانەت رادیکالانیشەوە، هەر گروپە فڕکان فڕکانیەتی، کوڕ ئەو کوڕەیە بەشی خۆی دەستەبەربکات. سوریا خەریکە لە هاوکێشە سیاسییەکە دەکرێتەدەرەوە، کورد لە سوریا تا ئەمرۆ لەڕووی سیاسی و سوپایی و کۆمەڵایەتییەوە بەگویرەی ئەو واقیعەی هەیە بە جوانی گەمەکە دەباتبەڕێوە، بۆیە دەبێ هۆشی لای ئەوەبێ کە نابێ دەسکەوتە کولتووری و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی، لە قوربانی و فیداکارییەکانی کەمتربێت، بۆیە دەبێ لەمڕووەوە هاوئاهەنگییەکی ژیرانە و دیبلۆماتکارانەی هەمەلایەن لەگەڵ هەرێمی کوردستاندا بکرێت، بەتایبەت کە لەڕوی جوگرافییەوە بەدەم یەکەوەن و هەر یەك خاکن. خۆ ئەگەر بەرژەوەندی زلهێزەکانی دنیا وابخوازێت و کار بگاتەسەر دابەشبوونی سوریا، ئەوا باشتر، بۆیە پێویستە هەم هەرێمی کودستان و هەم خەباتکارانی کوردستانی رۆژئاوا، ئەم ئەگەرە لەبەرچاوبگرن و خەباتکارانی کوردی کوردستانی رۆژئاوا، ئەو کانتۆنانەی ژێردەستی خۆیان بەپێی توانا زیادبکەن و بەنەفەسی دەوڵەتڕانییەکی مۆدێرنەوە بەگوێرەی توانا و ئیمکاناتی خۆیان بەڕێوەبەرن و زەمینە بۆئەوە خۆشبکەن هەرکە سوریا کرا بەقوربانی بەرژەوەندی زلهێزەکان و دابەشکرا، یەکسەر لەگەڵ هەرێمی کوردستاندا یەکبگرنەوە تا هەرێم لە هاوکێشەی سیاسی ناوچەکە و جیهاندا سەنگێکی ئەوتۆ پەیدابکات کە بەئاسانی لەهەموو روویەکەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت و لە پیلانە ناوچەیی و هەرێمیەکان دەربازببێت و بەدەنگی بەرز بڵێت: "ئەوەتا منیش هەم".

**باسی دووەم:**

**٣. تورکیـــــا:**

تورکیا، لە هەرسێ لایەنی سەربازی و ئابووری و سیاسییەوە کاریگەری گەورەی لەسەر هەرێم هەیە، هەرێم لەڕووی ئابوورییەوە زۆر لاوازە، ناتوانێت پشت بە توانای ئابووری خۆی ببەستێت و یەجگار دوورە لە خودکەفایی ئابوورییەوە، زیاتر هەرێمێکی ئیستهلاکییە، بازاڕێکی هەرزان و کراوەیە بۆ تورکیا و غەیری تورکیاش، زۆربەی هەرە زۆری کاڵای هاوردەی لەڕێگەی تورکیاوەیە. بەڕاستی تورکیا بە هەرێم خەنیبووە، نزیکەی هەزار و دووسەد کۆمپانیای هەمەجۆری تورکیا، چ کۆمپانیای وەبەرهێنان، چ پیشەسازی و چ بازرگانی، لەهەرێمدا لەگەڕدان و بەڕاستی هەرێم بووە بە کۆلۆنییەکی تورکیا. هەرهەموو ئەو کۆمپانیایانە، کرێکار و ئەندازیار و کارمەندی خۆیان لەتورکیاوە هێناوە. دیارە ئەو پارانەی لە کۆمپانیاکان و ئەو لەشکرە کرێکار و کارمەندە وەریدەگرن و رەوانەی تورکیای دەکەن سیولەی دراویی لەهەرێمدا کەمدەکەنەوە و تووشی قەیرانی دەکات. لەلایەکیدیکەشەوە کارکردنی ئەو هەموو تورکە لەهەرێمدا، دیاردەی بێکاری و بەتاڵی لە ناوخۆی تورکیادا کەمدەکاتەوە و دەنگی ناڕەزایی خەڵکی تورکیا لەبەرانبەر رژێمی تورکیادا کەمدەکاتەوە کە ئەمە هەرگیز نە بەقازانجی کوردی کوردستانی باکوورە نە بەقازانجی هەرێمە. ئەمە جگەلەوەی ئاستی بژێوی خەڵکی تورکیا باشدەبێت و سیولەی دراوی تورکیا زیاددەبێ و هی هەرێم کەمدەبێت.. دیارە مامەڵەی ئەو کۆمپانیایانە بە دۆلارە، دۆلاریش لە هەرێمەکەی ئێمەدا بە (عملە صعبە) حیسابە و چوونە دەرەوەی دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی لە بازاڕ و لەبانکەکاندا، کەمبوونەوەشی کار لە توانای ئابووری و دراوی هەرێم دەکات.. ئاڵوگۆڕی بازرگانی نێوان هەرێم و تورکیا ساڵانە خۆی لە (١٤ - ١٦) ملیار دۆلار دەدات کە لەڕێگەیەوە پارەیەکی یەجگار زۆری هەرێم دەڕواتەدەرێ و وڵاتێك ئاوەداندەکاتەوە کە لەبنەڕەتدا ناحەزی رەگەزی کوردە، بەتایبەتی کە هەرێم لەڕووی پیشەسازی و کشتوکاڵییەوە ئەوەندە لەپاش و پاشکەوتووە، هەرگیز ناتوانێ سوچێکی بچکۆلەی بازاڕەکانی تورکیا پڕبکاتەوە، بۆیە هیچ هاوسەنگیەك لەو بازرگانییەی نێوان

هەرێم و تورکیادا نییە و تورکیا بەشێوەیەکی شەرعی هەرێم تاڵاندەکات، کە جارجار نەوازشێکی هەرێم دەکات، لەبەرئەوەیە بە مانگایەکی بەشیری دەزانێت.

ئەگەر هەرێم لەساڵی (۱۹۹۱)ەوە بەگوێرەی نەخشە و پلانی زانستی کاری بۆ بەپیشەسازیکردن و ریفۆرمی کشتوکاڵی هەرێم، بە نەفەسێکی نەتەوەیی و دەوڵەتڕانییەوە بکردایە و هەموو شتەکانی نەکردبایە بەقوربانی حیزب حیزبێنە، هەرگیز بەمشێوە نەگینە نەدەکەوتینەژێر کاریگەریی سیاسی و ئابووری تورکیاوە.. خۆ سەبارەت بە سیاسەتی نەوتی هەرێم، وەکو دەڵێن، تاریکی مانگ سەرلەئێوارە دیارە.. سیاسەتێکی زۆر ناڕوون و ناکامە و هەرگیز بەگوێرەی نەخشە و پلانێکی ستراتیژی نەتەوەیی بەڕێوەنابرێت و هیچ وڵاتێکی نەوتی رۆژهەڵات وەکو پێویست خێری لە نەوت نەدیتووە، بۆیە دەسەڵاتدارانی هەرێم خەیاڵیان خاوە بهێڵرێ ئەو پارووە چەورە بەئاسانی بخۆن و با واتەسەورنەکەن بەونەفەسە حیزبییە تەسکەوە ئەو پارووەیان پێڕەوابدینرێ.. جا لەبەر تێکرای ئەو هۆیانەی کە لەسەرڕێڕئاماژەیان بۆکرا، هۆکارن بۆ باڵا دەستی سیاسی و ئابووری بەسەر هەرێمی کوردستاندا.. ئەمە جگەلەوەی کە شەڕە دەسەڵاتی یەکێتی و پارتی کەناڵێکی زۆر ئاسان و هەرزان بەهای بۆ تورکیا کردەوە، بەکەماڵی ئیسراحەت بێتەناوەوە و لەڕووی سیاسی و سەربازییەوە حوزور و ئامادەبوونێکی ئەوتۆ پەیدابکات کە کاربکاتەسەر هەرێم و لەودوو لایەنەشەوە تەواو لاواز و بێشەخسییەتی بکات. داشکاندنی پارتی بەلای تورکیادا، لە ترسی یەکێتییە وەکو چۆن داشکاندنی یەکێتی بەلای ئێراندا لە ترسی پارتییە کە ئەم دیاردەیە لەدوا ئەنجامدا بەقازانجی تورکیا و ئێرانی داگیرکەری کورد و بەزەرەری نەتەوەی کورد و تەنانەت پارتی و یەکێتیش دەشکێتەوە.

حاڵی حازر یەکێتی و پارتی، لەهەرێمدا خاوەنی سیاسەتێکی سەربەخۆ نین و جۆرە پاشکۆیەتییەکی ئێران و تورکیایان پێوەدیارە.. دیارە ئەمەش باجی ململانێی تەسکی حیزبایەتی و شەڕە کورسی دەسەڵاتە و لە کیسەی میللەتی کورد دەدرێت !! بۆیە پێویستە هێزە سیاسییەکانی هەرێمی کوردستان تازووە بە سیاسەتی خۆیاندا بچنەوە و قەناعەت بەزەرورەتی دەساودەسکردنی دەسەڵات بێنن تا بە نەفەسێکی نەتەوەییەوە، هێز و

لەشکرێکی یەکگرتووی کوردستانی دابمەزرێت و تێکڕای کەناڵە حەیاتییەکانی هەرێم، لەسەر بنەما و بناغەی دامەزراوەیی بنیاتبنرێتەوە و هەرێم بەنەفەسێکی دیموکراتییانەی دەوڵەتڕانییەوە بەڕێوەببرێت و ببێ بەئەزموونێکی دەوڵەمەند بۆ ئاییندەی کورد و کوردستان و لەهەرێمدا نموونەیەکی ئەرێنی ئەوتۆ پێشکەشبکەین، کە هەرێم سەنگ و ئیحتوبارێکی سیاسی وەها پەیدابکات کە لە هاوکێشە سیاسییەکانی ناوچەکە و دنیادا حیسابی بۆبکرێت.

بۆ نموونە، کارتی بزاڤی رزگاریخوازی کورد لە باکوری کوردستاندا، یەکێکە لەوکارتانەی کە کەس لە هەرێم لەپێشترنییە، بۆئەوەی زۆر بەجیدی مامەڵەی لەگەڵدابکات، مامەڵەکردنی ئەرێی هەرێم لەگەڵ بزووتنەوەی ناوبراودا، خۆی لەخۆیدا، فاکتەرێکە بۆ کەمکردنەوەی گوشاری تورکیا لەسەر هەرێم. چونکە هەرێم تائێستا ناتوانێ کارتی هەناردەکردنی وزە بۆ تورکیا، وەکو گوشار بۆسەر تورکیا بەکاربێنێ. خۆ پەیماننامەی نێوان روسیا و تورکیاش سەبارەت بەدامەزراندنی بۆری گواستنەوەی غازی سروشتی لەڕێگای تورکیاوە بۆ ئەوروپا، دەکاتە کارێك، ئەگەری گوشاری هەرێم، لەڕووی هەناردەکردنی وزەوە بۆ تورکیا، تەواو کەمببێتەوە، دیارە روسیا و تورکیا لەڕێگەی ئەم رێکەوتنە بەناوەڕۆك ئابووری و بەشێوە سیاسییەوە پەیوەندییەکی هاوپەیمانی رکابەرن، هەر لایەکیان پەیامی سیاسی خۆشیان هەیە. تورکیا دەیەوێ ناتۆ مل بۆ ئەجنداکانی ئەو لەسوریادا بدات. روسیاش دەیەوێ بە ئەوروپا بڵێ (قرم) بەشێکە لە روسیا و نەك بە قەیرانی ئۆکرانیای دروستکراوی ئەمریکا و ناتۆ، بگرە بە قەیرانی زۆر گەورەتریش چۆکدانادات و لەڕێگەی ئەندامێکی زۆر هەستیاری ناتۆوە، لەڕووی ئابوورییەوە بەسەر دنیا و ئەوروپادا دەکرێتەوە کە ئەمە لەئەنجامدا گوشاری هەرێم لەسەر تورکیا هێندە کەمدەکاتەوە کە بچێتە خانەی نەبووەوە.

**باسی دووەم:**

**٤. ئێــــــران:**

ئێران یەکێکە لەو وڵاتانەی کە لەگەڵ هەرێمی کودستان و چەندین وڵاتیتردا هاوسنوورە. لەسەر کەنداوی فارسە، گەرووی هورمزی بەدەستەوەیە، لەڕووی سوپایی و ئابوورییەوە لە وڵاتەکانی دەورووبەری بەتواناترە، ئەمە جگەلەوەی کە دۆستایەتی لگەڵ زلهێزێکی وەکو روسیاشدا خۆشە. "هەڵبەتە کۆماری ئیسلامی ئێران، سەرباری ئەوەی بە خۆی و بە حوکمی هەڵکەوتە جوگرافیاییەکەیەوە پێگەیەکی ستراتیژی زۆر گرنگی هەیە، لە سۆنگەی هەندێ بارودۆخ و هەلومەرجی تایبەتی دەولییەوە گرینگییە ستراتیژی و پێگە هەرێمایەتییەکەی، هێندەیدی زیادیکردووە، چونکە کەوتووەتە نێوان دوو ناوچەی چەقی جەنگی جیهانییەوە دژی تیرۆر، واتە نێوان عێراق و ئەفغانستان"(٢٣)

ئێران جگەلە پێگە ستراتیژییە گرینگەکەی، توانایەکی سوپایی گەورەشی هەیە و هەژموونی تەواوی بەسەر کەنداوی فارسدا هەیە، و جەماوەرێکی شیعەی باشی لەزۆربەی وڵاتانی کەنداویشدا هەیە. حوزورێکی هەمەلایەنەی ئابووری، ئایینی و سیاسی راستەوخۆیشی لەعێراقدا هەیە، "هەروەها پردی پەیوەندی نێوان ئاسیای ناوەندی و رۆژئاوای ئاسیاشە کە لەرۆژهەڵاتەوە هاوسنووری ئەفغانستانە و لەڕۆژئاواوە هاوسنووری عێراقە ئەمە کردوویەتییە کارێك رۆڵێکی یەجگار گرینگ لە جەنگی جیهانی دژیتیرۆردا بگێرێت، بەحوکمی ئەو پێگە جوگرافیاییەی کە دەڕوانێتەسەر عێراق و ئەفغانستان، بۆیە ئەمریکا ئەگەر نەتوانێ لەڕێگای پاکستانەوە کۆمەکی لۆجستی بگەیەنێتە ئەفغانستان، ئەوا بۆ ئەو مەبەستە ناچارە پەنا وەبەر ئێران بەرێت"(٢٤)

ئێران بەگوێرەی توانا، لایەنی پیشەسازی و کشتوکاڵی و سوپایی فەرامۆشنەکردوە و کاری بۆ پەرەپێدانیان کردووە و جۆرە پێشکەوتنێکی پێودیارە... بەهەرحاڵ لێرەدا زیاتر پەیوەندی ئێران و هەرێم مەبەستە. پەیوەندی هەرێم و ئێران لەڕووی ئابووری و بازرگانییەوە، تەقریبەن هەمان پەیوەندی هەرێم و تورکیایە. ئێرانیش وەکو تورکیا، لەڕێگەی لایەن و حزبێکی کوردییەوە جێپێیەکی بۆ خۆی کردووەتەوە و لەورێگەیەوە

ئەجیندای سیاسی خۆی لە هەرێم پیادەدکات کە یەکێك لەوئەجندایە رکابەرییە لەگەڵ تورکیادا و کارکردنە بۆ کەمکردنەوەی هەژموونی تورکیا لە دەڤەری هەرێمدا.

ئێران بە تیرێك چەندین نیشان دەشکێنێ، هەڤڕکی سیاسەتی تورکیا لەهەرێمدا دەکات و کۆسپی دەخاتەڕێگا، کورد لە سوننەی عێراق دادەبڕێت، تا بەرەیەك لەگەڵ سوننەدا دژی شیعە دروستنەکات.. ئەمە جگەلەوەی ئەگەری یەکێتی کوردیش لەهەرێمدا بەتەواوەتی دەسڕێتەوە کە ئەمە هەڕەشەیەکی پڕمەترسییە لە ئەزموونی دەسەڵاتڕانی هەرێم. دیارە تورکیا و ئێران هەریەکەیان ئامانجی تایبەتی خۆی لەعێراقدا هەیە سەبارەت بە ئەزموونی دەسەڵاتڕانی هەرێمیش هەگیز دۆستانە مامەڵەی لەتەکدا ناکەن، چونکە بەخۆیان کێشەی کوردیان هەیە و سەرکەوتنی ئەزموونی سیاسی هەرێم دەبێتە هاندەرێك بۆ کوردی هەردوو کوردستانی باکوور و رۆژهەڵات، بۆیە هەرێم لەسەرێتی زیرەکانە گەمە بەم کارتە گرینگ و هەستیارە بکات، تاکو وەکو هێزێکی کارا لە هاوکێشەی هێزی ناوچەکەدا حیسابی بۆبکرێت.

ئێران وڵاتێکی فرەنەتەوە و کەلتوورە، جگەلە هەردوو مەزهەبی شیعە و سوننە، زۆر وردەمەزەبان و تیرە و تایفەی ئایینی جیاوازی تیایە. شیعە و سوننە، بەزەقی و پەنهانی کێشماکێش و ململانێیان لەنێواندایە، شیعە دەستیان بەسەر هەموو دەسەڵاتەکانی ئێراندا گرتووە، سوننە هەست بە مەغدورییە دەکەن، ئەگەر پشتیوانیبکرێن دەتوانن لە باری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە نائارامی بۆ ئێران دروستبکەن، وەختێ نائارامی ناوخۆیی بۆ ئێران دروستببێ، ئیدی نایپەرژێ بەئاسانی پەلوپۆ بۆ دەرێی خۆی بهاوێژێ.. واتە هەرێم دەتوانێ لەهەردوو خەتی مەزەبی و نەتەوەییشەوە گەمەی سیاسی خۆی بکات و سنوورێك بۆ تەشەنەکردنی زێدەگاڤییەکانی ئێران دابنێ، دیارە ئەمەش بەبێ توانای ئابووری و سوپایی پێشکەوتوو پلانی دروست و سەرکردایەتییەکی یەکدەنگ و یەکگوتار و کارامە و لێزان هەرگیز نایەتەدی.

**بەشی سێیەم:**

**نەخشە و ستراتیژیەتی سیاسەتی هەرێم**

(حامد ربیع) دەڵێت: "بیرکردنەوەی ستراتیژی بریتییەلە وێناکردنی ئاییندە و دانانی نەخشەیەك بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئاییندەدا، بەو حیسابەی کە درێژەی ئێستا و ڕابردووە"[(٢٥)]

جا لێرەدا سەبارەت بە هەرێم و دەسەڵاتڕانانی هەرێمی کوردستان پرسیار ئەمەیە، ئاخۆ هیچ نەخشە و بیرکردنەوەیەکی ستراتیژیان هەیە؟ پەندیان لە رابردوو وەرگرتووە؟ هیچ خوێندنەوەیەکی جیدیان بۆ ئێستا هەیە؟ بەچ میکانیزمێك کۆمەڵگە بەرەو ئاییندە دەبەن؟ هیچ رۆشنبینییەکیان دەبارەی ئێستا هەیە تا دەربارەی ئاییندە هەیانبێ؟ هەڵبەتە واقیعی هەرێم لە وەڵامی ئەو پرسیارانە و زۆر پرسیاریتردا، پێماندەڵێت: نەخێر، بیرکردنەوەی ستراتیژی لەئارادانییە، پەند و عیبرەت لە رابردوو وەرنەگیراوە، خوێندنەوەیەکی جیدی بۆ ئێستا نییە، سوود لە ئەزموونی وڵاتانیدیکە وەرنەگیراوە، پاشاگەردانی باڵی بەسەر هەموو کایەکانی ژیانی هەرێمدا کێشاوە، هەرێم لەهیچ روویەکەوە نەبووە بەو هێزە کارایەی کە حیسابی بۆبکرێت.

دەبوایە دەسەڵاتڕانانی هەرێم بەگوێرەی نەخشە و پلانی ستراتیژی بیریان لەوەبکردایەتەوە کە چۆن کار بۆ پێشخستنی پیشەسازی و کشتوکاڵی و کایە حەیاتییەکانیدیکەی هەرێم بدرێت.

(زید الهویدی) لەبەر رۆشنایی پێناسەکەی (حامد ربیع)دا، دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە: "رۆشنبیری گشتی هزرڤانی ستراتیژی، ئاستی خوێنەواری زانستی، ئاستی تێگەیشتنی، پەروەردە و ئەزموونە سیاسییەکانی، ئەو نەسەقە ئایدولوژییەی کە باوەڕی پێیەتی، تەبیعەتی ئەو دەزگا و دامەزراوەیەی کە کاری تیادەکات، هەلومەرجی دەوروبەرەکەی کە ژینگەیەکی سایکولوژی دیاریکراوی بۆ دەسازێنێ، هەرهەموو ئەو فاکتەرانە رۆڵی گەورەی لە سروشتی بەرهەمی هزریی داهێنەرانەدا دەبینێ و کار لە تەبیعەت و سروشتی بیری ستراتیژی نەتەوەیی دەکات"[(٢٦)] جا بەم پێودانگە، نەخشەی ستراتیژی لەلایەن هزرڤانانی ستراتیژییەوە دێتەدارشتن و ئەو خەڵکانەش دەبێ هەموو ئەو

مەرجانەیان تێدابێ کە لەسەرێ ڕا ئاماژەیان بۆکراوە، بەڵام لەهەرێمدا، ئەو هزرڤانە ستراتیژییانە یان نین یان هەن و کەس هیچ بە کڵاویان ناپێوێ یان دوورن لە دەسەڵات و پرۆژە حزبییەکانی دەسەڵات! یان لەناو دەسەڵاتدان و لە قاڵبی حیزب و دەسەڵاتدراون و ناهێڵرێ مومارەسەی دەسەڵاتەکانی خۆی بکات، بۆیە دەتوانرێ بگوترێ لەهەرێمدا هیچ بەرنامەیەکی ستراتیژی نەتەوەیی لەئارادانییە و سەرچۆپی بەدەستی حیزبانەوە، حیزبیش چ حیزب! پاشقەرۆترین حیزب! وەك دەڵێن سەرچۆپی بدەیە گامێشێ هەر بۆلای کادێنی دەکێشێ! هەڵبەتە پرۆسەی هزرینی ستراتیژی نەتەوەیی، قارچك نییە لەخۆڕا هەڵتۆقێ، بۆئەوەی بەجوانی بخەملێ و گەڵاڵەببێ، دەبێ‌بەلایکەمەوە بە سێ قۆناغدا تێبپەرێت:

**قۆناغی یەکەم: کۆکردنەوەی هزر و بیرانە.**

**قۆناغی دووەم: دارشتنی بیرەکانە.**

**قۆناغی سێیەم: نرخاندن و هەڵسەنگاندنی بیرەکانە"[٢٧]**

جا ئەمجۆرە بیرکردنەوە ستراتیژیانە، نەك هەر لەناوەندە حیزبی و بەناو سیاسییەکانی هەرێمدا نییە، بگرە لە زانکۆکان و دامودەزگا بەناو ئەکادیمیەکانیشدا یان هەرنییە یان بەجۆرێ حیزبێنراوە لە نرخی نەبوودایە.

**"هەر پلانێکی ستراتیژی نەتەوەیی دەبێ رۆشنبینی روون و رەوانی دەربارەی ئەم خاڵانە هەبێ:**

١. چەمك و مانای پلانی ستراتیژی نەتەوەیی.

٢. تایبەتمەندی و خەسڵەتەکانی پلانی ستراتیژی.

٣. بایەخ و گرینگی پلانی ستراتیژی.

٤. سیما گشتییەکانی پلانی نەتەوەیی.

٥. دیاریکردنی دەوری سەرکردایەتی ستراتیژی لەکاراکردن و چالاکاندنی پرۆسەی پلانی ستراتیژی.

٦. دەستنیشانکردنی تەبیعەتی پەیوەندی نێوان پرۆسەی بیرکردنەوە و هزرینی ستراتیژی و پرۆسەی پلان و نەخشەدانانی سراتیژی" [٢٨]

جا چونکە هەرێم لەبواری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە، نەخشە و پلانی ستراتیژی نەتەوەیی نییە، بۆیە ناتوانێ ئەو رۆڵە کارایەی هەبێت کە پێویستە لەناوچەکەدا بۆ خۆی هەیبێت. هیزێك بێت، هاوکێشە سیاسی و ئابوورییەکانی ناوچەکە بەقازانجی خۆی بگۆڕێت، بەپێچەوانەوە وەکو پارسەنگ بۆ راستکردنەوە و هاوسەنگکردنەوەی ململانێ و کێشماکێشی هێزە دەرەکی و هەرێمایەتییەکان بەکاردەبرێت و چونکە خاوەنی بیر و نەخشەی ستراتیژی نەتەوەیی نییە، بەئاسانی شەڕی خەڵکی دێنێتەناو ماڵەکەی خۆی و زۆرجار پێبزانێ یان نەزانێ بەوەکالەت شەڕی ئەوان دەکات و ماڵی نەتەوەیی خۆی وێراندەکات و ماڵی ئەوان ئاوەداندەکاتەوە.

رەنگە هەندێکەس، بەتایبەتی لە نووسەرانی هەواداری حیزبە دەسەڵاتدارەکان بەم بۆچوونانە ناقاییلبن، بە بۆچوونی رەشبینانەی بزانن، پێیانوابێ هەرێم لەڕووی جیۆپۆلەتێك و ئابوورییەوە پێگەیەکی حیساب بۆکراوی هەیە و هاوسەنگی هێزی لەدەڤەرەکەدا راگرتووە.. هەڵبەتە ئەو خەڵکانە ئازادن چۆن بیردەکەنەوە، بەڵام واقیعی هەرێم ئەوەمان پێدەڵێت کە لەڕووی ئابوورییەوە زۆر لەپاشە و لەوپەڕی پاشاگەردانی و فرەخاوەنیدایە، لەڕووی سەربازییەوە، هێزێکی فشەڵی تەقلیدی میلیشاییە و چەکی هەرەباوی تفەنگە! لەڕووی سیاسییەوە گوتاری یەکگرتووی نەتەوەیی نییە، لەڕووی ئیداری و حکومەتدارییەوە، هێشتا بەدەم شیرپەنجە کوشندە پەنجا بەپەنجا حیزبییەکەوە دەناڵێنێ، ئیدی ئەم هەرێمە گۆج و ئیفلیجە چۆن دەتوانێ لەم هەزارڕێیانە بێپێشینەیەی سەدەی بیست و یەکەمدا رێی خۆی دەربکات، نەخوازەڵلا بەم ئەقڵییەتە حیزبیە تەسکەوە کە وەکو مۆریانە داویەتییە گیانی نەتەوەی کورد.

●●●

**سەرچاوەکان:**

**١. هادي قبيسي، السياسة الخارجية الامريكية بين مدرستين: المحافظية الجديدة و الوقعية، الدر العربية للعلوم ناشرون، عين التينة – شارع المفتي توفيق خالد، بناية الريم، الطبعة الاولى، ٢٠٠٨، ص٢٥**

**٢– ريتشارد ليتل، توازن القوى في العلاقات الدولية – الاستعارات و الاساطير و النماذج، ترجمة (هاني**

تابري)، دار الكتاب العربي، بيروت، لبنان، ٢٠٠٩، ص ١١٢.

٣. بير بيارنيس، القرن الحادي والعشرون لن يكون امريكياً، ترجمة: مدني قصري، المؤسسة العربية للدراسات و النشر، بيروت، لبنان، ٢٠٠٣، ص٣٨.

٤. بير بيارنيس، القرن الحادي والعشرون لن يكون امريكياً، ترجمة: مدني قصري، المؤسسة العربية للدراسات و النشر، بيروت، لبنان، ٢٠٠٣، ص١١٩

٥. هادي قبيسي، السياسة الخارجية الامريكية بين مدرستين: المحافظية الجديدة و الوقعية، الدار العربية للعلوم ناشرون، عين التينة - شارع المفتي توفيق خالد، بناية الريم، الطبعة الاولى، ٢٠٠٨، ص٢٩-٣٠

٦. دكتور محمد السيد سليم، تطور السياسة الدولية في القرنين التاسع عشر و العشرين، جمهورية مصر العربية، دار الفجر الجديد للنشر و التوزيع، طبعة الثانية، ٢٠٠٤، ص ٧٣

٧. ماجد احمد زاملي، (الحوار المتمدن)، العدد ٢٢٨٦، ٢٠١١، المحور، مواضيع و ابحاث سياسية (توازن القوى الدولية).

*) سوودم لة (مجلة دراسات استراتيجية) وةرطرتووة كة (مركز الامارات للدراسات و البحوث الاستراتيجية)، عدد ١٢٩، طبعة ٢٠٠٨، أبوظبي.

٨. فوزي حسن حسين، التخطيط الاستراتيجي للسياسة الخارجية و برامج الامن القومي للدول (الولايات المتحدة الامريكية نموذجاً)، مكتبة مدبولي، القاهرة، ط ١، ٢٠١٣، ص٣٣٥

٩. فوزي حسن حسين، التخطيط الاستراتيجي للسياسة الخارجية و برامج الامن القومي للدول (الولايات المتحدة الامريكية نموذجاً)، مكتبة مدبولي، القاهرة، ط ١، ٢٠١٣، ص٣٣٥-٣٣٦

١٢. مصطفى علوي سيف / مجلة دراسات استراتيجية، مركز الامارات للدراسات و البحوث الاستراتيجية، عدد ١٢٩، الطبعة ٢٠٠٨ / أبوظبي، دولة الامارات العربية المتحدة، ص ٨١.

١٣. Foreign Affairs عن شؤون السياسية، (توازن القوى في الشرق الاوسط - نهج اميركا الجديد، ترجمة (ليندا سكوتي)، الاحد ٣/١١/٢٠١٣.

١٧. هةمان سةرضاوةي ثيَشوو، ل ١٥٤.

٢١. هةمان سةرضاوةي ثيَشوو، ل ٢٤٨.

٢٣. فوزي حسن حسين، التخطيط الاستراتيجي للسياسة الخارجية و برامج الامن القومي للدول - الولايات المتحدة الامريكية نموذجاً. مكتبة مدبولي، القاهرة، ط ١، ٢٠١٣، ص١١١).

٢٤. هةمان سةرضاوةي ثيَشوو، ل ١١٢

٢٥. -فوزي حسن حسين، التخطيط الاستراتيجي للسياسة الخارجية و برامج الامن القومي للدول - الولايات المتحدة الامريكية نموذجاً. مكتبة مدبولي، القاهرة، ط ١، ٢٠١٣، ص ٣٩

٢٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٣

٢٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٦

٢٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٣

# هونەری جەنگی کورد لە چیا

محەممەد بەکر

ئازایەتی دیارترین سیفەتێکە کە لەمێژوودا درابێتە پاڵی کورد،[أ] هەروەك سەرچاوەکان ئاماژە بەوەدەدەن کە وشەی کورد لەبنەڕەتدا وشەیەکی هیندۆئەوروپییە و بەمانای پاڵەوان یان جەنگاوەر دێت.[١] هەندێکیدیکە وشەی کورد بەواتای ئازا و بەجەرگ یان شەڕانی و کۆڵنەدەر ماناەکەن و ئەسڵی وشەکەش بە فارسی دەزانن.[٢] درایڤەر سەبارەت بە ئازایەتی کوردان دەنووسێت: "ئازایەتی کورد، جێگەی قسەنییە و هەر لەمێردمنداڵییەوە چووەتە مێشکیانەوە کە"چەك نیوەی شەڕە" لەعەینیکاتدا ترس لە مردن یا کوژرانی نێو شەڕ هەرنییە.[٣] ریچ وەك بیستویێتی بۆماندەگێڕێتەوە کاتێ ئەوڕەحمان پاشای بابان لەسەرەمەرگدا لەسەر جێ بووە، کەسوکار و خزمەکانی ئازارێکی زۆریان بەدەست هێمنکردنەوە و دامرکاندنەوەیەوە چەشتووە، چونکە لەبارێکی زۆر خرۆشاو و هەڵچوودابووە و هەرئەوەی دووبارەکردووەتەوە کە بەزەبوونی و دەستەپاچەیی لەناوجێگادا دەمرێ، لەکاتێکدا حەزیکردووە لە مەیدانی شەڕەفدا بمرێ..[٤] - ب- هەژاری موکریانیش لە پێشەکی وەرگێڕانی شەڕەفنامەدا لە باسی ئازایی کورددا دەڵێ: ئەگەر پیاو بۆخۆی کورد نەبێ یان دەماری کورد باشنەناسێ، لە باسی ئازایەتی ئەم گەلەدا سەریدەماسێ و لایوایە بەشێکن لە چیرۆك و ئەفسانە و شتی وا رووینەداوە."..

زیندوومانەوە و گێڕانەوە و دەماودەمکردنی ئەو چیرۆك و بەسەرهاتانەی کە باس لە ئازایەتی و جوامێری دەکەن لەنێو کورددا هەر لەو ئەوینە قووڵەی کوردەوە سەرچاوەیگرتووە کە بۆ ئازایەتی هەیانە.. چیرۆکەکانی دوانزەسوارەی مەریوان و قەڵایی دمدم و دەیانیدیکە رووبەرێکی گەورەیان لە هونەر و ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی داگیرکردووە.. ئەگەرچی پاڵەوانەکەش کورد نەبووبێت وەك رۆستەم و زۆراب یان کەسایەتی

ئەسکەندەری مەکەدۆنی کە لەنێو کورددا وەك سەرکردەیەکی جیهانگیر ناسراوبووە، بەلاّم ئەوەی مایەی پرسیارە ئەوەیە نەتەوەیەك لەمێژوودا بەئازایەتی ناسرابێت و بەدرێژایی مێژووش نەیانتوانیبێت وەك نەتەوەکانیدیکە دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیان هەبێت؟؟ یان وەك ئەوەی هیگڵ پێیوایە "سەرکەوتن لەجەنگدا، زادەی توانای راستەقینەی نەتەوەکان بووە". [٥] دەشزانین ئازایی مەرجی بنەڕەتی سەرکەوتنە، کوردیش ئازایە، بەلاّم بۆ تا بەئەمرۆش ژێردەستەی نەتەوەکانیترە؟ ئەم دەرئەنجامە پێچەوانە چیمان پێدەڵێت؟؟ هەرچەندە ئەم پرسیارە وامان لێدەکات گومان لە ئازایەتی کورد بکەین، بەلاّم ئەوەی تەمی گومانمان دەڕەوێنێتەوە ئەوەیە کە ئەم سیفەتەی لەمێژوودا دراوەتە پاڵ کورد لەلایەن دوژمنانی کوردەوە دانپیانراوە و گەڕیدە و بیانییەکانیش گەواهی ئەم راستییە دەدەن.. سەبارەت بەوەی کە کورد نەیتوانیوە تا بەئەمرۆش دەوڵەتی سەربەخۆی هەبێت، هۆکار گەلێك رێگربوونە کە دەتوانم بڵێم خودی ئەم نووسینە تایبەتە بە بەشێك لەو هۆکارە جوگرافییانەی کە رۆڵی لە ئاراستەکردنی مێژووی کورددا هەبووە.. لێرەدا هەوڵدەدەین رۆشنایی بخەینەسەر شێوازەکانی تاکتیکی جەنگی و ستراتیجی سەربازی کورد لەمێژوود او رۆڵی تۆپۆگرافیا لەسەر جموجووڵە سەربازییەکان و پرکردنەوەی بۆشایی نابەرامبەری هێزەکان، هەروەها رۆڵی چیاکانی کوردستان لەپەکخستنی جموجوڵی سەربازی دوژمن و بەمەحاڵکردنی هێرشی بەرەیی و تاچەند چیا وەك قووولاّیی بەرگری فریادڕەسی کورد بووە لەبەرامبەر سوپای دوژمندا ؟؟.

کورد وەك نەتەوە لەهیچ قۆناغێکی مێژوودا نەمانبیستووە بە یەکگرتوویی بەرامبەر ئەوانیدی لەبەرەیەکدا جەنگیکردبێت، ئەوەی وەك کورد لەمێژوودا ناویهاتووە خێڵێك یان فیدراسیۆنی چەند خێڵێکی کورد یان میرنشینێك بووە، هەرئەم پەرتەوازەیی و پارچەپارچەبوونە وایکردووە ئازایەتی ئەم نەتەوە جەنگاوەرە بەرهەمێکی نەبێت.. دەربارەی تاکتیکی جەنگی کورد لەچیاکاندا، ئەوەی مێژوو پشتگیریدەکات ئەوەیە کە کوردەکان وەك نەتەوە هەمیشە بەرگریکەربوون تائەوەی کە هێرشبەربن.. ئەمەش سەرچاوەیگرتووە لەوەی کورد بە حوکمی شاخاوییبوونی نیشتمانەکەیان تووشی

پەرتەوازەیبوون و دابەشبوونیان لەم دیوودیوی زنجیرە چیاکان رێگربووە لەوەی بتوانن سوپایەکی گەورەی واپێکبێنن بیر لەفراوانخوازی و لەشکرکێشی بکەنەوە، سەرەڕای دابەشبوونی کوردستان بەسەر دەوڵەتانی دەوروبەریش لێکترازانی قووڵ و ریشەیی کۆمەڵگەی کوردی پارچەپارچەکردووە، دابەشبوونی ئایینی و مەزهەبی و خێڵەکی و دواجاریش پەرتەوازەیی زمان، ئەمانە هەموو هۆکاری ئەوەن کە کورد لەسەر شانۆی مێژوو وەك هێزێکی کارا و بڕیاربەدەست نەبینرێ، لەلایەکیترەوە لە بەرەبەیانی سەرهەڵدانی شارستانییەتەوە کوردستان جێگەی ژیان بووە، بەلاّم بەخشندەیی سروشتی زەوی و ئاسانیی پارێزگاریکردن لە دەوروبەر کە زۆرتر شاخاوییبوو، ئەوەندەی پێویستنەدەکرد خەڵکەکە خۆی بە حوکمەتکاری و سوپاسازییەوە خەریکبکا، بەمجۆرە حوکمەتە ناوخۆییەکان هەر بەو بچووکی و زەبوونی و کەمدەسەڵاتی مانەوە، لەبەرامبەر ئەمەدا، لە دەشتە نەرمەکانی میزۆپۆتامیای دراوسێدا، چونکە سەرچاوەکان کزبوون، ژیان پێویستی بەدەستپێوەگرتنیان دەکرد (وەکو پرۆژەکانی ئاودێری و گلدانەوەی ئاوی سێلاو) هەروەها پاراستنی دەشتاییە بەربەتاڵەکان، پێویستی بە رێکخراوەی حوکمەتی دەکرد جگەلە سازدانی هێزی سوپایی، بۆیە شانبەشانی دروستبوون و پەرەسەندنی قەوارەی حوکمەتەکان، شارەکانیش زیاتر گەورە و پانەوە بوون.[٦]

بۆ بەرچاوروونی زیاتر سەبارەت بە تاکتیکی جەنگی کورد لەچیاکاندا چەند رووداوێکی مێژوویی وەك نموونە بۆ باسەکەمان دێنینەوە، نارامسینی پادشای ئەکەدستان (٢٢٩١-٢٢٥٥)پ.ز دەڵێت: هەرکە گەیشتینە ناوەندی چیاکان، لەناکاودا لێماندەرپەڕین، پەلاماریانداین و بوونی خۆیان سەلماند.[٧] زەینەفۆن (٤٠١) پ.ز سەرداری ئەو دە هەزار[ج] سەربازە بەکرێگیراوە یۆنانییە بوو، کە بۆ یارمەتی راپەڕینەکەی "کۆرشی بچووك" بەسەر ئەردەشێری برایدا هاتبوونە ناوچەکە، لەکاتی گەڕانەوەیاندا، بە ولاّتی (کاردۆخی) کورداندا تێدەپەڕن و لەگەڵیاندا دەکەونەشەڕەوە. زەینەفۆن بەرلەوەی بە خاکی کاردۆخییەکاندا تێپەڕبێت لە دیلەکانی جەنگ سەبارەت بە کاردۆخییەکان ئەوەی پێوتراوە کە"''رێگەی باکووریش بەودیوی چیاکاندا دەچێتەناو کاردۆخییەکان.. گوتیان ئەو

خەڵکە لەچیاکاندا دەژین و زۆر شەڕەنگێزن و سەر بە شا نین. لەراستیدا جارێکیان لەشکریەکی ١٢٠,٠٠٠ کەسی شا چووەتە نێو وڵاتەکەیان و یەك کەس لێیدەرنەچوو بەهۆی سروشتی یەکجار سەختی ئەو خاکە(٨)، کەواتە دوو هۆکار وای لە سوپای یۆنانی کردووە کە ویستوویانە بەنەرمی رەفتاربکەن و لەگەڵ کاردۆخییەکان نەکەونە جەنگەوە:

یەکەم ئەوەیە سەرەڕای سەختی ناوچەکەیان زانیویانە خەڵکێکی ئازان و شەڕکەرن.
دووەم زانیویانە سەر بە شا نین و هەردوولا دوژمنی هاوبەشیان هەیە، بەڵام ئەوەی بوو بە مێژوو ئەمەبوو، زەینەفۆن دەڵێ ""کە لەشکرەکە گەشتە نێوکۆمەڵە گوندێك، کە لە دۆڵەکانی بنارەکەدا بڵاوبوونەوە، کاردۆخییەکان یەکسەر ماڵەکانیان چۆڵکرد و بە ژن و منداڵەوە هەڵاتن بۆ چیاکان.. دواتر دەڵێ ویستمان بەنەرمی رەفتاریان لەگەڵدا بکەین، چونکە کاردۆخییەکان دوژمنی شا بوون، بەڵام کاردۆخییەکان هیچ ئاماژەیەکی دۆستانەیان دیارنەخست کە تاریك داهات کاردۆخییەکان کۆبوونەوە و هێرشیانکردەسەر بەشی دواوەی سوپای یۆنانییەکان و بە تیر و بەرد هەندێکیان لێکوشتن. ژمارەی کاردۆخییەکان هێندە زۆرنەبوو لەراستیدا ئەگەر لەم رووداوەدا بە ژمارەیەکی گەورەترەوە هاتبان رەنگبوو بەشێکی گەورەی یۆنانییەکان رامالن،(٩) کەواتە وەك دەردەکەوێ کاردۆخییەکان ئەگەر خێڵی کۆچەریش بووبێتن ئەوا پەیوەستیش بوون بەخاکەوە و کاتێکیش زەینەفۆن پێشنیازی ئاگربەستی بۆکردون وداوای تەرمی کوژراوەکانی کردووەتەوە، کاردۆخییەکان تەنها مەرجیان ئەوەیە خانووەکانیان نەسووتێنن، کەواتە ناوچەکەیان وەك قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی خۆیان زانیوە و پاراستوویانە و نە یۆنانییەکان و نە پادشای ئەخمینییەکان نەیانتوانیوە سەریان پێنەویبکەن.. ئەوەش تارادەیەك روونددەبێتەوە کە کاردۆخی ناوێك بووە بۆ زیاد لە بنەماڵە و خێڵێك، چونکە بەرەنگاربوونەوە و تێکشکاندنی سوپای ١٢٠,٠٠٠ هەزار سەربازی شا و رێگرتن بەو دە هەزار سەربازەی زەینەفۆن سەرکردایەتیکردووە تەنها بە ئەندامانی بنەماڵەیەك ناکرێت.. ئەوەشی زیاتر ئەم بۆچوونە پشتراستدەکاتەوە فراوانی ئەو ناوچەیە کە سوپاکەی پیاتێپەڕیوە.. زەینەفۆن زیاد لە هەفتەیەکی بەشەڕکردن لەگەڵیان

بەسەربردووە تا رزگاریبووە لێیان، جێیگومانە ئەو ناوچە فراوانە قەڵەمڕەوی خێڵێك بووبێ بەتەنها، بەڵاَم لەڕووی تەکنیکی جەنگییەوە کە مەبەستی باسەکەمانە کاردۆخییەکان شەڕی بەرەییان نەکردووە، بەڵکو گروپی بچووك بچووکی جەنگاوەریان پێکدەهێنا و سەربەرزایی و چیاکانیان دەگرت و لەدواوە پەلاماری سوپای یۆنانییەکانیان دەدا.. زەینەفۆن بەمجۆرە باسیدەکات "کاردۆخییەکانیش لە چیاکانی دەوریاندا کۆمەڵێك ئاگریان هەڵکرد وەك جۆرێك ئیشارەت بۆ یەکتر. لا ١٢٦.. دوژمن پەلاماریدەدان بەتوندی و لەهەندێ تەنگەبەردا بە قۆچەقانی و کەوانەکانیان زۆر نزیکدەبوونەوە.. لا١٢٧ دواتر دەڵێ "گەیشتینە ئاوێك دەبوایە لێیبپەڕینەوە، بەڵاَم لەوێدا دوژمن تاوێرەبەردی گلۆرکردەوە، بەردەکان هەندی باری عەرەبانەیەك دەبوون و هەندێکیان لەوەش گەورەتربوون، گلۆردەبوونەوە و بە رەوەزەکان دەکەوتن و دەپرژان. ئیتر تەنانەت ڕێگەی ئەوەش نەبوو کە نزیکیش بکەوینەوە.لا ١٢٩.. سەبارەت بەتوانای جەنگی و چەکەکانیان دەڵێ "تاکە چەکیشیان کەوان و قۆچەقانی بوو.. لەڕاستیدا تیرئەندازی باشبوون، کەوانەکانیان چوار-پێنج پێ درێژبوون و تیرەکان سێ پێ دەبوون کە تیریان دەهاوێشت قاچی چەپیان پێشدەخست و کەوانەکەیان لەڕاستی ئەم قاچە رادەگرت، ئینجا پەتەکەیان رادەکێشا تیرەکانیان زرێی سینگپۆش و قەڵغانەکانیان دەبڕی. لا١٣٢، باس لەوەشدەکات لەکاتی شەڕدا سروودێکیان وتووە.لا١٣٨، کاردۆخییەکان لەڕووی تەکتیکی جەنگییەوە هەماهەنگی تەواویان لەگەڵ سروشتی شاخاوی ناوچەکەیان هەبووە، هەرئەمەشە وایکردووە هیچ سوپایەك نەتوانێت بەئاسانی بەناوچەکەدا تێپەڕێ چ جای تیابمێنێتەوە، بۆیە هەمیشە ناوچەکە نیمچە سەربەخۆییەکی هەبووە.. زەینەفۆن و سوپاکەی دواجار بە وڵاَتی کاردۆخیدا تێدەپەڕن، بەڵاَم بابزانین چۆن باس لە حاڵی سوپاکەی دەکات "بەدرێژایی هەفتەی رابردوو کە وڵاَتی کاردۆخیان بڕیوە بە بەردەوامی شەڕیانکردووەو لەوێدا زیانەکانیان لەهەموو زیانەکانی شەڕ دژ بە تیسافەرنیس و شا زۆرتربوو، جا کە بەبیریانهاتەوە کەوا دەردەسەرییان لەکۆڵبووەتەوە، خەوێکی خۆشیان لێکەوت.[١٠] ئەمە حاڵی سوپایەکی تۆکمەی دە هەزار کەسییە کاتێك ویستوویانە تەنها بەو وڵاَتەدا تێپەڕن.

نەوشیروان مستەفا سەبارەت بە هونەری جەنگی کاردۆخییەکان دەڵێ: کاردۆخییەکان لەشکری "نیزامی" یەکگرتو و پیشەییان نەبووە، گروپی بچووك بوون. پەیرەوی تاکتیکی "لێدەو هەڵێ" یان کردووە. بۆسەیان ناوەتەوە، سوودیان لە تۆپۆگرافی ناوچەکە وەرگرتوە. کتوپڕ پەلاماریانداون و خێرا ئاوابوون، لە کشانەوەی یۆنانییەکاندا دوایانکەوتوون و دەستیان لێوەشاندوون. لێیانکوشتون و لاشە و کەلوپەلیان پێبەجێهێشتوون.(١١)

نموونەی هاوچەشنیدیکە لە تۆمارە مێژووییەکاندا بەرچاون.. ئەوەتا مێژووناسێکیتری یۆنانی" دیۆدۆراس" هەر بە ماوەیەکی کورت دوای ئەوە دەڵێ کەوا کوردەکان لە کون و کەلێنی چیاکانیانەوە، بۆئێمە گەلێ زیاتر مایەی سەریەشەبوون، لەوەی لەگەڵ لەشکر و ئیمپراتۆرییەتەکانیتردا ناویاندەرکردبوو و کەوا تەنها بە بەکارهێنانی هێز یان رێکەوتن توانیمان کارێکبکەین کە لەتێکدانی باردۆخی پێدەشتەکان دوریانبخەینەوە.(١٢) تەیموری لەنگیش لەبیرەوەریەکانییدا باسلەوەدەکات کە بەرەو کرماشان چووە هۆزەکانی ناوچەکە لەدەربەندێکدا رێیان بە سوپاکەی گرتووە، تەیمور لە باسی سەختیی دەربەندەکە و تێپەڕبوون پیایادەڵێ "ئەو دەربەندە ئەوەندە سەختە ئەگەر دەوروبەری بگیرێت و سوپایەك بیەوێ پیابڕوات مەگەر دوای زیانێکی زۆر بتوانێ تێپەڕێ، چونکە بێجگەلە تیرباران لەهەردوو لاوە تاقمێکی کەم دەتوانن لە لاپاڵە سەختەکانەوە بەرد تلۆرکەنەوە و ژمارەیەکی زۆر بکوژن، لەبەرئەوە فەرمانی گەڕانەوەمدا، بەلاَم دەستەی دواوەی لەشکرەکەم ئاگاداریانکردم سەرەتای دەربەندەکە کە لێوەیهاتبووین عەشایەرەکان گرتوویانە.(١٣)

وەك دەبینین کوردەکان هەماهەنگی تەواویان لەگەڵ سروشتی سەختی ناوچەکەیاندا هەبووە و بەباشی بایەخی سەربازی ئەم دەربەند و گوزەرگە تەنگەبەرانەیان زانیوە و هەرکات سوپایەك هاتبێتە ناوچەکەیان نەیتوانیوە بەئاسانی و بەبێزیان تێپەڕێ.. چون توانای رێگری چیاکان لەسەر چەند فاکتەرێك بەندە، لەوانە بەرزی دەربەند و گوزەرگەکان بەگوێرەی هێڵی بەفری هەمیشەیی، هەروەها پلەی لێژیەکەی.(١٤) کە چیاکانی کوردستانی

پێناسراوە.ئەم دەربەندانەش بایەخێکی گەورەی سەربازی هەبووە لە مێژووی کورددا ریچ لەگەشتنامەکەیدا دەڵێ "ئەوڕەحمان پاشای(بابان) حاکمی پێشووی سلێمانی، کاتێ کە دەیویست سەربەخۆیی کوردستان بەدەستبهێنێ، هەموو ئەم دەربەندانەی قایمکردبوو،[١٥] هەروەها (هێنری بیندەر) کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا هاتووەتە کوردستان، سەبارەت بەم دەربەندانە دەڵێ: "لەم دەربەند و ملانەدا چەند کەسێکی شارەزا لەبەرامبەر لەشکرێکدا بەرگرییاندەکرد".[١٦] شێخ مەحمودیش دەربەندی بازیانی هەڵبژارد بۆ رووبەڕووبوونەوەی سوپای ئینگلیز، ڕێگای چوونەنێو ئەم مەڵبەندە شاخاوییە(کوردستان) بەچەند دەرەیەکدا تێدەپەڕێ کە هەندێکیان گەلێك فراوانن، بەلام تەنانەت ئەم دەرانەش بەچەندین کێوی بەردەلآن و چەتوون دەورەدراون و بەچەند دەربەندێکی باریك و تەنگ کۆتاییاندێت، بەجۆریك کە تەنانەت ڕێگای چوونەنێو ئەوانەوە لەهاوینیشدا دژوارە، بەتایبەتی لەزستاندا کە بە بەفرێکی زۆر دەئاخنرێن.[١٧]

بەلآم گرفتی گەورەی کوردان لەباری سەربازی و جەنگییەوە بەدرێژایی مێژوو ئەوەبووە کە زنجیرە چیاکانی کوردستان رۆڵی قوولآیی بەرگرییان بینیووە وەك لەوەی دیوارێکی سروشتی بن لەنێوان کورد و نەتەوەکانی دەوروبەریدا، لەم بارەشدا کە چیاکان کەوتوونەتە نێوەندی ولآتەوە هەماهەنگی و یەکگرتوویی کوردان کارێکی ئاساننییە، هەرئەمەش وایکردووە کە لەمێژوودا کورد نەیتوانیووە سوپای گەورە پێکەوەبنێت و بیر لە فراوانخوازی بکاتەوە و ئەو ئازایەتییەش کە کورد پێی ناوبانگیدەرکردووە لەمبارەدا پەرتەوازەبووە و بۆ سەرکردەیەك زەحەمەتبووە بتوانێ ئەم جەنگاوەرە ئازانە لە دەوری خۆی کۆکاتەوە و پارچەکانی ئەم ولآتە کە چیا لێکیدابڕیوون یەکخات. لە تۆپۆگرافیایەکی واسەخت و نالەباردا نەك هەر بۆ دوژمن ئاساننەبووە کوردان بخەنەژێر رکێفی خۆیانەوە، بەڵکو میرنشین و خێڵە بەهێزەکانی کوردیش نەیانتوانیوە ئەمکارە بکەن و هەر بەپارچەپارچەیی مانەوە و دوژمنایەتی نێوان کوردەکان خۆشیان تا بە رۆژگاری ئەمڕۆ بەشێکی دەرئەنجامی نالەباری تۆپۆگرافیای خاکی کوردستانە.

مینۆڕسکی لەبابەت پەیوەندی کورد و چیاوە دەڵێت "بەگشتی دەتوانین بڵێین کورد و چیا لێکجیانابنەوە، هەرکە دەشتایی دەستپێدەکات ئەوا کورد زەوییەکە بۆ عەرەب و فارس و تورك بەجێدێڵێت، لە دەوروبەری وانیش بۆ ئەرمەنەکان.(١٨)

ئەم چەند دێڕەی مینۆڕسکی ئاماژەن بۆ نیشاندانی زۆری ژمارەی چیاکان لەو رووبەرەی کەنێوی وڵاتی کوردانە، هەروەها ئاماژەشە بەوەی کە چیا کەوتووەتە نێوەندی وڵاتی کوردانەوە و سنوورەکانی دەشتن.. لەهەر بارودۆخێکدا کاتێك سوپایەك رووی لەم ناوچەیە کردبێت بێبەرگرییەکی ئەوتۆ چووەتەپێش تانزیکی قووڵایی خاکی کوردستان و دەسپێکی زنجیرەچیا سەختەکانی ناوەندی کوردستان بوونەتە قووڵایی بەرگری و رووبەڕووبونەوەی دوژمن، بەڵام لەمبارەدا دەشتاییەکانی کوردستان کە شارە گەورەکانی لێهەڵکەوتووە کەوتوونەتە دەستی دوژمن و تووشی تاڵانی و کاولکردن هاتوون. هاوشان لەگەڵ ئەوەشدا چیا سەختەکانی کوردستان تەواوکەری ستراتیجی زەمینی دەوڵەتانی دەوروبەربوون و بەمەش یەکێتی جوگرافی خاکی کوردستان لە چوارچێوەی سنووری هەریەك لە زلهێزەکانی دراوسێدا کارێکی ئەستەمبووە، خەباتی کوردانیش لەمبارەدا هەوڵێك بووە لەپێناو مانەوەدا.

سەبارەت بە چیاکان و رۆڵی لەدواخستنی پرۆسەی هۆشیاربوونەوەی کورد، بۆچوونەکانی ئازاد قەزاز رۆشنکەرەوە و یارمەتیدەرن کە دەنوسێت "تاکی کورد ناهۆشیاربووە، چی سەبارەت بە خودی خۆی (نەتەوە) چی سەبارەت بە دەرەوەی خۆی، هەمیشەش کاتێ دوژمن مافەکانی زەوتکردووە و هێرشیکردووەتەسەر، تەنها پەرچەکرداری نواندووە، هەمیشە پشتی بە شاخ قایمبووە، کورد کاتێك پشتی بە شاخ قایمبووە راستەوخۆ بۆ وەڵامدانەوە پەنادەباتەبەر شاخ یان سروشت، بتەوێ و نەتەوێ دۆخێکی سایکۆلۆژی بۆ سازکردووە، هۆشیاربوونەوە لەم دۆخە کە مرۆڤی تێدەکەوێ پرۆسەیەکی سایکۆلۆژی دەخوازێت، وەڵامدانەوەیەکی سادە و بێبیرکردنەوەیە، واتا بەئاستێکی هۆشیاری و بیرکردنەوەیەکی بەرزەوە وەڵامی ئەو هەڕەشەیە نەدراوەتەوە.(١٩)
ئەم پەرچەکردارە زۆرجار لە مێژووی کورددا دووبارەبووەتەوە، لەکاتێکدا کە هێرشی

دەکرێتەسەر لەلایەن دوژمنانەوە راستەوخۆ پەنادەباتە شاخەکان، لێرەدا جێگەی خۆیەتی بپرسین ئاخۆ ئەمە رۆڵی جوگرافیا نییە لەدووبارەبوونەوەی مێژوو لای کورد؟ وەك جەمال حەمدان دەڵێت: "ئەگەر مێژوو خۆی دووبارەکردەوە- کە رەنگە بیشیکات- ئەو دووبارەبوونەوە جوگرافیایە، بەمە جوگرافیا دەبێتە رەگی جەبری مێژوو، لەوەش زیاتر هەندێك دەڵێن مەگەر مێژوو جوگرافیایی جوولاّونییە؟ بەلاّم جوگرافیا مێژووی راوەستاوە.[٢٠] ئەگەر پێمانوابێت جوگرافیا رەگی جەبری مێژووە ئەوا بەهەڵەداچووین، دەشزانین مێژوو پرۆسەیەکی جوولاّوە و بەردەوام لەبەرەوپێشچووندایە، هەوڵەکانی مرۆڤ لەپێناو زاڵبوون بەسەر سروشت و کۆنترۆڵکردنی لەبەرچاوە، بەلاّم دەشپرسین ئاخۆ شکستی چەندین راپەڕینی کورد تەنها لە سەدەی رابردوودا دووبارەبوونەوەی مێژوو نەبێت چی دیکەیە؟؟ لەکاتێکدا ئەگەر بێپلانی و بێبەرنامەیی و کلتوری خێلاّیەتی و پەرتەوازەیی کۆمەڵگەی کوردی.. هتد هۆکاری شکستی ئەو راپەڕینانە بن، ئەوا جوگرافیا و جیۆپۆلۆتیك رۆڵی گەورەیان بینیوە لەدووبارەبوونەوەی شکستەکاندا. ئەگەرچی ئەم راپەڕینانە هەریەکە و لە پارچەیەکی ئەم ولاّتەدا بەرپاکراوە، بەلاّم چیرۆکی هەموویان تارادەیەکی زۆر لەیەکدەچن، سەرەتایی ئەم چیرۆکە بە زوڵمی بەردەوام و کەڵەکەبووی دوژمن لەسەر کوردان دەستپێدەکا و لەبەرامبەر ئەم ستەمە زۆرەدا کوردان رادەپەڕن و وەك هەمیشە چیاکان دەبنەوە لانکەی راپەڕین و جەنگ دژ بە دەوڵەت، دواجار دەوڵەت بۆ دامرکاندنەوەی گەمارۆیاندەدا و بەشێوەیەکی نامرۆڤانە لەناویاندەبات، کۆمەڵکوژی کوردانی دەرسیم لەلایەن دەوڵەتی تورکیاوە دەریدەخا تا چی رادەیەك دڕندانە ئەم راپەڕینانە کپکراونەتەوە. ئەمە دووبارەبوونەوەی مێژووە بەوچەشنەی کە د.کەمال مەزهەر پێیوایە "رووداوی مێژووی لە سنوورێکی تایبەتدا خۆی دووپاتدەکاتەوە، لەهەموو شوێنێك و هەموو کاتێك فشاری زۆر بووەتە هۆی تەقینەوەی ناڕەزایی،[٢١] بەلاّم وەلاّمدانەوەی سادە و بێبیرکردنەوەی کوردان بووەتە هۆی دووبارەبوونەوەی رووداو و چیرۆکەکان بەهەمان سەرئەنجامەوە. لێرەشەوە تێدەگەین بۆ کورد وەك کارایەکی مێژووکرد دەرناکەوێ.. ئەوەندەی مێژوو خاوەنی ئەمە، ئەم نەبووەتە خاوەنی مێژوو. ئەوەندەی ستەمی ئەوانیدی کوردی وەبیر جیابوونەوە و

جیاوازبوون لەوانیدی هێناوەتەوە، کەمتر لەوە ئیرادەیەکی خۆڕسك و سەربەخۆیی پێشوەخت سەرپێخراوە کە تیایدا هەستکردن بەجیاوازی ناسنامەی نەتەوەیی و داواکاری مافی سەربەخۆیی کردبێتە بنەما. بەمەش راپەڕینەکان دەبوون بە شۆڕش و هونەری جەنگی کورد بەتەنها پشتبەستن نەبوو بە چیا، بەلاّم لێرەدا ناوەڕۆکی بابەتەکە سەرزەنشتی پێشینانمان نییە ئەوەندەی روونکردنەوەی نالەباری تۆپۆگرافیای کوردستانە لەئاراستەکردنی مێژووی کورددا. ئازاد قەزاز سەبارەت بەپشتبەستنی کورد بە چیاکان پێیوایە "کە سەختی و بەرزی شاخەکانیش دانێکی سروشتیتر بووە بۆ کورد رۆکراوە، تابتوانێت لەوێدا خۆی پەنابدات، ئەم دوو فاکتەرە واتا دانی سروشتی"چیا"و دانی سیاسی دەوڵەتانی دەوروبەر، وای لە کورد کردووە کە زۆر عەقلّ بەکارنەهێنێت، لەبری جەنگ و ململانێی خوێناوی کە کۆتاییەکەشی هەمیشە و تاهەنووکەش بە شکستی کورد کۆتاییهاتووە.[٢٢]

ئەمەش بەومانای کە کورد هەرکات دوژمن پەلاماریدابێت پەنای بۆ چیاکان بردووە، هەولّینەداوە چارەسەرێکی عاقلاّنە بدۆزێتەوە، دەکرێت لەم حالّەتەدا وێنەی نەتەوەی کورد وەك مرۆڤێك نیشانبدەین کە لەسارایەکدا (چۆلّەوانی) گورگێك پەلاماریدەدات و درەختێکیش لەنزیکێتی راستەوخۆ دەچێتەسەر درەختەکە بۆئەوەی گورگەکە لەنێوینەبا، ئەو درەختە هەمان رۆلّی چیا دەبینێت، هەروەك چۆن مرۆڤەکە جورئەتناکات لە درەختەکە دووربکەوێتەوە، چونکە ئەگەر هاتو دوورکەوتەوە و گورگەکە پەلاماریبدات ئەوا ناتوانێت خۆی رزگاربکات لە دەستی.. دیسان وێنەکە هەمان وێنەی کوردە، تاڕادەیەك کوردیش بۆئەوەی پارێزگاری لەمانەوەی خۆی بکات هەمیشە لە دامێنی چیاکاندا ژیاون و کەمتر تێکەلّ بە دەسەلاّتەکانی دەوروبەر بوون، لەهەمانکاتیشدا هەمیشە لە پەراوێزی شارستانییەتەکانی ناوچەکەدا بوون. ئەنجامی پەیوەندی لەمێژینەی کورد و چیاکانی رۆحێکی سەرکەش وەك سەرکەشی چیاکانی لە مرۆڤی کورددا دروستبووە کە نایەوێ ملکەچ و فەرمانبەری هیچ دەولّەت و دەسەلاّتێك بێت، بۆنموونە ئەورەحمان پاشای بابان کاتێك لە (بابیعالی)یەوە داوایلێدەکەن ببێتە والی بەغدا رەتیدەکاتەوەو دەلّێت: "راستە من بەوە، پلەی یەکەمی وەزیریم دەدرێتێ، بەلاّم قومێك لە ئاوی چیاکانی

کوردستان بەهەموو تەختوبەختی دەوڵەتی عوسمانی ناگۆڕمەوە، رەنگە چوونیشم بۆ بەغدا گوزەرانم زۆر خۆشتربکات، بەڵاّم ئەنجامەکەی دەبێتە هۆی لەناوچوونی بنەماڵەی بابان.[٢٣] [ح]

لێرەدا دەکرێت یارمەتی لە کلتوری کوردی وەربگرین بۆ زیاتر نیشاندانی تاکتیکی "لێدەوهەڵێ" کە لەچیادا کوردەکان پەیڕەویانکردووە رەنگە هەڵپەرکێی کوردی و بەتایبەت شێوازی "سێپێی" باشترین نموونەیەك بێت بۆ تێگەشتن لەو تاکتیکە. ئەم شێوازەی هەڵپەرکێ رەنگە زیاد لەهەر شتێك لە نمایشێکی سەربازی بچێت، تیایدا ریزێك لە شێوەی بازنەی تەواونەکراودا (ئاماژەیە بۆ گەمارۆدان) دەستیان لەیەکدەئاڵێنن (ئاماژەیە بۆ یەکگرتن)و لە سەرچۆپی (سەرکردە) تا گاوانی (شوان و گاوانەکان) "چینەکانی کۆمەڵ" تیابەشدارن، بە جوولاّندنی لەش بۆ پێشەوە و بۆدواوە دێنودەچن و پێ بەزەویدا دەدەن (لێدەوهەڵێ)و ناوبەناویش (واتە جاری سێیەم کە بۆپێشەوەدەچن) سێجار بەتوندی پێ بەزەویدا دەدەن (ژمارە سێ ئاماژەیە بۆ جەختکردنەوە) لەوکاتەدا بە دەنگی بەرز بۆ دەربڕینی دڵخۆشی خۆیان هەموو ئەوانەی هەڵدەپەڕن دەقریوێنن.. ئەم قریوەیە ئاماژەیە بۆ سەرکەوتن بەسەر دوژمندا پاش چەندینجار کشانەوە و هێرشبردن.. بەوردبونەوە لەم شێوازەی هەڵپەرکێ و بەراوردکردنی بەو تاکتیکەی شەڕی کاردۆخییەکان لەچیاکاندا کە زەینەفون باسیکردوون ئەوە رووندەبێتەوە کە هەڵپەرکێ بەتەنها سەمایەك نییە کە کوردان بۆ دەربڕینی خۆشی خۆیان لەبۆنەیەکدا پێیهەستن، چوون خێرایی جوولەی کەسەکان و قریوەکێشان و حەماسەتیان لەکاتی هەڵپەڕیندا زیاد لە تایبەتمەندی سەماکەرێك نیشاندەدات.[د] ئەمەش سروشتییە بۆ نەتەوەیەك کە هەزاران ساڵە لەپێناو مانەوە و سەربەخۆییدا جەنگیکردبێت، سەرەڕایی ئەوەش خاکەکەی شانۆی جەنگ و لەشکرکێشی هەزاران ساڵی زلهێزانی ناوچەکە بووبێت. ئەم جەنگە بەردەوام و زۆرانە و ئیتیکی خێڵەکی (کۆچەری) رۆحییەتی جەنگاوەری لەکورددا بەهێزکردووە و تا بەئەمرۆش بەشانازییەوە خۆی بە نەوەی سەلاحەدینی ئەیوبی دەناسێنێ و لە سوهرەوەردی فەیلەسوفیش بێئاگایە. خاڵێکیدیکە پێویستە ئاماژەیپێبدەین بەشداری هەڵپەڕینی

ئافرەتە هاوشانی پیاوان لەبۆنەکاندا کە دەرخەری کەسایەتی بەرزی ئافرەتە لە کۆمەڵگای کوردەواریدا، وەك مێژوو نیشانیداوە کە هاوشانی پیاوان جەنگیان کردووە و گەڕیدەکانیش بەسەرسوڕمانەوە باس لە ئازادی و ئازایەتی و بەڕەوشتی ئافرەتی کورد دەکەن [ر]

مێجەرسۆن لە باسی ئازایەتی هەمەوەندییەکاندا دەڵێت: لەکاتێکدا زۆریان لەسەربێت، ژنەکانیشیان زۆر ئازایانە دەجەنگن و تفەنگیش بەباشی بەکاردەهێنن.[٢٤] "جیمس برانت" کە هاوینیساڵی ١٨٣٨ لەگەشتێکدا لەئەرزەڕومەوە بۆ بەدلیس بەناوچەکەدا تێپەڕیووە، لە زاری ژنێکی کوردەوە بۆماندەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: هەرکاتێك.. هێرشیانکردبێتەسەر مێردەکەی هەمیشە لەتەکیدا بووە.. فیشەك و تفاقی چەکی بۆ ئامادەکردووە لەوکاتانەی لەگەڵ هێرشبەراندا جەنگاوە و ئاگری چەکەکانی داباراندووەتەسەر داگیرکەران.. دواتر ناوبراو دەڵێت: ئەمەش ئەرك و فرمانی هەر ئافرەتێکی جەنگاوەرە لە کوردستان، کە زۆربەی جار رۆڵێکی کارا و چالاك دەگێڕن کاتێك شەڕ دەقەومێ. [٢٥] بەرخودان و بەرگری ئافرەتانی گەریلا هاوشانی براکانیان بۆ پاراستنی خاکی کوردستان دژی هێزێکی درندەی وەك داعش لەئەمڕۆدا، هەموو جیهانی تووشی سەرسامیکردووە، رەنگە ئەمەش بەسبێت بۆ نیشاندانی رۆڵ و کەسایەتی ئافرەتی کورد لەمێژوودا کە زیاتر مەبەستی باسەکەی منە. لێرەوە تێدەگەین خێڵ و عەشرەتەکانی کورد سەرەڕای پەرتەوازەیی و دوژمنداری نێوانیان توانیویانە لەپەنای چیاکاندا پارێزگاری لەبوونی خۆیان بکەن. چ لەبەرامبەر یەکتر یان لەبەرامبەر هێرشی نەتەوە و دەوڵەتانی دەوروبەر.. هەر لەم سۆنگەیەشەوە خانمە کوردناسی رووسی "ڤاسیلیەڤا دەڵێت: "زێدەڕۆیی نابێت بڵێین کوردەکان لەناو پێککەوتنی شەپۆلی گراوە سیاسییەکان لەناوچەکەدا، ئەگەر لە چرکە هەرەسەختەکانی مێژووی خۆیاندا بۆ سەرچیاکان نەچووبان کە لەوێ خێڵ و ئۆردوگای رەشماڵی حەشاریاندەدان، زەحەمەتبوو بیانتوانیایە خۆیان وەك کۆمەڵەیەکی ئیتنیکی بپارێزن.[٢٦]

بەڵام پشتئەستوری کوردان بە چیاکان وەك تاکە پەناگە و فریادڕەس زیاتر ئەوەبووە کە لەڕووی جیۆپۆلۆتیکییەوە هەڵکەوتەی شوێنی کوردستان لەنێوان دەوڵەتانی دەوروبەر و

دابەشبوونی بەسەر ئەو دەوڵەتانەدا کردبووی بە گۆڕەپانی پێکدادانی سوپاکانیان، ئەمەش بەدرێژایی مێژوو دۆخێکی نائارام و ناسەقامگیری لەناوچەکەدا دروستکردبوو.ئەم دۆخە (نەبوونی ئاسایش) راستەوخۆ کاریگەری هەمەلایەنەی لەڕووی کلتوری و ئابووری و سیاسی هەبووە لە شێوازی ژیانی کوردەکاندا، هەڵگرتنی خەنجەر و لەبەرپشتوێننانی لەلایەن پیاوی کوردەوە و بنیاتنانی گوندەکان لە شوێنی چەپەك و دیارنەبوو، دروستکردنی قەڵاکان لە بەرزایی چیاکاندا، هەر رەنگدانەوەی نەبوونی ئاسایشە. ئەوەتا مێجەرسۆن دەڵێ: کورد لەبەر ژیانی پڕمەترسییان لەنێو چیاکانی خۆیاندا پەنادەبەنەبەر هەموو بەرد و دارێك بۆ خۆپاراستن لە دوژمن.(٢٧) شەڕوشۆڕە بەردەوامەکانی ئەو دەوڵەتانە نەك هەر برسێتی و قاتوقڕی کاولکاری بەسەر کورد و وڵاتەکەیاندا هێناوە، بەڵکو هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆئەوەی خێڵە کوردەکان ژیانی کۆچەری هەڵبژێرن و واز لە کشتوکاڵ و نیشتەجێبوون بهێنن، چونکە لە هەلومەرجێکی ئاوادا جوتیاری کورد دڵنیانەبووە لەوەی تاکاتی هەڵگرتنی بەروبومەکەی زەوییەکەی تووشی تاڵانی نابێت لەلایەن سوپاکانی دەوڵەتانی رۆم و عەجەمەوە، هەروەك کابرایەکی خێڵەکی کورد بە(ریچ)ی وتووە هۆکاری سەرەکی کاولبوونی وڵاتەکەمان نەبوونی ئاسایشە و بەوهۆیەشەوە ئێمەی خێڵەکیی خۆمان بۆ کشتوکاڵ تەرخانناکەین. لەدرێژەی قسەکانیدا ئەوەدەردەکەوێ نەك هەر ترسی لەفەوتانی بەروبوومەکەی هەیە تا وەرزی هەڵگرتنەوەی خەلەوخەرمان، بەڵکو ئەو چەند تەغارەشی کە دەکرێ بە تۆو بەفیڕۆدەڕوا..(بڕوانە گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان. و: محەممەد حەمەباقی. لا ١٠٨-١٠٩) ریچ خۆشی باوەڕی وابووە "ئەگەر ئاسایش و ئاشتی لەم وڵاتەدا هەبێ و میراتگریش دۆخی سروشتی خۆی وەربگرێ، ئەم وڵاتە زۆر گەشەیدەکرد".(٢٨)

بابەتێکیدیکە کە کەمتر جێی سەرنجی مێژوونوسانی کورد بووە و دەرخەری دۆخی ناسەقامگیری وڵاتەکەیە، ئەوەیە کە بۆچی زۆربەی پایتەخت و مەڵبەندی سەرەکی دەسەڵاتی میرنشینە کوردییەکان لەڕابردوودا کەوتوونەتە قووڵایی ناوچە شاخاوییەکانەوە، وەك ئامێدی و رەواندز و بەدلیس و هەکاری و قەڵاچوالان و دواتر سلێمانی- ز-.. هتد،

لەکاتێکدا زۆربەی شارە گەورەکانی کوردستان لە دەشتایی سەر سنوورەکاندا هەڵکەوتوون و پێگەی گرنگی ئابووری و بازرگانیش بوون؟؟ ئەوەندەی پەیوەندی بە باسەکەی منەوە هەبێت بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە، پێموایە ئەو خوێندنەوەی میرە کوردەکان بۆ واقیعی سیاسی و سەربازی کوردستانی ئەوڕۆژگارە هەیانبووە، خوێندنەوەیەکی تاڕادەیەك دروست و گونجاوبووە، چونکە گەرچی لەزۆر رووەوە ئەو شارانەی لەدەشتاییەکاندا هەڵکەوتون لەبارتر و گونجاوتربوون بۆئەوەی بکرێنە پایتەخت، بەڵام لەڕووی سەربازییەوە هەڵبژاردنێکی دروستنەبووە، چونکە پاراستن و بەرگریکردن لەمانەوەی کارێکی ئاساننییە، بەهۆی ئاسانی داگیرکردنیەوە هەمیشە چاوی تەماحی داگیرکەرانی لەسەرە، بەتایبەت لە سەرزەمینێکی وەك کوردستانی ئەوڕۆژگارەدا کە لەنێوان دوو زلهێزی وەك ئێرانی و عوسمانیدا دابەشکراوە و چەند میرنشینێکی نیمچەسەربەخۆی ناوچەیی دژ بەیەك فەرمانڕەوایی بوون، هەربۆیە میرە کوردەکان بۆ پاراستنی دەسەڵاتەکەیان پشتیان بەشاخەکان قایم بووە، بۆئەوەی ئەو بۆشاییە سەربازییە پڕبکەنەوە کە بەبەراورد بە سوپا بەهێز و پڕچەك و پێشکەوتووەکانی ئێران و عوسمانی هەیان بووە، لەوەها بارودۆخێکدا میرە کوردەکان ئەوەندەی خاوەنی سڵکردنەوە و خۆپاراستن بوون لەپێناو مانەوەدا، کەمتر لەوە بیریان لەوەکردووەتەوە دەسەڵاتی خۆیان فراوانبکەن، لەحاڵێکی وادا هەڵبژاردنێکی بەمچەشنە تائەوڕادەیە دروستە کە مۆنتیسکۆ پێیوایە "دەسەڵات و هێزی پاشا لەوەدانییە کە بەئاسانی بتوانێ وڵاتەکەی فراوانبکا، بەڵکو لەوەدایە کە بەزەحمەت و گیروگرفتێکی زۆرەوە بتوانرێ هێرشیبکرێتەسەر.[٢٩] بەدەر لەوەش خەڵکی ناوچە شاخاوییەکان بەبەراورد بەدەشتەکان زیاتر گیانی یاخیبوون و راپەڕینیان تێدایە، چون لەلایەك چیاکان وەك قەڵایەکی سەختی سروشتی دەبێتە پەناگە بۆ خۆپاراستن و بەرەنگاری، لەلایەکیترەوە ئەو هێزەی دەیەوێ ئەو خاکە داگیربکا زۆر بەسەختی دەستی پێڕادەگا، چونکە بردنی کەرەستە و پێداویستییەکانی جەنگ و لەشکرکێشی بەرەو ئەو ناوچانە کارێکی دژوارە و دابینکردنی پێداویستییەکانیش لەو ناوچانە زەحمەتە، هەروەها بەپێچەوانەی دەشتەکانەوە کە دانیشتووانەکەی زیاتر خەریکی کشتوکاڵن، خەڵکی چیاکان

زیاتر کۆچەری و نیمچەکۆچەرین، بۆیە لەدەستدانی زەویوزار تووشی ملکەچی هەمیشەییان ناکات و ئەگەر تووشی شکستیش بوون دواجار دوژمن ناتوانێت پاش جەنگەکە لەچیاکاندا بمێنێتەوە، لەبەرئەوەی ئەو خەڵکەی بەرەنگاریانکردووە شەڕی بەرەییان نەکردووە و لەچیاکاندا بلاوبوونەتەوە دەبنەوە مەترسی بۆ سوپای هێرشبەر. هەر لەم سۆنگەیەوەیە کە مۆنتیسکۆ پێیوایە "ئازادی گەورەترین سامان و دارایی خەڵکی ناوچە شاخاوییەکانە.[٣٠] لێرەوە تێدەگەین بۆچی میرە کوردەکان زۆرینەی جەنگاوەرەکانیان شەڕکەری خێڵە کۆچەرییەکان [ث] بوون، چونکە میرە کوردەکان تاڕادەیەك لەوە تێگەشتبوون کە بونیاد و پێکهاتەی سەربازی تەبا و هەماهەنگە لەگەڵ سیستەمی خێڵەکی کۆچەریدا، ڕێکخستنی سوپا لەسەر بونیادی خێڵی کۆچەری درککردنی میرە کوردەکانە بەوەی کە لەخێڵەکاندا تەنها رایەڵەی خوێن و خزمایەتی لە هێزی سەربازیدا ڕێکخستنێکی ناوەندی بوو، بۆیە دەکرێت ئەمجۆرە ڕێکخستنەی خێڵەکان بە کۆچەری سەربازی ناوبەرین، چون ڕێکخستنی خێڵەکییانەی ئەم گروپانە لە هۆزێکی شوانکارەییدا خۆی لەگردبوونەوەیەکی کاروانی و ڕێگاپیشاندەر و گروپی چەکدار و شەڕکەردا دەنوێنێت، لەم شێوازی ژیانەدا زیاتر یەکگرتوو دەبن و یەکدەگرن.[٣١] [س] تاکۆتایی سەدەی نۆزدە، هێز و توانای جەنگی کوردان لەناو خێڵە کۆچەرە بزێوەکاندا مابووەوە، وەکو هەموو مێژوونووسانی ئەردەلانی ئەوە دەسەلمێنن، تائەو کاتەی بنەماڵەکانی ئەردەلان و بابان لەسەر شانۆی سیاسەت مابوونەوە. کۆچەرەکان هێز و کۆمەڵە جەنگییەکانی فیۆداڵە کوردەکانیان پێکدەهێنا. هاوسێکانی کورد هەر لەگەڵ کۆچەرەکاندا دەکەوتنە شەڕ و هەریەکە چەند جارێك شەڕەکەی دەدۆڕاند، چونکە کوردەکان لەڕووی شەڕکەری و چاونەترسییەوە لەهەموو رۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاستدا ناوبانگیاندەرکردبوو. رەنگە هەرئەو واقیعە ئەو تەسەورەی لای میللەتانی هاوسێی کوردان دروستکردبێت کە هاوپەیوەندارییەتیی ئێتنۆسی کوردی و شێوازی ژیانی ئاژەڵ بەخێوکردنی کۆچەری بێ بەهاومانا.[٣٢] بەلەبەرچاوگرتنی ئەو چەند دێڕەی سەرەوە بۆماندەردەکەوێ بۆچی شارەکانی ناوچە دەشتاییەکانی کوردستان وەك هەولێر و کەرکوك و کفری و کرماشان و

تەنانەت دیاربەکریش کە هەموویان شاری گەورە و گرنگ بوون لەڕووی ئابووری و بازرگانییەوە، بەلاّم بەئاسانی دەوڵەتانی عوسمانی و ئێرانی دەستیان بەسەرداگرتووە و کردوویانە بەپێگەی خۆیان بۆ ڕێگرتن لە فراوانخوازی میرەکوردەکان، بەتایبەت عوسمانییەکان کە بۆ ئەم مەبەستەش هانی خێڵە تورکەکانیان دەدا بۆ نیشتەجێبوون لەم شارانەدا (جگەلە کرماشان)، بەلاّم لە مەڵبەندە شاخاوییەکاندا دانیشتووانەکەی جگەلە کورد زۆر بەکەمی سەر بە نەتەوەیدیکەبوون و بەدرێژایی ئەو چەند سەدەیە میرەکان کوردەکان سەربەخۆ و نیمچە سەربەخۆ لەقەلاّکانیاندا فەرمانڕەوابوون، دروستکردنی شار و قەلاّ لەو شوێنە سەختانەدا و پەنا بۆ بردنی لەکاتی شکان و گەمارۆدانیان شێوازێکیدیکەی بەرگری کوردەکان بوو، داستانی قەلاّی دمدم و گەمارۆدانی لەلایەن شاعەباسی سەفەوییەوە لە نموونەی ئەو شێوازەن کە کوردان لەحاڵەتی بەرگریدا پەیڕەویانکردووە، بازرگانی فەرەنسی (ژان- پاپتسیت تاڤێرنییێ) کە لە ساڵی ۱٦۳۲ز بەکوردستاندا تێپەڕیووە لە وەسفی قەلاّیەکی گەورەی شاری بەدلیسدا دەڵێ: "ڕێگەی سەرکەوتنەسەر ئەم قەلاّیە یەکجار سەختە، دەبێ ولاّخی گەلەك چاپوکت پێبێت بۆئەوەی بتوانی پێیداهەڵگەڕێی"، هەروەها سەبارەت بە شاری ئامێدی دەڵێ: ئەم شارە لەسەر شاخێکی بەرز هەڵکەوتووە، کە پیاو بە سەعاتێك ئەوجا ئەگەر بتوانێ بەسەریداهەڵگەڕێ". [۳۳] عەبدلڕەزاق ئەسفەهانی کە هاوسەردەمی میرمحەممەدی سۆرانە (پاشا کۆرە) سەبارەت بە رواندوزی پایتەختی ئەم میرەکوردە دەڵێ: "لەسەر بەهێزیی و سەختی شوێن و جێگاکەی شتی سەیرم بیست کە سەرسووڕماومان دەکات، بەشێوەیەك کە دەڵێن گوزەرکردنی سوار و پیادە زۆر دژوار و ئەستەمە و بەپیادە ناتوانرێ لەیەك کەس زیاتر بەو ڕێگایەدا بڕوا. سێ لای قەلاّکەی چۆمێکی زۆر قووڵە کە ئەستەمە کەس بتوانێ لێیبپەڕێتەوە، لەلاکەیتریەوە کێوێکی بەرز و هەڵەمووتە کە خۆی لە شانی سەهەند و سەبەلان و دەماوەند دەدا. [۳٤]

میرەکانی ئەردەلاّنیش پێش ئەوەی پایتەخت بگوازنەوە بۆ سنە ناوەندی دەسەلاّتیان لە قەلاّکانی زەڵم و حەسەنئاباد و پاڵەنگان بوو، کە مەستورەی ئەردەلاّنی بەمشێوە

وەسفی قەڵای پاڵەنگان دەکات: "دەڵێن ئەو قەڵای پاڵەنگانە زۆر قەڵایەکی قایم و هەڵەمووت بووە و لە هەزار بەهەزارێکدا دروستکراوە کە کەمکەس بۆیکراوە پێیهەڵگەڕێ و بگاتە ئەو قەڵایە. سەبارەت بە قەڵای حەسەنئابادیش دەڵێ: "ئەوەندە بەرزە کە شان لەشانی هەوران دەسوێ، ئەوەندەش تەرزە کە هیچکەس بەخەونیش نەیدیوە.(٣٥) هەر لەم قەڵایانەدا بوو کە هەڵۆخانی ئەردەڵانی پاش شکاندنی چەندینجاری سوپای سەفەوییان شاعەباسی ناچار بەئاشتی کرد.. سەختیی شوێنی ئەم قەڵایانە وایکردبوو داگیرکردنی ئەستەمبێت، جگەلە رێککەوتن، ئەگەر خیانەتی قەڵانشینان رووینەدابا ئەوا تەنها تاکتیکێك بۆ گرتنی ئەو قەڵایانە گەمارۆدانی بوو بۆ ماوەیەکی زۆر تا جەنگاوەرانی نێو قەڵاکە ئاو و خواردەمەنیان لێببڕێت و ناچار بەخۆبەدەستەوەدان بن. یان هەڵبژاردنی جەنگ و نەبەردیی وەك ئەوەی لە داستانی قەڵای دمدمدا روویداوە.

(فۆن موتکە) سەرکردەی ئەڵمانی کە لەکاتی گەمارۆدانی میر محەمەد لە رەواندوزی پایتەختیدا، لای عوسمانییەکان بووە و دەڵێت: گرتنی یەك قەڵای کوردی لە بەرزی شاخێکدا سی تا چل رۆژی دەویست.(٣٦) سەختیی تۆپۆگرافیا و بوونی زنجیرە چیای بڵند کوردی لە مەترسی لەنێوچون و توانەوە پاراست، بەڵام پەرتەوازە و پارچەپارچەشیکردن، بۆیە لە مێژووی کورددا هیچ ئەوەندەی ئەو خاڵە روونییە کە لەهیچ قۆناغ و زەمەن و رووداوێکی مێژووییدا کوردەکان بە یەکگرتووی دژ بەئەواندیکە لەبەرەیەکدا نەوەستاونەتەوە، بەپێچەوانەوە هەمیشە خێڵ و میرەکانی کورد لەسەنگەردا بوون دژبەیەکتر، لەوەش کارەساتبارتر کوردەکان بۆ خزمەتی بەرژەوەندی وستراتیجی ئەوانیدی لەسەر خاکی خۆیان دژبەیەك بۆ ئەوانیدیکە جەنگاون. شەڕی چاڵدێرانی نێوان عوسمانی و سەفەوی نموونەیەکی دیاری ئەو جەنگانەن کە بووە هۆی کاولبوون و دابەشبوونی خاکی کوردستان و میرەکانی کوردیش لەهەردوو بەرەدا دژبەك بۆ خزمەتی ئەوانیدیکە لەشەڕدابوون.. ئەم دیاردەیە هێندە لەنێو کورداندا دووبارەبووەتەوە لەهەر کەسێکی ئاسایی بپرسی کە بۆ کورد تا بە ئەمرۆش بێدەوڵەتە؟ بێبیرکردنەوە پێتدەڵێت خۆخۆر و یەکگرتوونین.

لە کۆتایی ئەم باسەدا دەپرسین: ئایا ئازایی کورد و توانای جەنگاوەرییان بەتەنها لەشاخاویبوونی ولاتەکەیانەوە سەرچاوەیگرتووە؟؟ مێجەرسۆن زۆر بەتوندی ئەو تۆمەتانە رەتدەکاتەوە کە گوایا دەوترێ: "ئەوان (کورد) زیاتر خۆیان لەپاڵ بەردەکاندا دەپارێزن، کەمتر خۆیان دەردەخەن، چونکە لە کاری چڕ و تێکڕژان و دەستەویەخەدا بێکەڵکن و خۆهەڵکێش و ترسنۆکن، ناتوانن بەرگەی هیچ بەرامبەرێکی بەهێز بگرن". پێیوایە ئەوە بۆچوونی ئەو گەڕۆکانەیە کە بەولاتەکەدا تێپەڕیوون و شارەزاییان نەبووە لەڕووی سەربازییەوە و ناشزانن بۆ ئەوە ژمارەیەك هۆ و هۆکاری خۆی هەیە. گوللە لەسەرەوە و لەهەر چوارلاوە نیشانەدەگرێتەوە.[٣٧] ئەوەتا "سەن – تزو" دانای چینی و دانەری کتێبی "هونەری جەنگ" ٢٥٠٠ ساڵ پێش ئێستا دەڵێت: سەرکردەی دانا و بزورگی عەسکەری ئەوەیە.. دەزانێت چۆن سوود لە خەسڵەتەکانی شوێنەکان و بارودۆخەکان بەباشی وەردەگرێت، یاخود شوێن و بارودۆخی شیاو بۆ خۆی دەخولقێنێ، نەك هەر بەتەنێ پشت بە وزە و توانای سەربازەکانی ژێر فەرماندەیی خۆی ببەستێت.[٣٨] "دبلیو ئارهەی" حاکمی سیاسی هەولێر لە سەردەمی داگیرکاری بەریتانیادا سەبارەت بە توانای جەنگاوەری کوردەکان دەڵێت: کوردەکان بەپێی پێوەرەکانی ئێمە شەڕکەری باشنین.. لەبنەچەدا پیاوی شەڕی چەتەیین و لەبۆسەنانەوە و هێرشبردنەسەر (شوێنە قایمەکان) لاوەکییەکان بالادەستن. ئەگەر لەلایەن هێزێکی زۆرتر فشاری بخرێتەسەر کە نابەرامبەربن لەگەڵ هێزی ئەودا ئەوا بێدەستـــکردنەوە رادەکا و خودەگەیەنێتە قەلای چیاکان. ئەوێ پەناگەیەکی قایم و ئارامە.[٣٩](ش) هەرکەس کەمێك شارەزایی لە هونەری جەنگدا هەبێت تێدەگات ئەم هەڵسەنگاندنە ئەوپەڕی بێئاگاییە لە تەکتیکەکانی جەنگ. هیچ سەرکردەیەکی جەنگی سەربازەکانی لەبەرامبەر سوپایەکی بەژمارە زۆرتر و لەڕووی چەك و تفاقی جەنگییەوە تۆکمەتر بەکوشتنادات. کشانەوەی کوردەکان بۆناو چیا سەختەکان جگەلەوەی بۆشایی هێز (کەمی ژمارەیان) پڕدەکاتەوە، دەبێتە قوولایی بەرگریی و توانای دوژمن لاوازدەکات بەسەرکەوتنیان بەسەر چیاکاندا. لەهەمووشی گرنگتر راکێشانی سوپای دوژمن بۆناو قوولایی چیاکان لەلایەن کوردەوە ئەو هەڵبژاردنە لە دوژمن دەسەنێتەوە بۆ دیاریکردنی

شوێنی جەنگەکە. لەبارودۆخێکی ئاوادا سوپای دوژمن دەکەوێتە بۆسەی کوردەکان و تووشی هەلومەرجێکی خەتەرناك دەبێت. چونکە چیاکان بۆ پرۆسەی هەڵمەتبردن و هەڵهاتنی بەدەستوبرد زەوییەکی لەبارنییە، لەلایەکیترەوە کوردەکان هەرگیز ئەڵقەی گەمارۆیان بەتەواوی دانەخستووە و دەروازەیەکیان بۆ سوپای دوژمن دەهێشتەوە لێیەوە هەڵبێت، (بڕوانە: سوپاکەی زەینەفۆن) چونکە باش لەوەتێگەشتبون ئەگەر دوژمن زانییان دەربازبوونیان نییە، گیانفیدایانە رادەوەستن و بەرەنگاریدەکەن، بۆیە راوەدوونانی دوژمن و پەرتەوازەکردنیان و بۆسەنانەوە لەو دەروازەی وا بۆی هێڵراوەتەوە باشترین تەکتیکێکە لەوەها بارودۆخێکدا. دواتریش لەکاتی کشانەوە و هەڵهاتنی سوپای دوژمندا لەو مەودایەی بەناو کوردستاندا هاتووەتەپێش لە شێوەی گروپی بچووکی پارتیزانیدا [٤] پەلاماری سوپای دوژمن دەدەن، بۆیە لە کتێبی هونەری جەنگی "سەن- تزو"دا هاتووە: ئەگەر سەرکردە توانی تەحەکوم لە هەڵکەوتەی زەویدا بکات.. ئیدی ئەگەر سوپا لەڕووی پیاو و تفاقیشەوە لاوازبوو.. هەر دەرفەتی سەرکەوتنی لەبەردەمدا دەمێنێ.[٤٠] هەرچەندە ئەم بابەتە تایبەتە بە تاکتیکی جەنگی کورد لەچیاکاندا، بەڵام ئەمە بەو مانا نایەت توانای جەنگی کورد و ئەو ئازایەتییەی لەمێژوودا پێی بەناوبانگە تەنها لە سەختیی تۆپۆگرافیای وڵاتەکەیەوە سەرچاوەیگرتووە، چونکە پشتبەستنی کورد بە چیاکانی تاکتیکێکی سەربازی بووە بۆپڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە سەربازییە بووە کە لە کەمیی ژمارەی جەنگاوەرەکانیانەوە سەرچاوەیگرتووە، بەبەراورد بە سوپا گەورە و پڕچەکەکانی دەوڵەتانی زلهێزی دراوسێی.

لێرەدا جێی خۆیەتی بپرسین ئایا ئەو ئازایەتی و جوامێرییەی سەلاحەدینی ئەیوبی و جەنگاوەرانی کوردی هاوخوێنی نواندیان لەبەرامبەر شالاوی خاچ هەڵگرەکاندا لە شاخە سەختەکانی کوردستانی نیشتمانیدا بوو یان لە دەشت و بیابانەکانی میسر و شامدا؟؟.ئایا شاعەباس بەوهەموو دەسەڵات و هێزەوە بۆچی کوردەکانی بەزۆرەملێ بۆ خۆراسان گوێزایەوە؟ جگەلەوەی سنوورەکانی رۆژئاوای دەوڵەتەکەی پێبپارێزێ لە هێرشی بەردەوامی ئۆزبەگەکان کە داستانی ئازایەتی و خۆڕاگری ئەو کوردانە بەرامبەر بە تورکمانەکانی

ئۆزبەگستان مرۆڤ سەرسامدەکات.-غ- مێژوو پڕە لەو چیرۆکانەی کە باس لە ئازایی کورد و توانای جەنگاوەری کورد دەکەن، ئەوەتا دەربارەی هونەری جەنگی و تاکتیکی شەڕ ڕووبەڕووبونەوەو چۆنیەتی دەستوەشاندنی جەنگاوەرانی کورد (ابن منکلی) شارەزا لە هونەرەکانی جەنگ و کاروباری سەربازی دەڵێت: "چ بە سوارە و چ بە پیادە دەجەنگن، لە شەڕی شەوانە و دەستوەشاندن لە دوژمن و دزەکردندا ئەو توانا و شیانەی ئەوان هەیانە میللەتانیتر نییانە و چاکترین جەنگینی سوارەیان بە رمی ئەستوور و لەتی (لەشێوەی تەوردایە) قوورسە و سەرکەوتووترین جەنگینی هێزی پیادەشیان بە تێلاّیە کوشندەترە لە شمسێر و لە شەڕی دەستەویەخەشدا بە خەنجەر دەجەنگن و لەشەواندا دەتوانن دوژمن بڕفێنن.[٤١]

لەئەنجامدا دەتوانین بڵێین شێوازی جەنگی کوردەکان و تاکتیك و هونەری جەنگییان زیاتر پشتبەستن بووە بە چیا و ئەگەر سوپایەك رووی لە ولاّتەکە کردبێ، بۆسەیان بۆناوەتەوە و دەربەند و گوزەرگاکان بۆئەم مەبەستە یەکجار لەڕووی سەربازییەوە گرنگبووە بۆ ڕێگرتن لە پێشڕەویی سوپای دوژمن و غلۆرکردنەوەی بەردی گەورە لەچیاکانەوە روو بە دوژمن تەکتیکێکیدیکەی شەڕی کوردەکان بووە، هەروەها تاکتیکی "لێیدەو هەڵێ" کە بەمە زیانی زۆریان بە دوژمن گەیاندووە، زۆرجاریش پشتیان بە تاکتیکی "شەبەیخون" بەستووە، کە بریتییەلە پەلاماردانی لەپڕی دوژمن لەشەودا، بەزۆری ژمارەیەکی کەمی سوارە و جەنگاوەر ئەم کارەیان ئەنجامداوە، چیرۆکی دوانزە سوارەی مەریوان نموونەیەکی سەرکەوتووی ئەم تاکتیکەیە، چەکەکانیشیان تیروکەوان و رم و شمشێر و خەنجەر و قۆچەقانی و تێلاّ یان کوتەك بوو، تەنانەت دوای پەیدابوونی تۆپ و تفەنگ و باروت و گوللەش چیاکان بۆ کوردەکان زیاتر فریادڕەسبوون چون لەلایەك بردنی چەکە قوورسەکانی وەك تۆپ بۆ ناوچیاکان ئاساننەبوو، لەلایەکیتریشەوە بە تفەنگ نیشانەگرتن روو بە بەرزایی چیاکان کارێکی ئەستەمە. بەپێچەوانەوە بۆ کوردەکان کە بەرزاییەکانیان بەکاردەهێنا ئاسانتر و گونجاوتربوو. هەرچەندە لە کۆتایی فەرمانڕەوایی میرنشینە کوردییەکاندا کوردەکان بوون بە خاوەنی چەك و جبەخانە و لەشکر، بەلاّم هەرگیز لەڕووی

سوپاییەوە لەئاستی زلهێزانی دەوروبەردا نەبوون کە خاوەنی سوپایەکی "نیزام"ی ڕێکوپێك و پیشەیی بوون، بۆیە کوردەکان کەمتر شەڕی بەرەییان کردووە. ئەم میرانە ئەگەرچی هەندێکیان خاوەنی هێز و سوپای تاڕادەیەك نیزامی و پێشکەوتوو بوون، بەلاّم سەختی تۆپۆگرافیای ناوچەکە لەلایەك ڕێگربووە لەوەی میرنشینەکانیدیکە بەزۆری هێز بخاتەژێر ڕکێفی خۆی و دەوڵەتی کوردی بنیاتبنێ، لەلایەکیدیکەوە دەوڵەتانی دەوروبەر ڕێگربوون لەهەر پرۆسەیەکی لەوشێوە، چونکە دەسەلاّتێکی وابەهێزیان بەمەترسی دەزانی و بەدەر لەوەش بوونی زیاد لە میرنشینێك بۆئەو دەوڵەتانە کەڵکی ئەوەی هەبوو لەکاتی ڕاپەڕین و یاخیبوونی هەر میرێکدا، میرەکانیدیکە دەبنە هاوکار و هاودەستی دەوڵەت بۆ سەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکان.

بەداخەوە ئەمە دزێوترین دیاردەیەکە لە مێژووی کورددا، کەواتە شێوازێکیدیکەی جەنگی کوردەکان ئەو شەڕانەیە کە وەك بەشێك لە سوپای دەوڵەتانیدیکە بەشداربوون، جیۆستراتیجی ولاّتەکەیان گەورەترین فاکتەربووە بۆ تێوەگلانی کورد لە جەنگی نێوان دەوڵەتانی دەوروبەردا، جەنگی چاڵدێرانمان وەك نموونە باسکرد کە دلاوەرانی وەك "سارۆبیرە"(ف) پاڵەوانی گومناوی کورد ئازاترینی جەنگاوەرەکانی سوپای هەردوولا بوو. شاعەباس لەو بڕوایەدا بوو کە سەرۆك و خێڵی موکری هۆی نیوەی سەرکەوتنەکانی ئەوبوون، بەهەمانشێوە نادرشا دڵسۆزی کوردە موکریانی و ئەردەلاّنییەکانی دەنرخاند.[٤٢]

بەداخەوە بەخوێندنەوەی مێژووی کورد ڕاستی ئەو بۆچوونەی "ڤەرنان برۆدیل"مان بۆدەردەکەوێت کە دەڵێت: "چیاکان دروستکەری ئەو پیاوانەن کە خزمەتی ئەوانیدیکە دەکەن".[٤٣] ئەگەرچی ئەمە ڕاستییەکی مێژوویی تاڵە، بەلاّم هەمیشە کوردەکان بەهۆی فاکتەرە جوگرافی و جیۆپۆلۆتیکی و پەرتەوازەیی خێڵەکانەوە لە خزمەتی ئەوانیدیکەدا بوون و بەتایبەت لەدوای جەنگی چاڵدێرانەوە (١٥١٤) ز ئیدی ئەوەی لە سەدەی ڕابردوودا پێیدەوترا "جاشایەتی" لەکوردستاندا بوو بە دیاردە. هیوادارم سیاسەتمەدار و سەرکردەکانی کورد بۆ ئەمڕۆ و ئاییندەی کوردستان بایی ئەوەندە لە وانەکانی مێژوو فێربووبن کە سەرکەوتنیان لەیەکڕیزیاندایە. بۆ دووبارەنەبوونەوەی شکستەکانی ڕابردوو

ئەمڕۆ زیاد لەهەرکاتێك پێویستمان بەمێژووە چون وەك بەختیار عەلی دەڵێت: "مێژوومان پێویستە، هیچ نەبێ لەبەر دوو هۆی گرنگ، یەکەم: بۆئەوەی لە بەرینی ئازارەکانی ئینسان و لە قووڵی و لە دووبارەبوونەوەی بەردەوامی ئەو ئازارانە تێبگەین.

دووەم: چونکە بەبێ مێژوو ئەستەمە پردێکی راستەقینە لەنێوان هۆشیاری و یادەوەریدا دروستبێت.. مێژوو جێگای دروستبوونی یادەوەرییە، تەنها لەڕێگەی مێژووەوە فێردەبین چجۆرە یادەوەرییەك هەڵبگرین.(٤٤)

●●●

**تێبینی: ئەم بابەتە بەشێکە لە نووسینێك کە تیایدا لەچەند رەهەندێکەوە خوێندنەوەکراوە بۆ کاریگەری و رۆڵی تۆپۆگرافیا و بەتایبەت چیا لەسەر مێژووی کوردو ئاراستەکردنی ئەو مێژووە، هەربۆیە رەنگە لەهەندێك شوێندا پێویستی بەئاماژە و روونکردنەوەی زیاتر هەبوبێت نەمانکردووە، بەوهیوای کە بتوانین لە ژمارەکانی داهاتووی ئەم گۆڤارەدا(کۆچ) بەشەکانیدیکە بۆ تەکامولکردنی باسەکە بخەینەڕوو. پێویستە ئەوەش بڵێم جوگرافیا وەك رەگی جەبری مێژوو باسی لێوەنەکراوە، بەڵکو وەك هۆکارێك لەپاڵ هۆکارەکانیتردا رۆڵی هەبووە لە ئاراستەکردنی مێژووی کورددا.**

## پەراوێزەکان:

ا. سەبارەت بە ئازایەتی کورد زۆر وتراوە و مێژوونوس و فەیلەسوفە ئیسلامییەکانیش هەریەك بەجۆرێك ئەم سیفەتەی کوردیان لێکداوەتەوە، ئیبن خەلدون کۆچەرییەکان بەگشتی و لەناویاندا کورد بەئازا و بەهێز وەسفدەکات و دەڵێ هەمیشە چەکدارن و توانا و ئازایەتی بووەتە بەشێك لە سروشتیان و کاتێك کەسێك پەنایان بۆدەبات پەنایدەدەن.. فەزلولاَی ئەلعەمەری دەڵێ: کورد ئازاترین گەلی ئیسلامن و "دەوترێت لەناو موسڵماندا کورد و لەناو مەسیحیشدا گورجەکان ئازاترین گەلن".. ئیبن روشد (٥٩٥ك/١١٩٨ز مردووە) کە لە بەناوبانگترین فەیلەسوفە موسڵمانەکانە، دەڵێت: "هەندێ نەتەوە هەن بەسروشت ئامادەیی ئەوەیان تێدایە جۆرە فەزیلەکی دیاریکراو تیایاندا بەرهەمبێت، بۆیە سروشتییە بەشی تیۆری نەفس- واتە بەشی بەرهەمهێنەری دانایی- لای یۆنان بالاَدەستبێت و بەشی توڕەیی نەفس- بەتایبەتی بەرهەمهێنەری ئازایی -

لای کورد بەهێزبێت. ئەم دابەشبوونەی فەزیلەکانیش بەشێوەیەکی تایبەتی لە ئەنجامی کاریگەری ژینگەی سروشتییە بەسەر مرۆڤەوە.. لای ئەبوبەکر محەمەد کوڕی زەکەریای رازی (٨٦٤-٩٣٢ز) ئازایەتی کورد لە نەفسی شەهوانییەوە سەرچاوەیگرتووە و دەچنەڕیزی ئەو نەتەوانەی کە لەڕووی عەقڵییەوە لاوازن.. ئەم بۆچوونانە بنەمایەکی زانستیان نییە و زیاتر تاکەکەسی و سەرپێیین.. یاقووتی حەمەوی کە باس لە رێگریی و خراپەکاریی کورد دەکات لەشارەزووردا، بەلاّم دەشڵێت: "لەم ناوچەیەدا ئەوەندە پیاوماقووڵ و پێشەوا و زانا و دادوەر و فەقیە هەڵکەوتوون لەژماردننایەن." هەربۆیە دەتوانین بڵێین خراپنیشاندانی وێنەی کورد لای هەندێ لە مێژوونوس و فەیلەسوفان بەرهەمی ئەو بەرهەڵستی و راپەڕینانەیە کە کورد دژ بەو دەسەلاّتانەی دەوروبەر پێیهەستاون. زۆریشیان هەر کوردیان نەناسیووە و بۆچوونی ئەوانیدیکەیان دووبارەکردووەتەوە، بەلاّم کاتێك سوڵتانێکی کوردی وەك سەلاحەدین بەرگری لە خاکی موسڵمانان دەکات وێنەی کورد بەپێچەوانەی پێشووتر جواننیشاندەدرێ. (بڕوانە: حەیدەر لەشکری، وێنەی کورد لە زانینی مێژوویی ئیسلامیدا، و: د. محەمەد تاتانی، چاپی یەکەم، چاپخانە رەنج، سلێمانی ٢٠٠٩، لا ١٢٨-١٤٦)

ب. مردن لە مەیدانی شەڕەفدا ئارەزوویەك نییە تەنها لای ئەوڕەحمان پاشای بابان بەدیکرابێت، بەگشتی لای سەرکردە کوردەکان مردنی ناوجێگە مایەی شەرمەزاری بووە، مینۆرسکی وتەی یەکێك لە سەرۆکە کوردەکانی بەمشێوە تۆمارکردووە کە وتویەتی: "مردن لەناوجێگادا عارە، ئەگەر بۆم رێکەوت و بە گوللە بریندارببووم، ئەوا کاتێك هەڵمدەگرن و دەمبەنەوە بۆماڵەوە، ئەوە گومانی تیانییە کە هەمووان دڵخۆشدەبن، چونکە وەکو پێویست مردووم. (بڕوانە: مینۆرسکی. کورد. و: حەمەسەعید حەمەکەریم، لا ١٦٧.)

ج. ئەو سەربازە یۆنانییانەی کە لەلایەن کۆرشەوە بەکرێگیرابوون ژمارەیان ١٣٠٠٠ هەزار جەنگاوەربووە، بەلاّم پاش شکستیان لە جەنگی کوناکسا (Cunaxa) بەرامبەر ئەردەشێر دە هەزاریان ماونەتەوە. زەینەفۆن (گەزنەفۆن)یش هەر لەدوای ئەم شکستە و کوژرانی کۆرش بە سەرکردە هەڵبژێراوە بۆ دەربازبوون و گەڕانەوەیان بۆ یۆنان.

ح. خۆشەویستی ولاّت تەنها هۆکار نییە بۆ رەتکردنەوەی پلەوپایەی والی لەلایەن ئەوڕەحمان پاشاوە، بەڵکو هێنانەدی خەونەکەی (دەوڵەتی سەربەخۆ) لەلایەك و لەلایەکیتریشەوە باش لەوەگەشتبوو کە مەبەست لەمکارە لەناوبردنی میرنشینی بابانە کە خەونی لەمێژینەی عوسمانییەکان بوو.

د. لێرەدا تەنها مەبەست لەوشێوازەیە کە ناودەبرێ بە "سێ پێیی" ئەگینا شێوازەکانیدیکە رەنگە هیچ خوێندنەوەیەکی لەوچەشنە هەڵنەگرن. مێجەر نوئێل لەیاداشتەکانیدا کاتێ لە باکووری کوردستان بووە لە ناوچەکانی بازارجیك و بوستان کە خێڵی ئاتەمی کوردی لێبووە، بینەری هەڵپەرکێی کوردانی ئەو ناوچە بووە دەڵێت: وەسفی هەڵپەرکێی کوردی دەتوانم بەمەبکەم کە جوولاّنێکی شەپۆلئاسای هەموو ئەڵقەیەکە لەسەر ئاواز و جوولاّنی هارمۆنی مۆسیقا، وەك سروەی بەیان چۆن گوڵە گەنمەکان دەخاتە سەما و هەڵپەرکێ. لا ٤٩. میهردادی ئیزەدی لەکتێبەکەیدا (چەردە باسێك لەبارەی کوردانەوە) هەڵپەرکێ و شایی بۆ دووجۆر

دابەشکردووە کە جۆری یەکەم ئەو هەڵپەرکییانە دەگرێتەوە کە لەسەرخۆ و نەرم و بەنەزم دەکرێ. جۆری دووەمی هەڵپەرکێ بەتەوژم و خێراکانن ئەمەشی بە یەکێك لە خەسڵەت و سیماکانی کلتوری کوردی ناوبردووە و ئاماژەی بە وتەیەکی "مەلا مستەفا"ی بەرزانی دەکا کە وتویەتی: ئەوەی شایی نەزانێ کوردنییە" بڕوانە لا٥٤٣-٥٤٤-٥٤٥.

ر. ئازایەتی و ئازادی و داوێنپاکی ئافرەتی کورد سەرنجی زۆر لە گەڕیدەکانی راکێشاوە..ریچ دەڵێ: پلەوپایەی ئافرەت لەکوردستاندا زۆر لە پلەوپایەی ئافرەتی تورکیا و ئێران بەرزترە.. مێردەکانیان بە چاوی یەکسانیی بۆیاندەنوارن و گاڵتە بە دەستەپارچەیی و چۆکدادانی تورك دەکەن، هەروەها باس لەو ئازادییە زۆرەی ئافرەتی کورد دەکات بە بەراورد بە نەتەوەکانی دراوسێیان.(بڕوانە گەشتنامەی ریچ، و: **محەمەد** حەمەباقی..لا ۲۷۰ – ۲۷۱) لەباسی رەوشتبەرزیشدا مێجەرسۆن هاوڕا لەگەڵ مێجەر نوئێل و درایڤەر دەڵێ: لە زۆربەی دیالێکتەکانی زمانی کوردیدا وشەیەك نییە بۆ (قەحبە) بەکاریبێنن.. چون شەڕواڵپیسی و خراپەکاری لەنێو کورددا زۆر کەمە.(بڕوانە مێجەرسۆن. سلێمانی ناوچەیەك لە کوردستان، و: مینە لا ٦٩- ٧٦.. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە یاداشتەکانی مێجەر نوئێل.. لەئەمرۆشدا ئافرەتانی گەریلا باشترین نموونەیەکە بۆ ئازایی و ئازادی و بەرەوشتی ئافرەتی کورد.

ز. ئەگەرچی لەڕووی تۆپۆگرافییەوە قەڵاچوالان بە بەراورد بە سلێمانی شاخاوییترەو لە حاڵەتی جەنگدا داگیرکردنی زەحمەتترە، بەڵام دروستکردنی شاری سلێمانی و گواستنەوەی پایتەخت لەقەڵاچوالانەوە بۆ ئەم شارە نوێیە لەلایەن بابانییەکانەوە، رەنگدانەوەی متمانە بەخۆبونێکی گەورەی بابانییەکانە بە توانای سەربازی خۆیان و خەونی ئاییندەیان کە کردنی میرنشینەکەیان بوو بە دەوڵەتێکی سەربەخۆی بەهێز. هەوڵەکانی ئەوڕەحمان پاشای بابان لەم پێناوەدا ئەم بۆچونە پشتڕاستدەکاتەوە. بۆهێنانەدی ئەم خەونە قەڵاچوالان گونجاونەبوو. لەڕووی سەربازیشەوە ئەگەرچی سلێمانی بەتەواوی نەکەوتبووەنێو چیاکانەوە بەڵام زنجیرە چیاکان لەهەر چوارلاوە هەلی بەرگرییان بۆ دەڕەخساند، لەباشوورەوە کە زیاتر جێگەی مەترسیبوو، بوونی "زنجیرە شاخەکانی قەرەداخ کە سەرێکی دەربەندی بازیانە و سەرێکیتری دەربەندیخانە، چەندین دەربەندی تێدایە، لەوانە: دەربەندی باسەرە، دەربەندی سەگرمە، دەربەندی ئەستێل، دەربەندی گۆشان، دەربەندی گاور.. (ناوی ئەم دەربەندانە و جوگرافیای زنجیرە چیایی قەرەداخ وەرگیراوە لە: نەوشیروان مستەفا- بەدەم رێگاوە گوڵچنین، لا ١٩) " هەلی بەرگری دەڕەخساند و بایەخی ئەم دەربەندانە لە وەستاندنی پێشڕەوی سوپای دوژمندا یەکجار گرنگبوو.

ژ. سوپای میرە کوردەکان زیاتر لە جەنگاوەری خێڵە کۆچەرییەکان پێکهاتبوو، ریچ باس لەو سەرسوڕمانەی عوسمان بەگی برای مەحمود پاشای بابان دەکات کاتێ ریچ پێیوتووە دەسەڵاتدارێتی ئینگلتەرە بەدەست ئەو ئینگلیزانەوەیە کە خێڵەکی نین و خەڵکی ناوشارەکانن. پشتبەستنی میرەکان بە جەنگاوەری خێڵەکی لای بابانییەکان زیاتر دەبینرێ وەك لای ئەردەڵانییەکان، ئەمانولاخانی ئەردەڵانی داوای لە ئەوڕەحمان پاشای بابان

کردووە ئەوەی بۆ روونبکاتەوە کە بۆچی دەستەودایەرە و پیاوەکانی لەکاتی تەنگانەدا شوێنی ناکەون، وەك چۆن کوردانی بابانی بەرامبەر بە سەردارەکانیان دەیکەن؟ ئەوڕەحمان پاشای گەورە وەلاَمێکی زۆر توندی داوەتەوە و دەڵێت: چونکە تۆ سەرۆکهۆز نیت و پیاوەکانیشت پیاوی هۆزەکەت نین.. رەنگە نانیشیان بدەیتێ و پۆشتەشیان بکەیتەوە و پارەشیان بدەیتێ، بەلاَم هیچیان ئامۆزات نین، بەڵکو خزمەتکارن. (بڕوانە: گەشتەکەی ریچ . و: محەممەد حەمەباقی، لا ١٠٢-١١٣) بەلاَم محەممەد پاشای میری سۆران سنوورێکی بۆ نەریتی کۆمەلاَیەتی ئوروستۆکراتی کۆن دانا کەوا تەماشای جوتیاران دەکرا رەگەزێکی بێسوودن لەبواری سەربازیدا، هەربۆیە دەبینین لە بزوتنەوەکەی میر محەممەددا جوتیاران رۆڵی بەرچاویان هەیە و بەشێکی زۆری سوپای سۆران لە چینی جوتیاران بووە.

س. مەبەست لە یەکگرتنی ئەندامەکانی خێڵە لە چوارچێوەی خێڵەکەدا، نەك لەگەڵ خێڵەکانیدیکەدا، لە پێکهاتەی خێڵی کۆچەریدا خوێن و خزمایەتی ئەو بنەمایە بوو پەیوەندییەکانی لەسەر بینادەکرا، دڵسۆزی بۆ خێڵ سەرۆکخێڵ زیاتر بووە لە هاوسۆزی و هەستی کوردبوونی نێوان ئەم خێلاَنە. شەڕوشۆڕی بەردەوامیان لەسەر لەوەڕگا بۆ ئاژەڵەکانیان رێگربووە لە دروستبوونی فیدراسیۆنی خێڵەکی نێوانیان، بەلاَم میرە کوردەکان زۆرجار توانیویانە چەند خێڵێك لەم کۆچەرانە لە چوارچێوەی میرنشینەکاندا کۆبکەنەوە.

ش. چیاکان هەمیشە قوولاَیی بەرگری بوون بۆ کورد، چونکە جگەلە سەختی و گەردنکەشی چیاکان، سنووری دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان بەنێو قوولاَیی چیاکاندا تێپەڕدەبوو، بۆیە لەکاتی کشانەوەی بۆ ناوچیاکان دوژمن نەیدەتوانی پشتی لێبگرێ، چونکە نەیدەتوانی سنووری دەوڵەتەکەیتر ببەزێنێ، جگەلەمەش بەم کشانەوەیە دوژمن خۆی لەبەردەم خاکێکی نامۆدا دەبینێتەوە و لەبەرامبەر ئەمەدا کوردەکانیش شارەزایی هەموو کونوکەلەبەری ولاَتەکەیان بوون. سەرەڕایی سەرماوسۆڵە و بەفری چیاکان کە رێگربوون لە پێشڕەوی سوپای دوژمن، بۆیە زۆربەی کارەساتەکانی کۆمەڵکوژی کوردان و پەلاماری داگیرکەران بۆ سەرخاکی کوردستان لە بەهار و هاویندا ئەنجامدەدران، چونکە وەرزی توانەوەی بەفر و نەمانی سەرماوسۆڵەیە. "دبلیۆ ئارهەی" بەهەڵەداچووە ئەمەی کردووەتە پێوەر بۆ توانای جەنگاوەری کوردەکان.. لەئاستی جیهانیشدا کشانەوەی رووسیا لەبەرامبەر ناپلیۆندا (١٨١٢) بۆ قوولاَیی خاکەکەی بەو مەبەستە بوو.. خاك بگۆڕێتەوە بە کات و سوپای ناپلیۆن تووشی زستانی سەختی ولاَتەکەی بکات. دەرئەنجامیش ناپلیۆن بەهۆی سەرماوسۆڵە و برسیەتییەوە نزیکەی نیو ملیۆن سەربازی مردن.

ع. زاراوەی پارتیزان لەڕاستیدا بەو بەشە لە خەڵکی رووسیا دەگوترا کە لەماوەی هێرشی ناپلیۆن (١٨١٢) بۆسەر رووسیا، هێرشیاندەکردەسەر هێڵەکانی لۆجستیکی فەرەنسا. ئەمڕۆ ئەم زاراوەیە بەو گروپە چەکدارانە دەگوترێ کە لەپشتی هێڵەکانی دوژمنەوە هێرشدەبەنەسەر دوژمن و یەکەی بەرگری پێکدێنن. (فەرهەنگی سیاسی. ئامادەکردنی: زاهیر محەممەدی و یاسین حاجی زادە. لا١٢٨.)

غ. سەبارەت بە داستانی ئازایەتی کوردەکانی خۆراسان، بڕوانە (حرکە تاریخی کورد بە خوراسان) لە نووسینی

کەلیمولڵای تەوحیدی کە وریا قانع چەند بەشێکی لەم کتێبە کردووە بە کوردی و لەگەڵ چەند بەشێك لە کتێبی (حماسەسازانی گمنام کورد)ی حەبیبولای تابانی کە بە کوردی بە (دلاوەرانی کوردی گومناو) بلاوکراوەتەوە.

ف. سارۆبیرە کوردی گومناو و سەرداری گەورەی شائیسماعیلی سەفەوی، خەڵکی بانەی ناوچەی موکریانی رۆژهەلاتی کوردستانە و دیارترین پاڵەوانی جەنگی چالدێران بووە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە (حەبیبولای تابانی، دلاوەرانی کوردی گومناو، وەرگێڕانی وریا قانع، چاپی یەکەم، چاپ و بلاوکردنەوەی قانع، سلێمانی ٢٠٠٤. لاپەڕەکانی ١١-٤٧).

**سەرچاوەکان:**


١. میهردادی ئیزەدی، چەردەباسێك لەبارەی کوردانەوە، و: ئەمین شوان، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٧. لا ٧٧ .

٢. ك. ر. درایڤر . درایڤەر و کورد، و: ئەنوەری سوڵتانی، چاپی یەکەم، چاپخانەی شڤان، سلێمانی ٢٠٠٥. لا٢٢.

٣. هەمان سەرچاوە.لا٧٥.

٤. ریچ.گەشتانامەکەی ریچ بۆ کوردستان، و: محه حەمەباقی، لا٢٩٨.

٥. گاستۆن بۆتۆڵ: کۆمەڵناسی جەنگ، و: مەنسوور تەیفووری و سەردار حەسەن، چاپی یەکەم، چاپخانەی تیشك، سلێمانی ٢٠٠٦، لا ٢٥ .

٦. میهردادی ئیزەدی، چەردەباسێکە لەبارەی کوردانەوە، ئەمین شوان، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی٢٠٠٧. لا ٦٦ .

٧. هەمان سەرچاوە، لا ٧٣-٧٤.

٨. گەشتەکەی زەینۆفۆن، و: محەمەد مەسعود محەممەد جەلیزادە، چاپییەکەم، دەزگای چاپ وبلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ٢٠٠٦ لا١٢١

٩. هەمان سەرچاوە لا ١٢٥-١٢٦ .

١٠. هەمان سەرچاوە.١٣٢

١١. نەوشیروان مستەفا ئەمین: بەدەم رێگاوە گوڵچنین، کتێبی یەکەم، چاپی دووەم، الدار العربیە للعلوم- ناشرون، بیروت- لبنان،٢٠١٢ . لا ٢٨ .

١٢. (میهردادی ئیزەدی، چەردەباسێك لەبارەی کوردانەوە، سەرچاوەی پێشوو، لا ٨٤-٨٥.

١٣. مارسل بروین. بیرەوەرییەکانی تەیموری لەنگ، و: حەمەی حەمەسەعید، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ وپەخشی سەردەم، سلێمانی ١٩٩٩. لا ١٤١.

١٤. د. محمد عبدالغني سعودي، جوگرافیا و پەیوەندییە سیاسییە نێودەوڵەتییەکان، و: جەزا تۆفیق تالیب و ئەحمەد عەلی ئەحمەد، چاپی یەکەم، چاپخانەی حەمدی، سلێمانی ٢٠٠٥. لا ٢٠٩

١٥. گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان. و: محەممەدی حەمەباقی. سەرچاوەی پێشوو. لا ٧٥

١٦. سەفەرنامەی هێنری بێندەر، و: ئەبوبەکر خۆشناو، چاپی یەکەم، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی ٢٠٠٦، لا ١٤٩.

١٧. کوردەکان، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی و سیاسی، نووسینی حەسەن ئەرفەع، وەرگێڕانی سەردارمحەممەد، چاپی یەکەم ٢٠٠١ سلێمانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم. لا١٠ .

١٨. تاریق محەممەد عەبدولڕەحیم: مینۆرسکی و نووسینەکانی لەبارەی کورد"لە سەردەمی ئیسلامەتی تا سەردمی خەلافەتی عوسمانی". و: ئازاد عوبێد سالّح، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٨، لا ١٠٤.

١٩. ئازاد قەزاز: رۆحی کورد لە بندەستی (ناسیۆنالیزم، مارکسیزم، ئیسلامیزم)،چاپی یەکەم، چاپخانەی پەیوەند، سلێمانی ٢٠٠٨، لا ٥١-٥٢.

٢٠. د. عەبدوڵلا عەتەوی: دەوڵەت و کێشە نێودەوڵەتییەکان، وەرگێڕانی: جەزا تۆفیق تالیب و ئەحمەد عەلی ئەحمەد، چاپی دووەم، چاپەمەنی گەنج، سلێمانی ٢٠٠٧. لا٤٧.

٢١. د. کەمال مەزهەر ئەحەمەد: مێژوو، چاپی دووەم، چاپخانەی دۆست، هەولێر، ٢٠٠٧.، لا ٧ .

٢٢. ئازاد قەزاز : رۆحی کورد لە بندەستی (ناسیۆنالیزم، مارکسیزم، ئیسلامیزم)، سەرچاوەی پێشوو، لا ٥١.

٢٣. گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان.و: محەممەدی حەمەباقی. سەرچاوەی پێشوو. لا ١١١ .

٢٤. مێجەرسۆن: سلێمانی ناوچەیەك لە کوردستان، وەرگێڕانی: مینە، چاپی یەکەم، چاپخانە: مەڵبەندی کوردۆلۆجی، سلێمانی ٢٠٠٧، لا٦٩ .

٢٥. سەفەرنامەی مستەر جیمس برانت بۆ ناوچە کوردنشینەکان. و: هیممەت کاکەیی، چاپی یەکەم، چاپخانەی موکریانی، هەولێر ٢٠١٤، لا ٤٣.

٢٦. ی.ئی. ڤاسیلیەڤا. کوردستانی خوارووی رۆژهەلاَت، و: رەشاد میران، چاپی دووەم، لە بلاَوکراوەکانی دەزگای ئاراس، هەولێر ٢٠٠٩ لا ١١٢ .

٢٧. مێجەرسۆن: سلێمانی ناوچەیەك لە کوردستان، سەرچاوەی پێشوو. لا ٧٤ .

٢٨. گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان، و: محەممەد حەمەباقی،سەرچاوەی پێشوو. لا١٢٨ .

٢٩. مۆنتیسکۆ، رۆحی یاساکان، و: ئیدریس شێخ شەرەفی، چاپی دووەم، چاپخانەی دەزگای وەرگێڕان، هەولێر،٢٠٠٥، لا ٢٢ .

٣٠. هەمان سەرچاوە. لا ٣٩١ .

٣١. د. محەممەد شوانی، ئەنتربۆلۆژیای دانیشتووان، چاپی یەکەم، لە بلاوکراوەکانی ناوەندی ئاوێر، هەولێر ٢٠١٣، لا ٢١٦-٢١٧ .

٣٢. ی.ئی. ڤاسیلیەڤا. کوردستانی خوارووی رۆژهەلات، سەرچاوەی پێشوو لا١١٣.

٣٣. فەرهاد پیربال: کورد لە دیدی رۆژهەلاتناسەکانەوە. چاپی سێیەم، چاپخانەی شڤان، کوردستان ٢٠٠٩لا ١١٦ و ١١٨ .

٣٤. عەبدلرەزاق ئەسفەهانی: گەشتنامەی ئەسفەهانی بۆ شنۆ و ورمێ و رەواندوز، و: زاهیر محەممەد رەشید، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی ٢٠٠٩، لا ٣٨-٣٩ .

٣٥. مەستورەی کوردستانی: مێژووی ئەردەلان، وەرگێران و لێکۆلینەوەی هەژاری موکریانی، چاپی یەکەم. چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر ٢٠٠٢. لا ٥٢-٥٣ .

٣٦. حەسەن مەحمود حەمەکەریم: فەتواکەی مەلای خەتێ، چاپی یەکەم، چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی ٢٠٠٦. لا ٤٥ .

٣٧. مێجەرسۆن. سلێمانی ناوچەیەك لە کوردستان، سەرچاوەی پێشوو. لا٧٢.

٣٨. سەن- تزوو. هونەری جەنگ، و: رەوف حەسەن، چاپی یەکەم، چاپخانەی ژیار،سلێمانی ٢٠٠٤، لا ١٢٢ .

٣٩. دبلیۆ ئارهەی. دوو سال لە کوردستان (گەشتێکی نهێنی بۆ میزۆپۆتامیا)، و: لوقمان باپیر، چاپی ٢٠١٠، چاپخانەی رۆژهەلات، هەولێر.لا ٧٨.

٤٠. سەن- تزوو. هونەری جەنگ، سەرچاوەی پێشوو لا٢٥١.

٤١. پ.د. زرار سدیق تۆفیق. کۆمەلگای کوردەواری لە سەدەکانی ناوەراست، چاپی یەکەم، چاپخانەی رۆژهەلات، هەولێر٢٠١٤ لا ١٣٩

٤٢. مێجەرسۆن. سلێمانی ناوچەیەك لە کوردستان، سەرچاوەی پێشوو. لا ٧٦.

٤٣. سامان حسێن ئەحەمەد: رۆلی تۆپۆگرافیا لە ئاراستەکردنی مێژوو، گۆڤاری کۆچ، ژمارە(١١-١٢) پایز و زستانی سالی ٢٠٠٩،لا٦٣٣.

٤٤. بەختیار عەلی: ئەنگلۆس نۆڤۆس، ئایا مێژوومان پێویستە؟ رۆژنامەی ئاوێنە، ژمارە (٢٦٩)ی سێ شەمە ٥/٤/٢٠١١، لا٥.

# پاشماوەی ئاسەواری فەرهەنگی مادەکان لەبەردەم لێکۆڵینەوەکانی شوێنەوارناساندا

کەمال نوری معروف(*)

لێکۆڵینەوەی زانستی دەربارەی مادەکان و پێکهاتەی مێژووییان لەو سامانە ئاسەوارییانەیە کە بەدرێژایی سەدەیەك لە دەسەڵات دروستیانکردووە یان بەرلەوەش هەربوویانە ئەوەش دوای گەڕان و لێکۆڵینەوەی زۆر دێت کە لەوڕووەوە ئەنجامدراوە بۆ دەرخستنی گەوهەری باسەکە.

ئەو گەڕان و ئەرك وماندووبوونەش بەدوای نووسینەکانی (براون) (١٩٧٩)و (سانچێسی- ویردبنورگ) (١٩٧٩,١٩٨٥,١٩٨٧)و (جیتو) (١٩٨٦)و (براون) (١٩٨٦)و (ماسکارلا) (١٩٨٧) لەگەڵ نووسینێکیتری براون. ١٩٩٠ دێن و کەوتنەبەردەست. بەدوای ئەو نووسینانەشدا پرسی لێکۆڵینەوە لەسەریان دەستیپێکرد.

رای ئەو نووسەرانە و باسەکانیان کە پێشکەشیانکردووە بوونەتە هەوڵێك یان هاندەرێك کە زیاتر کەسانیتریش لەبواری (ماد)ناسیدا بێنەپێشەوە و هەوڵبدەن و گرنگیی زیاتر بە خوێندنەوەی ئەوجۆرە باسانە بدەن، بۆئەوەی دەرگای کلۆمدراو لەسەر مێژووی ماد و پاشماوەی ئاسەوارەکانیان بکرێتەوە و زیاتر پێیانئاشنابین. نابێت ئەوەش لەیادبکەین کە ئەم قۆناغەی ماد لە دەسەڵات لەگەڵ سەردەمەکانی دواتر لە مێژووی شوێنەوارناسیدا پەیوەستە بە ئاریاییانی کۆنەوە کە لەناویاندا (ماد) لەبەر رەگەزپەرستی گومناوکراوە.

لێرەدا مێژووی رووداوەکان ئەوەمان بۆدێنێتەوەیاد کە سارماتییەکان واتە (سیمیرییەکان)و (سکاکان)و (تراسی)ییەکان کێشەی گەورەیان بۆ مادەکان هێناوەتەڕوو،

*) لە فارسییەوە وەریگێڕاوە و لەسەری نووسیوە.

چونکە دژیانبوون و لە هەوڵی داگیرکردنی خاکیاندا بوون.

ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لەماوەی دە ساڵدا لەسەر پرسی مادەکان ئەنجامدراوە لەناویاندا هەست بەشێوە زانستییەکە دەکەیت کە بە لێکۆڵینەوەکانەوە دیارن و توانیویانە مێژووەکەیان بەرەوپێشبەرن. بەخوێندنەوەی ئەو دەستکەوتە زانستییە نوێیانە و بەپێی ئەو پێشنیارە زۆرانەی کە لەلایەن دۆستەکانی مادەوە پێشکەشکراون سەرئەنجامی ئەو هەوڵانە نووسینێتری هێناوەتەڕوو. کە بەشێوەیەکی گشتی پرسێکی گەورەی لەناو دنیایەکی مێژوویی و ئاسەواری و فەرهەنگیدا وروژاندووە کە دەخرێنەپاڵ مادەکان و لەناو مێژووەکەیاندا کۆدەبنەوە و بەرەوپێشیدەبەن.

نەخشی زۆر گرنگ کە سەرچاوەکانی کلاسیك و خۆرهەڵاتی باسیانکردووە بەوشێوەیەی کە موڵکی مادەکانن، بەڵام لەناویشیاندا هەن پەیوەستییانکردوون بە هخامەنشییەکانەوە، ئەوەش لێکۆڵینەوەیتری دەوێت لەلایەن شارەزایانەوە تاوەکو ببنە ڕێگانیشاندەر بەوەی مادەکان لەڕووی رامیاری و فەرهەنگی و هونەرییەوە بەر لە ئیمپراتۆرییەتی هخامەنشییەکان لەمەیدانەکەدا هەبوون. بۆ سەلماندنی دەتوانین پەنابەرینەبەر بەڵگە شوێنەوارییەکانی ماد کە لەناو پاشماوە ئاسەوارەکانیاندا گرنگن و لە شوێنە جیاجیاکاندا هەن بەتایبەتی لەو ناوچەیەی کە دەوڵەتی ماد لە چاخە کۆنەکانی هەزارەی یەکەمی پ.ز لە باکووری خۆرئاوای ئێران دامەزراوە. لێرەدا باسێکی (ماسکارلا) (١٩٨٧) دێتەپێشەوە کە بووەتە سەرەتایەك بۆ تێگەیشتن لە ماد. گەڵاڵەکردنی باسەکەشی لە ئەنجامی گەڕانەکانیدا بووە کە لەسەر هونەری ماد و قۆناغی نوێ بەرهەمیهێناوە، باسەکەش دەگەڕێتەوە بۆ نێوان کۆتایی دەیەی پەنجاکان و سەرەتای دەیەی شەستەکان کە ئامادەیکردووە. بەگشتی هەموو ئەمانە تیشك دەخەنەسەر مێژووی ماد کە بوونەتە بەڵگەنامە بۆیان بەپاڵپشتی کاری شوێنەواری. لەناویاندا دەرکەوتووترین شوێن کە لە گەڕانە مێژووییەکانا هاوشێوەیان هەیە ئەو شوێنانەن کە نەخش و نیگاری مادەکانی بەگەورەیی تێدانیشاندراون و نموونەش لەسەریان زۆرە. (جنیتو) (١٩٨٦) رایوایە چاوگێڕانێکی سەرتاسەری بە مێژووی دێرینی ئارياييانی کۆندا ئەوەدەردەخات کە

قۆناغی ماد بەشێکی سەرەکییە لە دامەزراندنی شارستانییەت لەناو دامەزراوەکانیاندا لەئێراندا.

بۆچوونێك کە باسکراوە لەسەر ئەو کەلوپەلانەیە کە لەو زەویانەدا دۆزراونەتەوە کە لەناو سنووری مادەکاندا بوون و گریشمەن لەسەر ئەوان دایناوە (مەبەست ناوچەی لوڕستانە)، بەڵام شارەزایانیتر هەن پشتگیری لەو رایە ناکەن. لێرەدا پێویستە پرسیارێکبکەین، بەڵام وەڵامەکەشی ئاساننییە، ئەویش ئایە مادەکان چ رۆڵێکیان گێراوە بۆ هێنانەدی باری سیاسیی و فەرهەنگی یان بەر لە دەرکەوتنی هخامەنشییەکان، بۆ وەڵامەکەی زانیاریمان لەسەری کەمە ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە مادەکان بەڵگەنامەی تەواویان بەجێنەهێشتووە یان بەهۆی نەبوونی کاری کنە و پشکنینەوە لەئێراندا نەمانتوانیوە وەڵامی بەجێمان هەبێت. لەلایەکیتریشەوە وەڵامی پرسیارەکە ناتوانین تەواوبدەینەوە لەبەرئەوەی پرسەکان جیاجیان و پەیوەندییان بە مێژووی خۆرهەڵاتی نزیکی کۆنەوە هەیە بەتایبەتی لەو بڕگەیەوە کە: ئارییەکان بەرەو بەرزاییەکانی ئێران رۆشتوون لە رۆژگاری هاتنی هیندوئەوروپییەکاندا، بۆیە بەگشتی مادەکان کە بەشێکی سەرەکین لە مێژووی کۆندا دەبێت زیاتر بۆیان پەنابەرینەبەر سەرچاوە پیرۆزەکانی پەرتووکە سەماوییەکان و بەڵگەنامەکانیتر ئەوانەی لە پاشماوەی شوێنەوار لە گۆڕە هەڵکۆڵراوە بەردینەکانی ناوچەی دەسەڵاتیان هەن، هەروەها سەرچاوەکانی ئاشوری و بابلی نوێ و ئۆراتۆییەکان و گەلێکیتر لە یۆنانیی و لیدی. ئەگەر لە خوێندنەوەی مێژووی ئێرانی کۆندا ئەوەبزانین کە جیاوازی لەناو عەشیرەتەکانی ماد و هخامەنشیی و پارتی و ساسانیدا بووە، دیارە ئەو جیاوازییەش فەرهەنگە جیاجیاکانیشی گرتووەتەوە و لەناو سەرچاوەکانیشا بەو هۆیەوە جودایی دروستکردووە کە لەناویاندا لێکۆڵینەوە لەسەر پاشماوەی ئاسەوارەکانیان کراوە بەتایبەتی ماد کە تاوەکو سنوورێك دژوارییی دروستکردووە، بۆیە هەموو ئەو پرسانەش بەپێی بەڵگەنامەی مێژوویی و لێکۆڵینەوەی هونەری- مێژوویی لە خۆرهەڵاتی نزیکی کۆندا لەناو تەنگژە و فشاردا ماونەتەوە.

تێڕوانینمان بۆ هەموو ئەو باسانەی کە مێژوونووسان لەسەر هونەری نەخشەسازی خۆرهەڵاتی نزیکی کۆن نووسیویانە کە باسی کۆمەڵایەتی- ئابووریی و بەگەڕخستنی سەنعەتسازییان کردووە بەپێی ئەو پاشماوە هونەرییانەی لە قۆناغی ماددا دەرکەوتوون بەئامانجی رەخنەلێگرتنیان بووە. ئەگەر سەیری ئەو نەخش و نیگارە بەرجەستەکراوانە و ئاسەواری پاشماوەی دیمەنەکانی هخامەنشی لە تەختی جەمشید و پاسارگاد و شووش بکەین ئەوە دەبینین کە زۆرینەیان بێناسنامە ماونەتەوە یان بۆیان ساخنەکراونەتەوە تاوەکو لەسەریان بڕیاری (هۆکاری هەڵکۆڵینی وێنەکان و لێکۆڵینەوە لەسەریان و رەخنەلێگرتنیان بدەین. ئەوجۆرە لێکدانەوە زۆرانەش کە بەبەڵگەوە لەسەریان کراوە بۆدەرخستنیان و دیاریکردنی قۆناغەکانیان بووە لەشوێنەکانیاندا، بەڵام ئەو بەڵگانەی کە بەمەزندە لەسەر نەخشە بەرجەستەکراوەکان رایان لەسەر دەربڕیون بە کەلوپەلە نەخشکراوەکانیشەوە لەگەڵ بەراوردکردنیان بەها و شێوەیان لەشوێنیتردا لەواقیعدا سوودبەخشبوون. لەناو ئەو بەڵگەنامانەشدا زۆرینەیان کە هەن هەتاکو لەتوێژینەوە یان لێکۆڵینەوەکانیشدا لەسەریان، لەناویاندا شوێن و سەردەم نەزانراون، ئەوەش وایکردووە نەتوانین وەڵامی پێویست لەسەریان بدەینەوە.

سەرچاوەی پۆشاکی دەرکەتوو لای مادەکانیش پۆشینی غەرقە و شەرواڵ بووە کە پشتێنیان لەسەربەستووە و خەنجەریان لەسەرداناوە کە بەزۆری لە نەخشە بەرجەستەکراوەکانی تەختی جەمشید و قزقەپاندا بەرچاودەکەون. هەر پارچەیەکیتریش لەو پۆشاکە و نموونەکانیان کە لەشوێنیتریشدا دەرکەوتوون بەبەراوردکردنیان بە هاوشێوەیان کە لە تەختی جەمشیددا لەڕووی بەردەکان دەرهێنراون، نموونەی ئەمانەی دواییش هەرگیز بەرچاونەکەوتوون، چونکە لە شوێنی دوور لە ناوەندی حکومەتی ماد دۆزراونەتەوە کە بۆ رۆژگاری لاوازی دەسەڵاتیان دەگەڕێتەوە، ئەو دۆزراوانەش کە هەن لای لێکۆڵەران دەیانخەنەپاڵ مادەکان، بەڵام رایتریش لەبەرامبەردا هەن رەخنەیانلێدەگرن و بۆ شوێنیتریان دەبەنەوە. ئەو رەخنانەش بەزۆری لەسەر کەلوپەلی لوڕستان و گەنجینەی جەیحون و هەمەدان و زێویە گیراون کە لەم دواییەدا شارەزایان هەموویان یان بەشێکیان دەبەنەوە بۆ

مادەکان، بەڵام بەرلەوانیش هەن ناونیشانیتریان بۆ داناون و نەیانداوەنەتەپاڵ مادەکان کە موڵکی ئەوانن.

(موری) لەباسێکیدا کە پەیوەستبووە بە قۆناغی هخامەنشی لە ساڵی (١٩٨٥) توانیویەتی بابەتەکەی بکاتە سەرچاوەیەك بەکاریبهێنێت بۆ خزمەتی مادەکان بەڵام لەمەدا نەهاتووە راستەوخۆ باسی ئاسەواری فەرهەنگی مادەکان بکات.

(موری) بۆ قسەکردن لەسەر هونەری هخامەنشی هاتووە لەناو چوارچێوەیەکدا سەردەمەکەی دیاریکردووە و بەشێکی لەناویدا تەرخانکردووە بۆ بابەتەکەی کە باسی بەردەهەڵکۆڵراوەکانی تەختی جەمشید و پاسارگاد و شووشە و بەشەکەیتریشی لەسەر کەلوپەلی جەنگییە کە بەکەمی بەرچاودەکەون. ئەوانەی لە هونەری دەرباری هخامەنشی لە مەعدەن بەقاڵبدەرهێنراون، بەبەراوردکردنیان بەگشتی لەگەڵ کۆمەڵە کەلوپەلی هونەری ئانازۆل و ئاشور و بابل و یۆنان و میسر و عیلام و سوریا- فەلەستین پێوەیان دیارن لەهەندێك رووە لەیەکتری دەچن، بەڵام بەڕای (موری) لە هونەری سکاییەوە زیاتر نزیکترن. ئەم بۆچوونە لای (کالمایەر)و (جتمار)یش هاوڕادەوەستنەوە، یاوەکو لەسەر ئەو باوەڕەن داڕشتن بە قاڵبی مەعدەنی بۆ ئاژەڵ لەئێراندا لە قۆناغی هخامەنشیدا بەبەراوردکردنیان بەیەکتری هاوشێوەبوون. بوونی تیوری (موری)ش زەمینەیەکی لەباری لە فەرهەنگی ئێرانیدا خۆشکردووە واتە بەر لە ئیمپراتۆرییەتی هخامەنشی ئەو دیاردەیە بەردەوامی بووە واتە لە سەردەمی مادەکانەوە بووە. ئەوەش لە سەرچاوەی مادەکانەوە دیارە کارە هونەرییەکان بە ساکاری رۆشتووە بۆیە وایکردووە لای لێکۆڵەران ناوی فەرهەنگی نەناسراوی لێبنێن، بەڵام بەسەیرکردنیان زیاتر دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە ئاماژە بەکۆنی سەرچاوەکە لەرووی بنەماوە نەدراوە.

ئەگەر هخامەنشییەکان بەر لە مادەکان سەرچاوە بووبن بۆ سەرنجڕاکێشان و بڕیاردان ئەوە بەناچاری رووبەڕووی بارودۆخێکی دژوار دەبینەوە لەبڕیارماندا، چونکە هونەری دەرباری ماد تەنیا هەر ئاکباتانەی لەسەرچاوە کۆنەکاندا نەگرتووەتەوە بەڵکو باسی دەستکردی هونەری مرۆڤیشی بەگشتی کردووە. لەلایەکیتریشەوە ئەگەر سەیری

مادەکان وەکو دەسەڵات بەشێوەی ئیمپراتۆریەتێك بکەین بەشێك لە لێکۆڵەران لەڕووی زمانەوە رایانوایە مادەکان جیاوازی تەواویان لەگەڵ زمانی پارسی کۆندا بووە.

بەهەمانشێوە ئەو جیاوازییە لەهونەرەکەشدا رەنگیداوەتەوە، چونکە ناوەندی حکومەت لە وڵاتی ماد بەدرێژایی رۆژگارەکە شوێنی سەنعاتکاران بووە کە بەداخەوە هیچ پاشماوەیەك لەو ئاسەوارە هونەرییانە کە هەبووبن بەهۆی تێکەڵاوبوونیان لەگەڵ سەردەمەکانیتردا دەرنەکەوتوون، ئەوەش بەهۆی نزیکبوونیان بووە لەشێوەدا کە هەتاکو ئێستاش پشکنەران لە کاری هەڵکۆڵیندا نەیانتوانیوە جیایانبکەنەوە یان ناسنامەکەی بناسن یان نیشانبدەن، لەگەڵ ئەوەشدا کە لێکۆڵەران لەم پرسەدا کاری بەدواداچوونیشیان بۆکردووە و لەسەری دواون. یەکێك لە شێوازی دەوڵەتی ماد ئەوەبووە کە توانیویەتی هونەری خۆی بەرەسمی بگەیەنێت لەگەڵ گەیاندنی پەیامی فیکری و ئایدیۆلۆژیی بەهەمانشێوە کەناڵی راگەیاندنی گەیاندنیشیان بۆ ئەورۆژگارە کە بەکاریانهێناوە لەڕێگای هونەری نیگارتاشی سەر بەردەوە بووە کە بەهۆیەوە پرسەکەیان گەیاندووە. ئەوەش دەریخستووە هونەری سنعاتسازی مرۆڤی قۆناغی ماد لەڕووی نیگارکێشانەوە کۆنتربووە لە قۆناغی هخامەنشی، بەڵگەش بۆئەمە بەکارهێنانی دارشتنی قاڵبی ئاژەڵ بووە کە بۆ فەرهەنگی ناوچەی دەشتەکانی دەبەنەوە کە لەوانەوە نزیکبوون. ئەمەش لەواقیعدا پرسێکە پەیوەستە بەفیکرەوە کە دەیکەینە ناونیشانێك بۆ یەکێك لە قۆناغە رەسەنەکانی فەرهەنگی ئێرانی کە مادە و لە سەرتاسەری ئاسیای ناوەندا بڵاوبووەتەوە و پاشماوە دۆزراوەکانی لەئەنجامی کاری کنە و پشکنیندا کۆکراونەتەوە.

ئەوەی سەرنجڕاکێشە لە تیوری گریشمەندا دەربارەی بوونی فەرهەنگی هاوبەشە لەنێوان (ماد- کیمیریەکان) یاوەکو (ماد- سکاکان) کە بەڕای ئەو بەنرخە یان دوریش نییە سەرچاوەی رەخنەلێگرتنیش بێت کە تیورەکەی لەسەرداناوە، بەڵام بەهۆی کەمی بەڵگەنامەکانەوە تیورەکەی شوێنی رەخنەلێگرتنە کە رای لەسەریداوە. ئەگەر پرسەکەش دانانی هونەری پاشماوەی نەخشی ئارياييەکان بێت لەناو پاشماوەی فەرهەنگی هخامەنشییاندا لەوانەیە گومناوبووبێت بەوشێوەیەی ئاسەواری فەرهەنگی ماد خرابێتەناو

کەلتووری هخامەنشییەکانەوە.

بەوردبوونەوە لە وردەکاریەکانی پاشماوەی هونەری ئەو کەلوپەلانەی کە زووتر بە لێکۆڵەران گەیشتوون و قسەیان لەسەرکردوون بۆناسینەوەیان، دەتوانین سوود لە باری سیاسی- کۆمەڵایەتی ئیمپراتۆرییەتی پادشاکان وەربگرین (بە مانا ماد) کە لە سەرچاوەکانی مێژووی (ماد)دا زانیارییان لەسەرهاتووە، لەوانەشە لە روانگەی لێکۆڵەرەکەشەوە زەمینە مێژووییەکەی زیاتر لەباربێت واتە بەوجۆرە بێت کە بەڵگەنامەکانی ماد تیشك زیاتر بخەنەسەر بابەتەکە لەڕووی سیاسیی و کۆمەڵایەتییەوە بەوەی خۆی بسەپێنێت. مێژووی مادیش بەدرێژایی رۆژگارەکە لەناو چوارچێوەیەکی سنووردارادا بووە، ئەوەش بەهۆی دامەزراوی سیاسیترەوە بووە کە بەڵگە لەوڕووە هەیە، هەندێك لایەنی پرسەکەش ئەوەی نادیارە تاوەکو ئێستاش ماوەتەوە و رۆشننییە. بەهەمانشێوە وەکو ئەوەی لە نووسراوەکان و یادگارییەکانی تەلارسازی هخامەنشی لە ناوچەی فارس و شووشدا هاتووە کە بەپێی بەڵگە دەرکەوتووەکان و بەسەیرکردنی قەڵەمڕەوی مێژووییان ئەوانە دەخرێنەپاڵیان و هیچ پاشماوەی ئاسەوارێکی گرنگتر لەوانەش بوونی خۆی لەورۆژگارەدا نیشاننەداوە جگەلەو پاشماوانەی ماد کە بەڵگەی، بوونیان لەو ناوچەیەدا نیشانداوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە مادەکان بەرلەهاتنیان بۆ خۆرئاوای ئێران پێدەچێت لە باکووری خۆرهەڵات ماوەیەك تیایدامابنەوە و ژیانیان بەسەربردبێت، هەرچەندە بۆچوونەکە سەرنجڕادەکێشێت، بەڵام هەتاکو ئێستاش تەواو جێگیرنەبووە. ئەگەر وابێت بوونی مادەکان لە هەزارەی چوارەمی پ. ز نیشاندەدات، ئەورۆژگارەش سەرەتایەکە بۆ دەرکەوتنی ئارياييەکان و چوونیان بۆ ناوچەی گورگان واتە سەرزەمینی رەسەنی هیندوئەوروپییەکان. هەر کاری کنە و پشکنینیش دەریخست کە شوێنی رەسەنی کۆنی ناسراوی باکووری خۆرئاوای ئێران پاشماوەی ئاسەواری (حەسەنلو)ی لە (عەقرب تەپە)و (دینخواتەپە)و لە (باباجان تەپە)و (نۆشیجان تەپە)و (جامە شوران)و (گودین تەپە)و (قەیتەرییە) ی لەخۆگرتووە، بۆیە لەوبارەیەوە چاخی ئاسن بەپێی ئەو لێکۆڵینەوانەی لەسەریکراوە دەردەکەوێت باکووری خۆرئاوای ئێران لەو سەردەمەدا بەرەوپێشچونی بەخۆوە

دیوه، بەڵام ئەو کاری کنه و پشکنینه وەڵامی تەواوی پەیوەندی نێوان ناسنامەی قەومیی و فەرهەنگی مرۆڤەکان بەدەستەوەنادات کە لەوێدا ژیاون.

تیورێك کە لە سەرەتای دەیەی ساڵی شەستی زاینی دەربارەی پەیوەندی نێوان فەرهەنگی چاخی حەوجۆشی نویٚ لە (حەسار) لەگەڵ ناوچەی سواڵەتی خۆڵەمێشی دوایی لە خۆرئاوای ئێران کە بە هاوسەردەم دایناون، لەواقیعدا پشتگیری لێنەکراوە، ئەو ناوچەیەش کە دەکەونە نێوان ئەو دوو سنووره جوگرافییەوە تائێستاش لە دەرەوەی خۆرئاوای باکووری خۆرهەڵاتی ئێران جێگیربووە، یاوەکو بەشێوەیەکیتر بڵێێن لە ناوەندی خۆرئاوای زاگرۆس بووە، بەڵام سواڵەتەکە لە باکووری خۆرهەڵاتی ئێران تەواو نەیتوانیوە پەیوەستبێت بە ئێرانییەکان یان هێندوئەوروپییەکان، بۆیە لەبەردەم ئەم هۆکارانەدا هاتنی ئارياييەکان بۆ ئێران پێدەچێت درێژخایەن بووبێت و سەرەتاکەی لە دواچارەکی هەزارەی چوارەمی پ. ز لەوانەیە دەستیپێکردبێت.

بەڵگەکانی زمانناسی لە (ئاوێستا و ویدا) باس لەوەدەکەن سەرزەمینی رەسەنی ئێرانییەکان لە خۆرهەڵات و باکووری خۆرهەڵاتدا بووە، لەمەدا شوێنەوارناسەکان هەرچەندە بەپێی بەڵگە نوێکان پشتگیریلێدەکەن، بەڵام لەبارەی کەرەسەی فەرهەنگییەوە بۆئەوەدەچن کە چەندان کۆمەڵ لەو ناوچەیەدا ژیاون کە لەئێستادا نادیارن. لەوانەشە ئەو هەژارییەی کە لە باشووری تورکمانستان لە سیستمی شارنشینیدا لەنێوان ساڵەکانی ١٦٦٠و ١٠٠٠ پ، ز کە روویداوە ئەنجامەکەی بەهاتنی مرۆڤی نوێ تۆمارکرابێت، هەرچەندە دیاردەکەش شوێنی سەرنجدانە بەڵام دووریشنییە پەیوەندی لەنێوان ئەوان و بینا یادگارییەکانی (تورنگ تەپە)و (ئالتین تەپە)و (موندیگاك) نەبێت، ئەگەر بەوشێوەیە بێت پشتگیری لە تیورە کۆنەکەی گریشمەن دەکەین، بەڵام زۆر نا. ئەوەش بەهاتنی ئارياييەکان دەستپێدەکات بۆ بانەکانی ئێران بەپێی سەرنجی ئەو لێکۆڵەرە فەرەنسی رووسییە کە سوودی لەو گۆڕانکارییانە دیوە بە بەڵگەی ئەوەی سەربانی گۆڕێك لە سیالك لەشێوەی جەمالۆندا دەرکەوتووە. ئەمەش پەیوەستە بە گۆڕانی فەرهەنگییەوە کە لەو بوارەدا دەرکەوتووە و هاوتەریبە لەگەڵ بەڵگەنامەکانیتری شوێنەوارناسیدا.

مادەکان بەڵگەنامەی هاتنیان بۆ ناوچەکەیان بەپێی سەرچاوەکان نیشانداوە. بەپێچەوانەوە هخامەنشییەکان لەهاتنیاندا بۆ ناوچەکەیان بە مانا لەکەیەوە هاتوون نیشانیاننەداوە، تەنیا ئەوەنەبێت لەهاتنیاندا رووبەرووی مادەکان بوونەتەوە و تا ئەندازەیەکیش لەژێر دەسەڵاتیاندا بوون بەهۆی ئەوەی لەورۆژگارەدا لاوازبوون. ئەوەش بەهۆی مێژووی هونەرییانەوە بووە کە لێیکۆڵراوەتەوە، بەڵام بۆئەوەی کە ناتوانن حزوریان هەبێت دەبێت لەوەتێبگەین کە ئەمە پرسێکی دژوارە یان باسێکە لەبارەی پەیوەندییانەوە لەرووی سیاسییەوە سەبارەت بە نەبوونی بەڵگەی نووسین و مێژووی هونەر، ئەوەش بەو مانایە نییە کە مادەکان لەمەیدانەکەدا نەبوون، بەڵکو لای لێکۆڵەران بەهۆی کەمی ئەو بەڵگەنامانە و بەراوردکردنیان بە هاوشێوەیان لەوەدڵنیابوون کە ئەو کەموکورییانە بۆ کەمی کاری کنە و پشکنینی شوێنەواری و رەگەزپەرستی ناحەزان دەگەرێنەوە بۆ دەستنەکەوتنی وەڵامی پێویست لەنەبوونی هەندێك زانیاری لەسەر مێژووی ماد. مێژووش دەریدەخات پەیوەندی لەنێوان مادەکان و هخامەنشییەکاندا بوونی بووە.

ئەوەش دیارە هخامەنشییەکان لەواقیعدا پەیرەوی سیستمێکی کۆمەڵایەتی سیاسی و کۆمەڵایەتی فەرهەنگی هاوشێوەی مادەکانیان کردووە کە دیارە کاریگەری ئەوانیان بەسەرەوەبووە.

لەکۆتاییدا لای شارەزایان ئاشکرایە شارستانییەت ملوانکەیەکە و موڵکی مرۆڤایەتییە، لەهەر شوێنێك ژیانی تێدابووبێت بۆ مرۆڤ ئەو شارستانییەتەی بەرەوپێشبردووە و خزمەتی خۆی لەو بوارەدا گەیاندووە.

قەومی مادیش یەکێکن لەو گەلانە و بەپێی بەڵگەنامەکانی شوێنەوار و مێژووی دێرین و کتێبە پیرۆزەکان خاوەنی ئیمپراتۆرییەتێکی گەورەبوون کە بۆ ماوەی سەدەیەك لەنێوان نیوەی دووەمی چاخی حەوتەمی پ. ز هەتاکو نیوەی یەکەمی چاخی شەشەمی پ. ز بەردەوامییان بووە و خاوەن دەسەڵات بوون. ئەو قەومە بەپێی هەموو ئەو بەڵگەنامانەی لە مێژووی کۆندا لە رۆژگاری ئەمرۆماندا بەدەستمانگەیشتوون لای شوێنەوارناسان پەراوێزخراون و چوونەتە خانەی لەبیرچوونەوە. وادیارە رەگەزپەرستی لەم

پرسەدا کاری خۆی ئەنجامداوە. بەڵگەشم بۆ ئەمە ساڵی ٢٠٠٠ کاتێك سەردانی وڵاتی ئێرانم کرد، ئەوەم بەلاوە باشبوو بڕۆمە هەمەدان بۆ دیدەنی (هەگمەتانە)ی کۆن کە پاشماوەی پایتەختی مادی لەکۆندا لەخۆگرتووە. لەو تەپەیەدا بینینم کاری کنە و پشکنین دەکەن. کاتێك لە کارمەندەکانم پرسی ئەم شوێنە لەکۆندا بەپێی ئاماژەی سەرچاوەکان پایتەختی مادەکان بووە ئێستا بۆچی لەچینەکانیدا بەپێی زانیارییەکانتان ئاماژەیەك بۆ سەردەمی ماد نییە؟ وەڵامەکەیان بۆ پرسیارەکە هێندە لاوازبوو کە دووربوو لە زانستی شوێنەوار. بەلایانەوە وابوو پایتەختی مادەکان لێرەنەبووە، بەڵکو قەڵایچەی بۆکانە. کاتێکیش گەڕامەوە بۆ راپۆرتەکانی کاری کنە و پشکنینی لیژنەکانی نێردراو لە بەرێوەبەرێتی گشتی شوێنەواری بەغدا کە بۆ نیوەی دووەمی ساڵانی پەنجاکانی سەدەی رابردوو دەگەڕانەوە، سەبارەت بەو گردانەی دەکەوتنەناو دەریاچەی دوکان کە لە روپێوی سەرەتاییاندا ئاماژە بە سەردەمی ماد درابوو، بەڵام کاتێك کنە و پشکنین لەو گردانەدا تەواوبوون و راپۆرتیان لەسەر نووسین تێیاندا سەردەمی ماد( پەراوێزخراو) لە شوێنی سەردەمی هخامنشی دانرا(٥٥٠-٣٢٧پ. ز) ئەمجۆرە بیرکردنەوەیە دوورە لە کاری زانستیی و زیان بە مێژوو و شارستانێتی مرۆڤیش دەگەیەنێت. رۆژێکیش دێت هەڵەی ئەو رەگەزپەرستانە راستبکرێتەوە و بەری خۆریش بە بێژنگ ناگیرێت.

●●●

**بۆ ئەم باسە سوود لەو سەرچاوەیە بینراوە:**

- باستان پژوهی/ عدد٣/ فصلنامه علمی، فرهنگی و پژوهی
- باستان شناسی دانشگاه تهران/ ص٢٤-٢٩

# فەلسەفە و زانست لای ئارسەر ئادنجتون

د. حەسەن حسێن سدیق(*)

**ئارسەر ئادنجتون** وەك زانا و فەیلەسوفێکی ئەزموونی - زانستی ناسراوە، گرنگی تەواو بە رۆڵی زانست و ماتماتیك دەدا لە راڤە و شیکردنەوەی سروشت و گەردوون، بۆیە کاتێك دەستەواژەیەك یان گریمانەیەك توانای ساغکردنەوە و توێژینەوەی نەبێ ئەوا لەڕووی زانستییەوە جێگای قبوڵکردنی نییە. ئەم بۆچوونە زیاتر ئەزموونییە، بەڵام ئامانجی زانست لەدوای شۆڕشە زانستییەکانەوە بریتییەلە تێگەیشتن و راڤەکردنی جیهانی فیزیکی "جیهانی دەرەوە"، ئەمە بە هاوکاری و هەمەهانگی لەگەڵ ماتماتیك ئانجامدەدرێ، چۆنکە لەئێستادا تیورە زانستییەکانی بواری فیزیای گەردوونی بەڕێگای هاوکێشە ماتماتیکەکانەوە پێشبینی رووداوەکان دەکەن لەداهاتوودا، تاکە هۆکاری ئەمە بۆ وردی و روونی ئەنجامە ماتماتیکییەکان دەگەڕێتەوە. ئەمجۆرە توێژینەوانە پیویستی بە پلانێك هەیە خۆی لەچەند هەنگاوێکی بنەڕەتیدا دەبینێتەوە:

أ. خوێندنەوەی دیاردە و رووداوەکانی جیهانی سروشتی لەڕێگای هەستەکانەوە یان ئامێرە زانستییەکانەوە.

ب. دارشتنی شێواز و هاوکێشەی هێمایی بۆ گوزارشتکردن لەو دیاردە و رووداوانە بەشێوەیەکی ورد، ئەمە واتای ئەوەیە کە پەیوەندی نێوان جیهانی دەرەوە و جیهانی تیورەکان دەستنیشانبکری.

ت. ساغکردنەوەی تیورەکان و گریمانەکانی جیهانی ماتماتیکی بەتاقیکردنەوە و تەماشاکردن، بەواتایەکیتر، گەڕانەوە بۆ جیهانی دەرەوە بۆ سەلماندنی تیورەکان.

ئەو هەنگاوانە زۆر گرنگن لە پرۆسەی ناسینەوەی جیهان و گەردوون، بەڵام کارێکی ئاسانییە زاناکان بۆ جیهانی دەرەوە بگەڕێنەوە بۆ سەلماندنی تیورەکان، چۆنکە هەڵکشان لە

*) مامۆستای زانست و لۆجیك لە زانکۆی راپەڕین / بەشی فەلسەفە.

جیهانی دەرەوە بەرەو جیهانی هێماکان بۆ خۆی ئالۆزە، چۆنکە بوونی جیهانی هێماکان لەجەوهردا لەسەر رووداوەکانی جیهانی دەرەوە و توانای خەیاڵی زاناکانەوە بەندە، بۆیە گەر هاتوو تیوریك لەگەڵ ئەزموون و تاقیکردنەوەدا یەکانگیرنەبوون، ئەوا دەبی لەرووی زانستییەوە رەتبکرێتەوە. ئایا دروستە ئێمە بڵێن گەر تیوریك لەگەڵ هەست و ئەزموون ناکۆکبوون، ئەوە دەبێ دووربخرێتەوە ؟ چۆنکە زۆر لە تیورەکانی ئێستا شیاوی تاقیکردنەوەی ئەزموونی نییە، ئایا دەکرێ لەبەر ئەم هۆیە دووربخرێتەوە؟ بۆیە زاناکانی فیزیای کوانتۆم و فیزیای گەردوونی، باس لەوەدەکەن ، زۆربەی گریمانە و وێناکان و تێڕوانینەکان بە ئامرازەکان و شێوازەکانی توێژینەوەکانی زانستی سەردەم یەکلاناکرێنەوە، بۆیە پێشنیاری ئەوەدەکەن کە میتۆدیکیتر یان شیوازیکیتری تاقیکردنەوە هەبێ بۆ ئەوکارە، ئەوان دەزانن کە گرفت و پرسیارەکانی زانست لەئیستادا بە میتۆدی زانستی چارەسەرناکرێن، بۆیە بیر لە دۆزینەوەی میتۆدیکیتر دەکەن، ئایا ئەو میتۆدە چییە؟

"باول فیرابند" فەیلەسوفی زانست باس لەوەدەکا کە هەموو رێگاکان بۆ توێژینەوەی زانستی دروستن و گونجاون، ئەو باس لە "ئەفسانە و ئایین و سیحر و فاڵ .." ئەوانە بۆ وەلأمدانەوەی پرسیار و گرفتەکان گونجاون، گەر چارەسەری کیشەکان بکەن، بۆیە بانگەشەی ئەوەدەکات کە میتۆد نییە لە توێژینەوەی زانستیدا، گرنگ ئەوەیە بتوانین وەلأم بۆ پرسیارەکان و چارەسەر بۆ گرفتەکان بدۆزینەوە، چ ئەوکارە بە میتۆدی زانستی ئەزموونی بکریت یان بە سیحر و ئەفسانە و ئایین. کەواتە ئەو میتۆدەی زاناکان ئاماژەی بۆدەکەن، دەکرێ میتافیزیك بیت! چۆنکە میتافیزیك لەهەموو قۆناغەکانیدا رۆڵی هەبووە لە گەشەپێکردنی زانست و تیورە زانستییەکان، بۆیە لەئیستادا دەتوانرێت بۆ هەمان میتۆدی میتافیزیکی بگەڕێنەوە بەمەبەستی راڤە و روونکردنەوەی ئەو گرفت و پرسیارانەی رووبەرووی زاناکان دەبیتەوە، بەنموونە کاتی زاناکانی گەردوونناسی باس لە پرۆسەی دروستبوونی گەردوون دەکەن و ئەو قۆناغانەی پرۆسەکە تیاداڕۆیشتوە، رووبەڕووی گرفتی زۆر دەبنەوە لەوانە "ئایا گەردوون دروستکراوە یان نا؟". ئەم پرسیارە بۆ ماوەی چەندها ساڵ بووە جیگای گفتوگوی زاناکان، بەلأم لەدوای سەدەی بیستەوە بۆ زاناکان دەرکەوت کە گەردوون دروستکراوە، بۆیە تەمەنیکی دیاریکراویش هەیە، ئەمە بووە هۆی ئەوەی بیر لە چارەنووسی گەردوون بکرێتەوە، گەردوون

ڕووبەڕووی ڕووداوی گەردوونی سەیردەبیتەوە، لەوانە زاناکان باس لەوەدەکەن کە "خور" دەتەقیتەوە و مانگ و هەسارەکانیتر لەخۆدەگری لەبەرامبەر زەویدا و هەروەها زەویش ڕووبەڕووی مووشەکیکی گەردوونی دەبێتەوە، دەبێتە هۆی سووڕانەوەی زەوی و گۆڕینی شوێنی خۆرهەلاّتن و ئاوابوون. ئەمانە ئەو گریمانانەن کە زاناکان بێریلێدەکەنەوە دەربارەی چارەسەرنووسی گەردوون. ئایا بەچ میتۆدێکی ئەو گریمانانە ساغدەکرێنەوە، دەسەلمێنرێت؟ بۆیە ناکرێ ئێمە وابێربکەێنەوە کە هەر گریمانە و تێڕاونینێك شیاوی تاقیکردنەوە نەبێ ئەوا زانستی نییە یان دەبێ دووربخرێتەوە، لەئێستادا زانست بەوجۆرە دەدوێ، بۆیە تاکە ڕیگا بۆئەوە گەڕانەوە بۆ دەقەکانی میتافیزیك و ئایین. ئەمانە لەگەلّ بۆچوونی "ئادنجتون" سەبارەت بە زانست زۆر دوورن لەیەکترەوە، بۆیە ئەو ئەجۆرە بۆچوونانە ڕەتدەکاتەوە، چۆنکە شیاوی تاقیکردنەوەی ئەزموونی نین، بەلاّم بۆ سەردەمی ئێستای ئێمە ئەوجۆرە بۆچوونە زۆر گرنگن بۆ دۆزینەوەی هۆکارە بنەڕەتییەکانی پرۆسەی دروستبوونی گەردوون.

لێرەوەیە کە ئامانجی زانا لە ڕوانگەی "ئارسەر ئادنجتونەوە" دەبی بونیادنانی جیهانێکی هێمایی بۆ جیهانی دەرەوە یان جیهانی ئەزموون، بەلاّم هێماکان بریتینلە وێنەی زاناکان دەربارەی جیهانی دەرەوە، ئەو وێنانە سەرچاوەکەی ئاگاییە نەك هەستەکان، بۆیە جارێکیتر ڕووبەڕووی ئەو پرسیارە دەبینەوە، گەر وێنەکانمان بەرهەمی هەستەکان نەبن چۆن جیهانی دەرەوەی پێڕاڤەدەکەین؟ بۆیە خەیالّی زاناکان ڕۆلّی خۆیان هەیە لەمەدا. کەواتە گەر خەیالّ وێنەکان بە جیهان ببەخشی ئەوا گومان لەوەدانییە بەشیك زۆری ئەزموونی مرۆیی تێکەلّ بەوەدەبی، ئەمە بۆخۆی بەلّگەیە لە ئامادەبوونی میتافیزیك و ئایین و ئەفسانە لەو وێناکردنە، بۆیە ئەرکی زانای فیزیایی بریتییەلە دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان جیهانی هێمایی و جیهانی دەرەکی لەڕێی بەکارهێنانی زمانی ماتماتیکی و ڕووداوەکانەوە. لێرەدا زاناکان هەندێ گریمانە دەخەنەبەردەست دوای ئەوەی هاوکیشەکان شیدەکرێنەوە دەربارەی بابەتەکان، ئەوا زاناکان گریمانەکان بۆ تاقیکردنەوەی ئەزموونی جێدەهێلّن بۆ ساغکردنەوەیان بەوجۆرە کارەکان ئەنجامدەدرێن.

خالّیکیتر لێرەدا بریتییەلەوەی کە زانینی مرۆڤەکان تا کۆتایی سەدەی نوزدە سەرچاوەکانی بریتیبوولە پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان و جیهانی دەرەوە لەڕێگای هەستەکانەوە،

ئەوان جیهانیان لەڕێگای هەستەکانەوە دەناسییەوە، ئەم زانینە پشتی بە تیوری فیزیای کلاسیکی نیوتن بەستووە، بۆیە زانیارییەکانی دیاریکراوبوون، بەلاّم لەدوای سەدەی بیستەوە زانستی فیزیا خوێندنەوەیتری هەبوو بۆ جیهان و گەردوون، بەنموونە، گەر ئێمە لە روانگەی فیزیای کلاسیکەوە بڕوانینە کەرەسەیەك وەك "کورسی" ئەوا هەندێ زانیاریمان دەستدەکەوێ وەك "رەنگ و قەبارە و فۆرم و کیش.."و پیمّانوایە ئەو تایبەمەندییانە بریتینلە کورسییەکە؟! بەلاّم لەگەڵ فیزیای نوێدا بابەتەکە جیاوازترە، چۆنکە هەمان "کورسی" لە روانگەی فیزیای نوییێەوە بریتییەلە گەردیلە و ئەلیکترون و شەپولەکان.. شتیتر، بۆیە زمانی فیزیای نوێ کۆمەڵی زانیاری تازەی خستەڕوو دەربارەی بابەتەکە کە پێشتر لە فیزیای کلاسیکدا ئەو زانیارییانە نەبوون. هەستەکان لەبەردەم ئەمە بێدەسەلاّت و بێتوانان، بۆیە ناکرێ ئەوەی سەرچاوەکەی هەست نەبێ زانستی نییە!! یان ئەوەی سەرچاوەکەی ئەزموون و هەست نەبێ بوونی نییە؟! کەواتە دەتوانین بلّێین زمانی زانستی فیزیای نوێ و هاوچەرخ دروست و راستترن لە گوزارشتکردن لە جیهان و گەردوون لە زمانی هەست و فیزیای کلاسیکی، کەواتە دەکرێ بلّێین میتافیزیك رۆڵی خۆی هەیە لە ئاشکراکردنی زانیارییەکان، بە مەرجێ ئێمە توانای خوێندنەوەی دەقەکانمان هەبێ، لێرەدا پێویستە جیاکاری بکرێ لەنێوان ئاستی زانیارییەکان:

أ. زانینی سنووردار یان دیاریکراو: سەرچاوەی ئەم زانیارییانە هەستەکانە، ئێمە بەشێکی کەمی جیهان لەڕێگای هەستەکانەوە دەناسینەوە.

ب. زانینی زانستی: سەرچاوەی ئەم زانینە بریتییەلە تیورە زانستییەکان و راڤە و شیکردنەوەیان بۆ دیاردەکانی جیهان.

ت. زانینی دوای زانست "میتافیزیکی": سەرچاوەی ئەم زانینە تیورە زانستییەکان و دەقەکانی ئاین و میتافیزیکە، ئەمجۆرە بریتینلە راستییەکان "راستییە زانستییەکان" لەگەڵ دەقەکاندا یەکدەگرنەوە لەژێر ناوی "ئیعجازی زانستی".

لێرەدا "ئارسەر ئادنجتون" گرنگی بەجۆری دووەمی زانینەکە دەدا، چۆنکە پێیوایە زانینی زانستی سوودی زۆر هەیە لە گەشەپێدانی توێژینەوەی زانستی، هەروەها بەیەکیك لەڕێگاکانی روونکردنەوەی بیرۆکە و بنەما بەکارهاتووەکانی فیزیا دەزانی، بۆیە ئەو لە تیورە فەلسەفییەکانیدا پشتی بە فیزیای ریژەیی و کوانتۆم بەستبوو. لێرەوە ئادنجتون بۆ بونیادنانی

فەلسەفە زانستییەکەی بۆ دوو بناغە دەگەڕێتەوە یەکێکیان "زانستی" ئەویتریان "فەلسەفی". ئەوانیش:

١. میتۆدی شیکاری.

٢. میتۆدی لێکدراو.

سەرەتا فەلسەفەکەی لە تیوری زانینی زانستیدا، لەسەر میتۆدی شیکاری بونیادنا، بناغەی ئەم تیورە بریتییەلە ناسینەوەی ئەو بیرۆکە و بنەمایانەی کە ئیپستیمۆلۆجیای زانستی لەسەر بونیادنرێت، ئامانجی "ئادنجتون" لەم گرنگیدانە بە ئیپستیمۆلۆجیای زانستی بریتییەلە دوورخستنەوەی هەر گریمانەیەك کە دەبێتە ڕێگر و ئاستەنگ لەبەردەم گەشکردنی زانستی فیزیا لە بونیادنانی جیهانی تیورەکان، هەروەها فراوانکردنی بواری زانینی فیزیای. بە نموونە، هەر یەك لە تیوری ڕێژەی و تیوری کوانتۆم وێنەیەکیتریان بە فۆرمی جیهان بەخشی لەگەڵ کۆمەڵی زانیاری کە دژ و ناکۆکبوون لەگەڵ بۆچوون و زانیاری فیزیای کلاسیکی. ئەم گۆڕانکارییانە بووە هۆی ئەوەی "ئادنجتون" بیر لە فەلسەفەیەك بکاتەوە بۆ زانست سەرجەم ئەو گریمانانە دووربخاتەوە کە سوودیان بۆ گەشەی زانستی نییە. ئەم دوای ئەوەی تیورە زانستییە هاوچەرخەکان وێنەیەکیتریان بەجیهاندا وەك ئەوەی فەیلەسوفانی سەدەی ١٩ جیهان بۆ ئەوان جیهانێکی مادییە هۆکارە بۆ خودی تیورەکان دەگەڕێتەوە کە فۆرمێکی مادییان بە جیهان بەخشیبوو، بەلاّم کاتێ فەیلەسوفانی سەدەی ٢٠ جیهان بە کۆمەڵی ڕووداو وەسفدەکەن، هۆکاری ئەمە بۆ خودی تیورە زانستییەکان بەتایبەتی "ڕێژەیی" دەگەڕێتەوە کە جیهانی وەك ڕووداو ناساندووە، هەروەها فەیلەسوفانی ئەزموونگەرا کاتێ گرنگیی و ڕۆڵی فەلسەفە یان میتافیزیك لەفیزیادا ڕەتدەکەنەوە و بەپێویستی نازانن، هۆکاری ئەمە بۆ خودی فیزیای کلاسیکی دەگەڕێتەوە کە جیهانی مادیی وەك بابەتی توێژینەوەی ڕاستەوخۆ وەرگرتبوو، هەر گریمانە و وێنەیەکیتر لە دەرەوەی ئەو جیهانەوە ڕەتدەکرانەوە بە پاساوی ئەوەی شیاوی تاقیکردنەوەی ئەزموونی نییە و هاوتای نییە لە جیهانی دەرەوە، بەلاّم لەبەرامبەردا فەیلەسوفی تیوری ڕێژەیی بەرگری لە گرنگیی فەلسەفە و گریمانەکان دەکرد، بەهیوای ئەوەی گونجاندن و هەمەهانگی دروستبێ لەنێوان زانست و فەلسەفە. هۆکاری ئەمە بۆ بوونی بنەمای فەلسەفەی

دەگەڕێتەوە لە فیزیای نوێدا. بەنموونە ئینشتاین دەڵێت: "دەتوانم بیسەلمێنم کە بەتواناترین ئەو خوێندکارانەی لەکاتی وانەوتنەوەمدا چاوم‌پێکەوتوون، ئەو خوێندکارانە بوون کە گرنگییان بە تیوری زانین دابوو" ئیپستیمۆلۆجیا"، نەك تەنها بەتوانابوون لەخوێندندا، بەڵکو خاوەنی راوبۆچوونی خۆشیان بوون. ئەم کەسانە بەردەوام لەبەرگریکردندابوون لە بۆچوونەکانیان"، بۆیە لێرەدا دەتوانین ئەوە بڵێن کە فیزیای هاوچەرخ و فیزیای گەردوونی لەڕووی بناغە و بیرۆکەی بنەڕەتییەوە زۆر لە ئیپستیمۆلۆجیا و میتافیزکەوە نیزیکن، چۆنکە زاناکان باس لە بابەتی وادەکەن کە بەهێچ شێوەیەك لەڕێی تاقیکردنەوەی ئەزموونییەوە ساغناکرێتەوە، لەهەمانکاتدا لە چوارچێوەی تیورێکی زانستیدا ئەو بۆچوونانە دەردەبڕێن. ئەمە لەگەڵ بۆچوونی "ئادنجتون" ناکۆکن، هەربۆیە زانا و فەیلەسوفە ئەزموونگەراکان بەردەوام لە هەوڵی دورخستنەوەی زانست بوونە لەوجورە گریمانانە، بەلاَم گەشەکردنی خێرای زانست و تیورەکان بوار بۆ ئەوجورە فەلسەفەیە ناهێڵن کە بۆ مەبەستی تایبەت ناوی مەرگ بۆ میتافیزیك یان فەلسەفە بەرزکەنەوە یان دەربڕین و دەستەواژەکانی بەبێواتا وەسفبکەن.

یەکێك لە هۆکارەکانی گرنگیدانی "ئادنجتون" بە تیوری زانینی زانستی بریتییەلەوەی کە زانینی زانستی تواناکانی ئەقڵ و خەیاڵ لەگەڵ تەماشاکردنی ئەزموونی کۆدەکاتەوە بۆ راڤەکردن و روونکردنەوەی دیاردەکان و رووداوەکان، بەنموونە تیورەکانی رێژەی و کوانتۆم لەو تیورانەن کە پشت بە ئەوجورە زانینە دەبەستیَ، بۆیە ئەرکی فەیلەسوف و زانا بریتییەلە دۆزینەوەیان و فراونکردنی بواری پراکتیزەکردنی، بۆیە زانایەکەی وەك "ئینشتاین" ئەو بۆچوونە رەتدەکاتەوە کە ئەزموون و هەستەکان بە تاکە سەرچاوەی بیرۆکەکان دەزانیَ و سەرچاوەکانیتری زانین رەتدەکەنەوە، بۆیە جەخت لە رۆڵی هزر و بیردەکاتەوە لە پیکهێنانی بیرۆکە و چەمکەکان، چۆنکە بیرۆکەکان هەڵهێنجراوی هزرن یان دروستکراوی هزرن، بۆیە ناکریَ لەڕێگای شارەزا و ئەزموونی ئێندیکشنەوە هەڵهێنجرێت بەنموونە، کاتی "ئینشتاین" باس لە "کات و شوێن" ناویدەنیَ "کاتشوێن" وەك رەهەندی چوارەم لەپاڵ رەهەندەکانی "درێژی و بەرزی و پانی"و گەشتکردن بەنێو کاتدا بەرەوە رابردوو یان ئاییندە، ئەوە گریمانەکانی بریتینلە وێنەی تیوری یان میتافیزیکی بەو واتای کە شیاوی تاقیکردنەوەی ئەزموونی نییە، چۆنکە لە جیهانی دەرەوە هاوتای نییە، بەلاَم ئەم لایەنی تیورەکە هۆکارە بۆ

گەشکردنی زانست و دۆزینەوەی نهێنییەکان، بۆیە ئینشتاین جەخت لە رۆڵی فەلسەفە و هزر دەکاتەوە لە پێشبینیکردنی داهاتوو، هەروەها لەئیستادا دەبینین لە زاناکانی فیزیای گەردوونی لەرێگای هاوکیشە ماتماتیکییەکانەوە پێشبینی رووداوی گەردوونی دەکەن کە بەهێچ شێوەیەك شیاوی تاقیکردنەوە نییە، وەك ئەوەی دەڵێن "گریمانەی ئەوەدەکرێ کە رۆژێك دێت خۆر دەتەقێتەوە و مانگ و هەسارەکانیتر لەخۆدەگرێ لەبەرامبەر زەویدا "ئایا ئەمجۆرە دەربڕین و دەستەواژانە بەپێی پێوەری فەلسەفەی ئەزموونگەرایی و پۆزەتیڤیزمی زانستییە؟ نەخێر لە روانگەی ئەو فەلسەفەوە قسەی پووچ و بێواتایە، بەلاَم زاناکان جەخت لەسەر ئەو گریمانانە دەکەنەوە بە خوێندنەوەی بۆ کاتەکانی رووداوە گەردوونییەکان کە لەرابردوودا روویانداوە، بۆیە پێشبینی ئەوەدەکەن کە رەنگە چارەنووسی گەردوون رووبەڕووی چەندەها دیاردەی سەیر بێتەوە کە پێشتر لەوجۆرە دیاردانە روویانەداوە. ئەوجۆرە گریمانانە دەکرێ بە "میتافیزیکی زانست" ناولێنرێ.

بەلاَم سەبارەت بە تیورەکەی "ئادنجتون" لە میتۆدی توێژینەوەی زانستیدا، بریتییەلەوەی کە میتۆد لە روانگەی "ئادنجتونەوە" بەکارهێنانی فاکتەکانە لەداڕشتنەوەی گریمانە و یاساکان و ساغکردنەوەی لەدواجاردا لەرێگای ئەو زانیاری و پێشبینییانەی دەربارەی ئایندە دەیخاتەبەردەست گەرهاتوو پێشبینییەکە لەگەڵ فاکتەکەدا یەکانگیربوو ئەوە دروستە و بەپێچەوانەوە نادروستدەبێ. بەجۆرە زانینی فیزیای نوێ پەیوەستە بەو میتۆدە زانستییەوە، بۆیە پیناسەی ئێمە بۆ گەردوون پشت بەو میتۆدە دەبەستێ کە فیزیای وەسفی جیهانی پێدەکا، بۆیە هەر بۆچوون و گریمانەیەك لە چوارچیوەی ئەو میتۆدە نەبێ ئەوە "ئادنجتون" لە فەلسەفەکەی دووریدەخاتەوە. کەواتە دەکرێ بەمشێوازە لە تیورەکەی "ئادنجتون" تێبگەین:

١. میتۆدی نێگەتیڤ "لایەنی نێگەتیڤی میتۆدەکەی": ئەم لایەنە تایبەتە بەگەڕان بەدوای ئەو گریمانە و بیرۆکانەی شیاوی تەماشاکردنی ئەزموونی نین بەمەبەستی ساغکردنەوەی بەهاکەی " دروست یان نادروست"، ئەمە گرنگی خۆی هەیە لەتوێژینەوەدا، چۆنکە زۆر گریمانە هەن لەفیزیادا کە تائیستا ئاڵوز و ناڕوونە، بۆیە گەر زاناکان ئەم کارەیان بۆ رەخسا، ئەوە بەئاسانی دەتوانن بگەنە زانینێکی فیزیکی روون کە هێچ ئالوزی تیادانەبێ.

٢. لایەنی پوزەتیڤی میتۆدەکەی: بە هەنگاوی دووەم دانراوە دوای تەواوبوون لە هەنگاوی یەکەم، زانا بەئاسانی دەتوانێ کار بۆ فراونکردنی زانین بدا لەبواری فیزیادا و دانانی تیوری زانستی کە مەودای فراون لەخۆبگرێ. لێرەدا گەر بپرسین ئایا "ئادنجتون" زانینی تیوری لە میتۆدەکەی دوورخستووەتەوە؟ ئایا ئەو لەگەڵ ئەودایە کە زانینی تیوری یان هزری رۆڵی هەبێ لەگەیشتن بە زانینێکی زانستی؟ دوای خوێندنەوەی "ئادنجتون" بۆ تیورەکانی "نیوتن و ئینشتاین" دەربارەی "کیشەی بابەتی الاسیر"و دیاردە شەپۆلییەکان، گەیشتە ئەوەی کە هەر تیوریك بیرۆکە و بنەمای ئیپستیمۆلۆجی خۆی هەیە، تاکە جیاوازی نێوان تیورەکان بۆ ئەو بنەما و بیرۆکانە دەگەڕێتەوە، بەنموونە ئیپستیمۆلۆجیای ئینشتاین لە تیوری هیزی راکێشان جیاوازە لە ئیپستیمۆلۆجیای نیوتن لە هەمان بواردا، چۆنکە ئینشتاین پشتی بە راستییە پێوانەیەکان بەستبوو، بەلاَم "نیوتن" پشتی بەهەندێ گریمانەی فەلسەفەی بەستبوو، کەواتە "یاسای راکیشانی" ئینشتاین لەڕووی ئیپستیمۆلۆجییەوە لەوەی "نیوتن" چاکترە، چۆنکە توانای چارەسەرکردنی گرفتەکانی هەیە و مەودای زانیارییەکانی فراونترکرد دەربارەی گەردوون و سروشت، کەواتە "ئادنجتون" بەهیچ شێوەیەك زانینی تیوری پشتگوێنەخستووە لە میتۆدەکەی، پێیوایە زانستی فیزیا دوو لایەنی گرنگ لەخۆدەگرێ: (لایەنی تیوری)و (لایەنی پراکتیکی) مەحاڵە یەکێکیان پشتگوێبخرێت، چۆنکە گەشکردنی زانست بەردەوام ئەم دوو لایەنەی لەخۆگرتووە. ئەمە بۆ خۆی بریتییەلە گەڕانەوەی پەیوەندی نێوان فەلسەفە و زانست .

●●●

**بۆ ئەم نووسینە سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە:**

١. دیزانی مەزن، ستیڤن هۆوکینگ و لیۆنارد ملۆدینو، وەرگیرانی، حۆسێن حۆسینی و کامیار سابیر، خانەی وەرگێڕان، ٢٠١١.

٢. جريبينن، جون، قصة الكون، ترجمة، مصطفى ابراهيم فهمي، كلمات عربية للترجمة والنشر، القاهرة، ط١، ٢٠١٠.

٣. جينز، جيمس، الفلسفة والفيزياء، ترجمة، حعفر رجب، دار المعارف مصر، ١٩٨١.

٤. خليل، ياسين، مقدمة في الفلسفة المعاصرة، دار الشروق للنشر والتوزيع، عمان- الاردن، ط٢، ٢٠١٢.

# بوێری سادەی بڕیاردان:

## ئەوەی چەپ لە تاچەرەوە دەبێت فێری ببێت

## سلاڤۆی ژیژەك

**و. لە فارسییەوە: فازڵ مەحمود وەلی**

**پێش خوێندنەوەی وتارەکەی ژیژەك و بۆ تێگەیشتنی باشتر لە وتارەکە بە پێویستمزانی بە چەند دێڕێك لەسەر مارگرێت تاچەر بوەستم:**

﴿١﴾

مارگرێت تاچەر "خاتوونی ئاسنین" تاقە ژنە کە لە مێژووی بریتانیادا بووبێت بە سەرۆکەزیر و یەکێکیشە لەوانەی کە درێژترین ماوەی سەرۆکوەزیرانی هەبووە واتە سێ قووناغی لەدوای یەك. تاچەر بڕوای بە ئازادی تاکەکەسی و گواستنەوەی دەسەڵاتە لەدەوڵەتەوە بۆ ناو سیستمی بازاری ئازاد. لایەنگری ئەو لە بازاڕی ئازاد و بەخشینی داموودەزگا دەوڵەتییەکان و گواستنەوەیان بۆ کەرتی تایبەت لەسیاسەتە بەباوبانگەکانیەتی. یەکەم لایەنی ئیشکردنی، "بەتایبەتکردنی" کەرتی گشتییە لەلایەن دەوڵەتەکەیەوە کە لەسەرەتای ساڵانی ١٩٨١دا لە برێتیش تیلیکۆمەوە دەستیپێکرد. تاچەر بەتایبەتیکردنی کەرتی گشتی بەڕێگایەك بۆ لەناوبردنی دژایەتی نێوان خاوەن کار و کرێکارەکان دەزانی. ئەو بەومەبەستە خەڵکی بەوەهاندەدا کە نەك ئەوەی خۆیان خاوەنی ئەو شوێنە بن کە کاری تێدادەکەن بەڵکو خاوەنی ئەو خانووەش بن کە دروستیدەکەن. لەم سیستمە نئۆلیبرالیزمە سەرمایەدارییە کە تاچەر پێداگری لەسەردەکات بەرهەمهێنەر و بەکاربەر هەر خۆیانن کە بڕیار لەسەر نرخ و ماهییەتی کاڵا دەدەن کە دواتر لە وتارەکەی ژیژەك گرنگی ماهییەتی

بڕیاردان بەبەستنەوە بەم مۆدێلە ئابوورییە دەردەکەوێت.

مارگرێت تاچەر لە وتارێکی مێژوویی خۆیدا لە ساڵی ١٩٨٧دا بۆچوونەکانی خۆی بەمشێوەیە دەدەبرێت: "بەبۆچوونی من ماوەیەکی زۆرە کە خەڵکی راهاتوون وەهابیربکەنەوە کە گوایە دەوڵەت بەرپرسیاری چارەسەرکردنی کێشەکانیانە. ئەگەر کەسێك کێشەی دارایی هەبێت بیرلەوەدەکاتەوە کە سلفە لە دەوڵەت وەربگرێت، ئەگەر کەسێك کێشەی نیشتەجێبوونی هەبێت بیرلەوەدەکاتەوە کە دەبێت دەوڵەت خانووی پێبدات، ئەوان کێشەکانی خۆیان دەخەنەئەستۆی کۆمەڵگا بەڵام ئایا بەڕاستی ئەم کۆمەڵگایە کێیە؟ شتێك بەمشێوەیە لەژێر ناونیشانی کۆمەڵگا بوونێکی دەرەکی نییە، ئەوەی کە بوونی هەیە تاکەکانی کۆمەڵگان، ژن یان مێرد یان خێزانەکانن هیچ حکومەتێکیش توانای کردنی هیچ کارێکی نییە مەگەر لەڕێگای ئەم خەڵکانەوە نەبێت، خەڵکیش دەبێت بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان پشتئەستووربن بە خۆیان و خەڵکانیتر. "ئەمە ئەرکی ئێمەیە کە کاروباری خۆمان رێکبخەین و یارمەتی کەسانیتریش بدەین، ژیان گرفتێکی دووسەرە، بەڵام بەداخەوە خەڵکی زۆر بەسەختی راهاتوون لەسەر مافەکانی خۆیان بەبێئەوەی بیر لە ئەرك و بەرپرسیاریاتییەکانی خۆیان بکەنەوە.

**

ڤینستۆن چێرچڵ لە دواپەڕەکانی کتێبە بەنرخەکەی بەناونیشانی "جەنگی جیهانی دووەم" کە لە ساڵی ١٩٥٣دا بلاوکرایەوە و توانی لە ڕێگەیەوە خەلاتی نۆبێلی ئاشتی بەدەستبهێنێت، بیری لە مەتەڵی بڕیاری سەربازی دەکردەوە. پاش ئەوەی کەسانی پسپۆڕ (ئابووریناسان و توێژەرانی سەربازی، دەروونناسان، کەشناسان) راڤەکردنەکانی خۆیان خستەڕوو، ئەرکی کەسێك بوو کە بڕیارێکی سادە و لە ناوەڕۆك قووڵ لەبارەی ئەو هەموو راڤانە بە (بەڵێ) یان (نەخێر)ێکی سادە بداتەوە. (دەبێت هێرشبەرین، دەبێت دانبەخۆدابگرین..)، ئەمجۆرە خۆنواندنە کە هیچکات ناکرێت بەتەواوەتی عەقلانیش بێت، هی کەسێکی فەرماندەیە. ئەرکی پسپۆڕان ئەوەیە کە بارودۆخ بەهەموو ئالۆزییەکانیەوە بخەنەبەردەست و ئەرکی فەرماندەش ئەوەیە ئەمە لە چوارچێوەی یەك بڕیاردا کورتکاتەوە.

بەتایبەت لە قەیرانە ئالۆزەکاندا فەرماندەیەك پێویستە ئەرکی فەرماندە دەستخستنەناو پۆلێنکردنێکی رەسەنە، لەنێوان ئەوانەی کە دەیانەوێت بگەڕێنەوە بۆ نێو پارامێترە کۆنەکان و ئەوکەسانەش کە ئاگادرای کەرەستەکانی گۆڕانن پۆلێنکردنێکی ئاوەها هەڵبەت نەك سازشێکی هەلپەرستانە، بەڵکو تەنیا رێگای گەیشتنە بەیەکگرتنێکی راستەقینە.. بهێڵن بانموونەیەك بهێنمەوە کە بەدڵنیاییەوە کاریگەریشی نییە: فەرەنسای ١٩٤٠ تەنانەت ژاك دوکلو، کەسی دووەمی پارتی کۆمۆنیستی فەرەنسا، لەگفتگۆیەکی تایبەتدا ئەوەی خستەڕوو کە لەو سەردەمە، ئەگەر لە فەرەنسا هەڵبژاردنی ئازادانە ئەنجامبدرایەت، مارشاڵ پێتەن ٩٠ لەسەدی دەنگەکانی بۆ خۆی بەدەستدەهێنا. کاتێك گۆگڵ لەکردەیەکی مێژووییدا، نارەزایی بەرامبەر بە مافی کاپتولاسیۆن بۆ ئەڵمانەکان دەربڕی و بەردەوامبوو لەبەرگریکردن، بانگەشەی ئەوەیدەکرد کە تەنیا ئەوە (نەك رژێمەکەی ڤیشی) کە وتەبێژی فەرەنسای راستەقینەیە (وتەبێژێکی فەرەنسای راستەقینەی، نەك تەنیا وتەبێژی (وتەبێژی فەرەنسییەکان!!) ). ئەو شتەی کە ئەو دەیوت بەتەواوەتی راستبوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە لەلایەن (دیموکرات)ییەوە نەك رەوایەتی نەبوو، بەڵکو بەئاشکراش بەرامبەر بە بۆچوونی زۆرینەی خەڵکانی فەرەنسا بوو. مارگرێت تاچەر، ئەو ژنەی کە هەرگیز لە قسەی خۆی پاشگەزنەدەبووەوە، فەرماندەیەکی بەمشێوەیە بوو. سەرەتا پێداگری لەسەر ئەو بڕیارە شێتئاسایەی دەکردەوە و بەرەبەرە ئەم شێتییە تایبەتەی بۆ لادانێك کە جێگای قبوڵی هەمووان بێت بەرزدەکردەوە، کاتێك سەبارەت بەگەورەترین دەستکەوتی پرسیارلێکراوە، بێ یەك و دوو وەلامی داوەتەوە: (پارتی کرێکاری نوێ). قسەکەی راستبوو: سەرکەوتنی لەوێدابوو کە تەنانەت دوژمنە سیاسییەکانیشی بنەما سەرەکییەکانی سیاسەتە ئابوورییەکەی ئەویان قبوڵکرد ـ سەرکەوتنی راستەقینە نەك لەئەنجامی سەرکەوتن بەسەر دوژمن، بەڵکو لەکاتێکدا روودەدات تەنانەت دوژمن زمانی تۆ بەکاربهێنێت، بەشێوەیەك کە بیرکردنەوەکانی تۆ بنەمای هەموو شتەکان پێکبهێنێت. ئیستا، ئەمڕۆ چی لە میراتی تاچەر دەمێنێتەوە؟ هەژموونی لیبراڵی نوێ بەئاشکرا لەساتەوەختی هەڵوەشاندنەوەیە، تاچەر لەوانەیە تەنیا خۆی تاچەریستێکی راستەقینەبوو ـ ئەو بەهەموو

قەناعەتێکییەوە بڕوای بە تیۆرییەکانی هەبوو. بەپێچەوانەوە لیبرالّیزمی نوێی ئەمڕۆ ـ وەکو مارکس دەیڵێت ـ (تەنیا وێنای ئەوەدەکات کە بڕوای بەخۆیەتی و چاوەڕێی ئەوەشدەکات کە جیهانیش هەمان باوەڕی هەبێت). ئەمڕۆ ڕێبازی کەلبی دراو، بووە بەباو. نوکتە بێرەحمانەکەی فیلمی (بوون یان نەبوون)ی لوبیچ بەبیربهێننەوە: کاتێك سەبارەت بە کەمپەکانی ئیشی زۆرەملێ (کەمپی چاودێری) لە لەهستانی داگیرکراو پرسیارکرا، ئەفسەرە بەرپرسە نازییەکە، ئێرناهارت، وەلاّمیدایەوە: (ئێمە چاودێری دەکەین و لەهستانییەکانیش لە کەمپ شوێن خۆشدەکەن). ئایا هەر ئەم بابەتە سەبارەت بەفەشەلهێنانی کۆمپانیای ئینرۆن (کۆمپانیای بەرهەمهێنانی کالاّ و پێداویستی لە هۆستۆن) لە کانوونی دووەمی ٢٠٠٢ دا ڕاستنییە ـ هەروەها سەبارەت بە تەواوی زیانلێکەوتنە داراییەکانی پاش ئەوەش ـ کە دەکرێت ئەمە وەکو شیکردنەوەیەکی کینایەئامێز لە چەمکی کۆمەڵگای ریسکخواز ڕاڤەبکرێت؟ ئەو هەزاران کارمەند و کرێکارەی کە پیشە و پاشەکەوتەکانیان لەکیسچوو و بەدڵنیاییەوە ڕووبەڕووی ریسك ببوونەوە، بەلاّم بێئەوەی بەڕاستی هەڵبژاردنێك لەپێشدا بوونی هەبێت ـ ریسك وەکو ئەجەلێکی هەڵواسراو دابەزی بۆ سەریان، بەلاّم لەبەرامبەردا ئەوانەی وائاگاداری ئەم بێنەوبەردەیەی ئەم ریسکە بوون و هاوکات دەیانتوانی دەستوەربدەنە بارودۆخەکە (ئەو بەڕێوەبەرانەی وا پۆستی بالاّیان هەبوو) ئەم ریسکەی خۆیانیان لەڕێگای بەپارەکردنی بەرهەمەکانیان تائاستێك کەمکردەوە ـ هەربۆیە ئەوە ڕاستە کە ئێمە لەکۆمەڵگایەکدا دەژین کە کۆمەڵە هەڵبژاردنێکی ترسناکی تێدایە، بەلاّم هەندێك ـ بەڕێوەبەرانی ڤال ئیستریت ـ هەڵدەبژێرن و لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانیتر ـ ئەو خەڵکە ئاساییەی کە خەریکی پێدانی سلفەکانیانن ـ ریسك دەکەن. یەکێك لە ئاکامە سەیرەکانی فەشەلهێنانی بازاڕە داراییەکان و ئەو هەنگاوانەی کە نرا بۆ بەرنگاربوونەوەی (ئەو پارە مۆڵەی کە بۆ یارمەتیدانی بانکەکان درا) نوێبوونەوەی شتێکە کە لەنێو بەرهەمەکانی ئایین ڕاندا خۆی حەشارداوە، کەسێك کە بەباشی دەتوانێت وتەبێژی ئایدۆلۆژی سەرمایەداری ڕادیکاڵ بێت لەسەر بنەمای ئەم دروشمە کە (تەماح باشە) ـ فرۆشی گرنگترین کتێبی ئەو بەناونیشانی (ئەتڵەس شانی لەقاند) دووبارە گەیشتووەتەوە حەدی تەقینەوە. لەسەر بنەمای کۆمەڵێك

راپۆرت کۆمەڵێك نیشانە دەرکەوتووە لەو سیناریۆی کە لە (ئەتلەس شانی لەقاند) باسکراوە ـ لەسەر ئەو بنەمایەی کە خودی سەرمایەدارە داهێنەرەکانیش خۆیان ماندەگرن ـ خەریکی روودانە. جۆن کۆمپێل، نوێنەری کۆماریخوازی کۆنگرە دەڵێت: (دەوڵەمەندەکانیش ماندەگرن. من لە پێوەرێکی بچووکدا، چاوم لە کۆمەڵێك نارەزاییە لەلایەن ئەو کەسانەی کە خۆیان داهێنەرن. ئەوان دەست لەو هەلپەرستییانەی خۆیان هەڵدەگرن چونکە دەزانن لەئەنجامی ئەوانەوە سزایان بەردەکەوێت). بێمانابوونی ئەم کاردانەوەیە لەوێدایە کە بەتەواوەتی بە هەڵە لە بارودۆخەکە تێگەیشتووە. زۆربەی ئەو برە زۆرە یارمەتییە داراییەی دەوڵەت بۆ رزگارکردنی سیستمی دارایی رێك دەچێتە گیرفانی ئەو (دێو)انەی کە لەسیناریۆکەی خاتوو راند لە کۆتوبەندی چاودێری دەوڵەت رزگاریان بووە، بەلاّم لە پرۆژە (داهێنان)ەکانی خۆیان شکستیانخواردووە و لەئەنجامدا هۆکاری ئەم قەیرانە داراییەن. ئەمە دێوە بلیمەتە داهێنەرانە نین کە هەنووکە فریای خەڵکانی ئاسایی تەمبەڵ دەکەون، ئەمە باجدەرە ئاساییەکانن کە دێنە یارمەتی (بلیمەتە داهێنەرە) شکست خواردوو و فەشەلەکان.

لایەنێکیتری میراتی تاچەر کە لەلایەن چەپەکانەوە هێرشیدەکرێتەسەر شێوازی رابەرایەتییە (سولّتەگەرا)کەیەتی، نەبوونی هەستی هاوئاستی دیموکراتیك. بەلاّم لێرەدا بارودۆخەکە لەوە ئالۆزترە کە وادێتە پێشچاو، نارەزاییە گشتییەکان کە تەواوی ئەوروپای گرتووەتەخۆی هەڵگری کۆمەڵێك داواکاری هاوبەشن کە لەبەرئەوەی خۆرسك و ئاشکرا و روونن جۆرێك لە (لەمپەری ئیپستمۆلۆژی) یان لەرێگای رووبەرووبوونەوەیەکی تەندروست بەرامبەر بە قەیرانی هەنووکەیی سیستمی سەرمایەداری دروستکردووە. ئەم نارەزاییانە لەپراکتیکدا بە کۆپییەکی عەوامانە لە سیاسەتی دولۆزی راڤەی بۆدەکرێت: خەڵکی دەزانن چییاندەوێت، توانای ئەوەیان هەیە داواکانی خۆیان دەستنیشانبکەن و هاوکێشەبەندی بکەن، بەلاّم تەنیا لەرێگای پیاهەڵپژان و چالاکییە بەردەوامەکانی خۆیان، هەربۆیە ئیمە پێویستیمان بە دیموکراتییەکی هاوبەشیانەی چالاك هەیە، نەك تەنیا دیموکراتییەکی نوێنەرایەتی لەگەڵ رێوشوێنی هەڵبژاردن کە هەر چوار ساڵ جارێك دەنگدەران لە پاسیڤبوون رزگاربکات. ئیمە پێوستیمان بەخۆ ـ رێکخستنێکی مەزنی گەل هەیە، نەك پارتێکی

سەنترالّی لینینی لە گەلّ رابەرێك و هتد.

ئەم ئەفسانەیە خۆی ـ رێکخستنێکی راستەوخۆ و بەدەرە لە نوێنەرایەتییەکی سیاسی کە دوایین داوە، قوولّترین وەهمێك کە دەبێت دابڕمێت ـ هەلّبەت رزگاربوون لێی، لەهەمووی ئەستەمترە. بەلّێ ئەوە راستە کە لەهەر پرۆسەیەکی شۆڕشگێڕانەدا کۆمەلّێك ساتی وروژێنەری پێکەوەبوون و هاوهەلّوێستی بوونی هەیە کە تێیدا هەزاران، تەنانەت سەدان هەزار کەس لەتەنیشت یەکەوە، شوێنێك داگیردەکەن، هەروەك مەیدانی تەحریر لە دوو سالّی رابردوو. هەلّبەت کە چەند ساتێك لە بەشداریبوونی بەکەفوکولّی پێکەوەییبوونی هەیە کە تێیدا، گردبوونەوە لۆکالّییەکان بیروڕا ئالّوگۆڕدەکەن و بڕیاردەدەن، کۆمەلّێك ساتی شکۆدار کە خەلّکی لەنێو بارودۆخێکی نائاسایی بەردەوام دەژین و کاروبار لەدەستدەگرن بەبێ رابەرێك کە رێنوێینیان بکات، بەلاّم ئەم بارودۆخانە درێژەناخایەنێت، چونکە لێرەدا (ماندووبوون) نەك واقیعێکی سادەی دەروونناسانەیە بەلّکو یەکێکە لە وتەزا ئۆنتۆلۆژییە کۆمەلاّیەتییەکان. زۆرینەی خەلّك ـ لەوانە خۆم ـ دەیانەوێت پاسیڤبن و متمانە بە دامودەزگای دەسەلاّتداری دەولّەت بکەن کە زەمانەتکەری جوولّەیەکی هێور و هاوڕێکی تەواوی بنیای کۆمەلّگایە، بەشێویەك کە من بتوانم بەئارامی تەواوەوە کارەکەم بکەم. ڤالّتەر لیپمێن لە کتێبی (رای گشتی) **١٩٩٢** دەنووسێت: دەبێت (چینێکی تایبەت) هەبێت کە حوکمڕانی بەسەر چین و توێژی هاولاّتیاندا بکات کە (بەرژەوندییەکانی ئەم چینە لە سەروو بەرژوەندیی ناوچەیی و لۆکالّیدا بێت) ـ ئەم چینە نوخبەیە دەبێت وەکو ئامێرێکی زانستی کردار بنوێنێت تابتوانێت زالّبێت بەسەر کەمووکوڕییە سەرەتاییەکانی دیموکراتی، واتە زالّبێت بەسەر ئامانجی نامومکینی (هاولاّتییەکی توانای رەها). دیموکراتی ئێمە وەها دەکات ـ بە رەزامەندی ئێمە: هیچ شتێکی نامۆ لەم وتەیەی لیپمێندا بوونی نییە، ئەمە راستییەکی ئاشکرایە، نامۆ ئەوەیە کە ئێمە لەگەلّ وشیاریمان بەرامبەر بەم شتانە، بەردەوامین لەسەر یاری دیموکراتی، وادەجوولّێینەوە وەکو بلّێی ئازادین و ئازادانە بڕیاردەدەین، بەلاّم بەبێدەنگی نەك ئەوەی کە تەنیا قبولّیدەکەین، بەلّکو تەنانەت خوازیاری ئەوەین بڕیارێکی شاراوە (کە لەناو خودی فۆرمی ئازادی بیروڕای ئێمەدا بوونی هەیە)

پێمانبڵێت کە چیبکەین و بیر لەچیبکەینەوە. (خەڵکی دەزانن چییاندەوێت) نە، ئەوان نازانن و نایانەوێتیش بزانن. ئەوان پێویستیان بە کۆمەڵێك نوخبەی شیاوە و هەر لەبەرئەمەشە کە سیاسەتمەدارێکی راستەقینە، نەك تەنیا نوێنەری بەرژەوەندییەکانی خەڵکە بەڵکو لەرێگای ئەوەوەیە کە خەڵکی لەوەتێدەگەن کە چی شتێکیان (بەڕاستیٚ دەوێت).

سەبارەت بەخۆ ـ رێکخستنێکی مۆلۆکولیانەی گەلێکی فرە بەرامبەر بە سیستمێکی هیرارکیەتی رەگداکوتاو و لەسەر بنەمای رابەرێکی کاریزماتیك، سەیری ئەم نموونەی ڤینیۆزیۆلا بکەن، ولاٚتێك کە زۆرکەس ئەوێیان لەبەر ئەو هەولاٚنەیان لەپێناو پەرەسەندنی حاڵەتێك لە دیموکراتی راستەوخۆ ستایشکرد (ئەنجومەنی لۆکاڵی، سەندیکاکان، ئەو کارگانەی کە لەژێر بەڕێوەبردنی کرێکارەکانە)، لەهەمانکاتدا ولاٚتێکە کە سەرۆککۆمارەکەی هۆگۆ جاڤێز بوو، رابەڕێکی بەهێز و کاریزماتیك (ئەگەر بەڕاستی رابەڕێکی بەمشێوەیە بوونی هەبێت). دەڵێی یاسای گواستنەوەی فرۆید لەم بواردەدا کارایی خۆی هەیە: بۆ ئەوەی کەسەکان (لە کەوڵی خۆیان بێنەدەرەوە)، تەونی پاسیڤبوونی خۆیان بەرامبەر بە سیاسەتی نوێنەرایەتی بشکێنن و خۆیان لە پێگەی کاربەدەستە سیاسییەکان، راستەوخۆ بێنەمەیدانەوە. گەڕانەوە بۆ رابەرێك زەروورەتە، رابەرێك کە هەلی ئەوەیان بۆ برەخسێنێت خۆیان لە قووڕولیتاو دەربهێنن، وەکو بارۆن مونشهاوزن (ئەرەستۆکرات زادەی ئەڵمانی سەدەی ۱۸)، رابەرێك کە (دەڵێی دەزانێت) ئەوان چییاندەوێت. هەر لەم لایەنەوەیە کە بەم دواییانە ئالان بادیۆ ئاماژەی بۆ ئەم خاڵە کردووە کە چۆن رێکخستنە ئاسۆییەکان بە بێدەسەلاٚتانە سەیری فەرماندەیەکی کلاسیك دەکەن، بەلاٚم لەهەمانکاتدا کۆمەڵێك فۆرمی نویٚ لە دەسەلاٚت دروستدەکەن کە بەبەراورد لەگەڵ فەرماندەی کلاسیك توندوتۆڵترن. ئەم تێزەی بادیۆ ئەوەیە کە سوژە پێویستی بە فەرماندەیەك هەیە تاوەکو خۆی لە ئاستی (ئاژەڵێکی ئینسانی) بۆ سەرەوە هەڵکێشێت و بەرامبەر بە رووداو ـ حەقیقەت وەفاداربێت: (فەرماندە ئەو کەسەیە کە یارمەتی خەڵکان دەدات تاوەکو بن بە سوژە. ئەمە واتە، ئەگەر رازیبین بەوەی کە سوژە لە ئەنجامی ململانێی تاك و هەمەکییەت سەردەردەهێنێت، ئەوکات ئاشکرایە کە تاك بۆ پێشکەوتن لەم رێگایەدا (و بوون بە سوژە) پێویستی بەواسیتەیەك و

لەئەنجامدا بەدەسەلاتێك هەیە. دەبێت پێگەی فەرماندە زیندووبکەینەوە. ئەوە هەڵەیە وا بیربکەینەوە بەبێ فەرماندەش دەکرێت شتێك بکرێت، بەتایبەت لەلایەن رزگاربوونەوە).

بادیۆ باکی لەوەنییە کە رۆڵی سەرەکی فەرماندە بەرامبەر بە هەستیاربوونی (دیموکراتیکی) ئێمە دابنێت: (ئەم کارە سەرەکییەی فەرماندە سازگارنییە لەگەڵ فەزای زاڵی (دیکوکراتیك)، هەر لەبەرئەم لایەنەیە کە من تووشی شەڕێکی تاڵ هاتووم لەگەڵ ئەم فەزایەدا (بەهەرحاڵ هەرکەسێك دەبێت سەرەتا لەئایدۆلۆژیاوە دەستپێبکات) ). ئێمە دەبێت بەبیترس لایەنگری لە پێشنیارەکانی ئەو بکەین: هەر بۆئەوەی بەشێوەیەکی پراکتیکانە کەسەکان لە (خەوەنووچکەی دیموکراتییە) کۆنەپەرەستانەکەیان خەبەرکەینەوە، لەم متمانە کوێرانەیان بۆ فۆرمی بەدامەزراوییبوونی دیموکراتی نوێنەرایەتی، پشتبەستن بەخۆ ـ ڕێکخستنێکی راستەوخۆ بەتەنیا بەسنییە پێویستمان بە دەمووچاوێکی نوێیە لە فەرماندە. ئەم بەیتە بەناوبانگەی شیعری (لەبەر هۆکارێك)ی رامبۆ وەبیربێننەوە: (لێدانە لەسەرخۆکانی پەنجەکانت لەسەر تەپڵەکە، دەنگەکان ئازاددەکات و هارمۆنییەکی نوێ دەخاتەگەڕ/ هەنگاوت (پیشاندەری) خزمەتی سەربازی پیاوە تازەکان و ڕێکخستنی رۆیشتنە ڕێکە سەربازییەکەیانە/ ئاوڕدەدەیتەوە: عەشقێکی نوێ/ سەیری پشتەوەدەکەی ـ عەشقێکی نوێ).

بەشێوەیەکی رەها هیچ شتێکی (فاشیستی) لەم دێڕانەدا نییە، پارادۆکسی سەرووچالاکی سیاسی ئەمەیە: دەبێت فەرماندەیەك هەبێت تاوەکو کەسەکان لە قووڕولیتاوی وەستان دەربهێنیت و ئەوان بەرەو ململانێیەکی خودیانەی و ئازادی بەخش لەڕێگای ئازادی پاڵپێوەبنێت. ئەو شتەی کە ئێمە ئەمڕۆ لەم بارودۆخە، پێویستیمانپێیەتی تاچەرێکە بۆ چەپ: رابەرێك کە خونواندنی تاچەرییانە بە ڕێڕەوێکی پێچەوانەدا دووبارەبکاتەوە و هەموو پێش گریمانەکانی نوخبە سیاسییەکان و هەموو ئینتیماکان لەبنهەڵتەکێنێت.

●●●

**سەرچاوە: رۆژنامەی شەرق**

# دەروونناسی و قەیرانی ناسنامە

ن: محەممەد مەهدی میرلوو
و: کاوە عەلیزادە

بەدڵنیاییەوە کێشەی ناسنامە یەکێك لەو کێشە گرینگ و ئاڵۆزانەیە نە تەنیا هەموو تاکێك بۆ خۆی لە پرۆسەی ژیاندا لەگەڵی رووبەڕوودەبێتەوە، بەڵکو یەکێك لەو تەوەر و بابەتانەیە کە تاقم و ژمارەیەکی زۆر لە بیرمەندانی بەشێوەی جۆراوجۆر بەخۆیەوە سەرقاڵکردووە. کێشەی ناسنامە و هەندێ لایەنی پێوەندیدار بەم بابەتە، زۆرجار لە ناوەند و چەقی ئاوڕدانەوەی زانستە جۆراوجۆرەکانی وەکو کۆمەڵناسی، فەلسەفە و دەروونناسیدایە.

لەم نێوانەدا دەروونناسی بەشێکی زۆر لە توێژینەوە و لێکدانەوەکانی خۆی بۆ ئەم بابەتە تەرخانکردووە. بێگومان بۆ لێکدانەوە و تاووتوێکردنی ئەم باسە ناکرێت ئاوڕێك لە بیروبۆچوونی دەروونناسی ناسراوی ئەڵمانی ئێریك هامبۆرگ ئێریکسۆن نەدەینەوە. روانینی داهێنەرانە و جیاوازی ناوبراو، سەبارەت بە کێشەی ناسنامە و بەتایبەت قەیرانی ناسنامە هۆکار و هەوێنی سەرەکی ئەم وتارەیە.

ئێریکسۆن یەکێك لە ناسراوترین و بەهێزترین دەروونشیکارانی سەدەی هاوچەرخە کە لە ساڵی ١٩٠٢ لە شاری فرانکفۆرتی ئەڵمان هاتووەتە جیهان. مەرگی لەناکاوی باوکی دەبێتە هۆی ئەوەی کە دایکی بۆ جارێکیدیکە لەگەڵ پیاوێك بە ناوی هامبۆرگێر ژیانی هاوبەش پێکبهێنێ. ئەم رووداوە دەورێکی زۆری لە ژیانی ئێریکسۆندا گێڕاوە.

بەپشتبەستن بە نووسراوە سەرەتاییەکانی، بۆمان دەردەکەوێت سەرەتا لەنووسینەکانیدا لە ناوی بنەماڵەیی زڕبابی کەڵکیوەرگرتووە"، بەڵام لەدوای نیشتەجێبوون لە ئەمریکا، وەکو شارۆمەندی ئەو وڵاتە لە ناوی بنەماڵەیی باوکی کەڵکیوەرگرتووە.

ئێریکسۆن لەدوای وەرگرتنی بڕوانامەی خوێندنی دواناوەندی لەبواری مرۆییدا، روودەکاتە کاروباری هونەری، کارێك کە لەو سەردەمەدا بۆ گەنجان لە ئەوروپا وەکو بەتاڵی بەئەژماردەهات.

ماوەیەك دواتر لە ساڵی ١٩٢٥ی زایینی دەچێتە ڤییەن و لە دامەزراوەی دەروونشیکاری لەژێر چاوەدێری فرۆید و ئاگۆست ئێشیر هۆرندا فێری زانستی فێرکاری لێکدانەوەی دەروونی دەبێت. هەروەها دواتر بۆ ماوەی ساڵێك وەکو لێکۆڵەری بواری دەروونناسی بەشی پزیشکی دەروونی سەبارەت بە دەمار، لە زانکۆی پزیشکی هارڤارد سەرقاڵی کار دەبێ. لە ساڵی ١٩٤٢ وەکو مامۆستای دەروونناسی لە زانکۆی بێرکلی کالیفۆرنیا سەرقاڵی وانەوتنەوە دەبێت. دوای حەوت ساڵ وانەوتنەوە لە زانکۆ، یەکەمین کتێبی خۆی لەژێر ناوی «منداڵ و کۆمەڵگا» چاپ و بڵاودەکاتەوە. بێجگەلەم کتێبە، چەندین وتار و کتێب و توێژینەوەی زانستیدیکەی سەبارەت بە رەوتی گەشەی مرۆیی نووسیوە. بۆ وێنە لە ساڵی ١٩٥٦ چووەتە وڵاتی هێندوستان و سەبارەت بەچۆنیەتی گەشەی کەسایەتی مهاتما گاندی لە سەردەمی منداڵیدا و هەروەها کێشە و گرفتی نەوەکان و هەندێ بابەتیدیکە توێژینەوەی ئەنجامداوە.

بێگومان خستنەبەرباسی چەمکی قەیرانی ناسنامە، یەکێك لە هۆکارەکانی ناسراویی ئێریکسۆن لە کۆڕ و کۆبوونەوە زانستییەکان و بەتایبەت لەبواری دەروونناسیدایە. هەندێ کەس و لایەن پێیانوایە خستنەبەرباسی تیۆری قەیرانی ناسنامە لەلایەن ئێریکسۆنەوە بۆ ئەو قەیرانانە دەگەڕێتەوە کە لە ژیانی شەخسی و تاکەکەسی خۆیدا ئەزموونیکردووە. لێکدانەوەکان دەریانخستووە ناوبراو لەژیاندا لەگەڵ هەندێ قەیرانی جۆربەجۆر رووبەڕووبووەتەوە و یەکەمین قەیران بۆ زڕبابی دەگەڕێتەوە. ئێریکسۆن بۆ چەندین ساڵ پێیوایە ناوی بنەماڵەیی ئەو هامبۆرگێرە و زڕبابی بە باوکی راستەقینەی خۆی دەزانی. دووهەمین قەیران لە قۆتابخانە هاتووەتەئاراوە. ئەگەرچی ناوبراو لە وڵاتی ئەڵمان دەرسی دەخوێند و خۆی بە شارۆمەندی ئەڵمانی دەزانی، بەڵام زۆرجار لەلایەن هاوڕێ قوتابییەکانیەوە پەراوێزدەخرا. جوولەکەبوون، هۆکاری تاراندن و دوورخستنەوەی

بوو. لەلایەکیدیکەوە هاوڕێ جوولەکەکانی بەهۆی کاڵی و وێکچوونی لەشولاری لەگەڵ ڕەگەزی ئارياييەکان، دوورەپەرێزییان لێدەکرد و خۆیان لەقەرەینەئەدا. لە کۆتایی ساڵەکانی خوێندنی دواناوەندیدا، ئێریکسۆن لەگەڵ قەیرانێکیدیکە ڕووبەڕوودەبێتەوە، هەربۆیە بۆ ماوەیەك لە کۆمەڵگا دادەبڕێت و لەدووی ناسنامەی سەرلێشێواوی خۆی دەگەڕێت. قەیرانی ناسنامەی ئێریکسۆن هاوکات لەگەڵ چوونە شاری ڤییەن و هەڵبژاردنی پیشەی مامۆستایی و پێکهێنانی ژیانی هاوبەش کۆتایی بەسەردادێت. بێگومان ئێریکسۆن نەتەنیا لەنێوان شارەزایانی بواری دەروونناسیدا، بەڵکو لەنێو هەموو چین و توێژێکدا زۆر خۆشەویست و لەهەمانکاتدا لێکدانەوە و توێژینەوەکانی سەبارەت بە پەروەردە و فێرکاری و ئاریکاری کۆمەڵایەتی، زۆر بەڕێزەوە چاویلێدەکرا. بەدڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین زانستی دەروونناسی زیاتر لەهەموو کەسێکیدیکە قەرزداری چالاکی و توێژینەوەکانی ئێریکسۆنە سەبارەت بە ڕەوتی پێکهاتنی بەردەوامی کەسایەتی تاك بەدرێژایی ژیان.

## پێکهێنانی ناسنامەی تاکەکەسی (شەخسی):

پەرەسەندنی ناسنامە، وەکو یەکێك لەلایەنەکانی گەشە و پەرەسەندنی خود دێتەئەژمار، هەروەها پەرەسەندن و گەشە بۆ خۆی باس و بابەتێکی گرینگی بواری دەروونناسی گەشە بەئەژماردێت. هەندێ بابەتی گرنگی وەکو پەرەسەندنی چەمکی خود، باوڕ بەخۆبوون و نەفسبەرزی یان بایەخدانان بۆ لێهاتوویی و تواناکانی مرۆڤ، پەرەسەندنی ناسینی ئەویتر و پەرەسەندنی ناسنامە لەخۆدەگرێت.

بە بۆچوونی ئێریکسۆن، یەکێك لەو ئەرکانەی مرۆڤ لە قۆناغی هەرزەکاریدا لەگەڵی ڕووبەڕوودەبێتەوە، پێکهێنانی ناسنامەی تاکەکەسییە. ئەم وتەیە بەو مانایەیە کە هەرزەکار بۆ گەیشتن و بەدەستهێنانی ناسنامەی شەخسی لەگەڵ هەندێ پرسیاری گرنگ وەکو من کێم؟ بەرەوکوێ دەڕۆم؟ مەبەستی من لە ژیان چییە؟ و.. ڕووبەڕوودەبێتەوە. ئەو پرۆسەی کە هەرزەکار لەو ماوەیەدا بۆ وەڵامدانەوە بەو پرسیارانە تێپەڕیدەکات، وەکو

قۆناغی بەدواداچوونی ناسنامە پێناسەدەکرێت. هەندێ پێیانوایە بەدواداچوون بەمەبەستی پێکهێنانی ناسنامە، قۆناغی هەرزەکاری کردووەتە قۆناغێکی ئاڵۆز و مەترسیدار، هەربۆیە لەم قۆناغەدا، قسە لە قەیرانی ناسنامە دێتەئاراوە، بەڵام سەبارەت بەم بابەتە، ئێریکسۆن هەڵوێستێکی ئارام و لەسەرخۆ دەگرێت و لە روانگەیەکیدیکەوە دەڕوانێتە پرسی قەیرانی ناسنامە.

**قەیرانی ناسنامە:**

خاڵێکی گرینگ و بەرچاو لە تیۆری ئێریکسۆندا، ئەوەیە کە پەرەسەندن و گەشەی کەسایەتی تاك بابەتێکە کە بەدرێژایی تەمەنی مرۆڤ روودەدات. لەلایەکیدیکەوە بابەتی سەرەکی لە پەرەسەندن و گەشەی کەسایەتی تاکدا بەدواداچوونی ناسنامەیە کە بە بۆچوونی ئێریکسۆن بەسەر هەشت قۆناغی دەروونی و کۆمەڵایەتیدا دابەشدەبێت.

ئێریکسۆن پێیوایە لەهەر قۆناغێکدا تاك لەگەڵ کێشە و ناکۆکییەك رووبەڕوودەبێتەوە و دەبێ رێگەچارەیەك بۆ ئەو کێشە و ناکۆکییە بدۆزێتەوە. سەرچاوەی ناکۆکی و ململانێ لەوەدایە کە تاك لەکاتی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هەلومەرجی نوێدا، هەندێ چاوەڕوانی نوێی بۆ دروستدەبێت. ئێریکسۆن پێیوایە لە ئاکامی ئەم رووبەڕووبوونەوانەدا، قەیران سەرهەڵدەدات. بە باوەڕی ناوبراو لە وەها بارودۆخێکدا، بۆ رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەم قەیرانانە، تاك دوو رێگەی لەبەردەستدایە: یەکەم، خۆڕێکخستن، دووهەم، دژایەتیکردن و رووبەڕووبوونەوە.

بە بۆچوونی ئێریکسۆن، چارەسەرکردنی هەر قەیرانێك لە کاتوساتی خۆیدا، دەبێتە هۆی ئاڵوگۆڕ لە کەسایەتی تاکدا و دەربازبوون بەرەو قۆناغێکی تازەتر. یەکێك لەو قۆناغانە، قۆناغی هەرزەکارییە (تەمەنی ١٨ـ١١ ساڵی). لەم قۆناغەدا، پرسی ناسنامە دێتەئاراوە و دەبێ تاك ئەم قەیرانە چارەسەربکات و وێنەیەکی مێانەڕەو و ناسنامەیەکی بەهێز و یەکپارچە لەخۆی بنیاتبنێت. لەڕاستیدا دەتوانین بڵێین ناکۆکی دەروونی ئەم قۆناغە بۆ سەرهەڵدانی هەستی ناسنامە دەگەڕێتەوە.

چارەسەرکردنی ئەم ناکۆکییانە کاتێك مسۆگەردەبێت کە تاك بتوانێت بەسەر لایەنە نەرێنی و خراپەکانی ئەم قەیرانەدا زاڵبێت و جۆرێك هەماهەنگی ناوخۆیی بۆ جێبەجێکردنی ئەرکە جیاوازەکانی ئەم قۆناغە پەیڕەوبکات، هەروەها کە پێشتریش ئاماژەمانپێدا، لەم قۆناغەدا هەرزەکار لەگەڵ چەندین پرسیاری گرنگ رووبەڕوودەبێتەوە، هەروەها کە لە قۆناغی منداڵیدا هەندێ پرسیاریدیکە دێتەئاراوە. لەم قۆناغەدا منداڵ بۆ وەرگرتنەوەی وەڵامی پرسیارەکان، دەگەڕێتەوە بۆ لای کەسانی گەورە و بەتەمەن و بەتایبەت دایکی و باوکی، بەڵام جیاوازی قۆناغی هەرزەکاری لەوەدایە، لەم قۆناغەدا پرسیارکەر و وەڵامدەرەوە هەرخۆیەتی، واتە هەرزەکار بۆ خۆی پرسیاردەکات و بۆ خۆیشی وەڵامی دەداتەوە. ئەم قۆناغە سیخناخە لە دڵەخورپێ، ترس و ڕاڕایی و دەبێ کات بەسەرچێت تاکو تاك بەجۆرێك لە یەکپارچەیی و یەکێتی ناسنامە بگات. ئێریکسۆن پێیوایە لەوەها زەمەن و مەودایەکی کاتیدا، قەیرانی ناسنامە سەرهەڵدەدات.

بە باوەڕی ئێریکسۆن قەیرانی ناسنامە لەلایەکەوە دەستەواژەیەکە بۆ وەسفکردنی رەوتی چالاکی و لەلایەکیدیکەوە قەیرانی ناسنامە بەشێکی جیانەکراوەیە لە رەوتی پەرەسەندن و گەشەی دەروونی و کۆمەڵایەتی مرۆڤی تەندروست.

هەر تاکێك لە سەرەتای سەردەمی باڵقبوونەوە تا دەسپێکی ژیانی کاری و بنەماڵەیی، هەندێ ئەرکی جیاجیا ئەزمووندەکات. لەم رەوتەدا هەرزەکاران خۆیان لەگەڵ کەسایەتییە گەورەکاندا هاوشێوەدەکەن و هەندێ هەڵسوکەوتی جۆراوجۆر، حەز و خولیا و جیهانبینیدیکە ئەزمووندەکەن. دەبێ ئەوەمان لەبیربێت، هاوشێوەکردن لەم تەمەنەدا، لایەنی هێمایی نییە. واتە ئەزموونی هەرزەکاران زۆر جیددییە و هەرزەکاران خەریکی جێبەجێکردنی کایەی ئەرکەکان نین، بەڵکو بەکردەوە ئەرکە جیاوازەکان ئەزموون و تاقیدەکەنەوە. لەم رەوتی هاوشێوەکردنەدا، هەرزەکاران لە هەوڵی ئەوەدان وێنەیەکی یەکپارچە و یەککگرتوو لە خۆیان بخەنەڕوو.

توێژینەوەکان دەریانخستووە، لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا جۆرەکانی هاوشێوەکردن و ئەرکە کۆمەڵایەتییەکان بەرتەسك و سنووردار و لەئاکامدا دیاریکردنی ناسنامە

تارادەیەك هاسانترە، بەڵام لە کۆمەڵگای مودێرن و پیشەسازی ئەمڕۆدا، دیاریکردنی ناسنامە کارێکی ئەستەم و دژوارە و دەبێ بەلەبەرچاوگرتنی کۆیەکی بێئەژمار لە توانا و پوتانسییەلەکان بێت.

**تیۆری جیمز مارسیا:**

تیۆری ئێریکسۆن سەبارەت بەپەرەسەندن و گەشەی ناسنامە، لەلایەن ژمارەیەکی زۆر لە شارەزایان و پسپۆڕانەوە لێکدانەوە و تاوتوێکراوە. یەکێك لەو پسپۆڕانە بەناوی جیمز مارسیا وتووێژێکی ڕێکخراوەیی بۆ پۆلێنبەندیکردنی ناسنامەی گەنجان تۆمارکردووە. بە بۆچووتی مارسیا رەوتی دیاریکردنی ناسنامە لەلای ئێریکسۆن ، چوار هەلومەرج و قۆناغی ناسنامەیی لەخۆدەگرێت کە دەکرێ بەپێی بوونی کێشە و گرفتێك سەبارەت بە ناسنامە لەبواری ناسینەوە و دەستنیشانکردن و توانای چارەسەرکردنی ئەو گرفتانە لەیەکتر جیابکرێنەوە کە بریتییەلە:

**یەکەم، بەدەستهێنانی ناسنامە:**

لەم بەشەدا ئەو کەسانە هەڵکەوتوون کە قەیرانی ناسنامەیان تێپەڕاندووە و خاوەن هەندێ تایبەتمەندی سەرەکی وەکو سەقامگیری کەسایەتی، یەکپارچەیی هزری و جیددیبوون لە هەڵبژاردنی پیشەدان. ئەم کەسانە بۆ وێنە خۆیان نەوەکو خوێندکاری ئینتێرنێتی، بەڵکو وەکو پزیشکێکی داهاتوو دەناسێنن. ئەم کەسانە هەرشتێك کە لەگەڵ بیروباوەڕی ئایینی و سیاسی بنەماڵەیاندا یەکنەگرێتەوە، بەلاوەی دەنێن.

**دووهەم، بەدەستهێنانی ناسنامەی نیوەچڵ و ناتەواو:**

لەم بەشەدا کەسانێك هەڵکەوتوون کە قەیرانیان ئەزموونەکردووە و بۆ دیاریکردنی ناسنامە گوێڕایەڵی بیروبۆچوونی دایك و بابیانن. ئەم کەسانە بەبێ پرسیارکردن، ئایین و بیروباوەڕی بنەماڵە قەبووڵدەکەن. کاتێك سەبارەت بە هەڵوێستی سیاسییان پرسیاردەکرێت

جۆرێك لە بێتاقەتی سەبارەت بەم بابەتانە لەسیمایاندا دەبینـدرێت. بـێـگـومـان ئـەگـەر رووداوێکی گرنگ بکەوێتە رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ بایەخ و ئەرزشە ئەزموونکراوەکانـیـان، زۆر زوو هەست بەسەرلێشێواوی دەکەن.

**سێهەم، دواکەوتی ناسنامە (پاشکەوتنی ناسنامە):**

کەسانی هەڵکەوتوو لەم بەشەدا، لەکاتی ئەزموونکردنی قەیرانی ناسنامەدان. ئـەم کەسانە ئەگەرچی لە هەوڵی ئەوەدان بایەخ و ئەرزش، حەز و خولیا، بیروبۆچوون و پیشـەی تایبەت بە خۆیان هەبێت، بەڵام هێشتا نەیانتوانیوە بڕیارێکی روون و ئاشکرا سەبارەت بەم بابەتانە بدەن، بەواتایەکیدیکە ئەم کەسانە لەنێوان هەڵبژاردنی حەز و خولیـای خـۆیـان و دایك و باوکیاندا گیریانکردووە. رەنگە ئەم کەسانە بۆ ماوەیەك وەکو بـاوك و دایـکـیـان هەڵسوکەوت بکەن، بەڵام لەدوای ماوەیەك بیرکردنەوە و رامان، بـیروبـۆچـوون و شـێـوەی هەڵسوکەوتی باوك و دایکیان لەبیردەکەن. ئەم کەسانە لەباشترین هەلومەرجدا مرۆڤێـکـی هەستیار، ئەخلاقی و رۆشنبیر و لەخراپترین هەلومەرجدا کەسانێکی پەشۆکاو، دڕدۆنگ و کەللەویشك و نەگۆڕ دیارن.

**چوارەم، پرژوبڵاویی ناسنامە:**

دەستەواژەی پرژوبڵاویی ناسنامە، بارتەقا و هاوشانی چەمکی سـەرلـێـشـێـواویـی ناسنامەی ئێریکسۆنە. بەدوور لەوەی کە ئەم کەسانە لەڕابردوودا تووشی قەیـران هـاتـوون یان نا، بەڵام هێشتا وێنەیەکی یەکپارچەیان لەخۆیان بەدەستنەهێناوە. بۆ وێـنـە رەنـگـە کەسێکی سەر بەم گرووپە پێیخۆشبێت بچێتە زانکۆی یاسـا یـان سـەرقـاڵـی کـاروبـاری بازرگانی بێت، بەڵام بەکردەوە هەنگاوێك هەڵنەگرێت و حەزی لە ئایـین و سـیـاسـەتـیـش نەبێت. ئەم کەسانە خاوەن هەندێ تایبەتمەندی سەرەکی وەکو رەشـبـیـنـی، خـوێـنـدنـەوەی سەرسەری و رواڵەتی و سەرلێشێواوین.

**سەرلێشێواوی ناسنامە:**

بە بۆچوونی ئێریکسۆن لەباشترین حاڵەتدا، قەیرانی ناسنامە دەبێ لە سەرەتـا یـان لەنێوان دەیەی سێهەمی تەمەندا چـارەسـەربـکـرێـت، تـاکـو تـاك بـتـوانـێ کـێـشـە و گرفتەکانیدیکەی ژیان چارەسەربکات. کاتێك ئەم رەوتە بـەسـەرکـەوتـوویـی تـێـپـەڕبـوو، ئەوکات دەتوانین بڵێین تاك ناسنامەی خۆی بەدەستـهـێـنـاوە. واتـە تـاك گـەیشـتـووەتـە چەمکێکی یەکپارچە سەبارەت بە ناسنامەی جنسییەتی، هەڵبژاردنی پیشە و جیهانبـیـنـی خۆی. بە پێچەوانە ئەگەر تاك (هەرزەکار) ئەم رەوتە بە سەرکەوتـوویـی تـێـپـەڕنـەکـات، تووشی قەیرانی ناسنامە و پرژوبڵاویی کەسایەتی دەبێت. بە واتایەکیدیکە تاکو کـێـشـەی قەیرانی ناسنامە چارەسەرنەکرێت، تاك ناتوانێت چەمکێکی یەکپارچە سەبارەت بە خـۆی بەدەستبهێنێت، ئێریکسۆن وەها دەرکـەوتـە و ئـەنجـامـێـکـی نـاخـۆش لـەژێـر نـاوی سەرلێشێواویی ناسنامەدا ناودێردەکات. تاك لەئاکامی ئەم رەوتـەدا (سـەرلـێـشـێـواویـی ناسنامە) بێجگەلە پرژوبڵاویی کەسایەتی تووشی ناتەبایی کـۆمـەڵـایـەتـی دەبـێـتـەوە و ناسنامەیەکی نەرێنی بەدەستدەهێنێت.

هەندێ کەس و لایەن بە هەڵە ناکۆکی لەنێوان بایەخ و ئەرزشی دایـك و بـاوك و هەرزەکاراندا، بە ناکۆکی و ململانێی نێوان نەوەکان تەفسیردەکەن، بەڵـام بـە بـۆچـوونـی ئێریکسۆن، هیچجۆرە دوژمنێك لەنێوان نەوەکاندا لەئارادانییە و ئەگـەر بـەشـێـوەیـەکـی ژیرانە و لەسەرخۆ لەگەڵ هەرزەکاران هەڵسوکەوت بکرێت، دەکرێ لە درێژەی پەرەسەندن و گەشەی هەرزەکاران و سەرهەڵدانی ناسنامەدا هەنگاوهەڵبگرێت.

●●●

**سەرچاوەکان:**


١. سیف، کدیور و همکاران (١٣٨٠)، روان شناسی رشد، جلد یك، تهران، انتشارات سمت.

٢. سیف، کدیور و همکاران (١٣٨٠)، روان شناسی رشد، جلد دو، تهران، انتشارات سمت.

٣. لطف آبادي، حسین (١٣٨٦)، زمینەی روسان شناسی هیلگارد، ترجمەی براهنی و همکاران، تهران.

٤. ..........، ............ (١٣٧٥)، تاریخ روان شناسی نوین، ترجمەی سیف شریفی.

# تیۆری شۆڕش

شاکار یوسف حەسەن

**پێشەکی:**

لە سەدەی نۆزدەوە فەیلەسوفان و لێکۆڵەرانی کۆمەلآیەتی لەبارەی دەوری کۆمەلآیەتی و مێژووی شۆڕش و هەلومەرجی ئەم دیاردەیە بیروڕای جۆراوجۆریان گۆڕیوەتەوە بەگشتی ئەو تیۆرییانە لە روانگەی سیاسییەوە سەیری شۆڕش دەکەن کە دووجۆرن:

یەکەمیان بۆچوونی چەپ کە گەشبینانە سەیری شۆڕش دەکەن بەپێی بۆچوونەکانیان شۆڕشە سیاسی و کۆمەلآیەتییەکان کەرەستەیەکی ناچاری و جەبری بوون بۆ گەیشتن بە کۆمەڵگەیەك کە تیایدا ئازادی و ئۆتۆنۆمی کۆمەلآیەتی و یەکسانی پیادەبکرێت.

گروپی دووەم کە راستڕەوە رەشبینەکانن نوێنەرانی ئەم قوتابخانەیە لەپێش و لەدوای شۆڕشی فەرەنسییەوە هەبوون کە بریتینلە لایەنگرانی ئەرستۆکراتی و کۆنەپارێزی و شاپەرستەکان و لایەنگرانی کلێسە.

بەدرێژایی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە کەسانێکی وەکو نیچە و گۆستاولۆبۆن شۆڕشیان بە تەقینەوەی سۆزی وەحشییانە و بەرەڵلآ و رووخێنەری جەماوەر زانیوە.

کانت لە کتێبی گریمانە لەبارەی دەستپێکردنی مێژووی مرۆڤایەتییەوە ١٧٨٦ لایوایە شەڕی گەورە کە تووشی نەتەوەی شارستانی تازە پێگەیشتوو شەڕی ئێستا و رابردوو نییە، بەڵکو ئامادەباشیشە بۆ جەنگی داهاتوو. شۆڕش لە روانگەی کانتەوە نموونە و چەشنێك سەرپێچی نایاساییە، چونکە لەگەڵ رووداني شۆڕش تووندوتیژی باڵدەکێشێت بەسەر بەرژەوەندییە هاوبەشەکاندا کۆمەڵگەی شارستانی دادەبەزێت بۆ دۆخی هەلومەرجی وەحشییانە و لێکترازان. شۆڕش مانەوە و بەردەوامی دەپووکێنێتەوە مەرجەکانی هەرچەشنە چاکسازی و کامڵبوون بەرەو دادگەری پووچەڵدەکاتەوە. کانت دەڵێت: شۆڕش رێگەیەکی دروستنییە بۆ گەیشتنی مرۆڤ بە یاسای کۆماری. کاتێك کانت ستایشی شۆڕشی فەرەنسی دەکات لەبەرئەوەیە باوەڕی بە پرنسیپەکانیەتی نەك بە کارکردن و کردارەکانی.

**لە مێژووی هەر شۆڕشێکدا دەبێت ڕەچاوی سێ شت بکرێت:**

- ئەو شتانەی خۆیان لە ئامانجەکانی شۆڕشدا دەبیننەوە بە دژی شۆڕشەکە دەشکێنەوە بەهۆی حەز و ئارەزووی چەند کەسانێکەوە.

- بەشە جیاوازەکانیدیکە کە تێڕوانینی جیاواز سەبارەت بە شۆڕشەکە وەردەگرێت دەربارەی لایەنگری و بەرژەوەندییەکانیان. ئەوانەی هێشتا ناچارکراون بەرژەوەندییەکانیان لەئامێزبگرن و تەنیا بۆ سوودی خۆیان هەوەڵبدەن.

- شۆڕش بریتینییەلە داوەتی خوان یان نووسینی وتار یان کێشانی وێنەیەك یا شت چنین، ناکرێت هێندە بێگەرد و لەسەرخۆ و نەرمونیانبیت شۆڕش بریتییەلە یاخیبوون لە کردەوەیەکی توندوتیژی کە لەڕێگەیەوە چینێك چینێکیتر لادەبات.

**تیۆرەکانی شۆڕش:**

لە ڕوانگەی کۆمەڵناسی سیاسییەوە تیۆرەکانی شۆڕش بە چوار ڕێباز دابەشدەکرێن:

١. لەڕووی ئابوورییەوە: مارکس پێیوابووو هۆکاری شۆڕش دەگەڕێتەوە بۆ فراژووبوونی هێزە بەرهەمهێنەرەکانی کۆمەڵگە ناکۆکی ئەم هێزانە لەگەڵ پەیوەند و سیستەمە سیاسی و کۆمەلایەتییەکاندایە کە شۆڕش دێنێتەکایەوە. ئەم تیۆرە لەسەر بنەمایەکی ئابووری دامەزراوە شۆڕش لەم تیۆرەدا بنەمایەکی کۆمەلایەتی هەیە و بەهۆی بەرزبوونەوەی ئاستی داواکارییەکانە.

٢. تیۆری دەروناسەکان: ئەم تیۆرە لەلایەن دۆ تۆکفێلی فەرەنسییەوە شیکراوەتەوە بەپێی ئەم تیۆرە دیاردەی ناڕەزایی دەبێت لە دەروونی تاکەوە سۆراغی بگیرێ. ناڕەزایی دەگەڕێتەوە بۆ سەرکوتکردنی نیازەکانی تاك یان باشتربوونی ژیان یا دژواربوونێکی کورتخایەن لەدوای ماوەیەکی درێژ خۆشگوزەرانی و کاردانەوەی ئەم ڕووداوانە بەسەر زەینی تاکدا.

٣. تیۆرە کۆمەڵناسەکان: دەگەڕێتەوە بۆ دۆرکایم کە ڕێبازەکەی خۆی بەناوی فانکشنالیزم و کۆمەڵگەی جڤاتی لێکدەداتەوە دۆرکایم پێیوایە کە ئەندامانی کۆمەڵگە بەهۆی فاماندن یان ویژدانی کۆمەکی هاوبەش پێکەوە یەکگرتوویان هەیە ئاڵۆزبوونی ڕۆژانەی کۆمەلایەتی و

دابەشبوونی کار ئەم یەکگرتوویی و ویژدانە کۆمەکە دەخاتە مەترسییەوە، ئینجا ئەم دۆخە لە کۆنترۆڵ دەردەچێت و کێشەی کۆمەلآیەتی دەسپێدەکات. هەر سەبارەت بەم تیۆرە کەسێکیتر بەناوی چارلس جانسۆن لە کتێبی (شۆڕش و سیستەمی کۆمەلآیەتیدا) شەش جۆر شۆڕشی کۆمەلآیەتی باسدەکات کە ئەمانەن (شۆڕشی جووتیاری، شۆڕشی هەزار ساڵە، راپەرینی ئەنارشیستی، شۆڕشی کۆمۆنیستی، کودەتای سەربازی).

٤. دوو کەسیتر کە کاریگەرییان هەبووە لەسەر تیۆریزەکردنی شۆڕش ئەوانیش ماکس ڤیبەری ئەڵمانی و ویلبیرتۆ پاریتۆی ئیتالی. لە روانگەی فیبەرەوە رەفتاری جڤاتی و هەرەوەزی جەماوەر دەگەڕێتەوە بۆ وەفاداری بە سیستەمێکی فیکری کە پێناسەیەکی نوێ لە واقیع و جیهان دەدات بە لایەنگرانی ئەم پێناسەیە هەمان چەمکی کاریزمایە لەمێژوودا بە رای ڤیبەر کاتێك دەسەلآت بەدەست هێزە کۆنباوەکانەوە بێت هاوکێشە بەرقەرارە، بەلآم دوو هێز ئەم هاوکێشەیە تووشی مەترسی دەکەن: یەکەم هێزی ئەقلآنی و دوەم کاریزما. بە باوەڕی پاریتۆ سەرهەڵدانی شۆڕش و هەرەوەزی سیاسی دوایین قۆناغی لاوازبوونی دەزگا سەرکوتکەرەکانی حکومەتە.. ئەم لاوازییە دەبێتە دەسپێکێك بۆ رێکخراوە دەسەلآتخوازەکان ئەوانیش لەهەر چەشنە نارەزایەتییەك بۆهێنانەسەر شەقامی جەماوەر کەڵکوەردەگرن.

## پێناسەی شۆڕش

شۆڕش یان (REVOLUTION) وەك دەستەواژە لە زاراوەیەکی ئەستێرەناسییەوە هاتووە کە پەیوەندی بە سوورانەوەی ئەستێرەکانەوە هەیە بە دەوری تەوەرەیەکی دیاریکراودا ئەمەش بەپێچەوانەی مانای شۆڕشی ئێستایە. لەکۆندا ئەم وشەیە لە ساڵی ١٦٨٨ بەکارهێنرا بۆ وەسفکردنی دەرپەڕاندنی خێزانی (ئال ستوارت) لە حوکمڕانی گەڕانەوەی دەسەلآت بۆ ولیام ماری THEGLORIOUS REVOLUTION.
بەم مانایە دەستەواژەی شۆڕش مانای گەڕانەوەی دەسەلآتە بۆ خاوەنەکانی پێشوو. بەپێی (لسان العرب) وشەی (الثورة) شۆڕش لە (ثار الشيء، ثوارنا، تثور، هاج) واتە (هەڵچوونی شتێك، هەژان و هەژاو، تێکڕژان) هەڵهێنجراوە. شۆڕش لەئەندازیاریدا بەشێکە لە جووڵەی

سوورانەوە. شۆڕش بە واتای بازدانێك بە پێشکەوتنی کۆمەڵگە گۆڕانکارییەکی چەندایەتی بۆ چۆنایەتی. پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی شۆڕشی کۆمەڵایەتی هاوشانی یەکترن دوو شێوازی گرێدراوی هەنگاوە مێژووییەکانی گەشەی کۆمەڵایەتی دەبنە شۆڕشی کۆمەڵایەتی. مەبەست لە شۆڕش جووڵانەوەیەکی میللی فراوانە لە دەرەوەی بوونیادی دەستوری باو یا لە دەرەوەی رەوایەتی ئامانجی گۆڕینی سیستەمی حوکمڕانی باوە لەدەوڵەتدا. بە بڕوای هارۆڵد لاسوێڵ شۆڕش بریتییەلە گۆڕانێکی لەناکاو لە پێکهاتەی دەوڵەت. لە فەرهەنگی زاراوەی سیاسیدا بەمشێوەیە پێناسەی شۆڕشی کردووە کە بریتییەلە لەناوبردنی تەواوی حکومەت یان سیستەمی سیاسی. لە ئەنسکلۆپیدیای ئۆکسفۆردا بەمجۆرە پێناسەی شۆڕش کراوە بەهێنانەئارای توندوتیژییانەی رژێم یان دەسەلاتێکی نوێ بە جێگەی رژێمی کۆن لەلایەن خەڵکی ئەو ولاتەوە. هانا ئارنێت لەکتێبەکەیدا (دەربارەی شۆڕش) شۆڕش بە بڕوای ئارنێت یەکێکە لە دیاردە سیاسییەکان شۆڕش ئازادی دەخوازێت شۆڕشگێڕان کەسانێکن لەپێناو سەرەڕۆیی بۆ ئازادی خەباتدەکەن. کارل مارکس لە کتێبی رەخنەگرتن لە ئابووری سیاسی لە ١٨٥٩دا پێناسەی شۆڕش دەکات دەڵێت: شۆڕش بریتییەلە جووڵاندنەوەی مێژوو.. شۆڕشگێڕی هەرجۆرە کردارێك یا شێوازێ یا تیۆرێك کە خوازیاری پشتگیری لە گۆڕینی بنەڕەتی بارودۆخی کۆمەڵایەتی یا سیاسی یا ئابووری یا کەلتوری بێت بە شۆڕشگێڕی لەقەڵەمدەدرێت.

شۆڕش و چەمکە نزیکەکان لەشۆڕشەوە: (شۆڕش و چاکسازی، شۆڕش و کودەتا، شۆڕش و زەبروزەنگ، شۆڕش و یاخیبوون)

لە زمانی سیاسیدا چەمکی شۆڕش تێکەڵدەکرێت لەگەڵ هەریەك لە چەمکەکانی (کودەتا و چاکسازی و یاخیبوون و زەبروزەنگ) بۆیە لێرە هەوڵدەدین ئەم چەمکانە لەیەکتری جیاکەینەوە.

بیرۆکەی ریفرۆم لە بزووتنەوەی ریفرۆمی ئایینی پرۆستانتی سەدەی شانزەمەوە هاتووە. دواتر جارێکیتر وشەی ریفرۆم هاتەئاراوە لەگەڵ بزووتنەوە سوشیال دیموکراس و بزووتنەوەی کرێکاران لە ئەوروپا. سەرهەڵدانی بژاردەکان لەنێوان ریفرۆم و شۆڕشدا چووەناو زانستی سیاسەتەوە. ناونیشانی وتارەکەی رۆزا لۆکسمبۆرك بۆ پەرچدانەوەی هەڵوێستەکانی

ئیدوارد بێرنشتاین لێرەوە سەرچاوەدەگرێت وتارەکەی لە ساڵی ١٩٠٠دا نووسیوە بەناوی ( شۆڕش یا ریفرۆمی کۆمەلأیەتی)دا. شۆڕشگێڕان دژی کۆنەپەرستین و تەنانەت ریفرۆمخوازەکانیش بە سازشکەر لەگەڵ رژێم و سستی لەکردەوەدا تاوانباردەکەن. ریفرۆمخوازیی بڕواهێنانە بەوەی کە دەکرێت هێدی هێدی کۆمەڵگە بەرەو گۆڕان و چاکبوون ببەیت بەبێ ئەوەی دەسکاری پێکهاتەی بنچینەی کۆمەڵگە بکرێت. لەم روانگەیەوە ریفرۆمخوازی بەرامبەر شۆڕشخوازی دەوەستێت. چاکسازی (ریفرۆم) بۆ چارەسەرکردنی لێکدژییە کۆمەلأیەتییەکان بەکاردەهێنرێت، بەلأم جەوهەری چاکسازی هەندێکجار گۆڕانکارییەکی قووڵی کۆمەلأیەتی دەخولقێنێ لەگەڵ ئەوشدا دەسەلأت بەدەست چینە کۆنەکەوە دەمێنتێت. ریفرۆم گۆڕانکاری یان پرۆسەی گۆڕینی لایەنێکە لە ژیانی کۆمەلأیەتی.

کودەتا وشەیەکی لاتینییە لە(colphus) وەرگیراوە بەمانای زەبروزەنگ و توندوتیژی واپێناسەدەکرێت کردەوەیەکی لەناکاوە لەلایەن گروپێ لە سەربازان و ئەفسەران یان چەند کەسانێکی نزیك لە دەسەلأت ئەنجامدەدرێت بۆ رووخاندنی سیستەمی دەسەلأت و سیستەمی ولأت ئامانجیان لەکارلابردنی سەرانی دەسەلأت و بەمەبەستی ئەوەی خۆیان بگەنە دەسەلأت. جیاوازی کودەتا و شۆڕش ئەوەیە کە شۆڕش لەلایەن خەڵکەوە ئەنجامدەدرێت و مەبەستیشی بریتییەلە چاککردنی هەمو بووارەکانی دەوڵەت. گینذز پێیوایە شۆڕش بنچینەی کودەتایە کە تیایدا گروپێك لە رێبەرەکان بەجێگەی گروپێکیتر دادەنرێت.

ئەلبێر کامۆ لە کتێبی مرۆڤی یاخیدا کە لە ساڵی ١٩٥١ لە فەرەنسا لەچاپدرا. کامۆ لەم کتێبەدا سەبارەت بە یاخیبوون و شۆڕش دەدوێت. بەلای کامۆوە زۆربەی شۆڕشەکان لەسەر بنچینەی کوشتن دامەزراون لەئەنجامیشدا بە دیکتاتۆرییەت شکاونەتەوە. هەربۆیە کامۆ یاخیبوون بەسەر شۆڕشدا پەسەنددەکات یاخیبوونێك کە لە کۆمەڵێك بەهای مرۆییەوە سەرچاوەدەگرێت.

مرۆڤی یاخی کتێبێکە دەربارەی شۆڕش و یاخیبوون و ئازادی مرۆڤی یاخی لای کامۆ مرۆڤێك نییە کە ئازادی بۆخۆی دەوێت و لەوانیتری یاساخدەکات کەسێك نییە کۆیلەبێت لە دۆخی دژایەتیکردنی خاوەنەکەیدا، بەڵکو کەسێکە دژ بە کۆیلەیەتی و خاوەن کۆیلەبوونە لەیەککاتدا. ئەم کتێبە قسە لەسەر شۆڕشە گەورەکانی دنیا دەکات وەك کردەی یاخیبوونی

مرۆڤ لەناو مێژوودا کامۆ هەم شۆڕشی فەرەنسی و هەم شۆڕشی ئۆکتۆبەر وەك دوو ساتەوەختی مێژووی یاخیبوون لە ئەوروپا وێنادەکات. لەم کتێبەدا کامۆ رووە تاریکەکانی شۆڕش و یاخیبوونمان نیشاندەدات و پێماندەڵێت چۆن مرۆڤی یاخی و دەکرێت ببنە کەسانی ستەمکەر و توندوتیژ.. چۆن دەکرێت یاخیبوون و شۆڕشەکان لە مژدەهێنانی ئازادییەوە بگوازنەوە بۆ سەرکوتکردن و کوشتن.

مرۆڤی یاخی ئەو مرۆڤەیە کە بەرلە جیهانی تەوتەمپەرستی و دوای جیهانی تەوتەمپەرستی هەیە. داوای دۆخێکی مرۆیی وەهادەکات کە تیایدا وەڵامەکان مرۆیی بن. بزاوتی یاخیبوون بزاوتێکی خۆپەرستانە نییە، هەروەها مەرجنییە بەلای کەسی چەوساوەوە سەرهەڵبدات، بەڵکو دەشێ بەدیتنی دیمەنی چەوسانەوەی کەسانیتریش سەرهەڵبدات هۆیەکانی سەرهەڵدانی یاخیبوون لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکیتر لەژیارێکەوە بۆ ژیارێکیتر دەگۆڕێت، هەربۆیە لە کۆمەڵگەی تەوتەمپەرستی و شتە بەپیرۆزکراوەکاندا کێشەی یاخیبوون نابینینەوە، چونکە وەڵامی هەمو شتەکان لەپێشدا دراونەتەوە پرسیار لەگۆڕدا نەماوە.

زەبروزەنگ دیاردەیەکی نائاسایی ژیانی کۆمەڵایەتییە بەم مانایە باس لە زەبروزەنگی نێوان مرۆڤکان دەکریت نەك بوونەوەرەکانیتر. بیرمەندی بەریتانی (جۆن کەین) پێناسەی زەبروزەنگ دەکات پێیوایە زەبروزەنگ بریتییەلە دەستدرێژیکردنی فیزیکی گروپەکان یاخود تاکەکان بۆ سەر جەستەی ئەوانیتر و مەرگیش دوایین ئەنجامی شاراوەی زەبروزەنگە. یۆهان گالتۆن باس لە دووجۆر زەبروزەنگ دەکات ئەوانیش (زەبروزەنگی بوونیادی و زەبروزەنگی کەلتوری). هانا ئارنێت لە کتێبە بەناوبانگەکەی بەناوی (on violence) دەربارەی توندوتیژی ئەنجامگیری ئەوەدەکات (دەسەڵات لە توانای مرۆڤەوە بۆ هەستان بەکردەی کۆنکرێتی پەیدادەبێت. بێمانایە بگوترێت دەسەڵات و زەبروزەنگ یەکشتن. دەسەڵات و زەبروزەنگ دژ و پێچەوانەی یەکترن لەو شوێنەدا یەکێکیان ببێتە فەرمانڕەوای رەها ئەویدیکەیان لەناودەچێت).

## شۆڕش لە ڕوانگەی ئیسلامەوە

سەبارەت بە مێژووناسە عەرەبە دێرینەکان ئەوان وشەی شۆڕشیان بەکارنەهێناوە، بەڵکو وشەکانی وەك (دەرچووون) و (ئاژاوەیان) بەکارهێناوە بەواتای دەرچووون بۆ داواکاری ماف، بەلاّم دەرچوون نەبێت بۆ دژی سوڵتان، بەڵکو دەرچوون بۆ واتا دەرچوونە بۆ ناو خەڵك بەمەستی داواکاری مافەکان. وتوویانە ئاژاوە قوڵەڕەشەکان یان دەرچوونی قەرامتەکان. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ تێگەیشتنی ئیسلام بۆ یەکگرتوویی وسەقامگیری کۆمەڵ. ئەم چەمکە واتە دەرچوون دەگەڕێتەوە بۆ ئەبی زەڕی غەفاری ساڵی ٣٢ی کۆچیکرد. (سەرم لەوە سووڕماوە چۆن ئەوەی خۆراك لەماڵەکەیدا نییە ناچێتەدەرەوە بۆ ناو خەڵك و شمشێرەکەی ڕاناکێشێت) لەئیسلامدا بەرامبەر دەرچوون چەمکی زاڵبوون هەیە بۆ ڕەوایەتی بەخشین بە دەسەلاّت لە چوارچێوەی خیلافەتی ئیسلامیدا زانا ئیسلامییەکان لە سەردەمی ماوەردی و ئیبن خەلدونەوە تیۆریزەیان بۆکردووە بۆنموونە ئیبن خەلدون گەیشتە ئەو ڕادەیەی دەوڵەتی نوێ واتە ئەوەی بەری دەرچوونە ناوبنێ دەوڵەتی دەرچوون یا (دەوڵەتی خەواریجەکان)، بەلاّم مەبەست لەمە تیمی خەواریجەکان نییە.

لەلایەکیترەوە عەلی بەدرەدینی کوڕی جەماعە لە کتێبی (تحریر الاحکام فی تدبیر اهل الاسلام)دا نووسیویەتی (ئەگەر ڕۆژگار بێپێشەوا بووو یەکێك پێشەوایەتی گرتەدەست کە شایستەی نەبووو بە هێز و توانا و سەربازەکانی خۆی بەبێ بەدەستهێنانی بەیعە خیلافەت خەڵکی سەرکوتکرد ئەوا بەیعەکە بڕێنراوەتەوە و پێویستە ڕێزی لێبگیرێت هەتاوەکو موسوڵمانان یەکگرتوبن و قسەیان یەکبێت. ئیبن تیمیە (٦٦١ـ ٧٤٤ك) پێیوابووە ماوەی خیلافەتی ڕاشیدەین درێژکراوەی ماوە پێغەمبەرایەتییە.. ئەوەی لەم ماوەیەدا لەئارادابووو موڵکداریبووو نەك خیلافەت. شەرعیش ئەوە حەرامناکات ئەو پاشایەش بە پاشای پەلاماردەر دەناسرێت.. کەواتە زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە کۆکن کە یەکگرتوویی نەتەوە وپێشەوایەتی بپارێزن پارچەپارچەبوون ڕەتبکەنەوە. ئیبن حەنبەل دەڵێت (ملکەچکردن بۆ پێشەوا ئەرکە لەسەر موسوڵمانان هەتا ئەگەر فاسق و فاجریش بێت. شۆڕش دژی ئەو پێشەوایە کارێکی خراپە (منکر)و دەبێتە ڕێگر لەبەردەمیدا نایەڵێت لەپێناو بەرژەوەندی خەڵکدا کاربکات). حەسەن بەسریش کاتێك هەڵگەڕانەوەبووو لە حەجاجی کوڕی یوسفی

سەقەفی خوێندکارەکان هاتنەلای حەسەن بەسری داوای پشتگرییانلێکرد بۆ شۆڕشەکەیان پێیگوتن (ئەوشتەی تۆ دەیڵێت لەبەرەنگاربوونەوەی ئەو بکوژەدا واتە حەجاج کە خوێندەڕێژێ و ماڵی خەڵك داگیردەکا و نوێژناکات هەرچی بیەوێ ئەنجامیدەدات من وای دەبینم شەڕینەکەن، چونکە ئەو کارانەی ئەو ئەگەر سزای خودا بێت ئێوە ناتوانن بە شمشێرەکانتان سزای خوا راگرن، چونکە خوا حەجاجی وەك سزایەك بۆ ئێوە ناردوە).

## کەسی شۆڕشگێڕ کێیە؟

وشەی شۆڕشگێڕ لە سەرتاسەری جیهاندا زۆر بلاّوە یەکێکە لە وشە نایابەکان سەرجەم بزووتنەوە ئازادیخواز و سیاسی و کۆمەلاّیەتی و ئەدەبییەکانیش شۆڕش بە بالاّی هەڵوێستی مرۆڤدۆستانەیان دەبڕێت. ئەریك فرۆرم دەپرسێت کەسی شۆڕشگێڕ کێیە؟ چەمکی کەسی شۆڕشگێڕ چەمکێکی سیاسی دەروونناسییە لەم روانگەیەوە وەکو کەسی دەسەلاّتخواز وایە. چەمکی کەسی دەسەلاّتخواز ئاوێتەیە لە گوتاری سیاسی و گوتاری دەروونناسی. کەسی دەسەلاّتخواز لە هەندێ زەمینە و بەرژەوەندی دیاریکراوی سیاسییەوە سەرچاوەدەگرێت. بۆ پێناسەی کەسی شۆڕشگێڕ دەبێت لەوەوە دەستپێبکەین کە کەسێتی شۆڕشگێڕانە چییە؟ لەڕاستیدا مەرجنییە کەسێتی شۆڕشگێڕانە کەسێك بێت لەشۆڕشەکاندا بەشداری کردبێت.بەچەمکە فرۆیدیەکەی هەموکەسێك لەبەر هەرهۆیەك بێت دەتوانێت لەشۆڕشدا بەشداری بکات بەچاوپۆشین لەوەی چ هەستێکی هەیە یان لەسەر چی بنەمایەك پەیوەندی بەشۆڕشەوە کردوە. کەسێتی شۆڕشگێڕ کەسێتییەکی ئاژاوەخواز نییە واتە کەسێك بێت رقی لە دەسەلاّتی خراپ نەبێت، بەلاّم بۆ مەبەستی تایبەتی خۆی و جێگرتنەوەی دەسەلاّت ئاژاوە و پشێوی بنێتەوە. دەتوانین نموونەی کەسێتی ئاژاوەخواز لەمێژوودا بهێنینەوە وەکو (رەمزی ماکدونالد) کە لەسەرەتادا وەکو کەسێکی ئاشتیخواز دەردەکەوت کاتێك دەسەلاّتی گرتەدەست چووەپاڵ دەستە و تاقمی دەسەلاّتداری پێشوو کە ئەم خەباتی لە دژیان دەکرد و وازیشی لە پارتەکەی پارتی کرێکاران هێنا یان لویس بلانس لەکاتی شۆڕشی ساڵی ١٨٤٨ی لە فەرەنسا کە پرۆدۆن کۆمەڵناسی سیاسی هێرشیکردەسەر بەرنامە چاکسازییەکەی لویس بلانسی وەزیری کاری حکومەتی فەرەنسی و بە کەسێکی خیانەتکاری شۆڕشی دەناساند.

شۆڕشگێڕ كەسێكە بە مرۆڤدۆستی نەشونمادەكات و سنووره خراپەكانی كۆمەڵگەكەی خۆی تێدەپەڕێنێ لە روانگەی ئەقڵ و مرۆڤدۆستییەكەیەوە كۆمەڵگا دەخاتەبەر رەخنە و توانای جیاكردنەوەی چاك و خراپی هەیە. سەرەكیترین خەسڵەتی كەسی شۆڕشگێڕانە سەربەخۆبوون و ئازادی ئەوە. بیر و هەستی كەسی شۆڕشگێڕ پرچەكە بە ئامرازەكانی رەخنە ئەو دروشمە لاتینییەی دەڵێت (دەبێ گومان لەهەموو شتێ بكرێت) لەواقیعدا بەشێكی زۆر گەورەی بەرپرسیارێتی كەسێتی شۆڕشگێرانەیە بەرامبەر جیهان.

## گرنگیی شۆڕشی فەرەنسی و ئەمەریكی

بێگومان شۆڕشی فەرەنسی یەكەمین پریشكی لە ١٤ی تەموزی ١٧٨٩ دەستپێكرد. ئەم شۆڕشە نەك هەر بۆ مێژووی فەرەنسا كرنگبووو، بەڵكو كاریگەریشی خستەسەر مێژووی ئەوروپا. ئەم رووداوە مێژووی دابەشكرد بۆ دووبەش. مێژووی بەرلە شۆڕش و مێژووی دوای شۆڕش. مێژووی بەرلە شۆڕش مێژووی سیستەمی پاشایەتی فیوداڵی و فێندەمیتالیزمی ئایینی بوو. مێژوویەك بووو ئەقڵ لەتاریكترین ساتەكاندا بوووە لەو مێژووەدا ئەوەی بالادەست بوووە ئامۆژگاری پیاوانی ئایینی و خورافاتی سەدەكانی ناوەڕاست بوووە، بەلام مێژووی دوای شۆڕش مێژووی سیستەمی كۆماری پەرلەمانی دیموكراسی مۆدێرن بووو ئەقڵ تیایدا رۆڵی سەرەكی بینیووە چی دیاردەی سروشتی ناعەدالەتی بوووە خراونەتەبەر رۆشنایی ئەقڵ و قسەیان لەسەركراوە. شۆڕشی فەرەنسا تەقینەوەی هەست و سۆزێكی چەپێنراوی نیشتیمانپەروەری بووو كە لەدووتوێیدا دەستەواژەی نیشتیمانپەروەری (patriote) بە هاوواتای وشەی شۆڕشگێڕی وەردەگیرا.

هەموو ئەو بزووتنەوانەی كە لەدوا شۆڕشی فەرەنسییەوە سەریانهەڵدا هەم شۆڕشگێڕێكی دیموكراسی بوون هەم بزووتنەوەیەكی ئازادیخوازی نەتەوەیی بوون، چونكە ئەم دوو بزاوتە هەردووكیان یەك ئامانجیان هەبووو بریتیبووولە ئازادیخوازی و نیشتیمانپەروەری بۆ زگاركردنی مرۆڤ. وشەی میللەت كلیلە وشەیە بۆ تێگەیشتن لە شۆڕشی فەرەنسی ناوەڕۆكی شۆڕشەكەش ئەوانە دیارییانكرد كە تراژیدیاكانی میللەتیان بەچاوی خۆیان دی، چونكە ئەوانەی بیرۆكەی میللەتیان خەملاند دووشتیان تێكەڵ بەیەك كردبووو بەزەییهاتنەوە

بەمیللەتدا و دادپەروەری میللەت. شۆڕشی فەرەنسی تەنیا شۆڕشێکی دیموکراتی نەبووو، بەڵکو شۆڕشێکی نیشتیمانیش بوو ئەمەش بەرێکەوت نییە، چونکە دیموکراسی نوێ لەرێگەی هەستکردنی نەتەوەوە بە سەروەری خۆی بەهۆی مافەکانی هاولاتیانەوە لەبەرامبەر ئەو فۆرمەی پێشوو سەریهەڵداوە کە بەرژەوەندییەکانی ئەرستۆکراتی کەمینە لەلایەك و نەبوونی مافەکانی میللەت لەلایەکیترەوە نەتەوە بەهیچ مانایەك پێکنایەت. نووسینەکانی سیس رۆڵێکی گرنگی هەبوو لەسەر سەرهەڵدانی شۆڕشی فەرەنسی دیدگای نەتەوەی سیاسی بۆ یەکەمینجار لای ئەو بەهۆی شۆڕشەوە بوونە چەمك و تێگەیشتنی تایبەت. سیس لە کتێبی (چینی سێیەم)دا باس لە شۆڕش و هەڵگەڕانەوەی چینی سێیەم کە چینی هەژار و مافخوراوانی لە دژی دوو چینەکەیتر کە چینی پیاوماقولاّن و پیاوانی ئایینی ستەمکارە دەکات. بەبڕوای مارکس و ئەنگلس شۆڕشی فەرەنسی رووداوێك بوو کە گرنگییەکی تایبەتی لە مێژووی جیهاندا هەیە بوو بە خاڵێکی وەرچەرخان. شۆڕشی فەرەنسی لە روانگەی ئارنێتەوە ناکارا نەبوو لەبەدیهێنانی ئەو ئامانجانەی کە لایەنگرانی شۆڕشخوازی بوون شۆڕش بە تیرۆر و توندوتیژی کۆتاییهات، بەلاّم شۆڕشی ئەمەریکی بەپێچەوانەوە توانای ئەوەی هەبوو تاکو ئەو ئامانجانەی گرتویەتەبەر بەدیبهێنێ.

شۆڕشی ئەمەریکی بە سەرۆکایەتی تۆماس جیفرسۆن گەورەی ئەم شۆڕشە لەوەدا کۆدەبێتەوە کە یەکەم دەستوری ماف و ئازادییەکانی تێداداڕێژرا یەکەم هەنگاویشە بۆ دانانی مەرج و ئەرکەکانی حکومەتی شەرعی. تۆماس پین یەکێکە لەو فەیلەسوفە دیارانەی کە لەم شۆڕشەدا رۆڵی هەبووە.. پین هێرش دەکاتەسەر هێزی چەوسانەوە و بە قێزەونی لەقەڵەمدەدا لەو باوەڕەدایە کە پێویستە ئازادی رووبەڕوو هیچ جۆرێك لەجۆرەکانی سەرکوتکردن و داپڵۆسین نەبێتەوە.

لە بواری سیاسیدا پین کتێبێکی گرنگی هەیە بەناوی هەستی هاوبەش ( common sense) ١٧٧٥ئەمە یەکەمین کتێب و گرنگترین کتێبیشی بوو کە تیایدا داکۆکی لە شۆڕشی ئەمەریکا دەکات.کاری ئەو لەم کتێبەدا رەواجدان بوو بەو تێزەی کە کاری پێویست هەوڵدانە بۆ جیابوونەوەی لە بەریتانیا لەم پێناوەشدا کەوتە هاندانی جەماوەر بۆ بەدیهێنانی ئەم خواستە. ئەم کتێبە مژدەدان بوو بە شۆڕش و سەرەتایەکیش بوو بۆ

راگەیاندنی سەربەخۆیی. ئەو سەربەخۆییەی لەو بەڵگەنامەیەدا بەرجەستەبوو کە تۆماس جیفرسۆن رەشنووسەکەی نووسی و پاشان فرانکلین دایڕشتەوە. ئەم کتێیە لە دەرەوەی ئەمەریکاش کاریگەری هەبوو بەتایبەتی لە فەرەنسا.

## تێڕوانینی هەندێك لە چەپەکان بۆ شۆڕش

تیۆری شۆڕشی مارکسیزم ـ لینینزم ماوەی دەیان ساڵ ئیلهامبەخشی خەباتی گەلانی رۆژهەلاَت و ئەمەریکای لاتین و تاڕادەیەك ئەفەریقاش بووە. لینین دەڵێت: (شۆڕش زانستێکی حەکیمانەیە گران و ئالۆزە ). مارکس شۆڕشی هەژارەکانی بە شۆڕشێکی سیاسی لەپێناو ئازادیدا دادەنا ئەم گرێدراوەی نان و ئازادی ئەو بابەتەیە کە خوێندنەوەی مارکس سەبارەت بە شۆڕشی فەرەنسی جیادەکاتەوە، چونکە شۆڕشی فەرەنسی ئامانجەکانی وەکو خۆی نەهێمایەدی و نەیتوانی کێشەی هەژاری چارەسەربکات. مارکس پێیوابوو ئازادی لەگەڵ هەژاریدا ناکۆکە. لینین پاش شۆڕشی روسی ئەم رەهەندەی مارکسی پاراست لەو بڕوایەدابوو ئازادی مانای ئازادبوونە لە هەژاری.

## مارکس سەرهەڵدانی شۆڕشەکان بۆ سێ هۆکار دەگەڕێنێتەوە:

- دابەشبوونی کار: مارکس سەرنجی خۆی لەسەر دابەشکردنی کاری ئابووری چڕدەکاتەوە کە دابەشکردنی کار هەبوو لەوێشەوە نایەکسانی لە خێزانەکان. گرووپی هاورێیان، قوتابخانە، سیاسەت، کەنیسەکان، لەهەرکوێیەك رێکخراوی کۆمەلاَیەتی هەبێت دێتەئاراوە.
- ململانێی کۆمەلاَیەتی: هەمو تاکەکان و رێکخراوەکان و کۆمەڵگاکان بۆ هەرشتێك بەهاداربێت شەڕی لەسەردەکەن هەندێك دەیبەنەوە و هەندێکیش دەدۆڕێن. هەندێك هەژار و هەندێکیش دەوڵەمەنددەبن. هەندێك بێتوانا و هەندێکیش قودرەتمەنددەبن. چینێکی بالاَ و چینێکی هەژار دروستدەبێت.
- هەبوونی خاوەندارێتی (موڵکایەتی تایبەت): دابەشکردنی کار و ململانێی کۆمەلاَیەتی دەبێتە هۆی دابەشکردنی ئیمتیازاتەکان بەشێوەیەکی نایەکسان. لێرەشەوە کەسەکان دەتوانن هەرچییەك بەدەستبێنن خاوەندارێتی بکەن. مارکس خاوەندارێتی تایبەت بە هۆکاری سەرەکی

نامۆبوون دادەنێت و ئەمەش دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ململانێ لەنێوان کرێکاری نامۆکراو و سەرمایەداری زێدەبەهاخواز.

مارکس دەڵێت لەهەموو شۆڕشەکانی پێشوودا چینە زۆرلێکراوەکان هێزی پێشڕەوی سەرەکی بوون، بەڵام بەرهەمی سەرکەتن بۆ چینە چەوسێنەرە نوێیەکان بوون. گەل درەختی چاندووە و چەوسێنەرەکان بەرهەمیان چنیوە. هێزی بزوێنەری شۆڕشی سۆشیالیستی کۆمەڵانی خەڵکی رەنجدەرە بە سەرکردایەتی چینی کرێکار کە بەرژەوەندییان لەگەڵ بەرژەوەندی زۆربەی کۆمەڵگەدا یەکدەگرنەوە.

بەبڕوای لینین شۆڕشی سۆشیالیستی کارێك نییە کە بەیەك تەکان جێبەجێبکرێت، هەروەها تاکە شەڕێکیش نییە لە یەك مەیداندا، بەڵکو زنجیرە جەنگێکی دوورودرێژە لەتێکڕای مەیدانەکاندایە، جەنگێکە تەواوبوونی نییە مەگەر بەستبەسەرگرتنی خاوەندارێتی بۆرژووازی. ئەوە هەڵەیە والێکبدرێتەوە کە خەبات لەپێناو دیموکراسیدا ببێتە هۆی ئەوەی کە پرۆلیتاریا روو لە شۆڕشی سۆشیالیستی وەربگێڕێت نەخێر، بەڵکو مەسەلەکە پێچەوانەیە، پرۆلیتاریا ناتوانێت بۆ زاڵبوون بەسەر بۆرژزازیدا ئامادەبێت ئەگەربێتو خەباتێکی شۆڕشگێڕانەی هەمەلایەن و بەردەوام و راستگۆیانە نەگێڕێت. لینین بانگەشەی شۆڕشێکی جیهانی دەکرد جەختی لەسەر ئەوەدەکردەوە کە شۆڕشی روسی دەبێ بەپێی تیۆرەکانی مارکس بێت و بەسەر هەموو گەلاندا جێبەجێبکرێت لەهەر ولاتێکی سەرمایەداریدا بێت. لینین لە کتێبی (دەبێت چی بکرێت) لە ساڵ ١٩٠٢ نووسی (ستراتیژێکی نوێ دەخاتەڕوو بۆ بەرپاکردنی شۆڕشی سۆشیالیستی ناوەرۆکی سەرەکی لەم کتێبەدا ئەوەیە بۆ گواستنەوەی هۆشیاری بۆ کرێکاران و رێکخستنی شۆڕشی سۆشیالیستی پێویستمان بە پارتێکی شۆڕشگێر هەیە)، دوو خاڵی سەرەکی ئەم کتێبەی لینین دەکەنە کتێبێکی گرنگ. یەکەمیان باوەڕبوون بە رۆڵی ئیرادەی شۆرشگێرانە لەبەرپاکردنی گۆڕانی سیاسی و کۆمەلایەتی ریشەییدا. دووەمیان پیاهەڵدان و بەرزڕاگرتنی نوخبەی شۆڕشگێڕە کە پێویستە لەئاستی سیاسی و فەرهەنگی و رەمزیدا رێبەرایەتی شۆڕش بکات. مادام کاری حیزب بەرپاکردنی شۆڕشە، بۆیە پێویستە هەموو ئەندامەکانی کەسانی شۆڕشگێڕبن دەبێ کەسانێك بن کە شۆڕشکردن ببێتە پیشەیان. لینین تیۆرێکیتری داهێناوە بە تیۆری (شۆڕشی بەردەوام) ناسراوە لە کتێبی (دوو تاکتیکی

سۆشیال دیموکرات) پێیوایە شۆڕشی سۆشیالیستی لەپاش بۆرژوازی سەرهەڵدەدات سەرەتا پێویستە مارکسییەکان چاوەڕێی شۆڕشی بۆرژووازی بن، دەکرێت لە شۆڕشێکی دیموکراتیدا بە رابەرایەتی پرۆلیتاریا شۆڕشی بۆرژوازی ببەسرێتەوە بە شۆڕشی سۆشیالیستییەوە.

بەکردەوە شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە ١٩١٧ بەم تاکتیکە بەبەرهەم گەیشت. لە ساڵی ١٩١٧دا دوو شۆڕش دروستبوو یەکەمیان شۆڕشی شوبات بوو دوای رووخانی تزاز و حکومەتی کاتی دووەمیان شۆڕشی ئۆکتۆبەر.

لینین لە وتارە بەناوبانگەکەیدا (هەرەسهێنانی ئینتەرناسیۆناڵی دووەم) شۆڕش بەبێ دۆخێکی شۆڕشگێڕی مەحاڵە لەمەوە گرنترین پێکهاتەکانی دۆخی شۆڕشگێڕی دەستنیشاندەکات:

١. کاتێگ شۆڕش دێتەئاراوە کە رژێمە حوکمڕانەکان نەتوانن بەبێ گۆڕانکاری حوکمڕانی بکەن کاتێ قەیرانێ سەرهەڵدەدات کە ببێتە هۆی ململانێ لەناو چینی بالآدا و لێکجیابوونەوە بەرچاودەکەون. بۆ سەرهەڵدانی ئەم دۆخە تەنیا ئەوە بەسنییە چینەکانی خوارەوە نەیانەوێت بەشێوازی کۆن ژیان بەسەربەرن، بەڵکو پێویستە مەحاڵبێت چینە بالآکانیش بەشێوازی کۆن بژین.

٢. کاتێك پێوەنالاَندنەکانی چینە چەوساوەکان زیاتربن ئەمەش هەمیشە لە جەنگەکان و دوای جەنگەکان دۆخی وشکەساڵی برسێتی بارودۆخی قەیرانی ئابووری توند و تەنانەت پاش کارەساتە سروشتییەکان پێشدێت.

٣. کاتێك چالاکی و بێزاری چینە چەوساوەکان ئەنجامی قەیرانەکە و رەفتارەکانی چینە چەوساوەکان زۆردەبن. ئەم خاڵە مامەڵە لەگەڵ هۆکاری خۆی دەکات کە پەیوەندی بە چالاکی هۆشمەندییەوە هەیە.

لەلایەکیترەوە ماوتسی تۆنگ دەڵێت: هیچ پارتێکی سیاسی توانای نابێت رابەری بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی بکات بەرەو سەرکەوتن تاوەکو خاوەنی تیۆرێکی شۆڕشگێڕانە نەبێت. چینەکان خەبات دەکەن هەندێك سەرکەتن بەدەستدێنن و هەندێکیتر لەناودەبرێن مێژووو هەروابووە ئاوابوونی شۆڕشی شارستانی بۆ هەزاران ساڵ. پارتی شۆرسشگێر رێبەری

جەماوەرە هیچ شۆڕشێك سەرکەوتنی بەدەستنەهێناوە کاتێك پارتە شۆڕشگێڕەکە ئەوانی بەهەڵەدا بردبێت. جەنگ درێژبوونەوەی سیاسەتە جەنگ بەو مانایە سیاسەت خودی جەنگیش کارێکی سیاسییە. لەکۆنیشەوە رووینەداوە جەنگ بووبێت و سروشتێکی سیاسی نەبێت. شۆڕشەکان و جەنگە شۆڕشگێرەکان لە کۆمەڵگەی چینایەتێدا ناچارییە بەبێ ئەوان مەحاڵە هیچ هەنگاوێك بنرێت لە گەشەکردنی سۆشیالیستی و رووخاندنی چینی کۆنەپەرستی فەرمانڕەوا. جەنگی شۆڕشگێڕانە دژە ژەهرێکە کە نەك تەنها ژەهری دوژمن لەناودەبات، بەڵکو لە چڵکەکانمان خاوێنماندەکاتەوە. هەموو جەنگێکی شۆڕشگێڕانەی رەوا هێز و دەسەڵاتی مەزنی پێبەخشراوە دەتوانێ زۆرشت بگۆڕێت زەمینەخۆشکات بۆ گۆڕانکاری. جەنگی شۆڕشگێڕانە جەنگی جەماوەرە دەکریت تەنها بەتەیارکردنی جەماوەر پشتبەستن پێیان ئەنجامبدرێت. پێویستە کادیرەکان حیزب شۆڕشگێڕبن خزمەتی زۆرینەی خەڵك بکەن لە چین و جیهاندا پێکەوە.

### جۆرەکانی شۆڕش:

ئەرستۆ شۆڕشەکان بەسەر دووجۆردا دابەشدەکات جۆرێك دەبێتە هۆی گۆڕینی دەستوری باو سیستەمی حوکمڕانی دەگۆڕێت بۆ یەکێکیتر، جۆرێکیتر حوکمڕانەکان لە چوارچێوەی بونیادی سیستەمی باودا دەگۆڕێت. لای ئەرستۆ دیموکراسی کەمتر لە ئۆلیگارشی تووشی شۆڕش دەبێت، چونکە دەشێت ململانێ یان کێشمەکێشمەکان لە حوکمڕانی ئۆلیگارشیدا لەنێوان میللەت و چینی حوکمڕان یان لەنێوان خودی چینی حوکمڕاندا بێت، بەلاّم لەدیموکراسیدا کێشمەکێشم تەنیا لەگەڵ چینی حوکمڕاندایە وململانێ لەناو میللەتدا نییە.

دەتوانین جیاوازی بکەین لەنێوان شۆڕشی سیاسی و کۆمەلاّیەتی. شۆڕشی سیاسی لە هەوڵی بەرهەمهێنانی گۆڕانکاریدایەلە کارەکتەرەکان و بارودۆخی هێز لەگەڵ دەستەی دەسەلاّتداران لابردنی گروپێکی کۆن و دانانی گروپێکی نوێ، بەلاّم شۆڕشی کۆمەلاّیەتی بەشداریکردنی سیاسی و کۆمەلاّیەتییە لە گواستنەوەی چینە ململانێکەرەکان لەگەڵ گۆڕانێکی رادیکالاّنە. شۆڕشی سیاسی نوێنەرایەتی وەرگرتنی دەسەلاّت دەکات لەلایەن چینی

پێشکەوتووخوازەوە، چونکە سەرجەم بابەتەکانی گۆڕینی شۆڕشگێرانە لەکۆمەڵدا چارەسەرناکات، بەڵکو هەندێك لەو بابەتانەی پەیوەندییان بەگواستنەوەی دەسەڵاتەوە هەیە چارەسەردەکات، بەلاّم شۆڕشی کۆمەلاّیەتی تەنها بەگواستنەوەی دەسەلاّت بۆ چینە نوێیەکان کۆتاییناییەت بەواتای تەنیا لە شۆڕشی سیاسیدا قەتیسنامێنێت، چونکە دوای شۆڕش قۆناغێکی نوێ دەستپێدەکات. لەمبارەیەوە مارکس دەڵێت: (شۆڕش هەموو شۆڕشێك کۆمەڵگەی کۆن تێکدەشکێنێ بەوشێوەیە سروشتێکی کۆمەلاّیەتی وەردەگرێت. شۆڕش، هەرچ شۆڕشێك دەسەلاّتی کۆن دەرووخێنێ بەوشێوەیە سروشتێکی سیاسی وەردەگرێت).

١. شۆڕشی میللی: وەکو شۆڕشی فەرەنسا ١٧٨٩وە شۆڕشەکانی ئەوروپای رۆژهەلاّت ١٩٨٩ شۆڕشی ئۆکرانیا و پرتوگال ٢٠٠٤.

٢. شۆڕشی سەربازی: هەندێکجار ناودەبرێت بە کودەتا وەکو کودەتاکانی ئەمەریکای لاتین لە پەنجا و شەستەکانی سەدەی بیستەم.

٣. کودەتای سەربازی: گروپێ لە سەربازەکانی نزیك لە دەسەلاّتی پێشوو هەڵدەستن بەکردەوەیەکی سەربازی بۆ لەناوبردنی دەسەلاّتدار و گەیشتنی خۆی بە کورسی دەسەلاّت و بەدیهێنانی دەسکەوتی تایبەتی.

**لە روانگەی سەردەمەوە شۆڕشەکان بەسەر دوو گروپدا دابەشدەبن:**

- شۆڕشە کلاسیکییەکان: بریتییەلە کەڵکوەرگرتن لە هێز و پیادەکردنی توندوتیژی بۆ گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی لە سیستەمی حکومدا.

- شۆڕشی مۆدێرن: بریتییەلە پێکهێنانی چاکسازی سەرەکی لە بواری کۆمەلاّیەتی و ئابووری و کەلتوری و ئیدارەی سیاسی و بەکەڵکوەرگرتن لە زانست و تەکنەلۆژیا.

**لەکۆتاییدا:**

جۆرزبە ماتیزینی خاوەنی ڕێکخراوی (ئیتالیای لاو) سەبارەت بە شۆڕش دەڵێت: (شۆڕش کاری پرەنسیپ و بیروباوەڕە نەك کاری چەك و شەڕەنگێزی، لەوانەیە هەندێکجار هێزی وەحشی و کوێر سەرکەون و خەڵکیش وەدوویانکەوێت، بەلاّم پیرۆزی ئەوان هەمیشە بە دیکتاتۆری چەوسانەوە ئەنجامیدەبێت). مێژوو باسی شۆڕشێکی میللی یان یان شۆڕشێك کە سەرکەتووبێت لەمیللیبووندا ناکات کە لەسەر بنچینەی هێنانەدی بەرنامەیەکی پێشوەخت دارێژرابێت بەپێی ئایدۆلۆجیایەکی سیاسی فیکری و بزووتنەوەخوازی ئاشکرا بەرپابووبێت تەنانەت ئەو شۆڕشانەش کە بوونە هۆی دامەزراندنی چەند رژێمێکی خاوەن ئایدۆلۆژی رەسمی وەکو کوبا وئێران لەسەرەتادا شۆڕش دژی زوڵملێکردن بوو یان بۆ گۆڕینی سیستەمی حوکمڕانی بوو یا بۆ رزگاربوون بوو لە دەستی کۆلۆنیالیزم بوونەتە هۆی هاتنەئارای چەند حیزبێکی هەژموونکەر سەرەنجام زاڵبوونی حیزبێك یان بزووتنەوەیەك بەسەر شۆڕشدا یان بەسەر دەسەلاّتدا. لەکاتی شۆڕشەکاندا تەنانەت حیزبە ئایدۆلۆژییەکان بەتەنگ ئەوەوەن جەخت لەسەر لایەنی کەمی بەرنامەکانیان بکەنەوە کە چەندین توێژی فراوانی میللەت و چەندین هێزی سیاسی و کۆمەلاّیەتی جیاواز کۆدەکاتەوە هەوڵدەدات بەرنامە تایبەتییەکەی خۆی بشارێتەوە یان دوایانبخات هەتاوەکو دوای دەسەلاّت گرتنەدەست بەهۆی شۆڕشەوە، بۆیە شۆڕشە میللییەکان بە سروشتی خۆیان شۆڕشی ئەو حیزبە ئایدۆلۆژییانە نین کە کۆششدەکەن بۆ دەسەلاّت گرتنەدەست.. شۆڕشە میللییەکان شۆڕشی میللین نەك چەکداری. دواتر حیزبەکان مێژوویەك بۆ شۆڕش دادەڕێژن خاوەنی خەسڵەتی فوولەخۆکردنە لەسەر بنچینەی ئەفسانەیەك یان وێناکردنی ئەوەی ئەو حیزبانە سەرکردایەتی شۆڕشیان کردووە نەدەکرا ئەو شۆڕشە بێئەوان بەرپابکرێت لەکاتێکدا هێز و حیزبەکانیتر بەوە تاوانباردەکەن ئەوەی کردوویانە دزینی شۆڕش بووە. لەڕاستیدا ئەگەر شۆڕش شۆڕشێکی هەمەلایەنە بێت حیزبێك بە بەرنامەیەکی هەمەلایەنەی فراوان سەرکردایەتی بکات ئەوا ستەمکارییەرك دەگۆڕێ بۆ ستەمکاریەکیتر بەزمانی کارل پۆپەر ئەندازەیەکی کۆمەلاّیەتی گشتی نوێ دەسەپێنێ. شۆڕش بەرپاکردن لەپێناو ئازادیدا هەمیشە بوونیادنانی دیموکراسی مسۆگەرناکات، چونکە بونیاتنانی دیموکراسی پرۆسەیەکی ئالۆزی پێکهاتووە لە راگرتنی

هاوسەنگی نێوان گشتی و تایبەتی مسۆگەرکردنی ئەوەی زۆرینە نەبێتە زۆرینەیەکی شوناسی نەگۆڕ، بەڵکو زۆرینەی رووەو بەرژەوەندییەکان بێت، چونکە ولاٌتانی وەها هەن دیموکراسی تیایدا بەبێ شۆڕش هاتووەتەدی وەك کەنەدا. پرۆدۆن رەخنە لە ناپلیۆن دەگرێت و دەلێت: ناپلیۆن لەبری ئەوەی خۆی بەشۆڕشەوە پابەندبکات چوو شۆڕشەکەی بە کەسایەتی خۆیەوە پابەندکرد.

●●●

**سەرچاوەکان:**

١. هەورامان وریا قانع، شۆڕشی فەرەنسی ١٧٨٩ هۆیەکانی بەرپابوون و دەسکەتەکانی، رەنج، سلێمانی،٢٠٠٦

٢. ئەکرەم میهرداد، ناسیۆتالیزم، بیر و هوشیاری، سلێمانی،٢٠٠٦

٣. عەزمی بەشارە، شۆڕش و توانای بەرپارکردنی شۆڕش، و. هەڵکەوت عەبدوڵلاٌ، سەردەم، سلێمانی ،٢٠١٣

٤. فلادمير لينين، الدولة والثورة

٥. لینین، شۆڕشی سۆشیالیستی مافی میللەتان لەدیاریکردنی چارەنووسی خۆیاندا، و. سالار رەشید

٦. ئازاد بەرزنجی، چەند وێستگەیەکی فیکری و ئەدەبی، چ٣، سەردەم، سلێمانی،٢٠٠٨

٧. مەریوان وریا قانع، کتێب و دونیا، سەردەم، سلێمانی،٢٠١١

٨. رامین جیهان بگلو، ماکیاڤیلی و ماکیاڤیلیزم، و. نەوید مێهرار، سەردەم، سلێمانی،٢٠٠٨

٩. جووێڵ شارون، دە پرسیاری کۆمەڵناسی، و. هێمن شەریف، بیر و هۆشیاری، سلێمانی،٢٠٠٨

١٠. جۆرج گۆڕفیچ، پرۆدۆن، و. ئارام ئەمین، موکریانی، هەولێر،٢٠٠٦

١١. ماوتسی تۆنگ، کتێبی سوور، فازڵ حسێن، ئایدیا، سلێمانی ،٢٠١٤

١٢. پی جێی پرۆدۆن، بیرۆکەی گشتی شۆڕش لە سەدەی نۆزدەیەمدا، و. فوئاد یونس، رۆژهەلاٌت، هەولێر،٢٠١١

١٣. شوان ئەحمد، چەند بابەتێکی فیکری، ئاراس، هەولێر، ٢٠١٢
١٤. رێبووار سیوەیلی، پیەر بۆردۆن و کۆمەڵناسی فەلسەفی، چ٢، رۆژهەلاّت، هەولێر، ٢٠١٣
١٥. گەیلان عەباس، فەرهەنگی رامیاری، چ١، چاپ و کۆمپیوتەری بەفر، سلێمانی،٢٠١٢
١٦. ئەحمەد شەبانی، فەرهەنگی زانستی سیاسی، چ١، دانشگاه کردستان، سنه،٢٠١٠.
١٧. شۆڕش ئەحمەد، مارکس ژیان و کاره فیکرییەکانی، چ١، چوارچرا،٢٠١١
١٨. سەمەند زەنگەنە، کاریگەری مافە سروشتییەکان لە سەرهەڵدانی شۆڕش، چ١، چاپخانەی حەمدی، سلێمانی،٢٠٠٩
١٩. حورية توفيق، فكر سياسي أفلاتون من محمد عبدة، ط٣، مكتبة الأنجلوس مصرية، قاهرة،١٩٩٩
٢٠. د.کمال پۆلادی، لە دەوڵەتی دەسەلاّتخوازەوە بۆ دەوڵەتی ئەقلّ، و: یوسف خدر چۆپان، چ١، چاپخانەی منارە، هەولێر،٢٠٠٧
٢١. د. زکریا براهیم، کێشەی ئازادی سیاسی، و: شوان ئەحمەد، چ١، چاپخانەی شڤان، سلێمانی،٢٠١١
٢٢. رۆچێ لاکۆمب، قەیرانی دیموکراسی، و. د. نورعلی تابندە، چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی،،٢٠٠٩
٢٣. رامین جیهان بگلو، دەسەلاّت و ئازادی، و: عەتا جەماڵی، چ١، چاپخانەی هاوسەر، هەولێر،٢٠٠٩.
٢٤. تعريف الثّورة www.mawdoo3.com
٢٥. پیتەر کالوەرت: شۆڕش و دژەشۆڕش، و. رەحمان ئەمیری، چاپخانەی خانی، دهۆك،٢٠١٠
26. oxfordpolitics, iainmelea and alistairmemillan, universitypress, thirdedition.
27. Aplain English guideto political terms ,national adultliter-cyagency, 2006

# پارادۆکسی (لەوحی مەحفوز) و (ناسخ و منسوخ) لە قورئاندا

لێکۆڵینەوە و ئامادەکردنی: ئاراس وەهاب

## بەشی یەکەم:

### بیردۆزەی تابلۆی پارێزراو (اللوح المحفوظ) لە ئیسلامدا:

بۆئەوەی بتوانین لە بیردۆزەی (لوح المحفوظ) یاخود (تابلۆی پارێزراو) تێبگەین ناچاردەبین یەك دوو نموونە بهێنینەوە. گەر بڕوانینەن کتێبێك کە لەکتێبخانەدا یاخود لەمۆزەخانەدا پارێزراوە، کاتێك ئیشماندەکەوێتە ئەو کتێبە، ئەوا دەکرێت قەرزیبکەین یاخود وێنەیەکی لەبەربگرین و دواجارا کتێبەکە بگێڕینەوە جێگای خۆی.

ئێمە لە سەر تیراژی وێنەلەبەرگیراو دەتوانین هەموو شتێك بکەین و بەئارەزووی خۆمان دەستکاریبکەین، بەڵام ڕێگامانپێنەدراوە دەستکاری تیراژە ئۆرجیناڵەکەی نێو مۆزەخانەکە، یان کتێبخانەکە بکەین. لەم نموونەیەدا دەتوانین تیراژی ئۆرجینلاّی نێو کتێبخانەکە، یاخود مۆزەخانەکە بە (اللوح المحفوظ)، (saved board) ناوببەین. نموونەیەکی دووەم: گەر لە بواری (IT) و (Database)دا بڕوانینە پرۆگرامە کۆمپیوتەرییەکانی سەردەم، دەبینین زۆربەیان لەسەر بنەمای (client & server) کاردەکەن. واتا، پرۆگرامێك داونلۆد دەکەیت و کارپێدەکەیت کە بۆت هەیە بە ئارەزووی خۆت دەستکاری ئیلیمێنتەکانی بکەیت، بەڵام بۆمان نییە دەستکاری پرۆگرامە بنەڕەتییەکە بکەین، کە لەسەر (server)ەکە پارێزراوە کە لە بنەڕەتدا هیچ مافی چوونەژوورەوەی پرۆگرامە ئۆرجیناڵەکانمان پێنەدراوە. ئەم بیردۆزەیە بیردۆزەی پاراستنی ڕەگەزە، پاراستنی ئۆرجیناڵ بۆ ئەوەی ئێمە هەمیشە بۆی بگەڕێینەوە، تاکو هەموومان لە یەك سەرچاوەوە ئەو زانیارییە وەربگرین. لە قورئاندا تابلۆی پارێزراو هەمان ئەو ئەرکەی پێسپێردراوە لەو دوو نموونەیەدا ئاماژەپێکراوە. تابلۆی پارێزراو، یاخود (اللوح المحفوظ)

(saved plate) ئەو (server)ەیە لای خوا پارێزراوە و یاسا کۆد و ئامۆژگارییی ئایینەکانی تێداپارێزراوە، پەیامبەران، بەپێی ئایینی ئیسلام لەو پلەیتە پارێزراوەوە ئایاتەکانیان بۆ دیتەخوارەوە. بەپێی لۆژیکی لاهوتی تەنها یەك سەرچاوە هەیە گشت پەیامبەرەکان تێکستیان لێوە بۆ دێتەخوار ئەویش پلەیتی پارێزراوە. بۆئەوەی ئاستی ئاگایی (محەممەد) لەبارەی تابلۆی پارێزراوەکانەوە بزانین دەبێت بڕوانینە ئەم خالآنەی خوارەوە:

١. ئایەتی ٢١و ٢٢ی سورەتی (البروج) دەلێت: "بل هُوَ قرآن مجيد (٢١) في لوح محفُوظٍ ". لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا (قورتوبی) دەلێت: " (في لوح محفوظ) أي مكتوب في لوح. وهو محفوظ عند الله تعالى من وصول الشياطين اليه. وقيل: هو أم الكتاب، ومنه انتسخ القرآن والكتب"، واتە: (لە تابلۆی پارێزراودا) یانی تابلۆ، ئەوە لای خوا پارێزراوە تاکو دەستی شەیتانەکانی نەگاتێ.

٢. هەروەها بڕواننە ئایەتی ١٤٥ لە سورەتی (الاعراف): "وكتبنا له في الالواح من كُلِ شَيءٍ مَوْعظَةً وتفصيلاً لكل شيءٍ فَخُذها بقوةٍ وامر قَوْمَك يأخذوا بأحسنها سأريكم دار الفاسقين". دەقی ئەم ئایەتە بەم شێوەیەیە: "لە تابلۆکاندا هەموو بابەتێکمان بۆ تۆمارکردبوو (لێرەدا مەبەس لە تەوراتە)، ئامۆژگاری تێروتەسەل بۆ هەموو چالاکییەکانی ژیان، هەروەها روونکردنەوە بۆ هەموو دیاردە و بابەتێکی تێدابوو، کەوابوو ئەی موسا: بەتوندی پابەندیان ببە و پەیڕەویانبکە، فەرمان بە نەتەوەکەشت بدە کە بەجوانترین شێوە وەریانبگرن و پەیڕەوییانبکەن، لەئاییندەدا شوێنی تاوانبار و لەسنووردەرچوانتان نیشاندەدەم، چۆن وێرانیدەکەین."

٣. لە (معجم الكبير للطبراني)، بەرگی ٢٠ لاپەڕەی ٢٢٥-٢٢٦دا، لە تەفسیری حەدیسی ژمارە ٥٢١دا هاتووە دەلێت: " أعطيتُ سورة طه و الطور من ألواح موسي ". واتە: سورەتی (طه) و (طور)م لە تابلۆکانی (موسا)وە بۆ هێناون.

٤. لە (تفسير القرآن)ەکەی (الرازی)، بەرگی ٥ لا١٥٦٣دا هاتووە: "عن جعفر بن محمد قال: الالواح التي انزلت علي موسي كانت من سدر الجنة وكان طول اللوح اثني عشر

ذراعا.. وكانت الواح موسي من بردي". واتە: لە زمانی (جەعفەر ي کوڕی محەممەد)ەوە کە لە پەیامبەری گوێلێبووە، گوتوویەتی: ئەو تابلۆیانەی بۆ (موسا) دابەزیوە لە درەختی (سدر)ی بەهەشت بووە و درێژییەکەی دوانزە گرێ بووە.. لە بڕگەیەکیتردا دەڵێت: تابلۆکانی (موسا) لە ڕووەکی (بردی) دروستکراون. هەرچەندە یەهودییەکان دان بەو زانیارییانەدا نانین، بەڵکو دەڵێن، لە (کتاب المقدس)، لە (سفر الخروج ١٩:٢٣)دا هاتووە کە تابلۆکانی (موسا) لە بەرد دروستکراون، بەو ناونیشانەی، کاتێك موسا بینیویەتی نەتەوەکەی بزن دەپەرستن، تووڕەبووە و لەداخدا بەردەکان شکاون. لەگەڵ ئەو رەتکردنەوەیەی یەهودییەکاندا لەبارەی پلەیتی پارێزراوی (موسا)وە، هێشتا موسڵمانەکان سوورن لەسەر راستیی ئەو تەفسیراتانەی خۆیان. ئەم رووداوەی موسا (علامە مناوی)یش لە کتێبی (فیض القدیر) بەرگی ٥ لا ٣٥٧دا جەختی لێدەکاتەوە. ٥. گەر سەیرێکی ئایەتی ٧٠ی سورەتی (الحج)یش بکەین، دەڵێت: "ألم تعلم ان الله یعلم ما في السماء والارض ان ذلك في كتاب ان ذلك على يسير." (ئیبنولکەسیر) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا و لە زاری ئەسحابەکانی (محەممەد)ەوە بەمشێوەیە بۆماندەدوێت: " یخبر تعالی عن كمال علمه بخلقه، وأنه محیط بما في السماوات وما في الارض، وأنه تعالی علم الكائنات كلها قبل وجودها وكتب ذلك في اللوح المحفوظ، كما قال رسول الله صلي الله علیه وسلم: (إن الله قدر مقادیر الخلائق قبل خلق السماوات والارض بخمسین ألف سنة وكان عرشه على الماء)". واتە: خوای گەورە تەواوی زانستەکانی خۆیمان لەبارەی مەخلوقاتەکان و هەموو ئەو شتانەی دەکەونە نێوان ئاسمان و زەوییەوە پێدەڵێت و بەگەورەیی خۆی بەئاگایە لەهەموو ئەو بوونەوەرانە پێش دروستبوونیان و هەموویشی لەسەر تابلۆ پاریزراوەکان نووسیون، هەروەکو چۆن پەیامبەر دروودی خوای لەسەربێت دەڵێت: (خوا پێوانەی مەخلوقاتەکانی پێش دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی بە پەنجا هەزار ساڵ، کاتێك تەختەکەی لەسەر ئاو بووە پێواوە).

٦. ئایەتی ٢٢ لە سورەتی (حدید) دەڵێت: "ما أصاب من مصیبة في الارض ولا في أنفسكم اِلا في كتاب من قبل أن نَبرأها اِن ذلك على الله یسیر". (قورتوبی) لە تەفسیری

ئەم ئایەتەدا دەڵێت: "... (الا في كتاب) يعني في اللوح المحفوظ ...". واتە لە وشەی (کتاب)ەکەدا خوا مەبەستی تابلۆی پارێزراوە. لەو ئایەت و تەفسیرانەی سەرەوەدا ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە کە لە چەندین جێگای جیاوازدا لە قورئان و حەدیسەکاندا ئاماژە بە تابلۆی پارێزراو کراوە و (**محەممەد**) خۆشی جەخت لە ڕاستی بوونی ئەو تابلۆ پارێزراوانە دەکاتەوە.

ئەو سەرچاوە نیوترالانەی باس لە تابلۆی پارێزراو دەکەن ئەوانەن ئاماژە بە دین و مێژووی سۆمەرییەکان دەکەن. سۆمەرییەکان نزیك بە سی هەزار ساڵ پێشزایین یەکەم شارستانییەتی خۆیان لە باکووری عێراق و لە ناوچەکانی میزۆپۆتامیا دامەزراندوە. یەکێك لە داهینانەکانی سۆمەرییەکان تابلۆ قوڕینییەکان بوون، ئەو تێکست و وینانەی لەخۆگرتوون کە مێژوو، دین و کولتوریانمان بۆ دەگێڕنەوە. سۆمەرییەکان باوەڕیانوابووە، خواوەندەکانیان لەئاسماندا خاوەنی تابلۆی قوڕین بوون و لەوێوە ئامۆژگاری نەتەوەکانیان کردووە. توێژەرەوە ئەنتی ئیسلامییەکان باوەڕیانوایە، بیرۆکەی تابلۆی پارێزراو لای (**محەممەد**) لەسۆمەرییەکانەوە وەرگیراوە، بەوپێیەی شارستانیی سۆمەرییەکان لەڕێگای کۆچ و ڕەو و داگیرکردنەکانەوە بەرەو ناوچەکانی سوریا و شام کشاوە و لەوێوە دانیشتوانی دوورگەی عەرەبی هەواڵی ئەو شارستانییەیان پێگەیشتووە. توێژەرەوە لاهوتییەکان پێیانوایە (**محەممەد**)یش لەبارەی سۆمەرییەکانەوە شتی زانیوە، ئەوانیش وایبۆدەچن، بیرۆکەکەی لەوانەوە وەریگرتبێت! لەدوای سۆمەرییەکان بابلییەکانیش لەڕێگای بەجێهێشتنی کۆمەڵێك تابلۆی قوڕینەوە مێژووی شارستانییەتی خۆیانمان بۆدەگێڕنەوە. هەمان بیرۆکەی بوونی تابلۆی پارێزراو خواوەندەکان لای دیانەتی ئایزیدییەکانیش هەبووە. پێکهاتەکانی تابلۆی پارێزراو، ئەو تابلۆیەی قورئانی لەخۆگرتووە:

تابلۆی پارێزراو خاوەنی کۆمەڵێك سیفاتە لەجۆری شێوە، پێکهاتە، زمان، قەبارە و ئەو مەتریاڵەی تابلۆکەی لێدروستکراوە و پێینووسراوەتەوە لەگەڵ شوینی پاراستنەکەی کە مشتومڕێکی زۆری لەنێوان زانایانی ئیسلام و نەیارانیدا خولْقاندووە. لەمبارەیەوە (قورتوبی) لە تەفسیری ئایەتی ٢١و ٢٢ی سورەتی (البروج)دا دەڵێت: "وروى الضحاك عن

ابن عباس قال (اللوح من ياقوتة حمراء، أعلاه معقود بالعرش وأسفله في حجر ملك يقال له ماطريون، كتابه نور، وقلمه نور، ينظر الله عز وجل فيه كل يوم ثلثمائة وستين نظره، ليس منها نظرة الا وهو يفعل ما يشاء، يرفع وضيعا، ويضع رفيعا، ويغني فقيرا، ويفقر غنيا، يحيي ويميت، ويفعل ما يشاء" لا إله الا هو)". واتە: "(زوحاك) لە زمانی (کوڕی عەباس) کە کوڕی مامی (محەمەد)ە گێڕاویەتیەوە: تابلۆکە لە یاقووتی سوورە، لە سەرەوە بە بنەوەی تەخت (عرش)ی خواوە بەستراوەتەوە و شۆڕبووەتەوە بۆ سەر ناوچەوانی جوبرائیل کە پێیدەوترێت (متریۆن). بە پینووسی نور و لە نور نووسراوەتەوە. خوای پەروەدگار لە ڕۆژێکدا سیسەد و شەست جار لێیدەڕوانێ و ئەوەی خۆی دەیەوێت دەیکات، ئەوەی بەرز دەژی نزمیدەکاتەوە، ئەوەی نزم دەژی بەرزیدەکاتەوە، فەقیر دەوڵەمەنددەکات و دەوڵەمەندیش فەقیردەکات، دەمرێنێت، دەژینێت، ئەوەی بیەوێت دەیکات و تەنها خۆیەتی ."

لەهەمان تەفسیردا (قورتوبی) دەڵێت: "وقال أنس بن مالك ومجاهد، إن اللوح المحفوظ الذي ذكره الله تعالى في جبهة إسرافيل. وقال مقاتل: اللوح المحفوظ عن يمين العرش ...". واتە: "(ئەنەسی کوڕی مالیك) گوتوویەتی، ئەو تابلۆ پارێزراوەی خوا باسی لێوەدەکات لەسەر ناوچەوانی (ئیسرافیل)ە، هەروەها گوتوویەتی، تابلۆی پارێزراو کەوتووەتە لای راستی تەختی خواوە.."، لە دیدگای ئیسلامدا (ئیسرافیل) سەرۆکی جبرائیلەکانی ئاسمانە.

لە کتێبی (العظمة لابن حيان الاصبهاني)دا، بەرگی ۲، ل۴۹۵ هاتووە: "عن سعيد بن جبير قال: انهم يقولون اللوح من ياقوتة وانا اقول كان من زمرد، كتابتها من الذهب، وكَتبها الرحمن عزوجل بيده، وسمع أهل السماوات صرير القلم". واتە: "لە (سەعید کوڕی جەبیر)ەوە، گوتوویەتی، دەڵێن تابلۆی پارێزراو لە یاقووتە، بەڵام من دەڵێم لە (زومرود)ە، نووسینەکەی لە ئاڵتوونە، و (رەحمان) بەدەستی خۆی نووسیویەتی و هەموو خەڵکانی ئاسمان گوێیان لە جیرەی قەڵەمەکەی بووە لە کاتی نووسینیدا"، هەروەها (سەیوتی) لە (الدر المنثور)ەکەیدا، بەرگی ٦ ل٧٦ باس لە تابلۆی پارێزراو بەمشێوەیە

دەکات: "عن ابن عباس قال: خلق الله اللوح المحفوظ لمسيرة مائة عام". واتە: "لە (کوڕی عەباس)ی دەگێڕنەوە گووتویەتی، خوا تابلۆی پارێزراوی بەدرێژایی سەد ساڵ ڕۆیشتن دروستکردووە." لەم تەفسیرەدا (کوڕی عەباس) کە کوڕی مامی پێغەمبەری ئیسلامە، ئەوەندە بە گەورە باس لەو تابلۆ پارێزراوە دەکات کە گوایە، گەر درێژی بکەین و سەد ساڵ لەتەنیشتییەوە بە پێ بڕۆین هێشتا درێژییەکەی تەواو نابێت. گەر بڕوانینە تەفسیرەکەی (ئیبن کەسیر)، بەرگی ٤ لا٤٩٦ بەمشێوە لە (کوڕی عەباس)ەوە بۆماندەگێڕێتەوە: "عن ابن عباس" اللوح المحفوظ طوله ما بين السماء والارض وعرضه ما بين المشرق والمغرب وهو من درة بيضاء". واتە: "لە (کوڕی عەباس)ەوە، تابلۆ پارێزراوەکە درێژییەکەی نێوان زەوی و ئاسمانە، پانییەکەشی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایە و لە (دوڕەت البەیزاو)یش دروستکراوە".

لەو تەفسیرانەوە بۆماندەردەکەوێت کە کۆدەنگییەك لەلای موسڵمانان و تەنانەت موفەسیرە بەناوبانگەکانیشیان دەربارەی پیناسە و جێگەی تابلۆی پارێزراو نییە! کەس نازانێت، بە بنەوەی تەختی خوادا هەڵواسراوە یاخود کەوتووەتە لای ڕاستییەوە. کەس نازانیت، لە یاقووتی سوورە، لە ئاڵتوونە، لەسەرە، یاخود لە (درة البيضاء)ەیە! هیچکەس بۆی ڕاستنەبووەتەوە، ئایا درێژییەکەی دوانزە گرێیە، نێوان زەوی و ئاسمانە، یاخود سەد ساڵ ڕۆشتنی پێیە! ئایا پانییەکەی دیاریکراوە؟ یەك لە شرۆڤەکارانی ئیسلامە دەڵێت نێوان ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتە، یەکێکیتریان دەڵێت چەند گرێیەکە و ئەوەی دواییشیان ئاماژە بە پانییەکەی ناکات! گەر بچینەسەر ئەوەی کێ نووسیویەتی، ئەوا کێشەکە هەندەیتر قووڵدەبێتەوە. هەندیك پێیانوایە، خوا بەدەستی خۆی نووسیویەتییەوە، واتە خوا دەستی هەیە و پینووسیشی وەکو کەرەسەیەکی دنیای مادی بەکارهیناوە، بەڵام هەندێکیتر لە شرۆڤەکاران پێیانوایە (ڕەحمان) نووسێویەتییەوە، هەندێکیتریش، پێیانوایە، گوایە فریشتەکان نووسیویانەتەوە. لێرەوە بۆماندەردەکەوێت لە نووسینەوەکەیشیدا ناتوانین گوتارێکی یەکگرتوو لەنێو موسڵماناندا بەدیبکەین. لەبارەی سەیرکردنەکەی ڕۆژانەی خواوە بۆ تابلۆکە، شرۆڤەکارانی ئەنتی ئیسلامی دەپرسن: بۆ دەبێت خوا لە ڕۆژێکدا

سیسەد و شەست جار سەیری تابلۆی پارێزراو بکات، چ کارێکی بەو سەیرکردنەیە؟ لە بەرانبەردا نە لە دەقە قورئانییەکاندا و نە لەتەفسیرەکاندا هیچ پاساوێك بۆ ئەو سەیرکردنەی خوا نەهێنراوەتەوە.

## ئایا تابلۆی پاریزراو دەستکاریدەکرێت؟

کێشەی دەستکاریکردنی دەقە قورئانییەکانی سەر تابلۆی پارێزراو یەکێکە لە کێشە هەرە گەورەکانی شرۆڤەکارانی ئیسلام. ئەنتی ئیسلامەکان پێیانوایە کە بەهیچ جۆرێك ناکرێت دەستکاریی دەقە پیرۆزەکان بکرێت، بەتایبەت ئەو دەقانەی لەسەر تابلۆی پارێزراون. ئەو دەقانە دەقی خواین و پێش دروستبوونی بوونەوەرەکان و هەموو ئەو شتانەی کەوتوونەتە نێوان زەوی و ئاسمانەوە نووسراونەتەوە. دەقی قورئان سەرەتا کە دابەزیوە هەتاوەکو دوای سەردەمی خەلافەتیش هیچ سەروبۆر و خلاّبەندییەکی نەبووە.

بڕواننە چەند وینەیەکی تیراژی یەکەمی بنەڕەتیی قورئان کە لە مۆزەخانەکانی (فەرەنسا)دا پارێزراوە. ئەو وینانە ئەو دەقانەن لە سەردەمی خەلیفەکاندا نووسراونەتەوە بەڵکو دواتر بۆی زیادکراوە؟؟

لە لا٢٥ی کتێبی (حقائق الاسلام في مواجهة شبهات المشككين)دا هاتووە: "من عناصر شبهاتهم حول جمع القرآن و مراحيله ماسبق الاشارة اليه من قبل، و هي، (تنقيط،، وتشكيل (ظبط)، وعلامات الوقف، وتنسيق القرآن)". واتە: "دەربارەی گومڕاییەکانی کۆکردنەوەی قورئان و قۆناغەکانی بریتینلەمانە: (خالّبەندی، پێکهێنان، نیشانەکانی وەستان و تەنسیقی قورئان)". کتێبی (حقائق الاسلام في مواجهة شبهات المشككين) لەلایەن شێخەکانی (ئەزهەر)ەوە نووسراوەتەوە، وەلاّمێکە بۆ هەموو ئەو پرسیار و گومڕاییانەی توێژەرەوە مەسیحی و بێلایەنەکان لەگەڵ نەیارانیان پرسیویانە. لەو کتێبەدا شێخەکانی (ئەزهەر) بەپشتبەستن بە تەفسیرە باوەڕپێکراوەکان هەوڵیانداوە وەلاّمی هەموو ئەو گومڕاییانە بدەنەوە کە ئەنتی ئیسلامییەکان و شرۆڤەکارەکانیان درووژاندویانە. لە لا٢٧ی کتێبەکەدا باس لەو کەسانە دەکات کە سەروبۆر و خالّبەندییان

بۆ قورئان دیاریکرد و بە (جماعه التابعین) ناویاندەبات، هەروەها ناوی چوار لە بەناوبانگترینی ئەو کەسانە دەهێنێت: (ئەبولئەسوەد لدوئەلی)، (نەسری کوڕی عاسمی لەیسی)، (یەحیای کوڕی یەعمەر) و (خەلیلی کوڕی ئەحمەد). ئەم چوار کەسە لە گەورە دواکەوتوویان (تابعین)ی ئیسلام بوون کە نەوەی یەکەمی دوای خەلیفەکانی راشدین بوون، واتە نە پێغەمبەر خۆی و نە کەسە هەرەنزیکەکانی دەستیان بۆ ئەمکارە بردووە، بەڵکو کەسانێك کردوویانە زۆر دووربوون لە سەرانی وەحیەوە. لەبارەی خاڵبەندییەوە هەمان سەرچاوە باس لە دانانی خاڵ لەسەر پیتەکانی قورئان دەکات و نموونەی (کمثل جنة بربوة) دێنێتەوە و دەڵێت، گەر خاڵ لەژێر پیتی (ح)ەکەدا نەبێت، ئەوا دەشێت بەمشێوازە جیاوازانەی خوارەوە بخوێنرێنەوە: (حیة، جِنة، خبة، جُنة، حِتة، خَیة.. هتد، کە هەریەکێکیان مانایەکی تایبەت و جیاوازی هەیە. هەرچی"ضبط"ە دروستکردنی جوولەیە لەوشەکاندا لە رێگەی دانانی (فتحة)، (ضمة)، (کةسرة)و (سکون)ەوە. (علامات الوقف) یش، بە واتای (نیشانەی وەستان) دێت، دەڵێت: بریتییەلە دانانی خاڵ لە کۆتایی ئایەتدا بۆئەوەی خوێنەر بزانیت، کە لەو جێگایەدا وەستان هەیە. لە هەمان سەرچاوەدا و لە لا٢٧دا دەڵێت: دانانی سەروبۆر و خاڵبەندی و نیشانەی وەستان بە دەستکاریکردنی قورئان هەژمارناکرێت، بەڵکو ئاسانکارییە بۆ خوێندنەوە و دوورخستنەوەی خوێنەر لە هەڵەی شوبهاندنی وشەیەك بە وشەیەکیتری نەشیاو. ئەوەی نەیارانی ئیسلام لەمبارەیەوە لەگەڵ ئیسلامییەکاندا مشتومڕی لەسەردەکەن ئەوەیە، دەڵێن: چۆن دەبێت خوا بەکەموکووڕیەوە دەقە قورئانییەکانی ناردبێتەخوارەوە بێئەوەی زانیبێتی کە مرۆڤ بە هەڵە دەیخوێنێتەوە؟ یاخود دەپرسن: گەر خوا دەیزانی نەبوونی سەروبۆر دەبێتەهۆی ئەوەی شەیتان هەڵە بە مرۆڤ دەکا بۆچی خۆی هەر لەسەرەتاوە بۆی دانەناوە؟ یاخود لانیکەم دەبوو ئەو ئەرکەی بخستایەتە سەرشانی (محەممەد) لەبری ئەوەی چەند گەنجێك دەیان ساڵ دوای پێغەمبەر خۆی و ئەو هەموو خەلیفە و سەحابەیە بکەونە دەستکاریکردنی قورئان؟

موسڵمانان باوەڕیانوایە خوا بە دەستی خۆی تابلۆکەی نووسیوە. لەمبارەیەوە رەخنەگران دەپرسن: چۆن دەبێت خوا دەستی هەبێت؟ ئەو پێنووسەی خوا تابلۆکەی

پێپڕکردبێتەوە، دەبێت چەند گەورە بووبێت؟ (ئیبنولتەیمییە) لە (جامع البیان)دا، بەرگی یەکەم، لا٢٨٨ دەڵێت: "(محەممەد) گوتوویەتی: عەرەبم لەبەر سێ شت خۆشدەوێت، لەبەرئەوەی خۆم عەرەبم، لەبەرئەوەی قورئان عەرەبییە و لەبەرئەوەی عەرەبی زمانی خەڵکانی بەهەشتە". بەشی کۆتایی ئایەتی ١٠٣ لە سورەتی (النحل) دەڵێت: ".. وهذا لسان عربي مبين ". واتە: "ئەوە زمانێکی عەرەبیی پاراوە". (سەیوتی) لە کتێبی (الدرَ المنثور)ەکەیدا، بەرگی٧ لا٣٦٥ دەڵێت: "عن ابن عباس: "كتب الله القرآن في اللوح المحفوظ بالعربية". واتە: "لە زاری (کوڕی عەباس)ەوە: خوا قورئانی لە تابلۆکەدا بە زمانی عەرەبی نووسیوەتەوە"ڕەخنەگرانی ئیسلام، هەرزوو ئەم تێزانەی (محەممەد)یان خستەبەر ڕەخنە و پرسییان: بۆ دەبێت زمانی بەهەشت و خوا عەرەبی بێت؟ ئەی عیبرییەکەی موسا و زمانی پێغەمبەری نەتەوەکانیتر چییان لێبەسەرهات و لەو دنیا چۆن مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت؟ ئەوەی ئاشکرایە، هیچ یەك لە پێغەمبەرانیتر نەیانگوتووە خوا زمانی نووسین و دواندنی زمانی ئەوانە، نە موسا وایگوتووە، نە زەردەشت و نە هیچ یەك لەوانیتر! ئەوەی مێژوو لەمبارەیەوە بۆماندەسەلمێنێت ئەوەیە، زمانی عەرەبی بەنووسین و قسەکردنەوە لە داهێنانی مرۆڤن. بەپشتبەستن بە سەرچاوە ئارکیۆلۆژییەکان دەردەکەوێت، نووسینی عەرەبی لەبنەڕەتدا دەگەڕێتەوەسەر نووسینی(*) (نبتی)یەکان کە لە نووسینی (ئارامی)، یاخود (سریانی)ەوە داتاشراوە.(**) کۆمەڵێك توێژینەوە لەم ساڵانەی دواییدا دەربارەی ڕەچەڵەکی نووسینی عەرەبی لەسەر دەستی زانایانی عەرەب خۆیان کراون، لە هەموو ئەو توێژینەوە و لێکوڵینەوانەدا ئەوە بەئاشکرا دەردەکەوێت کە نووسینی عەرەبی نزیك بە چوار سەدە پێش ئیسلام لە (ئەنبار)ەوە دەستیپێکردووە و دواتر بەرەو دوورگەی عەرەبی کشاوە. ڕەخنەگرانی ئیسلام هەمیشە دەگەڕێنەوە بۆ ئەو توێژینەوە و لێکۆڵینەوانە و دەڵێن: زمانی عەرەبی زمانی ئارامیی سریانییە، نەك زمانی خوا و بەهەشت بێت و بەسەر عەرەبدا سەپێندرابێت، هەروەها دەڵێن نووسینی عەرەبی لە (ئەنبار)ەوە سەریهەڵداوە و دواتر بەرەو دوورگەی عەرەبی کشاوە نەك لە ئاسمانەوە و لە ڕێگای تابلۆی پارێزراوەوە گەیشتبێتە دەستیان.

**بەشی دووەم:**

**(ناسخ و منسوخ) لە قورئاندا:**

**سەرەتا:**

لە بەشی یەکەمی بابەتەکەدا باسمان لە (لەوحی مەحفوز) کرد و ئێستاش دێینەسەر (ناسخ و منسوخ)، تاکو لە پاراداۆکسی نێوان ئەو دوو دیاردەیە تێبگەین. (ئیبن البارزی) لە لا[۱]ی کتێبەکەیدا بەناوی (ناسخ القران العزیز و منسوخه)ەوە دەڵێت: "بابەتی (ناسخ و منسوخ) لە قورئاندا بەیەکێك لە هەستیارترین بابەتەکان هەژماردەکرێت، بۆیە دەبێت هەموو موسڵمانێك ئاگاداریبێت و لێیتێبگات، تاکو بتوانێت بەرەو رووی بێباوەڕان و رۆژهەلاتناسان بووەستێتەوە و لەو رێگەیەوە بەرگری لەقورئان بکات". لەهەمان بڕگەدا (ئیبن البارزی) جەخت لەوەیش دەکاتەوە کە راستی و رەوانیی شرۆڤەی قورئان وابەستەی تێگەیشتنە لە دیاردەی (ناسخ و منسوخ). تێگەیشتن لە (ناسخ و منسوخ) تێگەیشتنە لە رەوایەتیی ئەحکامی قورئان. (ناسخ و منسوخ)ە پێماندەڵێت چ ئایەتێك کاری پێدەکرێت و چ ئایەتێك کاری پێناکرێت، کامیان لەقورئاندا ماوەتەوە و کامیان لێیدەرهێنراوە و سڕدراوەتەوە، گەر لەقورئانیشدا نەماوە و سڕدراوەتەوە ئایا تاکو ئێستاش کاری پێدەکرێت یان نا. دەشێت مرۆڤێکی موسڵمان پابەندی ئایەتێك بێت لەژێر رۆشنایی ئەو تێگەیشتنەدا حوکمبدات، کە لەوانەیە حوکمەکەی سڕدرابێتەوە یاخود ئایەتێکیتر جێگەی گرتبێتەوە یان خوێندنەوەکەی لەقورئاندا ماوە، بەلام حوکمەکەی نەماوە. کارکردن لەسەر قورئان، جگەلە کارکردن لەسەر حوکمی ئایەتەکان هیچیترنییە. مامەڵەکردن لەگەڵ ئەحکامی قورئان و ئایەتەکانیدا لە دەرەوەی مەعریفەی (ناسخ و منسوخ) هەمیشە سەپرایز (supprise)ی لێدەکەوێتەوە. دیاردەی (داعشیزم) کە لەم یەك دوو ساڵەی رابردوودا وەکو بزووتنەوەیەکی توندڕەوی ئیسلامی سەریهەڵدا و لە حوزەیرانی ۲۰۱٤یشدا بوو بە دیفاکتۆمی سیاسیی کوردستان، بەشێکە لەو سەپرایزە. بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی هیچ دینێك هەندەی دینی ئیسلام، هەم وەکو ئیمان، هەمیش وەکو تێکست نەبووەتە جێگای گفتوگۆ و لێکدانەوەی جیاواز. بۆ تێگەیشتن لەو ئالۆزییە

دەکرێت ئێمە چەند فاکتەرێك دەستنیشانبکەین کە دەشێت فاکتەریتریش هەبن ئێمە دەرکی پێنەکەین:

یەکەم: دەقی قورئانی زۆر بە پەرشوبلاوی هاتووەتەخوارەوە، لە دوو قۆناغی زۆر جیاوازی سیاسی و لە دوو ژینگەی جیاوازدا دابەزیوە، کاتێك دەڵێین دوو ژینگەی جیاواز، راستەوخۆ قسەمان لەسەر ئایاتە مەککی و ئایاتە مەدەنییەکانە.

دووەم: نەبوونی سیستم و یاسایەکی یەکگرتوو بۆ کۆکردنەوە و یاداشتکردنی دینە ئاسمانییەکان و بەتایبەت قورئان، بەڵکو دواتر هەموو لەرێی گێرانەوەی دەماودەم کۆکرایەوە.

سێیەم: دیسان نەبوونی تەفسیرێکی یەکگرتووی یاداشتکراو لەلایەن پەیامبەر خۆیەوە، بەڵکو خەڵکانی دوای خۆی کەوتنە تەفسیر و تەئویلی ئایەتەکان بە ئاراستەی جیاجیا.

ئایەتە (مەککی)ەیەکان بەوەجیادەکرێنەوە، لەقۆناغەکانی سەرەتا و ئاڵۆزیی بانگەشەی ئیسلامدا دابەزیون و هەموویان ئایەتی ئاشتیخوازی و پێکەوەژیانن و دوورن لە هەرەشەی کوشتنەوە. هەرچی ئایاتە (مەدەنی)ەکانە زۆربەی زۆریان هەرەشەئامێزن، ئایاتی قۆناغی بەهێزی و فراوانکردنی دەسەلاّت و سەپاندنی ئیسلامن. ئەو دوو گروپە لە ئایات دوو دنیای تەئویلی و تەفسیریی جیاوازی دروست خولقاندووە.

تێگەیشتن لە دیاردەی (ناسخ و منسوخ) توانای ئەوەمان پێدەبەخشێت هەموو ئەو ئایەتانە رەتبکەینەوە، ئاشتی، برایەتی و پێکەوەژیانێکیان پێوەدیارە، بەلاّم حوکمەکانیان بەتاڵکراونەتەوە، هەروەها ئەو ئایەتانەش بناسین کە جێگەیان گرتوونەتەوە و حوکمیان پێدەکرێت. بە بۆچوونی نەیارانی ئیسلام هەستیاریی ئەم دیاردەیە لەئاستێکدایە کە دەکرێت لەرێگایەوە پایەکانی ئیسلام هەڵبوەشرێنەوە و دەقەکانی لەکاربخرێن. ئەوان پێیانوایە، مادام ئێمە قسە لەسەر (وەحی) پەیامی خوا دەکەین، کەواتە نابێت بیرچوونەوە، پەشیمانبوونەوە، هەروەها سرینەوە و جێگرتنەوەی تێدا بێت. (ناسخ و منسوخ) لۆژیکی رەهایەتی مەعریفەی خوا رەتدەکاتەوە و بەدرۆی دەخاتەوە. لە پێوەست

بە لەوحی مەفوزەوە (تەبەری) دەڵێت: "الكتاب كتابان كتاب منهما يمحوا الله منه ما يشاء ويثبت والكتاب الثاني هو أم الكتاب". واتە :"کتێب لای خوا دوو کتێبە، یەکێکیان خوا هەرچییەکی بوێت تێیدادەیسڕێتەوە و لێیدەنووسێت، کتێبەکەیتریش دایکی هەموو کتێبەکانە". یەکێکیتر لە کێشە هەرە سەرەکییەکانی ئەم دیاردەیە، پێکدادانێتی لەگەڵ ئایەتی ٨٢ی سورەتی (النساء)دا، کە دەڵێت :"... لو كان من غير عند الله لوجدوا فية اختَّلافا كثيرا ". واتە: "گەر قورئان لەخواوە نەبوایە، بەڵکو لە هەرچ شتێکی ترەوە بوایە، ئەوا جیاوازی تێدادەبوو".

زانایان و دامودەزگا ئیسلامییەکان لە رابردوودا نوکوڵییان لە دیاردەی (ناسخ و مەنسوخ) کردووە، بەلاّم لە سەرەتای سەدەی بیستویەکدا لەژێر فشاری نەیارانیان و زانا مەسیحی، یەهودی و بێلایەنەکاندا چوونەتە ژێرباری و لە [*](شبهات)ەکاندا باسیان لێوەکردووە و بیانووی فیقهییان بۆهێناوەتەوە.

وشەی (نسخ) لە زمانی عەرەبیدا فرەمانایە، لە لایەك بەمانای "لابردن، سڕینەوە یاخود نەهێشتن"ی شتێك و جێگرتنەوە بەشتێکیتر دێت و لە لایەکیتریشەوە بەمانای "دەقلەبەرگرتنەوە" دێت. لەمەی دووەمدا مەبەست لەوەیە دەقاودەق و پیت بەپیت، کتێبێك یاخود نووسراوێك وەکو خۆی دووبارە بکەیتەوە. لە فەرهەنگی مەعجەمی عەرەبی (قاموس المعجم العربی)دا هاتووە: "نسخه به كمنعه ينسخه وانتسخه: ازاله به واداله واشيء ينسخ الشيء نسخا اي يزيله ويكون مكانه". واتە "لای برد، لایدەبات و شتێکیتری لە جێگەی دادەنێت" لەهەمانشوێندا دەڵێت: "والعرُب تقول: نسخت الشمس الظل وانتسخته: ازالته والمعنى اذهبت الظل وحلت محله وهو مجاز. ونسخت الريح اثار الديار: غيرتها". واتە: "عەرەب دەڵێت: خۆرەکە جێگەی سێبەرەکەی گرتەوە، واتە، سێبەرەکە رۆیشت و هەتاوەکە جێگای گرتەوە. باکە (رەشەباکە) شوێنماڵەکەی لەناوبرد: گۆڕی". تەفسیری ئەم فەرهەنگە بۆ بەکارهێنانی وشەی (نسخ) لەقورئاندا بەمشێوەیەیە: "وَنسخ الاية بالاية: ازالة حكمها.. والنسخ: نقل الشيء من مكان الى مكان وهو هو. ونسخه: غيره"، واتە: "جێگرتنەوەی ئایەتێك بە ئایەتێکیتر: نەهێشتنی حوکمەکەی.

(نسخ): گواستنەوەی شتێکە لەجێگایەکەوە بۆ جێگایەکیتر. بەمانای ئەوەدێت: گۆڕی". لەجێگایەکیتردا هەمان فەرهەنگی عەرەبی دەڵێت: "وقال الفراء: المسخ ان تعمل بالاية ثم تنزل اية اخرى فتعمل بها وتترك الاولى. وفي التنزيل: "ما ننسخ من اية او ننسها نات بخير منها او مثلها" والاية الثانية ناسخة والاولى منسوخة. وقال ابن الاعرابي: النسخ تبديل الشىء من الشىء وهو غيره. والشىء من الشىء وهو غيره". واتە: "(فەڕاء) گوتوویەتی: (نسخ) ئەوەیە کار بە شتێك بکەیت، ئینجا لایبەریت و جێگای بەشتێکیتر بگریتەوە و دواتر کار بە شتە تازەکە بکەیت. ئیبن ئەعرابی گوتوویەتی: (نسخ) گۆڕینەوەی شتێکە بەشتێکیتر".

گەر سەیری (المعجم الوسيط لمجمع اللغة العربية بالقاهرة لا ٩١٧) بکەین، دەڵێت: "نسخ الشيء أي أزالة، ويقال نسخ الله الاية: أي أزال حكمها، وفي التنزيل العزيز:ما ننسخ من آية أو ننسها نأت بخير منها أو مثلها. ويقال نسخ الحاكم الحكم أو القانون: أي أبطله". واتە: "نسخی شتێك بەمانای نەهێشتنی دێت. دەگوترێت: خوا ئایەتەکەی نەسخکرد، واتە حوکمی ئایەتەکەی نەهێشت، لە (تنزيل العزيز)دا: ئایەتێك، کە دیسڕینەوە یاخود لەبیرتاندەبەینەوە، ئەوا بەئایەتێکی باشتر و خێردارتر جێگەیدەگرینەوە". هۆکاری دابەزینی ئەو ئایەتە موفەسیران، بە تایبە (قمنی) لەکتێبەیدا بەناوی )(الاسلاميات)ەوە لا٥٦٨، دەیگێڕێتەوە بۆئەوەی جووەکانی مەدینەی ئەو سەردەمە باوەڕیان بە (ناسخ و منسوخ) نەبووە، نکوڵییان لێکردووە و گوتوویانە، نابینن چۆن (محەممەد) فەرماندەداتە هاوڕێکانی و دواتر نەهیلێدەکات و شتیتریان پێدەڵێت. لەبەرانبەردا (مەسیح) گوتوویەتی: "لا تظنوا أني جئت لانقض الناموس أو الانبياء. ما جئت لانقض بل لاكمل، فإني الحق أقول لكم: إلى أن تزول السماء والارض، لا يزول حرف واحد أو نقطة واحدة من الناموس حتى يكون الكل". واتە: "واهەستنەکەن کە من هاتبێتم بۆئەوەی دژایەتیی کۆد و یاساکان و پەیامبەران بکەم، بەڵکو بۆئەوە هاتووم تەواویانبکەم، ڕاستیتان پێبڵێم. تاکو زەوی و ئاسمان کۆتاییاندێت، یەك وشە یەك خاڵ لە یاسا و کۆدەکانی مەسیحییەت کەمناکرێتەوە بۆئەوەی کۆبێت".

(ئیمام نسفی) لە تەفسیری ئایەتی (البقرة)ەدا، بەرگی یەکەم ال١١٢ دا دەڵێت: "النسخ لغة التبديل ، وشريعة بيان انتهاء الحكم الشرعي المطلق الذي تقرر في أوهامنا استمراره بطريق التراخي فكان تبديلا في حقنا بيانا محضا في حق صاحب الشرع ". واتە: "نەسخ زمانی ئاڵوگۆڕە و شەرعییەتی بەیانکردنی حوکمێکی رەوایە، کە لە خەیاڵماندا بڕیاردەدات..". ئەوەی زانایانی ئیسلام و نەیارانی دانیانپێداناوە، زیاتر لە ٣١ سورەتی قورئانی لە کۆی ١١٢کەوتووتەژێر کاریگەریی (ناسخ و منسوخ)ەوە.

## ئەو گرفتانەی دیاردەی (ناسخ و منسوخ) خوڵقاندوویەتی:

دیاردەی (ناسخ و منسوخ) کێشەیەکی گەورەی بۆ زانایانی ئیسلام و دامودەزگانیان دروستکردووە، خاڵێکی لاوازە و هەمیشە دەکەوێتەبەر رەخنەی نەیارانیان. ئەم دیاردەیە لەقورئاندا خۆی هەڵگری دژەکەی خۆیەتی، هەندێك لە ئایەتەکانی ناو قورئان، خۆی دژی (ناسخ و منسوخ) قسەدەکات و لەگەڵیان نایەتەوە. بڕواننە ئایەتی ٣٤ لە سورەتی (الانعام)، دەڵێت: " ولقد كذبت رسل من قبلك فصبروا على ما كذبوا واوذوا حتى اتاهم نصرنا ولا مبدل لكلمات الله ولقد جاءك من نبا المرسلين". لەو دەقە قورئانییەدا ئەوەی بەلای ئێمەوە گرنگە ئەو بەشەیە کە دەڵێت: "ولا مبدل لكلمات الله"، واتە "قسەی خوا گۆڕینی نییە"، هەروەها ئایەتی ٢٧ی سورەتی (الکهف)یش لەبارەی وتەی خواوە دەڵێت: "واتُل ما أوحي اليك من كتاب ربك لا مبدل لكلماته ولن تجد من دونه ملتحدا". دووبارە، بەشی پێوەست تێیدا بە باتەکەی ئێمەوە ئەوەیە، کە دەڵێت: "لا مُبَدِّ لَ لِكلِماتِه "، بە واتای "جێگرەوە بۆ وشەکانی خوا نییە" دێت. ئەو ئایەتانە راستەوخۆ دەمانخاتەبەر دژایەتییەکی توندی تێکستە قورئانییەکە. نەیاران دەپرسن و دەڵێن، چۆن دەبێت خوا خۆی لەئایەتێکدا بڵێت کە قسەکانی قابیل بەگۆڕین و جێگرتنەوە نین و لەئایەتێکیتریشدا بڵێت کەی ئارەزوومانکرد و بەباشمانزانی ئایەتەکانتان بیردەبەینەوە و ئایەتی تازە و باشتریان لەجێگادا دادەبەزێنین. ئەم گرێکوێرەیە ئەرکی سەرشانی زانایانی ئیسلامی قورس و قورسترکردووە و زۆرکات نەیارانیان پێیانوایە دەرچوون لێیمەحالە. چی

چی دەسڕێتەوە؟ لەژێر رۆشنایی شیکاریی فەرهەنگەکانەوە لەسەرەتاکەدا ئاماژەیانپێکرا، وشەی (ناسخ) و (منسوخ) لەگەڵ (محکم) بەمشێوەیە لێکدەدەینەوە: ناسخ... بکەرە، ئەو ئایەتەیە جێگەی ئایەتێکیتری (منسوخ) دەگرێتەوە. منسوخ... ئایەتی سڕاوەیە، ئەو ئایەتە جێگەی گیراوەتەوە. محکم... واتە ئایەتێك نە ناسخە و نە مەنسوخە. زانایانی ئیسلام دانبەوەدادەنێن کە تەنها ئایاتە قورئانییەکانن کە دەتوانن یەکتر (نسخ) بکەنەوە، واتە سوننە ناتوانێت قورئان بسڕێتەوە، چونکو پلەیەك ئاستەکەی نزمترە. ئیمامی شافیعی لە نامەکەیدا دەڵێت: "وأبان الله لهم أنه إنما نسخ ما نسخ من الكتاب بالكتاب، وأن السنة لا ناسخة للكتاب وإنما هي تبع للكتاب بمثل ... انظر: الرسالة ص١٠٦، بتحقيق أحمد شاكر". واتە: "خوا بۆی روونکردووینەتەوە، ئەوەی ئایەت نسخدەکاتەوە ئایەتە سوننە نییە، بەڵکو سوننە دوای ئایەت دەکەوێت.." تەفسیرەکەی (قمنی) کە پێشتر ئاماژەیپێکرا، هاوکات بووە لەگەڵ ئەو گوتەیەی یەهودییە (یەسریب)ییەکان لەدوای کۆچی (محەمەد) بۆ ئەوێ و دوای ئەوەی پەیامبەر ئاراستەی نوێژی لە (قودس)ەوە بەرەو (کەعبە) گۆڕی. ئەو ئاڵوگۆڕ و هەڵگەڕانەوانەش لە ئایەتی ١٠١ی سورەتی (النحل)دا بەمشێوەیە ئاماژەپێیدەکات: "واذا بدلنا اية مكان اية والله اعلم بما ينزل قالوا انما انت مفتر بل اكثرهم لا يعلمون". واتە: "ئەگەر ئایەتێکیش بخەینە جێگای ئایەتێکیتر، ئەوا بۆ ئەوەیە پلە بەپلە شتەکان چۆن حەرامبکەین، خوا خۆی دەزانێت چی دادەبەزێنێت، ئێوە گوتتان تۆ لەخۆتەوە شت دەکەیت و سەرلێشێواویت، بەڵام ئێوە هیچ نازانن و نەفامن". بەپێی شرۆڤەی ئەو ئایەتانەی سەرەوە دەردەکەوێت، دیاردەی (ناسخ و منسوخ) دیاردەیەك بووە، هەر لە رۆژەکانی یەکەمی بڵاوبوونەوەی ئیسلامەوە گرفتی گەورەی بۆ پەیامبەر و قورئانەکەی دروستکردووە، موسڵمانان نەیانتوانیوە باوەڕ بەوەبکەن، وتەیەك هی خوا بێت و لەڕێگای جوبرائیلەوە گەیشتبێتە دەست (محەمەد) قابیل بەوەبووبێت بسڕدرێتەوە و دەقیتری لەجێگا دابنرێت. (محەمەد) چەندینجار ناچارکراوە ئایەتی پاساوهێنانەوە بۆ رەوایەتیدان بە دیاردەی (ناسخ و منسوخ) بهێنێتەوە، هەرئەوەش هۆکاری سەرەکیی دابەزینی ئایەتی ٣٩ی سورەتی (الرعد) بووە کە تێیدادەڵێت: " يمحوا الله ما يشاء

ويثبت وعنده ام الكتاب". واتە:"ئەوەی خوا پێیخۆشبێت دەیسڕێتەوە".

## سەرەتای سەرهەڵدانی دیاردەی (ناسخ و منسوخ) لە سەردەمی پەیامبەر و هاوەڵەکانیدا بوو:

بۆئەوەی لە سەرەتاکانی سەرهەڵدانی دیاردەی (ناسخ)و (منسوخ) لە سەردەمی پەیامبەری ئیسلام خۆی و خەلیفەکاندا تێبگەین، پێویستمان بەوەدەبێت وتەی هەندێك لە هاوەڵ و خەلیفەکانی ئەو سەردەمە بۆ خوێنەر بهێنینەوە. (ئیمام ئەبو جەعفەری نوحاس) لە کتێبی (الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم)ەکەیدا، لا٥ لە بڕگەی (باب: الترغيب فى تعلم الناسخ والمنسوخ)دا هاتووە دەڵێت: " لەڕێگای زنجیرەیەك لە هاوەڵەکان و شێخەکانی ئەو سەردەمەوە و لەسەر زاری (ئەبی ئەلبەحتەری)ەوە گوتوویەتی: (عەلی کوڕی ئەبی تالیب) دەچێتە مزگەوتێکەوە، دەبینێت پیاوێك قسە بۆ خەڵك دەکات و خەڵکەکە لە عەزاب و تۆلەکانی خوا ئاگاداردەکاتەوە. (ئیمامی عەلی)ش لەو لاوە دەپرسێت: ئەمە کێیە، ئادەی بۆم بانگبکەن با بیناسم. کاتێك پیاوەکە دێتە لای، (عەلی) لێیدەپرسێت: تۆ (ناسخ) و (منسوخ) دەزانیت، ئەویش لەوەڵامدا دەڵێت: نەخێر. (ئیمام عەلی) پێیدەڵێت: دەبڕۆ لێرە زکیر مەکە و قسەمەکە."

(تەبەری) لە لا٣٣٨ی کتێبی (تاريخ الرسل والملوك)دا، بەرگی دووەم، باس لەوەدەکات (محەممەد) لە سەرەتای بانگەشەی پێغەمبەرایەتییەکەیدا تووشی شکستێکی گەورەبووە. قوڕەیشییەکان لێیتەکیونەتەوە، گاڵتەیان پێکردووە و هەوڵی ئەشکەنجەیشیان داوە. زانایانی ئیسلام هەموویان لەسەرئەوە کۆکن کە کرۆکی ناکۆکییەکانی نێوان بانگەشەکەی (محەممەد) و قورەیشییەکان پەیوەندی بە پەرستنی سێ بتە گەورەکەی (لات، عوزا و مەنات)ی ناو مەککەوە هەبووە. بەپێی هەموو بەڵگە مێژوویی و ئارکۆلۆژییەکان ئەو بتانە بڕبڕەی پشتی بژێوی گەورەپیاوان و دەولەمەندەکانی قورەیش بوون. حاجی لە باکوور و باشوور، ڕۆژهەاڵت و ڕۆژئاواوە roویان لە مەککە کردووە و نوێژیان بۆئەو بتانە کردووە، کە بەگەورەترین بتەکانی ئەو سەردەمە ژمێردراون. (محەممەد)یش بۆ سەپاندنی

ئیسلام دەبوو دژی ئەو نەریتانە بوەستێتەوە کە تێیدا تووشی بەربەستییەکی توند بووەتەوە. ئەو هۆکارانە وایانلێکردووە، خەفەت بخوات، بێهیواییەك لەدڵیدا دروستببێت و ئاواتی خواستووە خوا ئایەتێك دابەزێنێت کە خۆی و نەتەوەی قورەیش لێکنزیکبکاتەوە. هەر لەو بڕگەیەدا ئاماژە بەوەشدەکات کە (محەممەد) نەتەوەکەی خۆیی خۆشویستووە و حەزینەکردووە لێیدوور و زویربن. لەدوای ئەو دوعا و پاڕانەوەیە خوا ئەم ئایەتەی لە سورەتی (الاسراء) بۆ دابەزاندووە: " والنجم اذا هوى، ما ضل صاحبكم وما غوى.. افرايتم اللات والعزى، ومناة الثالثة الاخرى..". دەقی ئایەتەکە بەم مانایە دێت: "سوێند بەو ئەستێرانەی، گەر بکەونەخوارە، هاوەڵەکەتان (محەممەد) وێڵ و سەرگەردان نییە.. ئایا ئێوە (لات) و (عوزا) و سێیەمەکەیان (مەنات)تان بینیوە..". (فخر الرازی) لە بەرگی چوارەمی تەفسیرەکەیدا، لا٢٤٤ لەپێوەست بەم ئایەتەوە، بەهەمانشێوەی تەبەری بەمشێوەیە جەخت لە هۆکاری دابەزینی ئەو ئایەتەدەکاتەوە: "أن رسول َالله لما رأى إعراض قومه عنه، شّق عليه ما رأى من مباعدتهم عما جاء به، فتمّ بشيء ما يقارب بينه وبينهم لحرصه على إيمانهم. فجلس ذات مرة في ناد من أندية قريش، وجلس معه كثيرون من أبناء قريش، وأحب يومئذ الا يأتيه من ّالله شيء ينفر منه، وتمنى ذلك فأنزل تعالى سورة النجم..". واتە: "پەیامبەری خوا کاتێك بینی، نەتەوەکەی دژی دەوەستنەوە غەمباربوو، خەفەتی خوارد و ئاواتی خواست خوا لەڕێگای ئایەتێکەوە یارمەتیبدات، نێوان خۆی نەتەوەکەی چاکبکاتەوە..".

بەهەمانشێوە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: "أنها مكية لما روى ابن مسعود أنه قال: هي أول سورة أعلنها رسول الله صلى الله عليه وسلم بمكة. وفي "البخاري" عن ابن عباس: أن النيي صلى الله عليه وسلم (سجد بالنجم، وسجد معه المسلمون والمشركون والجن والانس) وعن عبدالله أن النبى صلى الله عليه وسلم قرأ سورة النجم فسجد لها، فما بقي أحد من القوم الا سجد، فأخذ رجل من القوم كفا من حصباء أو تراب فرفعه إلى وجهه وقال: يكفيني هذا". واتە: " سورەتەکە مەککییە، بەو مانایەی لە سەرەتای بانگەشەکەی (محەممەد)دا لە مەککە دابەزیوە. (ئیبن مەسعود) گێڕاویەتییەوە گوتوویەتی: ئەوە یەکەم

سورەتە پێغەمبەر لای خەڵکی مەککە ئاشکرایکردبێت. لە (البخاری)دا هاتووە، لە زمانی (کوڕی عەباس)ەوە: (محەممەد) کوڕنووشی بۆ ئەستێرەکان بردووە، لەگەڵیدا موسڵمانان، موشریکەکان، هەروەها جنۆکەکانیش کوڕنووشیان بردووە". (تەبەری) لەوێدایە باس لەوەدەکات کە گوایە، (محەممەد) دوای ئەوەی ئەو قسانەی تەواوکردووە شەیتان چووەتەسەر زمانی و ئەم ئایەتەی خوارەوەی پێدەربڕیوە: "تلك الغرانيق العلى وإن شفاعتهن لترتجى". واتە: "ئەو سێ بتە بەرزە شەفاعەتیان ڕەوایە". وشەی (الغرانیق) کۆی (غرنق)ە، (غرنق)، ئەوجۆرە باڵندە ڕەنگسپییەیە کە بەزۆری بەسەر دەریاکاندا و لەبەرزاییەکی زۆرەوە دەفڕێت. ناوی ئەو سێ بتە و ئاستی پیرۆزیی و بەرزییان بەو باڵندانە وەسفکراوە. گێڕانەوەکان کە لە (صحیح)یشدا هاتووە دەڵێت ئەم ئایەتە گەورەترین خاڵی وەرچەرخانی مێژووی ژیانی بانگەشەی (محەممەد) بوو لەو سەردەمەدا. دەنگێکی زۆری داوەتەوە و تێیدا قورەیشییەکان لە (محەممەد) ڕازیبوون و قەبوولیانکردووە. لەوێدا قورەیشییەکان ڕاستەوخۆ گوتوویانە، ڕاستە خوا مردن و ژیانی بەدەستە، هەر ئەویشە رزقماندەدات، بەڵام گەر ئەوە چارەنووسی تۆی تێبکەوێت، ئەوا شەفاعەتت بۆ ئێمە کردووە، کەواتە ئێمەش لەگەڵت دەبین. ئەوەی شایانی باسە، ئەم چیرۆکە لە ئەدەبییاتی ئیسلامیدا بە (قصة غرانيق العلى)، واتە (چیرۆکی بتە پایەبەرز و بڵندەکان) ناسراوە.

لێرەدا جێگای خۆیەتی برێك سەرنجی خوێنەر بۆ لای یەکێك لە ڕووداوە گرنگەکانی ئەو چیرۆکی (قصة غرانيق العلى) ڕابکێشین، بۆئەوەی زیاتر گرنگیی بابەتی (ناسخ و منسوخ)یان بۆ ڕوونببێتەوە. سەرچاوەی ئابووریی دەڤەری (مەککە) لە سەرەتای بانگەشەی ئیسلامدا کە لە دەستی قورەیشییە ناودار و دەوڵەمەندەکاندا بوو بریتیبوولەو دەرامەتەی لە حاجیانی ئەو سێ بتە دەستیاندەکەوت. (مەککە) جێگای سەرەڕێی حاجیان و بازرگانانی نیوان (شام) و (حەبەشە) بووە، خاوەنی هیچ سەروچاوەیەکیتری ئابووری نەبوو. ئەو سێ بتەش گەورەترین و بەناوبانگترین بتی ئەو سەردەمە بوون، خەڵکانێکی زۆر لە شام و شیرازەوە لە وەرزی حەجدا بەرەو مەککە کەوتوونەتەڕێ بۆ بینینی ئەو سێ بتە کە لەژێر دەستی (ئەبی سوفیان) و (هیند)ی ژنیدا بووە. (محەممەد) ئامانجی یەکەمی

لێدان و تێکشکاندنی ئەو پایە ئابوورییە بووە، بەڵام وەکو پێشتر گوتمان (تەبەری) و (ئین کەسیر) هەردووکیان ئاماژەیان بەوەداوە، کە لەسەرەتاوە شکستیخواردووە و تێگەیشتووە کە دەرەقەتی قورەیشییەکان نایەت. تەنانەت لەهەندێك لەگێڕانەوەکاندا هاتوو کە (محەممەد) چەندجارێکیش لەدوای بێهیواییەکی زۆر هەوڵی خۆکوشتنی داوە، سەرچاوەکان ئاماژە بەوەدەکەن رەنگە چوارجار ئەو هەوڵەیدابیت، بەلاّم لەلایەك (وەرقەی کوڕی نوفل)و لە لاکەیتریش جوبرائیل نەیانهێشتووە جێبەجێیبکات. (سەلمان روشدی) نووسەری بەناوبانگی هیندی دانیشتووی (بەریتانیا) کە لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی رابردوودا، رۆمانێکی بەناوی (آيات الشيطانية)ەوە نووسی، تێیدا لە یەك لەکاپیتەلەکانیدا لە شێوەی گێڕانەوەیەکی فەنتاسیدا چیرۆکی (غەرانیق)ی ئەو سەردەمەمان بۆ دەکاتە یەکێك لە رووداوەکانی ئەو رۆمانە. ئەو رووداوە لە دنیای ئیسلامی و ئەورووپیدا بووەهۆی تووڕەبوونی موسڵمانان، راپەڕین و کەوتنە پەلاماردانی قونسوڵخانەکانی بەریتانیا. کار گەیشتە ئەوەی پاداشتی دوو ملیۆن دۆلاری لە لایەن کۆماری ئیسلامیی ئێرانەوە بۆ گرتن و کوشتنی (سەلمان روشدی) تەرخانبکرێت. لە سەرتاسەری دنیادا لەمیانەی ئەو خۆپیێشاندان و پەلاماردانانەدا لە سەروو ٢٥ کەس کوژران. ئەو تووڕەبوونەی موسڵمانان نکوڵیکردن بوو لەڕاستی و دروستیی (آيات الشيطانية)، هەروەها نکوڵیکردن بوو لە دیاردەی (ناسخ و منسوخ).

بەپێی گێڕانەوەکان، لەدوای ئەوەی (محەممەد) ئایەتە شەیتانییەکە تەواودەکات و سوجدە دەبات ژنانی سەماکاری قورەیش راستەوخۆ دەستدەکەن بە هەڵهەلەلێدان، دەیشگێڕنەوە دەڵێن (حەمزە)ی مامی پەیامبەر زۆر لە پەیامبەر تووڕەدەبێت و پێیدەڵێت تۆ حەیات بردووین، بەجۆرێك تووڕەدەبێت گۆچانەکەی دەکێشێت بە بەرپێی (محەممەد)دا خۆڵ و لمێکی زۆر بەدەمووچاویدا دەپرژێت. جگەلەوە لەهەمانکاتدا ژمارەیەکی زۆر لە کەسانی ناوداری تیرەی (نەجاشییەکان) لەکاروانێکدا بەرەو مەککە بەرێوەدەبن، تاکو بچن پاڵپشتیی خۆیان بۆ (محەممەد) پەیامبەری دینی نوێ دەربڕن، بەلاّم کاتێك لەڕێگا هەواڵی ئەو شەفاعەتەی بتەکانیان پێدەگات ئەوانیش پەشیماندەبنەوە و دەگەڕێنەوە بۆ

(حەبەشە). رووداوی (الغرانیق) لەوێدا کۆتاییهاتووە بەلکو دوای هەشت ساڵ (محەممەد) دانیەوەدادەنیت کە ئەوە شەیتان چرپاندوویەتی بەگوێیدا و ئایەتی جوبرائیل نەبووە، خوا گوتەی وای نەدرکاندووە، بڕواننە ئایەتی ژمارە ٥٢ لە سورەتی (الحج)، کە دەڵێت: "وما أرسلنا من قبلك من رسول ولا نبي الا إذا تمنى ألقى الشيطان في أمنيته فينسخ الله ما يلقي الشيطان ثم يحكم الله آياته والله عليم حكيم". دەقی ئەم ئایەتە بەوشێوەیە، خوا راستەوخۆ لەگەڵ پەیامبەر دەدوێت و پێیدەڵێت: "پێش تۆ هیچ پەیامبەرێکمان نەناردووە، ئاواتی گەورەی بۆ نەتەوەکەی خۆی نەخواستبێت، شەیتان زەفەری پێنەبردبێت و هیواکەی بە هەڵە نەچرپاندبێت بەگوێیدا، خواش ئەو ئایەتانە دەسڕێتەوە، خوا خۆی دانا و زانایە". (قورتوبی) بەمشێوە تەفسیری ئەو ئایەتەمان بۆ دەکات: "والجهة الاخرى التي فيها الاشكال وهي الاحاديث المروية في نزول هذه الاية،.. روى الليث عن يونس عن الزهري عن أبي بكر بن عبدالرحمن بن الحارث بن هشام قال: قرأ رسول الله صلى الله عليه وسلم "والنجم إذا هوى" فلما بلغ " أفرأيتم اللات والعزى، ومناة الثالثة الاخرى" سها فقال: "إن شفاعتهم ترتجى" فلقيه المشركون والذين في قلوبهم مرض فسلموا عليه وفرحوا، فقال "إن ذلك من الشيطان" فأنزل الله تعالى"وما أرسلنا من قبلك من رسول ولا نبي" الاية. قال النحاس: وهذا حديث منقطع وفيه هذا الامر العظيم. وكذا حديث قتادة وزاد فيه "وإنهن لهن الغرانيق العلى" ". لەم تەفسیرەدا (قورتوبی) دەڵێت: "لەسەر زاری چەند هاوەڵێکی پەیامبەرەوە، کە لە (حارسی کوڕی هیشام)یان بیستووە: پەیامبەر ئەم ئایەتەی خوێندووەتەوە: والنجم إذا هوى - سوێند بەو ئەستێرانەی، گەر بکەونەخوارەوە. دواتر، کە دەگاتە "أفرأيتم اللات والعزى. ومناة الثالثة الاخرى - لات و عوزا و سێیەمیشیان مەناتتان نەبینیوە، ئینجا گوتی: شەفاعەتکردنیان رەوایە. ئینجا بێباوەڕەکان و دەروونەخۆشەکان دڵخۆشبوون: ئەوەبوو دواتر گوتی: ئەوە لەشەیتانەوە بوو. ئینجا خوا ئایەتی "وما أرسلنا من قبلك من رسول ولا نبي" ی دابەزاند تاکو بیسەلمێنیت کە بەتەنها پەیامبەری ئیسلام نییە شەیتان چرپاندوویەتی بەگوێیدا.

(بەغەوی) هۆكاری دابەزینی ئایەتی٥٢ی سورەتی (الحج) بەمشێوەیە لێكدەداتەوە: "أخبرنا أبو بكر الحارثي قال: أخبرنا أبو بكر بن حيان قال: أخبرنا أبو يحيى الرازي قال: أخبرنا سهل العسكري قال: أخبرنا يحيى عن عثمان بن الاسود عن سعيد بن جبير قال: قرأ رسول الله ( اَفرَاَيتُم اللات وَالعُزّى وَ مناَت الثالِثُة الأُخرى) فألقى الشيطان على لسانه تلك الغرانيق العلى وشفاعتهن ترتجى ففرح بذلك المشركون وقالوا: قد ذكر آلهتنا فجاء جبريل عليه السلام إلى رسول الله وقال: اعرض علي كلام الله فلما عرض عليه فقال: أما هذا فلم آتك به هذا من الشيطان فأنزل الله تعالى (وما أرسَلنا مِن قَبلِك مِن )". واتە: "لە زمانی زنجیرەیەك لە هاوەڵەكانی (محەممەد)ەوە، گوێیانلێبووە (سەعید كوڕی جەبر) گوتوویەتی: پەیامبەری خوا گوتی: (افرايتم اللات والعزى ومنات الثالثة الاخرى) ئەو سێ بتەتان بینیوە، شەیتانیش دەچێتەسەر زمانی و دەبێت بە (ئەو غەرانیقە بەرز و پیرۆزانە شەفاعەتیان رەوایە، ئینجا بێباوەڕان دڵخۆشدەبن و دەڵێن: ئەوە ناوی خواوەندەكەمان دەبات. دواتر (جوبرائیل) دیت و دەڵێت قسەكانی خوات بۆ دەكەم و دەڵێت: ئەوە شەیتان پێیكردوویت، ئێستا خوا ئەمەی بۆ دابەزاندوویت (وما ارسلنا من قبلك من)".

لەڕێگای ئەو شرۆڤەكارییانەی سەرەوە ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە كە سەرەتای سڕینەوەی ئایەت و جێگرتنەوەی بە ئایەتێتر لەكوێوە دەستیپێكردووە و هۆكارەكەی چیبووە. سەرجەم شرۆڤەكارانی ئیسلام و بێلایەنەكان لەسەر ئەوە كۆكن كە قۆناغی مەككی قۆناغی (compromise) كردن، واتە جۆرێك لەسازشكردن بووە بۆ دینی ئیسلام. لەو قۆناغەدا لەبەرئەوەی ژمارەی دواكەوتووانی هێشتا كەمبووە، هێزی سەربازی و بودجەی خۆیانیان نەبووە و لەژێر هەڕەشەی لەناوچوونیشدا بوون پەیامبەر بەوپێیە هەڵسوكەوتی كردووە. لەمبارەیەوە بڕواننە تەفسیرەكەی ئیمام (جەلالەدین سەیوتی) لە كتێبی (الاتقان في علوم القرآن) لە بەرگی٣ لا٥٧دا دەڵێت: "صدر "الامر بالقتال عندما قوي المسلمون، أما في حال الضعف يكون الحكم وجوب الصبر على الاذى". واتە:"موسڵمانانا لە بارودۆخی بەهێزییاندا فەرمانی كوشتاریان دەركردووە، بەڵام لە بارودۆخی لاوازییاندا خۆڕاگری و سەبریان بەپێویست زانیوە". بۆ دڵنیابوون لەقۆناغی

ئارامی، ئاشتی و پێکەوەژیان، لەقۆناغی لاوازی و نەبوونی هێز بڕواننە هەندێك لەو ئایەتە ئاشتیئامێزانەی خوارەوە کە لە مەککە دابەزیون و نەرمی و نیانییان پێوەدیاربووە بریتینلە:

١. ئایەتی ٦ ی سورەتی (الکافر)، دەڵیت: "لکم دینکم و لی دین"، واتە: "ئێوە دینی خۆتان منیش دینی خۆم".

٢. ئایەتی ٢٥٦ لە سورەتی (البقره)، دەڵیت: "لا اکراه فی الدین.."، واتە: "لە دیندا رق و کینە نییە".

٣. ئایەتی ١٣ لە سورەتی (المائده)، لەکۆتاییەکەیدا دەڵێت: "........ فآعفوا واصفح ان الله یحب المحسنین"، واتە: "لێیانببوورن، دەستبخەنە دەستیان، خوا چاکەکاری خۆشدەوێت".

٤. ئایەتی ٢١ لە سورەتی (الانفال)، دەڵیت: "وان جَنحوا لِلّسلم َفاجَنح لها َوَتوّکل َعلَی الله اِنه هو السمیع العلیم"، واتە: "گەر بۆ ئاشتی باوەشیان بۆکردنەوە تۆش باوەشیان بۆبکەرەوە، پشت بەخوا ببەستە خوا گوێبیست و دانایە

٥. ئایەتی ٤٦ لە سورەتی (العنکبوت) دەڵێت: "ولا تجادلوا اهل الکتاب الا بالتي هی احسن الا الذین ظلموا منهم وقولوا امنا بالذي انزل الینا وانزل الیکم واهنا والهکم واح ونحن له مسلمون"، واتە: "بەباشتر نەبێت دەمەقاڵی لەگەڵ ئەهلی کیتاب مەکەن..".

زۆربەی هەرەزۆری موسڵمانان بەرانبەر دیاردەی (ناسخ و منسوخ) هەستیارن، واهەستدەکەن ئیشکردن لەسەر ئەو بابەتە جگەلە هێرشێکی ناڕەوا و بێبنەما، جگەلە کەمکردنەوەی راستگۆیی وتەکانی خوا هیچیترنییە! ئەوان پێیانوانییە ئەو دیاردەیە کێشەیەکی تەئویلییە، بەڵکو بەمەبەستی تێکشکاندنی پیرۆزییەکان نەیارانی ئیسلام دروستیانکردووە. بۆئەم مەبەستە، یەکێك لەقەشە مەسیحییە بەناوبانگەکان و سەرسەختترین نەیاری ئیسلام (زکریا قمص) لەڕێگای پێنج بەڵگەوە کە ئێمە هەوڵدەدەین

لێرەدا ئاماژەیانپێبکەین و بڕێك لێیانوردببینەوە، دەیەوێت ئەو گومڕاییە بڕەوێنێتەوە:

١. لەڕێگای قسەکانی پەیامبەر (محەممەد) خۆیەوە: لەقورئاندا سێ ئایەت ڕاستەوخۆ باس لە دیاردەی (ناسخ و منسوخ) دەکەن، جگەلەوەی لەچەند ئایەتێکیتردا بەناڕاستەوخۆش باسیلێوەدەکات. ئەو ئایەتانەی ڕاستەوخۆ باسیلێوەدەکەن ئەمانەن:

یەکەم: ئایەتی ١٠٦ لە سورەتی (البقرة): "ما ننسخ من اية او ننسها نات بخير منها او مثلها الم تعلم ان الله على كل شىء قدير"، دەقی ئایەتەکە بەم مانایە دێت: "ئەو ئایەتانەی دەیانسڕینەوە و لەبیرتانیدەبەینەوە، ئایەتی باشتر، یاخود ئایەتێکیتری هاوشێوەی خۆیتان بۆدەهێنینەوە، نازانن خوا توانای هەموو شتێکی هەیە".

دووەم: ئایەتی ١٠١ لە سورەتی (النحل): "واذا بدلنا اية مكان اية والله اعلم بما ينزل قالوا انما انت مفتر بل اكثرهم لا يعلمون". دەقی ئایەتەکە بەمشێوەیەیە: "کاتێکیش ئایەتێك دەخەینە جێی ئایەتێکیتر، خوا خۆی دەزانێت چی دادەبەزێنێت و چ فەرمانێکدەدات، ئەوە نەفامانن دەڵێن: تۆ هەر لەخۆتەوە شت هەڵدەبەستیت، بەڵکو ئەوان زۆربەیان نەزانن". (ئیبن کەسیر) بەمشێوەیە ئەم ئایەتە تەفسیردەکات: "هو أصلح لخلقه فيما يبِّدل ويغير من أحكامة، قالوا: إنما أنت مفتر يقول: قال المشركون بالله ، المكذبو رسوله لرسوله: إنما أنت يا محمد مفتر: أي مكذب تخرص بتقول الباطل علىّ الله ، يقولّ الله تعالى بل أكثر هؤلاء القائلين لك يا محمد: إنما أنت مفتر جهال، بأن الذي تأتيهم به من عند ّالله ناسخه ومنسوخه ، لا يعلمون حقيقة صحتة". لەتەفسیرەکەوە دەردەکەوێت، دیاردەی (ناسخ و منسوخ) (محەممەد)ی لەسەر سەرزەنشتکراوە و بەسەرلێشێواو لەقەڵەمیانداوە، خوایش ئەو ئایەتەی بۆئەوە دابەزاندووە موسڵمانان تێبگەینێت کە ئەوە خوا خۆیەتی جێگۆڕکێ بە ئایەتەکان دەکات، دەیانسڕێتەوە و شتی نوێیان لەجێگا دادەبەزێنێت و هەر خۆیشی دەزانێت چیدەکات.

سێیەم: ئایەتی ٣٩ لە سورەتی (الرعد): "يُمحو الله ما يشاء ويثبت وعنده ام الكتاب" (بەغەوی) تەفسیری ئەم ئایەتەمان بۆ دەکات: "فقال سعيد بن جبير ، وقتادة:

يمحو الله ما يشاء من الشرائع ، والفرائض فينسخه ويبدله، ويثبت ما يشاء منها فلا ينسخه"، واتە: "(سەعيد کوڕی جەبر)و (قەتادە) گوتوويانە: خوا بەئارەزووی خۆی لە شەريعەت، فەريزە و ياساکان لا دەبات، دەيانسڕێتەوە و ئەوەی بيەوێت جێگيريياندەکات". لەجێگەيەکيتردا دەڵێت: "وعن عمر ، وابن مسعود - رضي الله عنهما - أنهما قالا يمحو السعادة، والشقاوة أيضا، ويمحو الرزق والاجل ويثبت ما يشاء". ئەوەی لێرەدا (بەغەوی) لە زمانی (عەمر)و (کوڕی مەسعود)ەوە بۆماندەگێڕێتەوە ئەوەيە، خوا تەنها ئايەتەکان ناسڕێتەوە، بەڵکو خوا بەئارەزووی خۆی شادی وخۆشی، نەگبەتی و رسق و چارەنووسيش دەسڕێتەوە.

(جمال الدين الجوزي) لە لا٣٣ی کتێبەکەيدا بەناوی (نواسخ القرآن)ەوە دەڵێت: "أخبرني أبو إمامة.. أن رهطا من أصحاب النبي قد أخبروه أن رجال منهم قام في جوف الليل، يريد أن يفتتح سورة كان قد وعاها، فلم يقدر على شيء منها الا بسم الله الرحمن الرحيم، فأتى إلى النبي في الصباح، ليسأل النبي عن ذلك. وجاء آخرون لنفس الغرض، ثم أذن النبي فسألوه عن السورة، فسكت ساعة لا يرجع إليهم شيئا، ثم قال: نسخت البارحة". واتە: "(ئەبو ئيمامە) پێيگوتووم، کە ژمارەيەك لە هاوەڵەکانی پەيامبەر پێيانگوتووە، پياوێکيان لە نيوەی شەودا هەڵستاوە، ويستوويەتی سورەتێك بخوێنێتەوە کە لەبەريبووە، بەڵام جگەلە (بسم الله)کەی نەبێت نەيتوانيوە هيچ يەك لە ئايەتەکانی بڵێت. ئينجا لەبەيانييەکەيدا چووەتە لای پەيامبەر، تاکو لەوبارەيەوە پرسياری لێبکات، هەندێکيتريش لەبەر هەمان هۆ لەوکاتەدا لەوێبوون. کاتێك پرسياريان لە پەيامبەر کردووە، پەيامبەر تاکو کاتژمێرێك بێوەڵامبووە، دواتر گوتوويەتی: ئەوە دوێنێ سڕدراوەتەوە". لێرەوە دەردەکەوێت کە پەيامبەر راستەوخۆ خۆی قسەی لەسەر سڕينەوەی ئاياتە قورئانييەکان کردووە. (جوزی) لەهەمان کتێبدا، لە تيراژە ئەلەکترۆنييەکەيدا، لا٩٩ دەڵێت: "(دارقگنی کە عەلی کوڕی عومەرە) گێڕاويەتييەوە لە لێدوانەکەی (جابری کوڕی عەبدوڵڵا)ەوە، گوتی، پەيامبەر گوتوويەتی: قسەکانی من قورئان نسخناکاتەوە، بەڵکو قورئان خۆی هەندێکی يەکتر نەسخدەکەنەوە".

٢. لەڕێگای قسەکردن لەسەر چارەنووسی سورەتی (الاحزاب)ەوە: (جوزی) بەهەمانشێوە لە لا٣٣ی کتێبەکەیدا دەڵێت: " عن شريك ابن عاصم عن (زر)، قال لي أُبيّ بن أبي كعب: كيف تقرأ سورة الأحزاب؟ قلت: ثلاثة وسبعين آية، قال والذي أحلف به، لقد نزلت على محمد وأنها تعادل سورة البقرة أو تزيد عليها". واتە: "لە (شەریکی کوڕی عاسم/ زر) ەوە، (ئەبیو ئیبن ئەبی) پێیگوتم" چۆن سورەتی (الاحزاب) دەخوێنیتەوە؟ منیش پێم گووت" حەفتاوسێ ئایەت، ئەوەی، کە سوێندی پێدەخۆم، کاتێك بۆ (محەممەد) دابەزیوە هەندەی سورەتی (البقرە) بووە یاخود زیاتربووە، سورەتی (البقرە) لە ٢٨٦ ئایەت پێکهاتووە". لەو شیکارییەی سەرەوە و لەڕێگای قسەی زۆرینەی زانایانی بوواری (ناسخ و منسوخ)ەوە ئایەتی (الاحزاب) نزيك بە ٢١٣ ئایەتی لێنەسخکراوەتەوە. پرسیارێك لەوێدا نەیارانی ئیسلام دەیکەن ئەوەیە، هۆکاری لابردنی ئەو هەموو ئایەتە چییە کە سەرچاوەکەی (لوح المحفوظ)ە! هەر لەمبارەیەوە گێڕانەوەیەکیتر لە کتێبی (الاتقان في القرآن ج٢) لا٢٦دا لەسەر (عائیشە)ی ژنی پەیامبەرەوە هەیە، دەڵێت: "عن عروة بن الزبير عن عائشة قالت: كانت سورة الاحزاب تقرأ في زمن النبي مائتي آية فلما كتب عثمان المصاحف لم نقدر منها الا ما هو الان". واتە: "لە (عەروە کوڕی زبیر)ەوە، لە (عائیشە)ی بیستووە، گوتوویەتی" سورەتی )الاحزاب) لە سەردەمی پەیامبەردا دووسەد ئایەت بوو، بەڵام کاتێك (عوسمان) قورئانی کۆکردەوە و نووسیوە، جگەلەوەی ئێستا لەبەردەستدایە هیچیتری نەماوەتەوە". موسنەفەکەی (عبدوالرزاق)یش بەمشێوەیەی خوارەوە باس لە ژمارەی ئایەتەکانی سورەتی )الاحزاب) دەکات: "عبد الرزاق عن الثوري، عن عاصم بن أبي النجود، عن زر بن حبيش قال : قال لي أبي بن كعب " كأين تقرءون سورة الاحزاب؟ " قال: قلت : إما ثلاثا وسبعين ، وإما أربعا وسبعين . قال : "أقط؟ إن كانت لتقارب سورة البقرة، أو لهي أطول منها، وإن كانت فيها آية الرجم". قال: قلت : أبا المنذر وما آية الرجم؟ قال: إذا زنيا الشيخ والشيخة، فارجموهما ألبتة نكالا من الله والله عزيز حكيم . "قال الثوري: وبلغنا أن ناسا من أصحاب النبي صلى الله عليه وسلم كانوا يقرءون القرآن أصيبوا يوم مسيلمة فذهبت حروف من القرآن". واتە: "لە (عەبدولڕەزاق) کە لە (سوری)

بیستووە، ئەویش لە (عاسم ی کوڕی ئەبی نجود)ەوە گوێیلێبووە، گوتی: (کوڕی کەعب) پێیگوتم: ئێوە سورەتی (ئەحزاب) بە چەند ئایەت دەخوێندنەوە؟ ئەویش گوتی: یان حەفتا و سێ یاخود حەفتا و چوار. گوتی: هەرگیز؟ هەندی سورەتی (البقرە) بوو، وابزانم درێژتریشبوو، تەنانەت ئایەتی (ڕەجم)یشی تێدابووبێت. (سوری) گوتی: (باوکی مونزیر) ئایەتی (ڕەجم) چییە؟ ئەویش گوتی: گەر ژن و پیاوێك زینایانکرد، بەردبارانیانبکەن خوا ڕەهایەتی و ڕەوایەتیداوە". لەو شرۆڤانەی سەرەوە بۆمانڕووندەبێتەوە، کە سورەتی (الاحزاب) کە زۆربەی هەرەزۆری ئایەتەکانی لە مەککە دابەزیوە تووشی شالاوێکی سڕینەوەی قورسبووە. سڕینەوە و جێگرتنەوەی بەئایەتیتر سنووری هەموو سورەتەکانیتری بەزاندووە، بووەتە جێگای گفتوگۆی هاوەڵانی نزیك پەیامبەریش.

٣. لە ڕێگای دانپێدانانەکانی (عومەری کوڕی خەتاب)ەوە:

(سەیوتی) لەکتێبەکەیدا لەبارەی (عومەری کوڕی خەتاب) و لێدوانی لە (ناسخ و منسوخ) ەوە دەڵێت: "لا يقولن أحدكم: قد أخذت القرآن كله، وما أدراك ما كله، لقد ذهب منه قرآن كثير، ولكن ليقل أخذت منه ما ظهر". واتە : "کەس نەڵێت کە قورئانی هەموو لەبەرە و دەیزانێت، ئایا دەزانێت (هەموو) مانای چییە کە لەوانەیە زۆری لەکیسچووبێت، بەلاّم دەتوانێت بڵێت ئەوەم لەبەرە کە بەدەرەوەیە و زانراوە". (عومەری کوڕی خەتاب) یەکێکە لەو کەسایەتییانە کە لە سەردەمەکەی خۆیدا بەجیاواز (فاروق) ناسرابوو، کاریگەریی زۆری لەسەر (محەممەد) هەبووە، ڕۆڵی هەبووە لە نەسخ و دابەزینی بڕێکی زۆر لە ئایاتە قورئانییەکاندا. زانایانی لاهوتی پێیانوایە، گەر کەسێك هەبووبێت (محەممەد) لێیترسابێت ئەوە (عومەری کوڕی خەتاب) بووە. لێرەدا لە وتەکانی (عومەر)ەوە دەردەکەوێت، کە قورئان زۆر لەوە زیاتری لێسڕدراوەتەوە کە خەڵکی زانیویانە.

٤. لەڕێگای تێگەیشتن لە گۆڕینی قورئانەوە لەلایەن (عوسمانی کوڕی عەفان)ەوە:

دووبارە (سەیوتی) لە لا٢٦ی کتێبەکەیدا لەمبارەیەوە دەڵێت: "حدثنا حجاج ابن جريح،

أخبرني أبي حميدة عن حميدة بنت يونس قالت: قرأ علي أبي وهو ابن ثمانين سنة في مصحف عائشة: إن الله وملائكته يصلون على النبي، يا أيها الذين آمنوا صلوا عليه وسلموا تسليما، وعلى الذين يصلون في الصفوف الاولي، قالت كان ذلك قبل أن يغير عثمان المصحف". دەقی ئەم گوتەیە بەمشێوەیەیە: "(حەجاج کوڕی جەریح) قسەی بۆکردین کە (ئەبی حەمیدە)ی کچی (یونس) گوتوویەتی: (علی) باوکم لە تەمەنی ٨٠ ساڵیدا بوو، لە مەسحەفەکەی (عائیشە)ەوە شتی بۆدەخوێنمەوە و دەیگوت: خوا و فریشتەکان نوێژیان لەسەر پەیامبەر دەکرد، ئەی ئیمانداران نوێژبکەن بۆ پەیامبەر و ئەوانەی لە ریزی پێشەوە لەنوێژدا وەستاون و سەڵاوەتیان لێبدەن، وتیشی ئەمە پێش ئەوەبوو )عوسمان) دەستکاریی قورئانەکە بکات ". لەهەمان بڕگەدا و دووبارە لەسەر عومەر ئەم بڕگەیە باسدەکات: "عن عدي ابن عدي قال عمر لعبد الرحمن ابن عوف: ألَم ْ تجْد ِفيَما أنزَل علَيَناَ: أ ْن َجا ِهُدوا َكَما َجا َهْدتُم اول مرة؟ فإنا لا نجدهاْ، قا َل: اسقطت فيما اسقط من القرآن". واتە: "لە (عودەی کوڕی عودەی)ەوە، (عومەر) بە (عەبدولرەحمان کوڕی عۆف)ی گوتووە، نازانی چیمان بۆ دابەزیوە: دەبێت جیهادبکەن وەکو ئەوەی یەکەمجار کردووتانە، ئێستا بەدیناکەین" نەماوە هەروەکو ئەوانەی لەقورئاندا نەماون". لەم بڕگەیەدا، (سەیوتی) ئاماژە بەوەدەکات کە (عومەر) باس لە ئایەتێك دەکات، نەخوێندنەوە(تلاوة)ی ماوە، نە حوکمی ماوە، بەڵام دەڵێت، کاتی خۆی دابەزیوە.

٥. لەڕێگای بینین و دانپێدانانەکانی (مەسلەمەی کوڕی مخلد)ەوە:

لەمبارەیەوە لەهەمان سەرچاوە و بڕگەدا هاتووە: " عن أبي سفيان الكلاعي أن مسلمة ابن مخلد قال لهم ذات يوم: اخبروني بآيتين من القرآن لم تكتبا في المصحف، فلم يخبروه. وعندهم أبو الكنود سعد ابن مالك، فقال ابن مسلمة: "إن الذين آمنوا وهاجروا وجاهدوا في سبيل الله بأموالهم وأنفسهم، الا أبشروا أنتم المفلحون، والذين آووه ونصروه وجادلوا عنه القوم الذين غضب عليهم، أولئك لا تعلم نفس ما أخفي لهم من قرة أعين جزاءا بما كانوا يعملون". دەقی ئەم گوتەیە بەمشێوەیەیە: "لە (ئەبی سوفیانی کەلاعی)ەوە،

(موسەلەمەی کوڕی مەخلەد) ئەورۆژە پێیگوتوون" دوو ئایەتم پێبلێن کە لەقورئاندا نەنووسرابێتەوە، بەلاّم نەیانتوانیوە بیلێن. لەوکاتەدا (ئەبو کنود سەعد کوڕی مالك) لەوێبوو، ئینجا (ئیبن مەسلەمە): إن الذين آمنوا وهاجروا وجاهدوا في سبيل الله بأموالهم وأنفسهم، الا أبشروا أنتم المفلحون، والذين آووه ونصروه وجادلوا عنه القوم الذين غضب عليهم، أولئك لا تعلم نفس ما أخفي لهم من قرة أعين جزاءا بما كانوا يعملون". لەم بڕگەیەی (سەیوتی)ەوە ئەوەمان بۆدەردەکەوێت کە ئەو ئایەتەی (ئیبن مەسلەمە) خوێندوویەتییەوە لەقورئاندا نەماوە و کاتی خۆشی نەنووسراوەتەوە.

## جۆرەکانی (ناسخ و منسوخ):

سێ جۆری جیاواز لە (ناسخ و منسوخ) لەقورئاندا بەدیدەکریت، بۆئەوەی بتوانین مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین دەبێت هەریەکەیان لەڕیشەوە تێبگەین:

١. سڕینەوەی خوێندنەوەکەی (تلاوة) یاخود تێکستی ئایەتەکە لەقورئاندا، بەلاّم هێشتنەوەی حوکمەکەی (ما نسخ حرفه وبقي حكمه):

ئایەتی (الرجم) (الزاني والزانيه)

(ئەبی نوحاس) لە کتێبی (الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم)دا، ڤێرژەنە ئەلەکترۆنییەکەی، لە لا٦٩دا دەڵێت: " ما قريء على أحمد بن شعيب عن محمد بن المثنى قال حدثنا محمد قال حدثنا شعبة عن قتادة عن يونس بن جبير عن كثير بن الصلت، قال زيد بن ثابت سمعت رسول الله يقول الشيخ والشيخة إذا زنيا فأرجموهما البتة وقريء على أحمد عن قتيبة قال حدثنا أبو عوانة عن سماك بن حرب عن سعيد بن جبير عن ابن عباس قال قال". واتە: "ئەوەی بۆ (ئەحمەدی کوڕی شوعەیب) خوێنراوەتەوە، لەسەر زاری زنجیرەیەك لەهاوەڵانیەوە، لە زمانی (زەیدی کوڕی سابت)ەوە کە راستەوخۆ لە (محەممەد)ی بیستووە گوتوویەتی (گەر ژن و پیاو زینایانکرد بێقەیدوبەند بەردبارانیانبکەن)". (ئیبن حەزم ئەندەلوسی) لە کتێبی (ناسخ و منسوخ فی القرئن الكريم)دا، باس لەجۆرەکانی (ناسخ و منسوخ) دەکات و بەسەر سێ جۆردا دابەشیدەکات. لەوێدا، لە کاپیتاڵی

سێیەمدا، لا٩ کە پێوەستە بە پۆلێنکردنی جۆرەکانیەوە، ئایەتی (الرجم) وەکو جۆری دووەمی (ناسخ و منسوخ) پۆلێندەکات و دەڵێت: "والثاني: نسخ الخط دون الحكم: عن عمر رضي الله عنة قال: كنا نقرأ (الا ترغبوا الرغبة عنهما) بمعني الاعراض عن آباءكم، ومن ذلك: الشيخ والشيخة إذا زنيا فارجموهما البتة نكالا من الله والله عزيز". نەك هەر (ئەندەلوسی)، بەڵكو زۆربەی زۆری شرۆڤەكارانی ئیسلام لەسەر ئەوە كۆكن كە (عومەری كوڕی خەتاب) هەوڵێكی ئێجگار جیددی داوە، تاوەكو ئایەتی (الرجم) دووبارە بخرێتەوەنێو تێكستەكانی قورئان، هەرئەویش بووە زیاتر لەهەموو كەس ویستوویەتی ئەوەبڵێت كە ئەو ئایەتە لەقورئاندا هەبووە و كاریشی پێكراوە. یەكێكیتر لە تیۆرییەكان باس لە لابردنی خوێندنەوەكەی و هێشتنەوە حوكمەكەی دەكات و هۆكەیشی دەگێڕێتەوە بۆئەوەی (محەممەد) لەسەردەمێكدا ئەوەندەی ویستوویەتی لەگەڵ یەهودییەكان جیاوازبێت ئەوەندە ئاگای لە یەكێتی تێكست و ئەحكامەكان و دەقەكانی قورئان نەبووە. دەڵێن یەهوودییەكان لەو سەردەمانەدا و پێشتریش كەلتووری (رجم)كردنیان هەبووە. كاتێك ئەو حاڵەتانەیان لە (مەدینە) بەرچاوكەوتووە لای (محەممەد) گوتوویانە، كە ئەوان (رجم) دەكەن، بەلاّم دواتر لە قۆناغی ناكۆكییەكانیدا لەگەڵ یەهودییەكاندا رایگۆڕیوە، وەكو تێكست لەقورئاندا دەریهێناوە، بەلاّم حوكمەكەی هێشتووەتەوە. لەبارەی دیاردەی دژایەتیكردنی (محەممەد) بۆ یەهودییەكان، هەندێك لە توێژەرەوان باس لە دیاریكردنی رۆژانی هەینی دەكەن كە لەبەرانبەردا یەهودییەكان رۆژانی شەممەیان داناوە كە تێیدا خواپەرستی كاركردنی (نسخ) كردووەتەوە، واتە كاركردنیان تێدا حەرامكردووە و لە بری ئەوە خواپەرستییان حەلاڵ كردووە. جگە لەو نموونەیە، لە زۆر سەرچاوەدا نموونەی گۆڕینی كەعبەش دەهێنرێتەوە، كە لە سەرەتا وەكو یەهودییەكان روویاندەكردە (بیت المقدس) لە (فەلەستین)، بەلاّم دواتر روویان وەرگێڕا رووەو (مەككە)، هەرچەندە ئەم چیرۆكە پەیوەندی بەفاكتەریتریشەوە هەیە، بەلاّم ئەوەش یەكێكە لە فاكتەرەكان. هەندێك لە شرۆڤەكارانی ئیسلامیی سەردەم بەمشێوەیە لەبارەی ئەو ئایەتەوە دەدوێن و دەڵێن : "آية الرجم يعرفها علماء السنة بأنها آية من القرآن نسخ لفظها، وبقي حكمها في القرآن، بينما ينكر ذلك بعض علماء الشيعة.

وقد ورد ذكر هذه الاية التي كانت قبل النسخ ضمن سورة الاحزاب بلفظ هو (الشيخ والشيخة إذا زنيا فارجموهما البتة نكالا من الله والله عزيز حكيم) قرأها الصحابة على عهد رسول الله صلى الله عليه وسلم، ثم رفعها الله مع ما رفع من القرآن، مع بقاء الحكم الذي هو باق وثابت ومؤكد بالسنة والاجماع. وقد روى هذا عدد من الصحابة، ووافقهم الاخرون ولم ينكروا عليهم، وقد وردت شواهد كثيرة عن الصحابة والتابعين والعلماء". ئەو کورتە دەقە ئەوەمان پێدەڵێت کە (شیعە)کان پیادەی ئەو ئایەتە ناکەن، ئەوان زیاتر باوەڕیان بە ئایەتێك هەیە لەقورئاندا وەکو تێکست مابێتەوە. هەندێکیتر لە شرۆڤەکارانی ئیسلام دەڵێن (موسلیم) ئەو ئایەتەی لە (صحیح)ەکەی خۆیدا دەرکێشاوە و باوەڕی پێینەبووە، وایبۆچووە کە تەنها (عومەری کوڕی خەتاب) باوەڕی پێیبووە و ویستوویەتی لەقورئاندا بیهێڵێتەوە. لەلایەکیترەوە (الزیلعی) لە (نصب الراية) دا لە لا ٤٧٣دا دەڵێت: "روى البخاري ومسلم عن ابن عباس أن عمر بن الخطاب خطب فقال: إن الله بعث محمدا صلى الله عليه وسلم بالحق، وأنزل عليه الكتاب فكان فيما أنزل عليه آية الرجم فقرأناها ووعيناها ورجم رسول الله صلى الله عليه وسلم ورجمنا من بعده، وإني حسبت إن طال بالناس الزمان أن يقول قائل ما نجد آية الرجم في كتاب الله، فيضلوا بترك فريضة أنزلها الله فالرجم حق على من زنى من الرجال والنساء إذا كان محصنا إن قامت البينة أو كان حمل أو اعتراف، وأيم الله ! لولا أن يقول الناس زاد عمر في كتاب الله عز وجل لكتبتها".

واتە: "هەردووك (بوخاری) و (موسلیم) لە زاری (ئیبن عەباس)ەوە گوتوویانە" (عومەری کوڕی خەتاب) گوتوویەتی: خوا (محەممەد)ی ناردووە و راستیی تەسلیمکردووە و کتێبی خوای بۆ دابەزاندووە، هەروەکو چۆن ئایەتی (رەجم)یشی دابەزاندبوو، ئەوەبوو خوێندمانەوە و لەبەرمانکرد، پەیامبەر خۆی رەجمیکرد و ئێمەش بەدوایدا و من دەمزانی کە گەر درێژە بکێشێت و کات تێپەڕببێت خەڵکی دەڵێن ئایەتی (رەجم) لەقورئاندا نییە، ئەوسا یەکێك لەو فەریزانەی خوا دایبەزاندبوو تەرکیاندەکرد، (رەجم) حەقێکە بەسەر هەموو ژن و پیاوێکەوە کە زینادەکەن بەو مەرجەی دانیپێدابنێن و بەسەریاندا سەپابێت، سوێند بەخوا، گەر خەڵکی نەیانگوتایە (عومەر) لە کتێبی خوا زیاددەکات دەمنووسییەوە".

ماڵپەڕی (مركز الفتوى) کە بەشێکی گرنگی (ئیسلام ویب)، بە یەکێك لە سەرچاوە گرنگەکانی سەردەم هەژمار دەکرێت. زانایانی ئیسلام و ئەو کەسایەتییانەی کار لەسەر فەتوا دەکەن زۆر کات دەگەڕێنەوە بۆ ئەو ماڵپەرە بۆ جەختکردنەوە لەسەر بڕیارەکانیان. لەو ماڵپەرەدا بەمشێوەیە باس لە ئایەتی رەجمەکات: ".. فقد ثبت في صحيح السنة أن الله سبحانه وتعالى أنزل آية الرجم للزاني الثيب على رسول الله صلى الله عليه وسلم، وكانت قرآنا تتلى فترة في حياة رسول الله صلى الله عليه وسلم حتى نسخ الله لفظها وبقي حكمها، وانظر تفصيل ذلك في الفتوى رقم: ٥١٣٢، ولمزيد من الفائدة راجع أيضا الفتوى رقم: ١٣٩١٩، والفتوى رقم: ١٤٠٥". واتە: "لە سەحیحی سوننەدا جێگیربووە کە خوا ئایەتی (الرجم)ی بۆ پەیامبەر ناردووەتەخوارەوە بۆ بێوەپیاوان و بێوەژنان، بەشێك بوو لە قورئان، تاکو ماوەیەکیش لە سەردەمی پەیامبەر خۆیدا دەخوێندرایەوە ئەوەبوو دواتر خوێندنەوەکەی نەما، بەڵام حوکمەکەی هەرمایەوە..".

لەو تێکست و شرۆڤانەی سەرەوەوە بۆماندەردەکەوێت ئایەتی (رەجم) لە سەردەمی (محەمەد) خۆیدا ئایەتێکی قورئانی ئاکتویەل (actual) بووە، خوێندراوەتەوە و کارپێکراوە، دواتریش، تەنها خوێندنەوەکەی نەسخکراوەتەوە، حوکمەکەی هەرماوەتەوە و کاریشی پێدەکرێت.

یەکێکیتر لەو ئایەتانەی وەکو تێکست لە قورئان دەرهێنراوە، بەڵام حوکمەکەی هەرماوە ئایەتی (رضاعة الکبیر)ە. جێگەی خۆیەتی لێرەدا ئاماژەیەکی کورت بە هۆکارەکانی سەرهەڵدانی بابەتی (رضاعة الکبیر) کە بە مانای (شیردان بەگەورە) دێت لە سەردەمی پەیامبەردا بکەین. لە دوورگەی عەرەبی ژمارەی کۆیلە و خزمەتکار زۆربوون کە بریتیبوونلە مرۆڤی گەورەی شەڕکەری جەنگەکان، زۆربەی زۆریان نێرینەبوون یاخود ئەو کۆیلانەی لە باشووری ئەفریقیاوە لەڕێگای کڕینوفرۆشتنەوە دەگەیشتنە لایان. ئەو کەسانەش لەماڵەکاندا لەنێو خێزانی موسڵمانانندا دەژیان و لە مەحرەماتی ماڵ هەمووی بەهرەمەندبوون. بۆئەوەی موسڵمانان دڵنیابوونایە لەوەی هیچ شتێك لەنێوان ژن و کچەکانیان و کۆیلە و خزمەتکارەکان روونادات دەبوو ژنی ماڵەکە لە مەمکی خۆی

شیربداتە ئەو کۆیلەیە یاخود ئەو خزمەتکارە تاوەکو لەڕێگای ئەو شیرەوە ببوایە بە کەسێکی مەحرەمی خێزانەکە و لەوڕێگایەوە جووتبوونی سێکسی نێوان کچان و ژنانی ئەو ماڵە لەگەڵ کۆیلەکە یاخود خزمەتکارەکەدا حەرامدەبوو.

(أبو عمر يوسف بن عبد الله بن محمد بن عبد البر) لە ل٢٨٦ی لە کتێبی (الاستذكار الجامع لمذاهب فقهاء الامصار)ەکەیدا دەڵێت: "عبد الله بن أبي بكر بن حزم ، عن عمرة بنت عبد الرحمن، عن عائشة زوج النبي - صلى الله عليه وسلم - أنها قالت: كان فيما أنزل من القرآن - عشر رضعات معلومات يحرمن - ثم نسخن بخمس معلومات ص ٢٨٦ فتوفي رسول الله - صلى الله عليه وسلم - وهو فيما يقرأ من القرآن". دەقی ئەم بڕگەیە بەمشێوەیەیە: "لە (عەبدوواللهی کوڕی ئەبوبەکر کوڕی حەزم)ەوە، لە (عومرەی کچی عەبدولڕەحمان)ەوە کە راستەوخۆ زمانی (عائیشە)ی هاوسەری پەیامبەری ئیسلامەوە گوێی لێبووە گوتوویەتی: ئەوەی لەقورئاندا لەبارەی شیردانی گەورەوە دابەزیبوو، بە (١٠)جار شیردان (رضعات)ی زانراو حەرامدەبوو، دواتر پێنجی زانراویان سڕدرایەوە، ئەوەبو ئیتر پەیامبەر مرد". (محەممەد) لە یەکێك لەحەدیسەکانیدا گوتوویەتی: "إن الرضاعة تحرم ما تحرم الولادة". واتە: "شیردان ئەوە حەرامدەکات کە لەدایکبوون حەرامیدەکات". لێرەوە قسەکەی (عائیشە)مان بۆئاشکرادەبێت کە گوتوویەتی لە (١٠) جار شیردان یاخود سنگمژین کە دەبێتەهۆی حەرامکردنی جووتبوونی سێکسی نێوان کەسی شیردەر و شیرخواردوو لەقورئاندا دابەزیوە تەنها پێنجیان ماوەتەوە ئەوانیتر (نسخ) کراوەتەوە. بەواتایەکیتر (٥) جار شیردانەکە، (١٠) جارەکەی (نسخ)کردووەتەوە. لێرەدا (تەحریم) بەمانای بەحەرامبوونی جووتبوون و کاری سێکسی نێوان نێرینە و مێینە دێت.

شیردانی گەورە لە حەدیسەکانی پەیامبەردا چەندجارێك قسەی لەسەرکراوە، لە (شرح النووی)یدا بابی تایبەتی بۆ تەرخانکراوە و بەمشێوەیە باسی لێوەدەکات: "باب رضاعة الكبير.. حدثنا عمرو الناقد وابن أبي عمر قالا حدثنا سفيان بن عيينة عن عبد الرحمن بن القاسم عن أبيه عن عائشة قالت جاءت سهلة بنت سهيل إلى النبي صلى الله عليه وسلم فقالت يا رسول الله إني أرى في وجه أبي حذيفة من دخول سالم وهو حليفه فقال

النبي صلى الله عليه وسلم أرضعيه قالت وكيف أرضعه وهو رجل كبير فتبسم رسول الله صلى الله عليه وسلم وقال قد علمت أنه رجل كبير زاد عمرو في حديثه قوله صلى الله عليه وسلم : أرضعيه، قال القاضي: لعلها حلبته ثم شربه من غير أن يمس ثديها ولا التقت بشرتاهما، وهذا الذي قاله القاضي حسن، ويحتمل أنه عفي عن مسه للحاجة كما خص بالرضاعة مع الكبر، والله أعلم ". (نەوەوی) لەو بەشەدا لە زاری (عائیشە)ەوە بۆماندەگێڕێتەوە کە لە دەمی زنجیرەیەك لە هاوەڵی پەیامبەر و کەسانی دەوروبەریانەوە گوازراوەتەوە و گەیشتووەتە لای (عەمروناقد)، تێیدا (عائیشە) دەڵێت: "(سوهەیلەی کچی سەهیل) هاتووەتە لای پەیامبەر و پێیگوتووە: ئەی پەیامبەری خوا، لە دەموچاوی (ئەبی حەزیفە)دا هاتنەژوورەوەکەی ئاشتی هاوەڵیەتی. پەیامبەریش دەڵێت: شیری بدەرێ. ئەویش پرسیویەتی: ئەو پیاوێکی گەورەیە (لەهەندێك گێڕانەوەدا سوهەیل ئەوەش دەڵێت کە ئەو پیاوێکی گەورەیە و سەروسمێڵی هەیە). پەیامبەریش زەردەخەنەیکردووە و گوتوویەتی: با بشزانیت گەورەیە. (عەمرو) درێژەیدەداتێ و دەڵێت: پەیامبەر گوتوویەتی شیربیدەرێ، قازیش گوتوویەتی: بریا بەوجۆرە بوایە، بیتوانیایە بیدۆشیایە و بیخواردایەتەوە بێئەوەی دەستی بەر سنگی بکەوتایە. ئەمە ئەوەبوو (قازی حەسەن) گوتی. دەشێت لەدەستلێدان بوورابێت تەنها لەبەرخاتری شیردان بەگەورە، خوا خۆی دەزانێت". (صحيح المسلم) لەوبارەیەوە دەڵێت: "وحدثني أبو الطاهر وهارون بن سعيد الايلي واللفظ لهارون قالا حدثنا ابن وةب أخبرني مخرمة بن بكير عن أبيه قال سمعت حميد بن نافع يقول سمعت زينب بنت أبي سلمة تقول سمعت أم سلمة زوج النبي صلى الله عليه وسلم تقول لعائشة والله ما تطيب نفسي أن يراني الغلام قد استغنى عن الرضاعة: فقالت لم قد جاءت سهلة بنت سهيل إلى رسول الله صلى الله عليه وسلم - ص ١٠٨٧ - فقالت يا رسول الله إني لأرى في وجه أبي حذيفة من دخول سالم قالت فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم أرضعيه فقالت إنه ذو لحية فقال أرضعيه يذهب ما في وجه أبي حذيفة فقالت والله ما عرفته في وجه أبي حذيفة".

هەندێك لە زانایانی ئیسلام، بەتایبەت سوننەکان بەهیچ جۆرێك باوەڕیان بە دیاردەی (شیردان بەگەورە) نییە، بۆیە کاتێك باس دەگاتە ئەو ئاستە، راستەوخۆ دەگەڕێنەوە بۆئەو حەدیسانەی، باس لەو تەحریمکردنە دەکات کە تەنها لەکۆرپەییەوە دەبێت. گەر سەیری (سنن)ەکەی (ترمذي) بکەین لە بڕگەی (باب ما جاء ما ذكر أن الرضاعة لا تحرم الا في الصغر دون الحولين)دا و لە حەدیسی ژمارە (١١١١)دا دەڵێت: "حدثنا قتيبة حدثنا أبو عوانة عن هيشام بن عروة عن أبيو عن فاطمة بنت المنذروفاطمة بنت المنذر بن الزبير بن العوام وةي ام أمراة هيشام بن عروة عن أم سلمة قالت قال رسول الله صلى الله عميو وسلم ال يحرم من الرضاعة الا ما فتق الامعاء في الثدي وكان قبل الفطام قال أبو عيسى هذا حديث حسن صحيح والعمل على هذا عند أكثر أهل العلم من أصحاب النبي صلى الله عليه وسلم وغيرهم أن الرضاعة لا تحرم الا ما كان دون الحولين وما كان بعد الحولين الكاملين فإنه لا يحرم شيئا".

دەقی ئەو حەدیسە بەمشێوەیەیە: "(فاتمەی کچی مونزیر) لە (ئوم سەلمە)ی بیستووە، (محەممەد) گوتوویەتی: تەحریم روونادات، تاکو رێخۆلەکان لە شیری مەمك پڕنەبن پێش ئەوەی دەمی لە مەمکەکە دووربخەیتەوە". ئەم حاڵەتەی (ترمزی) باسی لێوەدەکات، حاڵەتێکە تەنها لە منداڵی بەرمەمکدا رووددات. لەدوای ئەو تێکست و شرۆڤانەی سەرەوە بۆماندەردەکەوێت، بابەتی (شیردان بەگەورە)ش وەکو بابەت و دیاردەکانیتر ئەکچووەیل بووە، هەر لە سەردەمی پەیامبەر خۆیەوە لەئارادابوووە، گفتوگۆی لەسەرکراوە و کێشمەکێشمیشی بەدوای خۆیدا هێناوە. شیعەکان بەپێچەوانەوە، ئەوان هەندی سوننەکان هەستیارنین بەرانبەر بە (شیردان بەگەورە)، هەندێك لە زانایانی شیعە دەڵێن، ئەو گیانلەبەرانەی گۆشتیان حەرامە شیرەکانیشیان حەرامە، بەڵام بۆ مرۆڤ وانییە، چونکو مرۆڤ کۆرپەکەی خۆی بە شیر پەروەردەدەکات. هەندێکیتریان راستەوخۆ (شیردانی گەورە)یان حەڵاڵکردووە و پێیانوایە کوڕ و باوك دەکرێت لە یەك سەرچاوەوە شیر وەربگرن و بیخۆنەوە.

٢. سڕینەوەی حوکمەکەی، بەڵام هێشتنەوەی خوێندنەوەکەی لەقورئاندا. (مانسخ حکمه وبقي حرفه أو تلاوته): ئەو ئایەتانەی حوکمەکەی سڕدراوەتەوە، بەڵام خوێندنەوەکەی ماوەتەوە ژمارەیان زۆرن، هەندێك پێیانوایە ١٢٤ ئایەتە و هەندێکیتر پێیانوایە ژمارەیان دەگاتە ١٤٤ ئایەت. (ابراهیم الابیاری) لە کتێبی (تأریخ القرآن)دا بە ١٤٤ ئایەت لەقەڵەمیاندەدات.(الامام الخازن) لە لا٩٤ی بەشی یەکەمی تەفسیرەکەیدا دەڵێت: ان ما نسخ حکمه وبقيت تلاوته کثير في القرآن". واتە: "حوکمەکەی سڕدراوەتەوە و خوێندنەوەکەی ماوەتەوە ژمارەیان زۆرە". هەرچی (سیوطي)یە لەوبارەیەوە دەڵێت: "کل ما في القرآن من الصفح عن الكفار والتولي والاعراض والكف عنهم منسوخ بآية السيف، وهي: إذا انسلخ الاشهر الحرم فاقتلوا المشركين..، وهذه الاية نسخت مائة وأربعة وعشرين ". واتە :"هەموو ئەو ئایەتانەی لەقورئاندا باس لە دەستلەناودەست، پشتگوێخستن و گرنگیپێنەدانی بێباوەڕان دەکات بە ئایەتی )السیف) سڕدرایەوە کە دەڵێت: هەرکە مانگەکانی حەرام تەواوبوو، موشریکەکان بکوژن". لەمبارەیەوە، ئەگەر سەیری کتێبی (الاسلامیات)ەکەی (السید القمنی) بکەین، لە لا٥٨٤دا دەڵێت: "المعلوم أنه عندما ُجمع المصحف زمن (عثمان ابن عفان ـ رضي الله عنه) تم جمع كثير من الايات المنسوخة إلى جوار الايات الناسخة، وهذا هو الواقع الذي فرض إنشاء باب في النسخ بعنوان (ما نسخ حكمه وبقيت تلاوتة) وهو الواقع الذي أدى إلى ظهور كثير من الايات بمظهر التضارب والتناقض". واتە: " ئاشکرایە، کاتێك (عوسمانی کوڕی عەفان) دەستیکرد بەکۆکردنەوەی قورئان، بڕێکی زۆر ئایاتی مەنسوخیشی لەپاڵ ناسخەکاندا لەگەڵدا کۆکرایەوە، ئەوە بووەهۆی سەپاندنی بابێکی تایبەت بە (ناسخ و منسوخ)، هەرئەوەش بووە هۆکاری ناکۆکی و پێکدادان لە دەرکەوتنی ئایەتەکاندا".

لەبەرئەوەی ئایەتی (السیف) ئایەتێکی زۆر گرنگە و زووزوو ناویدەبەین، دەمانەوێت لێرەدا بەکورتی ئەو ئایەتە شرۆڤەبکەین پێش ئەوەی بچینە قووڵایی ئەم بڕگەیەوە. ئایەتی (السیف)، کە ئایەتی ژمارە پێنجە لە سورەتی (التوبة)، بەپێی وتەی نەیارانی ئیسلام خۆیان ئایەتێکی فەرمانییە(امری)یە و حوکمی ١٢٤ ئایەتی ئاشتی و

پێکەوەژیانی رەتکردووەتەوە: "فإذا انسلخ الاشهر الحرم فاقتلوا المشركين حيث وجدتموهم وخذوهم واحصروهم واقعدوا لهم كل مرصد فان تابوا واقاموا الصلاة واتوا الزكاة فخلوا سبيلهم ان الله غفور رحيم". دەقی ئایەتەکە بەم شێوەیە: "هەرچ کاتێك مانگە موحەرەمەکان تێپەڕی بەسەرچوو، گومڕا و موشریکەکان بکوژن لەهەرچ کوێیەك چنگتان لێیانگیربوو، بیانگرن بە دیل، چواردەوریان بتەنن، چاودێرییانبکەن، خۆ ئەگەر تۆبەیان کرد و دەستیانکرد بە نوێژکردن، ئەوا بیانبەخشن، خوا بەخشندە و لێبووردەیە.

با ئێستا برێك وردتر بڕوانینە ئایەتی٢١٧ لە سورەتی (البقرة) کە دەڵێت: "يسالونك عن الشهر الحرام قتال فيه قل قتال فيه كبير وصد عن سبيل الله وكفر به والمسجد الحرام واخراج اهله منه اكبر عند الله والفتنة اكبر من القتل ولا يزالون يقاتلونكم حتى يردوكم عن دينكم ان استطاعوا.." دەقی ئایەتەکە بەمشێوەیەیە: "لە بارەی شەڕ و کوشتارەوە لە مانگەکانی حەرامدا (کە بریتینلە ـ ذوالعقدة ـ ذوالحجة ـ محرم ـ رجب) پرسیارت لێدەکەن. تۆش پێیانبڵێ: جەنگ لەوجۆرە مانگانەدا کارەساتە و هەڵەیەکی گەورەیە، بەرهەڵستیکردنی رێبازی خوا، بێباوەڕی، جەنگ لە مزگەوتی حەرامدا و دەربەدەرکردنی خەڵکەکەی لای خوا زۆر لەوە گەورەترە (لە کوشتنی کەسێك یان چەند کەسێك لە مانگی حەرامدا)، هەروەها ئازاردانی ئیماندار تاوانێکە لە کوشتن گەورەترە، ئەوان بەردەوامن لە شەڕ و کوشتار، بۆیشیانبکرێت واتانلێدەکەن لە دین و ئایینتان پاشگەزببنەوە..". شرۆڤەکارانی ئیسلام هەموویان لەسەر هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە کۆکن و بەمشێوەیەی خوارەوە لێکیدەدەنەوە: "هذه الاية نزلت بسبب خطأ وقع فيه عبد الله بن جحش وأصحابه حينما بعثهم رسول الله صلى الله عليه وسلم إلى نخلة، وهو موضع بين مكة والطائف يتحسسون له أخبار قريش ولم يأمرهم بقتال، الا أنهم لما نزلوا نخلة مرت بهم عير لقريش تحمل زبيبا وادما وتجارة وفيها عمرو بن الحضرمي ومعهً ثلاثة نفر فقتلوا عمرو بن الحضرمي، وأسروا اثنين، وفر الرابع، واستاقوا الاسيرين والعير حتى قدموا المدينة، فلما رآهم رسول الله صلى الله عليه وسلم، أنكر عليهم قائلا: ما أمرتكم بقتال في الشهر الحرام وأوقف العير والاسيرين وأبى أن يأخذ من ذلك شيئاً، ومع هذا بعث المشركون

يعيرون المسلمين بما صنعوا فأنزل الله هذه الاية:يسالونك عن الشهر الحرام قَتا لٍ فيه قُل قتال فيه إلى آخر الاية.. ". (محەممەد) (عەبدوڵلاّ کوڕی جەحش)و هاوەڵەکانی ناردووە بۆ جێگایەك، بەناوی (نەخلە)ەوە کە دەکەوێتە نێوان (مەککە)و (تائیف)ەوە. لەوێ چاوەڕێی کاروانێکی بازرگانیی مەککییەکان بوون، بۆئەوەی لەتێپەڕینیاندا گوێبیستی هەواڵ و دەنگوباسی قورەیشییەکانی (مەککە) بن. کاتێك کاروانەکە دەگات و بارەکەیان لەژێر درەختەکەدا لادەدەن، لەبارەکەدا خواردن و بابەتی جۆراوجۆری تێدایە و لەنێو رەوە بازرگانەکانیشدا (عەمرو کوڕی خەزرەمی)و سێ هاوڕێی تێدادەبێت، بەرەو رووویاندەبنەوە و شەڕ روودەدات، تێیدا (عەمرو)و هاوەڵەکانی دەکوژرێن. بێگومان هەواڵی ئەو رێگەپێگرتن و کوشتارە دەگاتەوە دەمی (مەککی)ەکان، کە دەبێتەهۆی ئەوەی زۆر لە (محەممەد)و دینەکەی تووڕەبن، لەبەرئەوەی لە مانگی حەرامدا کوشتاریانکردووە. (محەممەد) یش ئەو ئایەتەی لەو فۆرمەدا بۆ دێتەخوارەوە بۆئەوەی روونیبکاتەوە کە مەبەستی کوشتارنەبووە. ئایەتەکە درێژەیدەبێت و دەڵێت کە ئازاردان و دەرکردنی موسڵمانەکان لە مزگەوتی حەرام لە کوشتار قورسترە، ئازاردان و دژایەتی خوا و بێباوەڕیی دیسان لە کوشتار قورسترە. ئەو بەشەی ئایەتەکە ئاماژەیەکی رۆشنە بەوەی، راستە مانگی حەرامە، بەلاّم مادام کاتی خۆی ئەو کافر و گومڕایانە موسڵمانەکانیان راوناوە و لەنێو مزگەوتی حەرامدا شەڕیان پێفرۆشتوون و ئازاریانداون، ئەوجۆرە کارانە لای خوا لە کوشتارەکەی (نخلە) قورسترە. هەرچەندە سەرەتای ئایەتەکە واپێشاندەدات دژی کوشتارە، بەلاّم ئەو بەشەیتری کە ئاماژەپێیکرا پشتگیرییەکی ناڕاستەوخۆی کوشتنی کافر و گومڕاکانە لە مانگەکانی حەرامدا. هەندێکیتر لە زانایانی ئیسلام هۆکاری دابەزینی ئەو ئایەتە دەیگێڕنەوە بۆئەوەی کە (محەممەد) مەبەستی بووە رێگە بە کاروانی بازرگانیی (مەککی)ەکان بگیرێت و وەکو دەستکەوتی شەڕ دەستی بەسەردابگیرێت.

٣. سڕینەوەی خوێندنەوەکەی و لابردنی حوکمەکەیشی (ما نسخ حکمه، ونسخ أیضا حرفه أو خطه أو تلاوته):

یەکێك لەو سورەتانەی زۆرترین ژمارەی ئایاتی (منسوخ)ی بەرکەوتووە سورەتی (ئەحزاب)ە. وەك پێشتر لەبارەیەوە دواین، لەسەر زاری (عائیشە) خۆیەوە کە ژمارەی ئایەتەکانی هەندێ سورەتی (البقرە)ە بووە، بەلاَم دواجار تەنها ٧٣ ئایەتی ماوەتەوە. (الجوزی) لە کتێبی (نواسخ القرآن)دا دەڵێت هەموو ئەو ئایەتانە خۆیشیان و حوکمەکانیشیان (نسخ)کراونەتەوە. ئەو چیرۆکەی لە سەرەتای باسەکەوە لێیدواین کە (جمال الدین الجوزی) لە هەمان کتێبی (نواسخ القرآن)دا و لە زاری (ئەبو ئیمامە)ەوە بۆیگێڕاینەوە، دەربارەی ئەو پیاوەی ویستوویەتی ئایەتەکە بخوێنێتەوە، بەلاَم تەنها (بسم الله)ەکەی بیرمابوو، پەیامبەریش پێیگوتووە کە ئەو ئایەتە دوێنێ (نسخ)بووەتەوە. هەموو زانایانی ئیسلامە لەسەر ئەوەکۆکن کە ئەو ئایەتە خۆیشی و حوکمەکەیشی سڕدراوەتەوە.
(ناسخ و منسوخ) لەدینەکانیتردا:

هەندێك لە زانایانی ئیسلام پێیانوایە کە دیاردەی (ناسخ و منسوخ) تەنها لە دینی ئیسلامدا ڕوویندداوە، بەڵکو هەموو دینەکانیتریشی گرتووەتەوە. ئەم گوتارە ئیشکالاتی زۆی تێدەکەویت.

ئیشکالاتی یەکەم ئەوەیە، پێشتر دینی ئیسلام هەموو دینەکانیتری ڕەتکردووەتەوە و تەنها دینی ئیسلام بە دینی ڕاستەقینە دەزانێت، بەلاَم لێرەدا پارادۆکسێك دروستدەبێت، کە تێیدا دانبەوەدادەنێن، دینیتر هەیە جگەلە دینی ئیسلام.

ئیشکالاتی دووەم ئەوەیە (سەیوتی) لە لا٢٤٢ی (الاتقان في العلوم القرآن)ەکەیدا دەڵێت: "النسخ بما خص الله به هذة الامه و قد اجمع المسلمون علي جوازه". واتە: "(نسخ) خوا دایناوە بۆ ئەم نەتەوەیە و موسڵمانانیش هەموویان ڕێگەیانپێداوە". گەر بمانەوێت لەبارەی دیاردەی (ناسخ و منسوخ)ەوە لەمەسیحییەتدا بدوێین، ئەوا ڕاستەوخۆ بەر ئەو قسەیەی (مەسیح) دەکەوین لە سەرەتای باسەکەماندا ئاماژەمانپێیدا کە تێیدادەڵێت: " لا تظنوا أني جئت لانقض الناموس أو الانبیاء. ما جئت لانقض بل لاکمل، فإني الحق

أقول لكم: إلى أن تزول السماء والارض، لا يزول حرف واحد أو نقطة واحدة من الناموس حتى يكون الكل ". واتە: "من نەهاتووم بۆئەوەی دژایەتیی كۆد و یاساكان و پەیامبەران بكەم، بەڵكو بۆئەوە هاتووم تەواویانبكەم، راستیتان پێبڵێم. تاكو زەوی و ئاسمان كۆتاییاندێت، یەك وشە یەك خاڵ لە یاسا و كۆدەكانی مەسیحییەت كەمناكرێتەوە بۆئەوەی كۆبێت". لە (ئەنجیل)دا هاتووە: "إن كان أحد فی المسیح یسوع فهو خلیقة جدیدة". جیاوازیی كارەكانی (مەسیح) لەچاو دینەكانیتردا لەوەدایە كە (مەسیح) فەرمان و نەهی نییە، بەڵكو گۆڕینی سروشتی مرۆڤە لەڕێگای ئامۆژگاری و رێنوومایییەوە كە تێیدا مرۆڤ دڵ و دەروونی خۆی بەڕاشكاوانە دەكاتەوە. جگەلەوە مەسیحییەكان باوەڕیانوایە، گەر خوا پەیامبەرانی لەیادبچێت و پەیامەكانی خۆی لێتێكەڵببێت، چۆن مرۆڤەكانی بیرناچێتەوە كە ئەمەش دووبارە لەگەڵ لۆژیكی مەعریفەی رەهای خوادا نایەتەوە. جگەلەوە، لۆژیكی بیرچوونەوە لۆژیكێكی بایۆلۆژییە، مادام مرۆڤ بیردەكاتەوە كەواتە دەشێت بیرچوونەوەشی هەبێت، بەلاّم لەكاتی

قسەكردن لەسەر خوا مادام ئێمە هەمان پێكهاتەی مرۆیی بە خوا نابەخشین چۆن دەكرێت سیفاتە بایۆلۆژییەكانی مرۆڤی بخەینەپاڵ!

هەندێكیتر لەو ئایەتانەی كەوتوونەتەژێر كاریگەریی دیاردەی (ناسخ و منسوخ) ەوە:- سورەتی (ال عمران) نزیك بە ١٠ ئایەتی (منسوخ)ی تێدا كە هەموویان بە ئایەتی (السیف) سڕدراونەتەوە.

ئایەتی ٢٠ لە سورەتی (ال عمران): "وان تولوا فانما علیك البلاغ" كە تێیدا خوا بە پەیامبەری ئیسلام دەڵێت، بۆ بێباوەڕان ئەوەی لەسەر تۆیە تەنها ئاگاداریكردنەوەیە. ئەم ئایەتە كە هیچ توندوتیژ و كوشتارێكی تێدانییە بە ئایەتی (السیف) سڕدراوەتەوە. بڕوانە كتێبەكەی (الجوزی).

ئایەتی ٢٨ لەهەمان سورەت: "..الا ان تتقوا منهم تقاة ویحذركم الله نفسه والی الله المصیر". (بەغەوی) هۆكاری دابەزینی ئایەتەكە دەبەستێتەوە بەوەوە، هەندێك كەسایەتی لەجۆری (رفاعة بن المنذر، عبد الله بن جبیر وسعید بن خیثمة) ئەمانە

ئامۆژگاریی هه‌ندێك له‌ هاوه‌ڵه‌كانی خۆیان و لایه‌نگرانی ئیسلام كردووه‌ كه‌ له‌و یه‌هودی و مه‌سیحییانه‌ دووربكه‌ونه‌وه‌ ده‌یانه‌وێت كه‌شخه‌یی به‌سه‌ر دینی خۆیانه‌وه‌ بكه‌ن. كاتێك ئه‌م رووداوه‌ ده‌گاته‌وه‌ ده‌م )محه‌ممه‌د) ئه‌و ئایه‌ته‌ دێته‌خواره‌وه‌.

ئایه‌تی ٨٥ له‌ سوره‌تی (ال عمران): "ومن یبتغ غیر الاسلام دینا فلن یقبل منه وهو فی الاخره من الخاسرین". واته‌: "ئه‌و كه‌سه‌ی جگه‌له‌ دینی ئیسلام دوای دینێكیتر بكه‌وێت، لێیقه‌بووڵناكرێت و ئه‌و كه‌سه‌ له‌دوایدا دۆڕاوه‌". ئه‌م ئایه‌ت مه‌ده‌نییه‌ و ئایه‌تی " لكم دینكم و لی دین "ی نه‌سخكردووه‌ته‌وه‌. له‌ ته‌فسیره‌كه‌ی (به‌غه‌وی)دا له‌باره‌ی ئه‌م ئایه‌ته‌وه‌ ئه‌مه‌ به‌دیده‌كه‌ین: "نـزلت في اثني عشر رجًل ارتُدوا عن اْلاسلام وخرجوا من المدینة وأتوا مكة كفارا، منهم الحارث بن سوید اْلانصاري". (به‌غه‌وی) هۆكاری دابه‌زینی ئایه‌ته‌كه‌ ده‌گێڕێته‌وه‌ بۆئه‌وه‌ی دوانزه‌ كه‌س له‌ ئیسلام هه‌ڵگه‌ڕاونه‌ته‌وه‌، )مه‌دینه‌)یان جێهێشتووه‌ و روویانكردووه‌ته‌ )مه‌ككه‌)ی كافره‌كان و له‌نێویشیاندا )حارسی كوڕی سوه‌ید) ی مه‌سیحی تێدابووه‌. نه‌یارانی ئیسلام و مه‌سیحییه‌كان ده‌پرسن و ده‌ڵێن بۆ ده‌بێت خوا ته‌نها له‌به‌ر خاتری دوانزه‌ كه‌س یه‌ك له‌ وته‌كانی خۆی بسڕێته‌وه‌ و هه‌ڕه‌شه‌یانلێبكات، ئایا )حارسی كوڕی سوه‌ید) و هاوه‌ڵه‌كانی گرنگتربوون بۆ ئیسلام یاخود نه‌ته‌وه‌كی گه‌وره‌ی یه‌هودی و مه‌سیحییه‌كان كه‌ پێشتر پییانیگوتبوو "ئێوه‌ دینی خۆتان و ئێمه‌ش دینی خۆمان".

به‌هه‌مانشێوه‌ ئایه‌تی ٨٦ له‌هه‌مان سوره‌ت: كیف یهدي الله قوما كفروا بعد ایمانهم وشهدوا ان الرسول حق وجاءهم البینات والله لا یهدي القوم الظالمین" له‌درێژه‌ی ئه‌و رووداوه‌ ده‌دوێت و گله‌یی له‌هه‌ڵگه‌ڕاوه‌كان تێیدا به‌رده‌وامه‌ و ئایه‌تی "دینی خۆم بۆ خۆم دینی خۆت بۆ خۆت"ی ره‌تكردووه‌ته‌وه‌. بڕوانه‌ كتێبه‌كه‌ی (جوزی) لا٢٣٧.

به‌شێكی ئایه‌تی ٩٧ له‌م سوره‌ته‌ كه‌ ده‌ڵێت: "ولله علی الناس حج البیت"، زانایان پێیانوایه‌ ئه‌م ئایه‌ته‌ به‌به‌شێكیتری هه‌مان ئایه‌ت سڕدراوه‌ته‌وه‌ كه‌ ده‌ڵێت: "من استطاع الیه سبیلا".

سورەتی (المائده)ش ژمارەیەکی زۆر ئایەتی تێدایە کە کەوتوونەتەبەر شالآوی (ناسخ و منسوخ)ەوە. ئایەتی ٥ لەم سورەتە دەڵێت: "وطعام الذين اوتوا الكتابحل لكم وطعامهم حل لهم". (بەغەوی) لە تەفسیری ئایەتەدا بەمشێوەیە بۆماندەدوێت و دەڵێت: "(اليوم احل لكم الطيبات) يعني: الذبائح على اسم ّالله عز وجل، (وطعام الذين اوتوا الكتاب حل لكم) يريد ذبائح اليهود والنصارى ومن دخل في دينهم من سائر اْلامم قبل مبعث النبي محمد صلى َطَعا ُم ال ّالله علية وسلم حًلال لكم". واتە خوا هەموو جۆرە خواردن و نێچیر و قوربانییەکانی یەهودی و مەسیحییەکانتانی لێحەلآڵکردووە. (جوزی) بەهەمانشێوە لە (نواسخ القرآن)ەکەیدا بەوشێوەیە شرۆڤەیدەکات کە مەبەستی قوربانی سەربرینەکانی یەهودی و مەسیحییەکانە لە موسڵمانانی (مەدینە)ی حەلآڵکردووە. (جوزی) لەهەمان بڕگەدا ئاماژەبەوەدەکات کە ئەو ئایەتە بە ئایەتی ١٢١ی سورەتی (الانعام) سڕدراوەتەوە کە دەڵێت: "ولا تأكلوا مما لم يذكر اسم الله عليه"، واتە: "شتێك مەخۆن ناوی خوای لەسەرنەهاتبێت".

ئایەتی ١٣ی سورەتی (المائده) دەڵێت: "فاعف عنهم واصفح.." ئەم بەشە لە ئایەتی ١٥٩ی (ال عمران)یشدا دووبارەبووەتەوە، جگەلەوە هاوشێوەیەکیتریشی هەیە کە بریتییەلە ئایەتی ١٤ی سورەتی (التغابن)، دەڵێت: ".. وان تعفوا وتصفحوا..". دەقی هەردوو ئایەتەکە بە مانای لێبووردن و دەستخستنەناودەستی یەهودی و مەسیحییەکان و بێدینەکانەوە دێت. زانایانی ئیسلام زۆر کۆکنین لەسەر چارەنووسی ئەم ئایەتە، زۆربەیان دەڵێن بە ئایەتی (السیف) (منسوخ)بووە و هەندێکیشیان دەڵێن تاکو ئێستایش (محکم)ە، واتە حوکمەکەی ماوە. ئەوانەی باوەڕیان بەوەهەیە ئەو ئایەتە و هاوشێوەیەکیشی لە سورەتی )التغابن( )نسخ) کراوەتەوە ئاماژە بە ئایەتی ٢٩ی سورەتی (التوبة) دەکەن کە دەڵێت: " قاتلوا الذين لا يؤمنون باللهولا باليوم الاخر.."، واتە:"ئەوانە بکوژن کە باوەڕیان بە خوا و ڕۆژی دوایی نییە".

ئایەتی ٩٩ لە سورەتی (المائدة) دەڵێت: "ما على الرسول الا البلاغ". ئەوەی لەسەر شانی پەیامبەر تەنها گەیاندنە، ئەمە دەقی ئەم ئایەتەیە. (جوزی) لە تەفسیری

ئایەتەکەدا دەڵێت، هەندێك پێیانوایە ئەم ئایەتە (محكم)ە، واتە حوکمەکەی ماوە، هەندێکیش دەڵێن، لەبەرئەوەی ئەو ئایەتە سنوورەکانی دەسەلآتی پەیامبەری زۆر بەرتەسککردووەتەوە و تەنها ئەرکی گەیاندنی بەبێ شەڕ و کوشتار خستووەتەسەر شانی، بۆیە بە ئایەتی (السیف) سڕدراوەتەوە، تاوەکو دەسەلآتەکانی فراوانتربێت و مەودای کوشتاریشی بۆ بکاتەوە. هەندێك لەو زانایانە پێیانوایە، گەر ئەو ئایەتە (نسخ)نەبوایەتەوە چۆن پەیامبەر دەیتوانی لە ئەرکی گەیاندنی پەتییەوە رێگای کوشتار و شەڕ بگرێتەبەر. سورەتی (الانعام)یش هاوشێوەی سورەتەکانیتر ژمارەیەکی باش لە ئایەتەکانی (نسخ) کراونەتەوە و حوکمیاننەماوە بەڵکو تەنها خوێندنەوەیان ماوە. (جوزی) ژمارەی ئایەتە (نسخ)کراوەکانی ئەم سورەتە بە ١٧ ئایەت هەژماردەکات و بۆ هەریەکەیشیان بەڵگەی مێژوویی دەهێنێتەوە. ئێمە لەم بڕگەیەدا چەند ئایەتێك بەنموونە دەهێنینەوە. گەر بڕوانینە ئایەتی ١٠٦ی ئەم سورەتە، دەڵێت: " اتبع ما اوحي اليك من ربك لا اله الا هو واعرض عن المشركين". لەم ئایەتەدا خوا داوا لە پەیامبەر دەکات، کە دوای وەحی خوا بکەوێت و جگەلەو هیچ خوایەکیتر نییە و داواشیلێدەکات کە بێباوەڕان و گومڕاکان پشگوێبخات و وەلایانبنێت. ئەم ئایەتە زۆربەی زۆری زانایان لەسەرئەوە رێکن، کە بە ئایەتی ژمارەی ٥ی سورەتی (التوبة) (نسخ)کراوەتەوە، کە دەڵێت: "فاقتلوا المشركين حيث وجدتموهم"، واتە: "لەکوێدا تووشی موشریکەکان بوون بیانکوژن".

ئایەتی ١٠٧ لە سورەتی (الانعام) دەڵێت: "ولو شاء الله ما اشركوا وما جعلناك عليهم حفيظا وما انت عليهم بوكيل".[٧] دەقی ئەم ئایەتە ئەوەمان پێدەڵێت، کە گەر خوا بیویستایە ئەوان گومڕانەدەبووون و خوا پەیامبەریشی نەکردووە بە بریکاری ئەوان، واتە یەهودی و مەسیحی و گومڕاکان. )ئیبن عەباس) دەڵێت ئایەتی ١٠٧ ی سورەتی (الانعام)یش بە ئایەتی (السیف) (نسخ)کراوەتەوە. (جوزی) و (ئیبن کەسیر) و هەندێکیتر لە موفەسیرانی ئیسلام جەخت لە سڕینەوەی ئەم ئایەتە دەکەن.

ئایەتی ١٠٨ی هەمان سورەتی (الانعام) دەڵێت: ولا تسبوا الذين يدعون من دون الله فيسبوا الله عدوا بغير علم كذلك زينا لكل امة عملهم ثم الى ربهم مرجعهم فينبئهم

بما كانوا يعملون". دەقی ئەم ئایەتە بەمشێوەیەیە: "ئەی باوەڕداران نەکەن جوێن بەو بتانەی نەفامان بدەن کە هاواری بۆدەکەن و دەیپەرستن، نەوەکو ئەوانیش بەناحەق و بەنەفامی جوێن بەخوا بدەن، چونکو ئەوان نایناسن و قەدری نازانن، ئا بەوشێوەیە ئێمە بۆ هەر گەل و نەتەوەیەك کردەوەکانیانمان رازاندووەتەوە، لەوەبەدواوە ئەوان هەر بۆلای پەروەردگاریان دەگەڕێنەوە، ئەوسا ئاگاداریاندەکاتەوە بەو کار و کردەوانەی کە دەیانکرد".

ئەم ئایەتەش یەکێکیترە لەو ئایەتانەی کەوتووەتەژێر فشاری ئایەتی (السیف)ەوە و حوکمەکەی نەماوە، بەڵکو تەنها خوێندنەوەی ماوە. (ئیبن حەزم) دەڵێت ئەم ئایەتە بەهۆشداریدانەوەی (خەتاب) بە ئایەتی (السیف) سڕدراوەتەوە، لەبەرئەوەی ئایەتی (السیف) کوشتنی تێدایە و کوشتنیش زۆر توندترە لەجوێندان. (جوزی) پێیوایە، (ئیبن حەزم) هەڵوێستی بەرانبەر بە (نسخ)بوونەوەی ئەم ئایەتە زۆر رۆشننییە، چونکو لەسەرەتاوە دەڵێت، (نسخ)کراوەتەوە و دواتریش دەڵێت: من واینابینم (نسخ)کرابێتەوە، بەڵام جگەلە (ئیبن حەزم) هەندێکیتریش لە موفەسیرەکان هێشتا پێیانوایە ئەو ئایەتە حوکمەکەی نەماوە.

ئایەتی ١٣٥ی هەمان سورەت دەڵێت: "قل يا قوم اعملوا على مكانتكم اني عامل فسوف تعلمون من تكون له عاقبة الدار انه لا يفلح الظالمون". واتە: "(پێیانبڵێ ئەی نەتەوە و هۆزەکەم چیتان بۆدەکرێت لەسەر شێوازی خۆتان ئەنجامیبدەن، منیش بەردەوامم کە ستەمکاران سەرفرازنابن". ئەم ئایەتەش بە ئایەتی (السیف) (نسخ) کراوەتەوە.

سورەتی (الاعراف) سێ ئایەتی تێدایە (نسخ)کراوەتەوە. ئێمە لێرەدا یەك ئایەت بەنموونە دەهێنینەوە. ئەم ئایەتە دەڵێت: ولله الاسماء الحسنى فادعوه بها وذروا الذين يلحدون في اسمائه سيجزون ما كانوا يعملون". دەقی ئایەتەکە بەمشێوەیەیە: "هەرچی ناوە جوان و پیرۆزهکانە بۆ خوایە، ئیتر بەو ناوانەوە دوعا و نزابکەن، هانا و هاواری بۆبەرن، واز لەوانەبهێنن، کە لە ناوە پیرۆزهکانی خوا لادەدەن. لەئایندەدا پاداشتی ئەو کار و کردەوانەیان وەردەگرن کە ئەنجامیدەدەن". لەبارەی ئەم ئایەتەوە (جوزی) باس لە (ئیبن

زیاد) دەکات، کە گوتوویەتی ئەم ئایەتە سەرلەبەری بە ئایەتە کوشتارئامێزەکان (نسخ) کراوەتەوە. (ئیبن حەزم) ئایەتی (السیف) بە (ناسخ)ی ئەم ئایەتە دادەنێت و دەڵێت، سورەتی (الاعراف) مەککیە، بەلاّم (السیف) سڕیویەتییەوە. گەر بمانەوێت قسە لەبارەی سورەتی (انفال)ەوە بکەین، بۆماندەردەکەویت ئەویش بەدەرنییە لەو شالاّوە، بەڵکو ئەویش ٦ ئایەتی کەوتوونەتەژێر کاریگەریی (ناسخ و منسوخ)ەوە.

## سورەتی ئەنفال:

بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی ئایەتە (ناسخ و منسوخ)ەکانی ئەم سورەتەوە بڕوانە کتێبەکەی علامە الجوزی ل٣٤٣. لەم سورەتەدا نزیك بە ٨ ئایەت کەوتووەتەژێر کاریگەریی ئەو دیاردەیەوە، بەلاّم ئێمە لێرەدا تەنها شیکردنەوە بۆ یەك دوو ئایەتیان دەکەین کە بەلای ئێمەوە گرنگیی خۆیان هەیە و بڕێك زیاتر گرنگییان پێدەدەین، لەبەرئەو یادگارییە مێژووییە تاڵەی ئێمە لەگەڵ ئەم ئایەتە هەمانە. بڕواننە ئایەتی ژمارە ١ لە سورەتی (انفال)، دەڵێت: "یسألونك عن الانفال، قل الانفال لله والرسول..". دەقی ئایەتە بە کوردی بەمشێوەیەیە: "لەبارەی ئەنفالەوە پرسیارت لێدەکەن، بڵێ ئەنفال بۆ خوا و پەیامبەرەکەیەتی". (بەغەوی) دەڵێت: "سورة الانفال مدنیة وهي خمس وسبعون آیة قیل: الا سبع آیات من قوله ": وإذ یمکر بك الذین کفروا" إلی آخر سبع آیات فإنها نزلت بمکة والاصح أنها نزلت بالمدینة ، وإن کانت الواقعة بمکة". واتە: "سورەتی (ئەنفال) لە حەفتا و پێنج ئایەت پێکهاتووە و جگەلە حەوت ئایەتی کۆتایی نەبێت ئەویتری لە مەدینە دابەزیوە، بۆیە بە ئایەتێکی مەدەنی ناسراوە". (جلال الدین السیوطي) لە ل٥ي (الدر المنثور التفسیر بالمأثور)ەکەیدا بەمشێوەیە باس لە سەردەمی دابەزینی ئایەتەکە دەکات: "واخرج سعید بن منصور، والبخاري وابن المنذر، وابو لشیخ، وابن المردویة، عن سعید بن جبیر، قال: قلت لابن عباس، سورة الانفال: قال، نزلت في البدر، وفي لفظ تلك سورة الدر". ئەوەی (سەیوتی) بۆمان باسدەکات، لە زمانی زنجیرەیەك لە هاوەڵی پەیامبەرەوە کە راستەوخۆ لەبنەڕەتدا لە (ئیبن عەباس)یان گوێلێبووە، گوتوویەتی کە سورەتی (ئەنفال) لە

ڕۆژی (بدر)دا دابەزیوە. (النحاسی) لە لا ١٥١ی کتێبەکەیدا دەڵێت: "(یموت بن المدرع) بەپاڵپشتیی (ئیبن عەباس) گوتوویەتی، سورەتی (ئەنفال) مەدەنییە، واتە لە (مەدینە) دابەزیوە". (تەبەری) لەتەفسیرەکەیدا بەمشێوەیە باس لە هۆکاری دابەزینی ئایەتەکەی دەکات: "یسألونك عن الانفال. قال أهل التفسیر: سبب نزول هذه الایة هو أن النبي - صلى الله عليه وسلم - قال يوم بدر "من أتى مكان كذا فله من النفل كذا ومن قتل قتيلا فله كذا ومن أسر أسيرا فله كذا"، فلما التقوا تسارع إليه الشبان وأقام الشيوخ ووجوه الناس عند الرايات، فلما فتح الله على المسلمين جاءوا يطلبون ما جعل لهم النبي - صلى الله عليه وسلم - فقال الاشياخ : كنا ردءا لكم ولو انهزمتم لانحزتم إلينا، فلا تذهبوا بالغنائم دوننا، وقام أبو اليسر بن عمرو الانصاري أخو بني سلمة فقال: يا رسول الله إنك وعدت أن من قتل قتيلا فله كذا، ومن أسر أسيرا فله كذا، وإنا قد قتلنا منهم سبعين وأسرنا منهم سبعين، فقام سعد بن معاذ -رضي الله عنه - فقال : والله يا رسول الله ما منعنا أن نطلب ما طلب هؤلاء زهادة في الاجر ولا جبنا عن العدو، ولكن كرهنا أن نعري مصافك فيعطف عليه خيل من المشركين فيصيبوك، فأعرض عنهما رسول الله - صلى الله عليه وسلم -. وقال سعيد: يا رسول الله إن الناس كثير والغنيمة دون ذلك، فإن تعط هؤلاء الذين ذكرت لا يبقى لأصحابك كبير شيء، فنزلت". لێرەدا (تەبەری) دەڵێت: "پەیامبەر لە ڕۆژی شەڕی (بدر)دا گوتوویەتی: هەرکەسێك گەیشتە فلاَنە شوێن، ئەوا فلاَنە شتی بەردەکەوێت و ئەو کەسەی کەسێکی کوشت، ئەوا ئەوەی بەردەکەوێت، خۆ گەر یەکێك دیلێك بگرێت، ئەوا فلاَنە شتی بەردەکەویت. کاتێك شەڕکەران گەیشتنە شمەکەکان گەنجەکان بەپەلە گەیشتنەسەری و پیرەکانیش لەو لاوە گوتیان: ئێمە کراسی بەرتانبووین، گەر ڕامان بکردایە بۆمان دڵتەنگدەبوون، لەبەرئەوە بەبێ ئێمە دەستەکەوتەکان مەبەن. (ئەبو یەسر بن عومەر)ی ئەنساریی برای (بەنی سەلمە)ش گوتی: ئەی پەیامبەری خوا بەڵێنتدا ئەو کەسەی کەسێکی کوشت فلاَنە شتی بدەیتێ و گەر یەکێك یەکێکیشی بەدیلگرت، ئەوا فیسارە شتی بدەیتێ، بەمەرجێ ئێمە حەفتا پیاومان لێکوشتوون و حەفتاشمان لێبەدیلگرتوون. لەو لاشەوە (سعد کوڕی مەعاز) خوای لێڕازیبێت- گوتی: ئەی

پەیامبەری خوا بەوخوایە ئەوەی وایلێکردین داوای ئەو شتانە نەکەین کە ئەوان (لێرەدا ئەوان مەبەست لە گەنجەکانە) کردوویانە رازیبوونمان بوو بەچاکە، ترسماننەبوو لە دوژمن، بەلاّم رقمان لەوەبوو هەموو شتەکانت لێبکەینەوە و واتلێبکەین سوارەکانی دوژمن بتبینن، بیاندایە بەسەرتدا و پەلاماریان بدایتایە. پەیامبەر ویستی پشتگوێیانبخات، بەلاّم (سەعید) گوتی: ئەی پەیامبەری خوا خەڵك زۆرن و غەنیمەکانیش کەم، گەر هەموو ئەو شتانە بدەیتە ئەوان، ئەوا هیچ بۆ هاوەڵەکانت نامێنێتەوە.. ".

تەفسیری (بەغەوی) لەبارەی ئەم ئایەتەوە بەمشێوەیەیە: "القول في تفسير السورة التي يذكر فيها الانفال (يسألونك عن الانفال قل الانفال..)اختلف أهل التأويل في معنى الانفال التي ذكرها الله في هذا الموضع، فقال بعضهم: هي الغنائم، وقالوا: معنى الكلام : يسألك أصحابك يا محمد عن الغنائم التي غنمتها أنت وأصحابك يوم بدر لمن هي، فقل هي لله ولرسوله". (تەبەری) پێیوایە وشەی (ئەنفال) بەمانای جۆراوجۆر دێت، هەندێك بە (دەستکەوتی جەنگ)و هەندێکیتر بە مانای گووتن لێکیدەدەنەوە، بەلاّم ئەوەش دەڵێت کە ئایەتەکە وەکو وەلاّمێك بۆ جەنگاوەرانی شەڕی (بەدر) دابەزیوە و خوا بە پەیامبەرەکەی دەڵێت: لەبارەی ئەنفالەوە پرسیارت لێدەکەن، بڵێ ئەنفال، واتە دەستکەوتی جەنگ بۆ خوا و پەیامبەرەکەیەتی. ناکۆکییەکان لەنێوان جەنگاوەران و (محەممەد) لەلایەك و نێوان جەنگاوەران خۆیاندا لەلاکەیترەوە، لەسەر دابەشکردنی پشکی دەستکەوتەکان تا هاتووە گەورە و گەورەتربووە. سەرەتا (محەممەد) خۆی پێنجیەکی پشکەکانی بۆخۆی دیاریکردووە و ئەوانیتریشی بەسەر جەنگاوەراندا دابەشکردووە کە ئەمەش گلەییەکی زۆری جەنگاوەرانی لێکەوتووەتەوە. (نوحاسی) لە کتێبەکەی خۆیدا لا١٥١ دەڵێت: "القول ألاول ابن عباس من رواية ابن ابي طلحة قال: الانفال الغنائم التي كانت خالصة للنبي ليس لاحد فيها شيء، ثم أنزل الله تعالى: واعلموا أنما غنمتم من شيء". واتە (نوحاسی) لە زمانی (تەڵحە)ەوە، کە راستەوخۆ بۆ (ئیبن عباس)ی گێڕاوەتەوە، گوایە پەیامبەری ئیسلام هیچی لە دەستکەوتەکان بەشی خەڵك نەداوە، بەڵکو هەمووی بۆ خۆی هەڵگرتووە، بۆیە دواتر ئایەتی (واعلموا أنما غنمتم من شيء) دابەزیوە کە خوا تێیدا بە موسڵمانانی گوتووە:

ئاگاداربن ئێوەش دەستکەوتتان هەیە. دووبارە (نوحاسی) باس لەوەدەکات کە بابەتی پێنجیەکی پشکەکان نارەزایەتییەکی زۆری لێکەوتووەتەوە و دواتر خوا ناچاربووە گۆڕانکاری لەئایەتەکەدا بکات، ئایەتی پێشوو بەگۆڕانکارییەوە کۆپیبکات و ئەم ئایەتە نوێیەی لێبنێرێتەخوارەوە: "واعلموا انما غنمتم من شيء فان لله الخمس وللرسول ولذي القربى واليتامى والمساكين وابن..". دەقی ئایەتەکە ئەوەما پێدەڵێت کە پشکی پێنجیەك بۆ خوایە، نەوەکو بۆ پەیامبەر. شرۆڤەکارانی مەسیحی لەمبارەیەوە دەڵێن ئەمە فێڵێك بوو پەیامبەر لە جەنگاوەرەکانی خۆیی کردووە، چونکو ئەو ئایەتە پێنجیەکی پشکەکانی بۆ خوا داناوە، خواش خۆی ناتوانێت بەکاریبهێنێت، بەڵکو پەیامبەر نوێنەریەتی، کەواتە دواجار پەیامبەر خۆی بڕیاردەدات بەشی کێ بدات یاخود نەدات. ئاستی ناکۆکی و ناتەباییەکان گەیشتووەتە رادەی ئەوەی ئایەتیتر دابەزێت کە ئەوی پێشتووتر نەسخدەکاتەوە، ئایەتەکەش بەمشێوەیەیە: "فاتقوا الله وأصلحوا ذات بينكم"، واتە: "لەنێو خۆتاندا رێکبکەون و ئەو شتە چارەسەربکەن".

ئایەتی٢١٩ لە سورەتی (البقرە)، براوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو لا١٩٧: "يسألونك عن الخمر والميسر قل فيهما إثم كبير ومنافع للناس..". (ئیبن کەسیر) لە تەفسیرەکەی خۆیدا بەمشێوەیە باس لە هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە دەکات: "قال الامام أحمد: حدثنا خلف بن الوليد، حدثنا إسرائيل، عن أبي إسحاق، عن أبي ميسرة، عن عمر أنه قال: لما نزل تحريم الخمر قال: اللهم بين لنا في الخمر بيانا شافيا. فنزلت هذه الاية التي في البقرة: يسألونك عن الخمر والميسر قل فيهما إثم كبير ومنافع للناس.. الميسر: القمار.. فدعي عمر فقرئت عليه، فقال: اللهم بين لنا في الخمر بيانا شافيا. فنزلت الاية التي في النساء، ياأيها الذين آمنوا لا تقربوا الصلاة وأنتم سكارى، فكان منادي رسول الله صلى الله عليه وسلم إذا أقام الصلاة نادى: الا يقربن الصلاة سكران . فدعي عمر فقرئت عليه، فقال: اللهم بين لنا في الخمر بيانا شافيا. فنزلت الاية التي في المائدة. فدعي عمر ، فقرئت عليه ، فلما بلغ، فهل أنتم منتهون؟ قال عمر : انتهينا، انتهينا". لە تەفسیرەکەی (ئیبن کەسیر)ەوە دەردەکەوێت کە ئەم ئایەتە لەسەر داوای عومەر بۆ دیاریکردنی هەڵوێستێکی

رۆشن لەبارەی خواردنەوەی ئەلکهولییەوە دابەزیوە. ئایەتەکەش نەرمی و نیانییەکی زۆری پێوەدیارە و مانای دەقی ئایەتەکە بەمشێوەیەیە: "لەبارەی شەراب و رابواردنەوە پرسیارت لێدەکەن، بڵێ گوناهی گەورەی تێدایە و سوود و لەزەتیشی بۆ مرۆڤەکان هەیە". لەدرێژەی تەفسیرەکەیدا (ئیبن کەسیر) دەڵێت:" پەیامبەر (عومەر)ی بانگکردووە و بۆیخوێندووەتەوە، دیارە ئەویش پێیڕازینەبووە و دووبارە داوای هەڵوێستێکی رۆشنتری لەبارەی شەراب و مەیسەرەوە کردووە. ئینجا ئایەتی ٤٣ لە سورەتی (نساء) دابەزی کە دەڵێت: "یا أیها الذین آمنوا ال تقربوا الصالة وأنتم سکاری". واتە: ئەی باوەڕداران بە سەرخۆشی لە نوێژ نزیکمەبنەوە. دووبارە پەیامبەر (عومەر)ی بانگکردووە و ئەم ئایەتەشی بۆ خوێندووەتەوە و لەوێشدا عومەر دیارە دووبارە پێیڕازینەبووە، گوتوویەتییەوە: هەڵوێستێکی رۆشنمان لەبارەی شەراب و مەیسەرە دەوێت، کاتێك دەگاتە: فهل أنتم منتهون. ئیتر لەوێدا عومەر دەڵێت بەسە ئیتر، بەسە ئیتر". (نوحاسی) لە زمانی (ئەبی جەعفە)وە دەڵێت کە کۆمەڵێك لە زانایان پێیانوایە ئایەتی "یسألونك عن الخمر والمیسر قل فیهما إثم کبیر ومنافع للناس" سڕینەوەی ڕێگاپێدانی خواردنەوەی شەراب بووە. دواتر، هەروەکو لە تەفسیرەکەی (ئیبن کەسیر)ەوە دیارە، هەمان ئایەت بە ئایەتێکی توندتر کە سنووری نوێژکردن لەبەرانبەر سەرخۆشی دیاریدەکات سڕدراوەتەوە. لەدرێژەی باسەکەدا (نوحاسی) دەڵێت ئەو ئایەتەش حوکمەکەی بەم ئایەتەی خوارەوە بەتاڵکرایەوە کە دەڵیت:"ومن ثمرات النخیل والاعناب.."، واتە: "ئەو ئەلکهولییانەی بەروبوومی خورما و ترێن". ئەو کێشەیە لەوێدا کۆتاییینەهاتووە، بەڵکو لەدوای ئەو زنجیرە ئایەتە ئایەتی کۆتایی لەوبارەیەوە ئایەتی ٩٠ و ٩١ لە سورەتی (المائدە) هاتووتەخوارەوە:"یایها الذین امنوا انما الخمر والمیسر والازلام والانصاب رجس من عما الشیطان..". دەقی ئەم ئایەتە دەڵێت: "ئەی باوەڕداران دڵنیابن کە ئەلکەولییەکان، قومار، بت و مۆنەمێنتەکان کاری نابەجێ و شەیتانین، خۆتانی لێدووربگرن و خۆتانی لێبپارێزن، بۆئەوەی لەهەردوو جیهانەکەدا سەرفرازی و بەختەوەری بەدەستبهێنن".

ئایەتی ٢٢١ لە سورەتی (البقره) :" ولا تنكحوا المشركات حتى يؤمن ولأمة مؤمنة خير من مشركة ولو أعجبتكم..". (بەغەوی) بەمشێوەیە باس لە هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە دەکات": سبب نزول هذه الاية أن أبا مرثد الغنوي بعثه رسول الله صلى الله عليه وسلم إلى مكة ليخرج منها ناسا من المسلمين سرا فلما قدمها سمعت به امرأة مشركة يقال لها عناق وكانت خليلته في الجاهلية فأتته وقالت: يا أبا مرثد الا تخلو؟ فقال لها ويحك يا عناق إن الاسلام قد حال بيننا وبين ذلك قالت : فهل لك أن تتزوج بي؟ قال نعم ولكن أرجع إلى رسول الله صلى الله عليه وسلم فأستأمره فقالت أبي تتبرم؟ ثم استغاثت عليه فضربوه ضربا شديدا ثم خلوا سبيله فلما قضى حاجته بمكة وانصرف إلى رسول الله صلى الله عليه وسلم أعلمه بالذي كان من أمره وأمر عناق وما لقي بسببها وقال: يا رسول الله أيحل لي أن أتزوجها؟ فأنزل الله تعالى. وقيل: الاية منسوخة في حق الكتابيات بقوله تعالى "والمحصنات من الذين أوتوا الكتاب من قبلكم - المائدة. دەقی ئەم ئایەتە بەمشێوەیەیە: "پەیامبەر )موسید غەنوی) بە نهێنی ناردووە بۆ (مەککە) تاکو یارمەتی هەندێك موسڵمان بدات و بەسەلامەتی دەریانبکات کە گەیشتە ئەوێ ژنێکی بێباوەڕ کە کاتی خۆی دۆستایەتی لەگەڵ (غەنوی) هەبووە دەیبینێت و پێیدەڵێت" دەتەوێت بمهێنی؟ ئەویش وەڵامدەداتەوە و دەڵێ" بەڵێ، کاتێك دەگەڕێتەوە بۆ لای (محەمەد) و چیرۆکەکەی بۆدەگێڕێتەوە ئەو ئایەتەی ٢٢١ دادەبەزێت..". لەقسەکانی (بەغەوی)ەوە دەردەکەوێت کە ئەو ئایەتە بە ئایەتی " والمحصنات من الذين أوتوا الكتاب من قبلكم" (نسخ)کراوەتەوە. (نوحاسی) لەبارەی ئەم ئایەتەوە دەڵێت سێ گوتە هەیە: هەندێك لە زانایان پێیانوایە ئەم ئایەتە (ناسخ)ە، هەندێکیتر پێیانوایە (مەنسوخ)ە، بەڵام برێك پێیانوایە نە (ناسخ)ە نە (منسوخ)ە بەڵکو (محکم)ە. ئەوانەی گوتوویانە ئەم ئایەتە منسوخە بریتینلە (مالك بن ئەنەس، سفيان بن سعيد، عبدالرحمن بن عمر). ئەوانەیشی دەڵێن ئەم ئایەتە ناسخە بیرتینلە (جعفر بن مجامع. لە ابراهيم ابن مسحاق الحربى)ەوە گوێلێبووە، تیرەیەك پێیانگوتووە، ئەو ئایەتەی سورەتی (البقرة) ناسخە.

(ئیبن العربی) له (احکام القرآن)ەکەیدا بەمشێوەیە ئایەتەکە شیدەکاتەوە:"المسألە الاولى: اختلف الناس فيها على ثلاثة أقوال: الاول: لا يجوز العقد بنكاح على مشركة كانت كتابية أو غير كتابية " قاله عمر في إحدى روايتيه، وهو اختيار مالك والشافعي إذا كانت أمة. الثاني: أن المراد به وطء من ال كتاب له من المجوس والعرب "قاله قتادة. الثالث: أنه منسوخ بقوله تعالى..: اليوم أحل لكم الطيبات وطعام الذين أوتوا الكتاب حل لكم وطعامكم حل لهم والمحصنات من المؤمنات والمحصنات من الذين أوتوا الكتاب من قبلكم إذا آتيتموهن أجورهن محصنين غير مسافحين ولا متخذي أخدان.. ". واتە: "بابەتەکە چەند روویەکی جیاوازی هەیە. یەکەمیان: خەلك بە سیٚ شێوە لێیدەدوێن. دووەمیان: مەبەست لەو عەرەب و مەجوسانەیە کە خاوەنی کیتابی ئاسمانی نین" ئەمە (قەتادە گوتوویەتی). سێیەمیان: ئەم ئایەتە بە ئایەتێکی نوێتر، ئایەتی ٥ لە سورەتی (المائدە)، کە دەڵێت: "والمحصنات من الذين أوتوا الكتاب من قبلكم" سڕدراوەتەوە".

لەڕاستیدا یەکێك لەو فاکتەرانەی بڕیار لەسەر ناسخ و منسوخبوونی ئایەتێك دەدات سەردەمی دابەزینەکەیەتی. گەر ئایەتێك لە سەرەتای سەرهەڵدانی ئیسلامدا و لە سەردەمی مەککیدا هاتبیتەخوارەوە ناکرێت بڵێیت ئەو ئایەتە ناسخی ئاتێکیترە کە لەقۆناغەکانی گەشەی ئیسلامدا و لە سەردەمی مەدەنیدا هاتبێتەخوارەوە. ئەم ئایەتەی دووەم لەگەڵ ئەوەشدا رای جیاواز زۆرن دەربارەی سەردەمی دابەزین و ماناکەی، بەلاٚم هەندێك لە زانایان پێیانوایە کە ژنانی ئەهلی کیتابیش لە موسڵمانان حەرامکرابێت. ئایەتی ٢٢٢ لە سورەتی (البقرة): "ويسألونك عن المحيض قل هو أذى فاعتزلوا النساء في المحيض ولا تقربوهن حتى يطهرن فإذا تطهرن فأتوهن من حيث أمركم الله إن الله يحب التوابين.. ". دەقی ئایەتەکە بەمشێوەیەیە: "لە ژنی بێنوێژ پرسیارت لێدەکەن، بڵیٚ لە ژنانی بێنوێژ دووربکەونەوە، نزیکیانمەبنەوە تاکو پاکدەبنەوە". (نوحاسی) لە زاری (ئەبو جەعفەر)ەوە دەڵێت ئەم ئایەتەش لە ناسخ و منسوخەکانە، لەبەرئەوەی لە شەریعەتی بەنی ئیسرائیل ئەوە یەکلاییبوبووەوە، ژن لە دەورەی مانگانەدا بووبێت، نەدەبوو هاوبەشیی خواردن و خواردنەوەی بکەیت، نەدەبوو لەگەڵی جووتبیت و لێشی نزیکببیتەوە. لێرەدا

ئەوەی (نوحاسی) تیشکی دەخاتەسەر ئەوەیە، دابەزینی ئایەتەکە (نسخ)کردنەوەی شەریعەتی بەنی ئیسرائیل بووە، چونکو لەو سەردەمەدا، لەبەرئەوەی تێکستی قورئانی تەواونەبوبوو موسڵمانانی مەدینە ناچاردەبوون بۆ بەڕێوەبردنی ژیانیان پەنا بۆ یاسای یەهوودی مەسیحییەکان بەرن. دواتر (محەممەد)و لایەنگرانی وردەوردە و لەڕێگای داواکارییەکانی موسڵمانان و لایەنگرانەوە ئایەت بۆ هەریەك لەو کەلێنانە بدۆزنەوە و لە یاسا و شەریعەتی بەنی ئیسرائیل و یەهودییەکان دووریانبخەنەوە. لە کتێبەکەی (نوحاسی)یدا هاتووە کە (ئەنەسی بن مالك) لەڕێگای زنجیرەیەك لە هاوەڵی (محەممەد)و خۆیەوە بۆ (ئەحمەدی کوڕی عومەر)ی گێڕاوەتەوە کە یەهودییەکان گلەییان لە (محەممەد) کردووە و گوتوویانە (محەممەد) لەژیاندا تەنها شتێکی نەکردووە گەر لە کەلێنێکەوە دژایەتی ئێمەی پێنەکردبێت. شەریعەتی خواردن و خواردنەوەشیان لەگەڵ ژنی خوێندارردا حەرامکردبوو، بەڵام (محەممەد) تەنها جووتبوونی حەرامکردبوو. لەهەمان سەرچاوەوە و لە لا٦١١دا لەدرێژەی باسەکەیدا (نوحاسی) لە زمانی (ئەنەس)ەوە دەڵێت" (محەممەد) ئامۆژگاریکردوون و فەرمانی پێکردوون، کە لەگەڵ ژنانی بێنوێژدا نانبخۆن و بخۆنەوە، بەڵام تەنها جووتبوون لەفەرجەوە نەکەن، بەڵکو جووتبوون لەپشتەوە بکەن. (نوحاسی) بۆ سەلماندنی ئەو گوتەیە لە ڕێچکەی شافیعیدا کە (ئەبو جەعفەر) گوتوویەتی، دەڵێت: "بۆ (ئەحمەد بن محەممەد بن حەجاج) خوێنراوەتەوە کە لەڕێگای زنجیرەیەك لە هاوەڵی پەیامبەر و (عائیشە) خۆیەوە و راستەوخۆ لە زاری (مەسروق)ەوە، کە لە (عائیشە)ی بیستووە، گوتوویەتی: هەموو شتێك بەڵام جووتبوون لەفەرجەوە نا". بۆ تێگەیشتن لە تێکەڵی و پێکەوەژیانی نێوان ئیسلام و یەهودی و مەسیحی بڕوانە تەفسیری (المنار)، کە دەڵێت: ".. حيث الاختالط بين العرب واليهود ، وهؤلاء يشددون في مسائل الحيض والدم، كما هو مذكور في الفصل الخامس عشر من سفر اللاويين من الاسفار التي يسمون جملتها التوراة ، ومنها أن كل من مس الحائض في أيام طمثها يكون نجسا، وكل من مس فراشها يغسل ثيابه ويستحم بماء ويكون نجسا إلى المساء، وكل من مس متاعا تجلس عليه يغسل ثيابه ويستحم بماء ويكون نجسا إلى المساء، وإن اضطجع معها رجل فكان طمثها عليه يكون

نجسا سبعة أيام، وكل فراش يضطجع عليه يكون نجسا إلخ .. وللرجل الذي يسيل منه دم نحو هذه الاحكام عندهم..". لەهەمان تەفسیردا لەبارەی مەسیحییەکانەوە بەمشێوەیە دەدوێت: " وأما النصارى فقد نقل عنهم أنهم كانوا يتساهلون في أمر المحيض وكانوا مخالطين للعرب في مواطن كثيرة ، وروي أن أهل الجاهلية كانوا لا يساكنون الحيض ولا يؤاكلونهن كفعل اليهود والمجوس، ومن شأن الناس التساهل في أمور الدين التي تتعلق بالحظوظ والشهوات فال يقفون عند الحدود المشروعة فيها لمنفعتهم ومصلحتهم، فكان اختلاف ما عرف المسلمون عن أهل الكتاب مما يحرك النفس للسؤال عن حكم المحيض في هذه الشريعة المصلحة ، فسألوا كما في حديث أنس الاتي قريبا فأنزل الله تعالى على نبيه : ويسألونك عن المحيض..". لە دەقی ئەم تەفسیرەدا وا هاتووە کە مەسیحییەکان ئاسانکارییان بۆ ژنانی بێنوێژ کردووە و زانیویانە کە عەرەبە جاهیلییەکان زۆر خۆیان لە ژنی بێنوێژ بەدوورگرتووە.

ئایەتی ٣٩ لە سورەتی (الرعد) دەڵێت: " يمحو الله ما يشاء وعنده ام الكتاب". (قورتوبی) لە تەفسیری ٚ ئەم ئایەتەدا دەڵێت: "أي يمحو من ذلك الكتاب ما يشاء أن يوقعه بأهله ويأتي به ويثبت ما يشاء، أي يؤخره إلى وقته، يقال: محوت الكتاب محوا، أي أذهبت أثره". واتە: "ئەوەی حەزبکات خوا، لە قورئان دەیسڕێتەوە وەکو ئاماژە و ئاگادارییەکی موسڵمانان. ئەوەشی بیەوێت دوایدەخات بۆ کاتی خۆی: دەگوترێت: کتێبەکەم لەناوبرد، واتە هیچ نیشانەیەکیم نەهێشت". لەشوێنێکیتردا و لەدرێژەی تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: " وقال ابن عمر: سمعت النبي - صلى الله عليه وسلم - يقول: يمحو الله ما يشاء ويثبت الا السعادة والشقاوة والموت". واتە: "ئیبن عومەر گوتوویەتی: گوێم لە پەیامبەر بوو دەیگووت: ئەو شتەی بیەوێت خوا دەیسڕێتەوە، جگەلەوانەی پێوەندی بە خۆشی و شادی یاخود بە نەگبەتی و مردنەوە هەیە"، هەروەها دەڵێت: "وعن أبي عثمان النهدي أن عمر بن الخطاب - رضي الله عنه - كان يطوف بالبيت وهو يبكي ويقول: اللهم إن كنت كتبتني في أهل السعادة فأثبتني فيها، وإن كنت كتبتني في أهل الشقاوة والذنب فامحني وأثبتني في أهل السعادة والمغفرة، فإنك تمحو ما

تشاء وتثبت، وعندك أم الكتاب". واتە: "لە زاری ئەبی عوسمانی نەهدییەوە، عومەری کوڕی خەتاب خوای لێڕازیبێت بە دەوری کەعبەدا تەوافیدەکرد و دەگریا، دەیگووت: خوایە، ئەگەر منت لە ریزی خەڵکی ئاسوودە و چاکەکار نووسیوە، ئەوا جێبەجێبکە، خۆ ئەگەر لە ریزی خەڵکی نەگبەت و خراپەکارت داناوم، ئەوا بمسڕەوە و بمخەرە ریزی چاکەکارانەوە، تۆ ئەوەی ئارەزووبکەیت دەیسڕیتەوە و ئەوەشی بتەوێت دوای دەخەیت، جیبەجێیدەکەیت، دایکی قورئانیش لای تۆیە". لای (تەبەری) تەفسیرێکیتر بەدیدەکرێت. ئەو پێیوایە کە قورەیشییەکان خۆیان زۆر بە گوناهبار زانیوە و وادەرکیانکردووە، دەچنە دۆزەخ، بەلاّم لەرێگای (ناسخ و منسوخ)ەوە خوا هەم دەتوانێت ئایەت و دەقەکان بسڕێتەوە و جێگەیان بگرێتەوە بە ئایەتی نوێ و هەم دەشتوانێت بڕیاری چارەنووسساز لەسەر بەندەکانی خۆی بگۆڕێت، گەر بڕیاریدابێت بیانخاتە دۆزەخ، ئەوا دەتوانێت لەرێگای پاڕانانەوە و دوعا، لەرێگای داواکردن بە ئایەتی تازە دەتوانێت ئەو بڕیارە بگۆڕێت و بیانخاتە بەهەشت. سەرباری هەموو ئەو تەفسیرە جیاوازانە، هەندێکیتر لە زانایانی لاهوتی و نەیارانی ئیسلام باوەڕیانوایە، لەدوای ئەوەی (محەممەد) لە چیرۆکی (الغرانیق)ەکەدا ئەو دیاردەیەی دەرخست، لەوێوە ئیتر موسڵمانان پەنایانبردەبەر ئەوەی خوا دەکرێت لە بڕیارە چارەنووسسازەکان پەشیمانببێتەوە و ئاڵوگۆڕیان تێدابکات. لەم ئایەتی ژمارە ٣٩ی سورەتی (الرعد)ەوە مانای (محو)ی (نسخ)مان بۆدەردەکەویت، کە بەواتای سڕینەوەی لە ریشەی ئایەتێك، بڕیارێك، یاخود دیاردەیەك و جێگرتنەوەی بە بڕیار و دیاردە و ئایەتی تازە دێت. لەمبارەیەوە (ئیبن کەسیر) لەتەفسیرەکەیدا، بەرگی یەکەم ، والمبا َح َم حًلالً نٌّحول الحًل َل حراماً، والحرا لا١٠٤دا دەڵێت: "عن ابن جرير تعليقاً على الاية "مانسخ من آية" قوله أي: ُ نحول الحلال حراما والحرام حلالا، والمباح محظورا، والمحظور مباحا". (ئیبن کەسیر) لەم تەفسیرەیدا کە لە (ئیبن جەریر)ەوە دەربارەی (ما نسخ من اية)ەوە گوتوویەتی: حەرام دەکاتە حەلاڵ و حەلاڵیش دەکاتە حەرام و رێگەپێدراو دەکاتە قەدەغەکراو و قەدەغەکراویش دەکاتە رێگەپێدراو. ئایەتی٢٦ ی سورەتی (البقرة) دەڵێت: "لا إكراه في الدين قد تبين الرشد من الغي فمن..". "لا إكراه في الدين" یەکێکە لەو

ئایەتانەی زۆرترین قسەهەڵدەگرێت، بە یەكێك لە ئاشتیتخوازترین ئایەتە مەككییەكان دەژمێردرێت كە بووە بە (منسوخ)و لەلایەن دەیان ئایەتیتری كوشتارئامێزەوە حوكمەكەی سڕدراوەتەوە.

(بەغەوی) بەمشێوەیە شرۆڤەیدەكات: "قال سعید بن جبیر عن ابن عباس رضي الله عنهما: كانت المرأة من الانصار تكون مقلاة - (المقلاة من النساء) لا یعیش لها ولد - وكانت تنذر لئن عاش لها ولد لتهودنه، فإذا عاش ولدها جعلته في الیهود فجاء الاسلام وفیهم منهم فلما أجلیت بنو النضیر كان فیهم عدد من أولاد الانصار فأرادت الانصار استردادهم وقالوا: هم أبناؤنا وإخواننا فنزلت هذه الایة: لا إكراه في الدین. فقال رسول الله صلى الله علیه وسلم "خیروا أصحابكم فإن اختاروكم فهم منكم وإن اختاروهم فأجلوهم معهم". دەقی ئایەتەكە بەمشێوەیەیە: "ژنانی لایەنگران منداڵی كوڕیان بۆنەدەما، لەبەرئەوە سوێندیاندەخوارد كە، گەر كوڕیان بوو و ژیا، ئەوادەبێت بیكەنە یەهودی. كاتێك ئیسلام هات بەشێك لەو ژن و ماڵانەی منداڵیان دابووە جووەكان چوونەپاڵ ئیسلام و كاتێكیش (بەنی نەزیر)یان چۆڵكرد هەندێك لە منداڵە كوڕەكانیان سەر بە لایەنگران بوون، بۆیە لایەنگران ویستیان وەریانبگرنەوە، لەبەرئەوە گوتیان: ئەوانە كوڕی ئێمەن برای ئێمەن، بەوهۆیەوە ئایەتی (لا إكراه في الدین) دابەزی. پەیامبەری ئیسلام گوتی، سەربەستییان بدەنێ، گەر هەڵیانبژاردن، ئەوا هی ئێوەن، خۆ گەر ئەوانیان هەڵبژارد، ئەوا لەگەڵ ئەوانن".

(مجاهد) لەبارەی ئەم ئایەتەوە دەڵێت: "كان ناس مسترضعین في الیهود من الاوس فلما أمر النبي صلى الله علیه وسلم بإجلاء بني النضیر قال الذین كانوا مسترضعین فیهم: لنذهبن معهم ولندینن بدینهم فمنعهم أهلوهم فنزلت: لا إكراه في الدین". (موجاهد) دەڵێت كە خەڵكی منداڵەكانیان دەدایەدەست دایەنە یەهودییەكان تاكو منالیان بۆبمێنێت، بەڵام كاتێك (محەممەد) تیرەی (بەنی نەزیر)ی چۆڵكرد ژمارەیەكی زۆر لەو مندالانەیان لەگەڵدابوو، بۆیە دایك و باوكیان هاواریان لێهەڵستا و گوتیان، چارەنووسی ئەوان چییە، ئەویش ئەو ئایەتی (لا إكراه في الدین)ەی بۆ گوتن. وقال قتادة وعطاء: نزلت في أهل

الكتاب إذا قبلوا الجزية وذلك أن العرب كانت أمة أمية لم يكن لهم كتاب فلم يقبل منهم الا الاسلام فلما أسلموا طوعا أو كرها أنزل الله تعالى: لا إكراه في الدين. فأمر بقتال أهل الكتاب إلى أن يسلموا أو يقروا بالجزية فمن أعطى منهم الجزية لم يكره على الاسلام وقيل كان هذا في الابتداء قبل أن يؤمر بالقتال فصارت منسوخة بآية السيف وهو قول ابن مسعود رضي الله عنه". ئەم تەفسیرە باس لەوە دەکات، "(قەتادە) و (عەتا) گوتوویانە: بۆ یەهودی و مەسیحییەکان دابەزی کە دەبوو سەرانەبدەن، لەبەرئەوەی نەتەوەی عەرەب نەتەوەیەکی نەفام و نەخوێندەواربوون. ئەوانیتر لەبەرئەوەی خاوەنی کتێبی پیرۆز بوون، عەرەبەکان جگەلە خۆبەدەستەوەدان بەزۆر بوایە یاخود بەخۆشی هیچیتریان لێقەبوولنەدەکرا. هۆی دابەزینی ئەو ئایەتە ئەوە بوو. دواتر لایەنگرانی ئیسلام دەستیاندایە شەڕ و کوشتاریان تاکو بەزۆر بیسەپێنن بەسەریاندا، لەوێوەبوو ئایەتەکە سڕدرایەوە و ئایەتی کوشتار بەناوی (السيف)ەوە لەبری دابەزی. ئەمانە قسەی (کوڕی مەسعود) بوون خوا لێیڕازیبێت". (ئیبن کەسیر) دەڵێت: "وقال ابن أبي حاتم: حدثنا أبي حدثنا عمرو بن عوف أخبرنا شريك عن أبي هلال عن أسق قال: كنت في دينهم مملوكا نصرانيا لعمر بن الخطاب فكان يعرض علي الاسلام فآبى فيقول، لا إكراه في الدين. ويقول، يا أسق لو أسلمت لاستعنا بك على بعض أمور المسلمين وقد ذهب طائفة كثيرة من العلماء أن هذه محمولة على أهل الكتاب ومن دخل في دينهم قبل النسخ والتبديل إذا بذلوا الجزية. وقال آخرون: بل هي منسوخة بآية القتال وأنه يجب أن يدعى جميع الامم إلى الدخول في الدين الحنيف دين الاسلام، فإن أبى أحد منهم الدخول فيه ولم ينقد له أو يبذل الجزية، قوتل حتى يقتل. وةذا معنى الاكراه قال الله تعالي. ستدعون إلى قوم أولي بأس شديد تقاتلونهم أو يسلمون. يا أيها النبي جاهد الكفار والمنافقين واغلظ عليهم. يا أيها الذين آمنوا قاتلوا الذين يلونكم من الكفار وليجدوا فيكم غلظة واعلموا أن الله مع المتقين. ". ئەوەی (ئیبن کەسیر) بۆماندەگێڕێتەوە، لە زمانی (ئەسەق)ەوە، باس لەوەدەکات کە خۆی مەسیحی بووە، (عومەری کوڕی خەتاب) هەمیشە داوایلێکردووە ببێت بە ئیسلام، ئەویش ڕەتیکردووەتەوە، بۆیە ئایەتی (لا إكراه في الدين) دابەزیوە. تەنانەت

(عومەر) پێیشیگوتووە، گەر ببیت بە ئیسلام، ئەوا بەرپرسیارییەك، کارێکت پێدەبەخشین. لەدرێژەی تەفسیرەکەیدا (ئیبن کەسیر) دەڵێت: ژمارەیەکی زۆر لەدینەکانیترەوە بەدانی سەرانە بە ئیسلام رازیبوبوون، بەلاّم دواتر ئەو ئایەتە بە ئایەتە کوشتارئامێزەکان حوکمەکەی نەما و کەوتنە گیانی ئەو خەڵکە. کار گەیشتووەتە ئەوەی، گەر داوایان لە یەکێك کردبێت کە ببێت بە ئیسلام، گەر نەبووبێت، ئەوا کوشتوویانە. نەیارانی ئیسلام دەپرسن و دەڵێن، مادام (لا إكراه في الدين) هەبوو، ئەی ئەوکات بۆ بەهەشت و دۆزەخ هەبوو، گەر هەمووکەس دینی خۆی هەبووبێت و کەس مەرجنەبوو لە کەس بکەوێت، ئیتر ئەو هەموو ئیشکردنە لەسەر دۆزەخ بۆ چیبوو! (نوحاسی) لە کتێبی (الناسخ و المنسوخ)ەکەیدا و لە لاپەرە ٨١دا بەمشێوەیە باس لەو ئایەتە دەکات و دەڵێت: عەرەبە قورەیشییەکان لەسەر ئیسلام رقیان لە پەیامبەر دەبووە، چونکو شەڕی لەگەڵ دەکردن، بەهیچیان رازینەدەبوو بەئیسلامبوونیان نەبێت. ئەوەی ئەم قسەیەیدەکرد (سلێمانی کوڕی موسا) بوو، هەر ئەویش بوو دەیگوت ئەم ئایەتە بەئایەتێکیتر سڕدراوەتەوە کە دەڵێت: "يا أيها النبي جاهد الكفار والمنافقين واغلظ عليهم ومأواهم جهنم وبئس المصير". دەقی ئایەتەکە ئاوایە: "ئەی پەیامبەر دژی بێباوەڕان و گومڕاکان تێبکۆشە، تەنگیان پێهەڵبچنە دوا مەنزڵگەیان دۆزەخە و چارەنووسیان خراپە ". (نوحاسی) لە (زید بن اسلم)ەوە بۆماندەگێڕێتەوە کە (محەممەد) لە سەرەتای بانگەشەکەیدا نزیك بە دە ساڵی لەمەککەدا بەسەربرد، هیچ کوشتاری لەگەڵ نەدەکردن، ئەوانیش جگەلە کوشتار هیچیتریان نەدەکرد، بۆیە دواتر خوا رێگای بۆ (محەممەد) خۆشکرد شەڕیان لەگەڵدا بکات. هەندێکیتر لە زانایان پێیانوایە کە ئەم ئایەتەی دوایی مەنسوخ نییە، بەڵکو ئەوەی یەکەم بۆسەر ئەهلی کیتاب دابەزیوە و ئەمەیان بۆ بێباوەڕانە. دەگێڕنەوە دەڵێن، (عومەری کوڕی خەتاب) یەخەی پیرێکی مەسیحی گرتووە و پێیگوتووە، ببە بە ئیسلام. ئەویش گوتوویەتی من پیرم و مردن لەبەر دەرگامە. دەڵێن (عومەر) گوتوویەتی وەڵلاّ (ال إكراه في الدين).

ئایەتی ١٩٠ لە سورەتی (البقرة): "وقاتلوا في سبيل الله الذين يقاتلونكم ولا تعتدوا ان الله لا يحب المعتدين". هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە موفەسیرەکان بەمشێوەیە لێکیدەدەنەوە: "أن رسول الله صلى الله عليه وسلم اشتاق هو وصحابته إلى البيت الحرام، وأرادوا أن يعتمروا، فجاءوا في ذي القعدة من السنة السادسة من الهجرة. وأرادوا أن يؤدوا العمرة. فلما ذهبوا وكانوا في مكان اسمه الحديبية، ووقفت أمامهم قريش وقالت: لا يمكن أن يدخل محمد وأصحابه مكة. وقامت مفاوضات بين الطرفين، ورضى رسول الله بعدها أن يرجع هذا العام على أن يأتي في العام القادم، وتخلى لهم مكة ثلاثة أيام في شهر ذي القعدة". "حدثني المثنى قال، حدثنا إسحاق قال، حدثنا عبد الرحمن بن سعد، وابن أبي جعفر، عن أبي جعفر، عن الربيع في قوله: وقاتلوا في سبيل ّالله الذين ُيقاتلونكم ولا َتعتدوا إن ّالله لا يحب المعتدين. قال: هذه أول آية نـزلت في القتال بالمدينة، فلما نـزلت كان رسول ّالله صلى ّالله علية وسلم يقاتل من يقاتله، ويكفُّ عمن كف عنه". لە کتێبەکەی (نوحاسی)ەوە ل٢٧: قال ابن زيد هي منسوخة، نسختها (وقاتلوا المشركين كافة كما يقاتلونكم كافة). موفەسیرە ئیسلامییەکان هۆکاری دابەزینی ئەو ئایەتە دەگێڕنەوە بۆئەو رووداوەی تێیدا (محەممەد) ساڵی شەشەمی کۆچی ویستوویەتی بۆ بەئەنجامدانی عەمرە سەردانی ماڵی حەرام بکات، ئەوەبوو لە (حودەیبییە) لەگەڵ قورەیشییەکان کۆبوونەوە، بەلاّم رێگەیان پێنەدان عەمرەکەیان بکەن. ساڵی دوای ئەوە بەهەمانشێوە دەبوو بۆ عەمرە بچوونایە ماڵی حەرام، بەلاّم بۆ بەرگرتن لەهەمان بڕیاری ساڵی پێشوو ئەوەبوو ئایەتی "وقاتلوا في سبيل الله الذين.." دابەزی. لەدرێژەی تەفسیرەکانیاندا شرۆڤەکاران لە ئایەتەکەی یەکمجاردا مەبەست لەوەبووە کە ژن و منداڵ و پیاوی پیر نەکوژرێت، چونکو محەممەد لەشەڕەکاندا ئەو دیمەنانەی بینیوە و رقی لێبووەتەوە، وشەی (معتدين) لەوێوە هاتووە، چونکو ئەوە بەتەعەدا حیساببووە، بەلاّم دواتر کە (نسخ)کراوە و ئایەتی دووەم دابەزیوە. (تەبەری) دەڵێت:"حدثني يونس، قال: أخبرنا ابن وهب، قال، قال ابن زيد في قوله: "وقاتلوا في سبيل الله الذين يقاتلونكم". إلى آخر الاية، قال: قد نسخ هذا! وقرأ قول ّالله: َ"وَقاتِلوا المشركين كافة كما يقاتلونكم كافة.سورةتی (التوبة) ئایةتي ٣٦. وهذه

الناسخة، وقرأ: براءة من الله ورسولِه حتى بلغ: فاذا انسلخ الاشهر الحرم فاقتلوا المشركين حيث وجدتموهم الى: ان الله غفور رحيم. سورة التوبة، ئايەتی ٥". دەقی ئەو لێدوانەی ) تەبەری) بەمشێوەیەیە: "(ئیبن وەهەب) هەولێداوینەتیٚ، وتی، (ئیبن زەید) گوتوویەتی: ئایەتی (وقاتلوا في سبيل ّالله الذين ُيقاتلونكم) بە ٣٦ی سورەتی (التوبة) (نسخ)کراوەتەوە کە دەڵێت وقاتلوا المشركين كافه كما..). ئەوەش دواتر (نسخ)کراوەتەوە، تاکو گەیشتووەتە ( فاذا انسلخ الاشهر الحرم..)".

زانایانی ئیسلام بەمشێوەیە بیانووی رەوایەتیی کوشتارەکانی ئیسلام و ئەو ئایەتانە دەهێننەوە: "إنه القتال لله، لا لأي هدف آخر من الاهداف التي عرفتها البشرية في حروبها الطويلة. القتال في سبيل الله . ال في سبيل الامجاد والاستعلاء في الارض، ولا في سبيل المغانم والمكاسب". "أولها: أن الاية منسوخة بآيات أخر، تأمر بقتال المشركين مطلقا، نحو قوله تعالى: "فاقتلوا المشركين حيث وجدتموهم". هەروەها ئایەتی ١٩ی هەمان سورەت دەڵێت: "قاتلوا الذين لا يؤمنون بالله ولا باليوم الاخر". واتە:"تێکۆشان و کوشتار لەپێناو رێگای خوادایە، لەپێناو هیچ شتێکیتردا نییە.."

●●●

### پەراوێزەکان:

*) (نبت) شارێك بووە كەوتووەتە باشووری شامی ئەو سەردەمەوە.

**) بڕواننە توێژینەوەکەی دکتۆر (لیث شاكر محمود رشید) دەربارەی زمانی عەرەبی، هەوەرها بڕواننە لێکۆڵینەوەکانی دکتۆرە (خیال محمد مهدی الجواهری)، کچی شاعیری بەناوبانگی عەرەبی عێراقی.

# زمان و شیعر

ئیسماعیل فەرەج

مرۆڤ ئەوکاتانەی چمکی هەقیقەتێکی بۆ ئاشکرادەبێت مانای ئەوەنییە کە ئیتر ئاسوودەیە و دڵی ئاویخواردووەتەوە، بەڵکو پێویستی بەوەهەیە لە چۆنیەتی ئەو دڵنیاییی و گەیشتن بەو هەقیقەتە تێبگات. لەگەڵ بەرژەوەندی و داخوازییەکانیدا بیانگونجێنێت. مرۆڤ لەو سەرقاڵییەدا دەگاتە ئەو باوەرەی کە هەقیقەت تەنها تایبەت نییە بەخۆیەوە یاخود پلان بۆ دارێژراونییە کە لەرێگەی رەوشێکی روون و هەستپێکراوی ئامادەکراودا بەرجەستەبووبێت، بەڵکو هەقیقەت تێگەیشتنە لە مرۆڤەکە خۆیی و تێگەیاندنی دەوروبەرەکەیەتی بۆ بەردەوامبوون و بەشوێنداگەڕان. نالی لە شاکرێکی پڕمانادا لە لاپەرە ١٢١ی دیوانەکەیدا دەڵێت:

**وا زەن مەبە روخسارەیی تۆ غائیبە قوربان**
**بنوارە چـلۆن نەقشە لەنێو دیـدەیی تەڕما**
**یا توربەتیٚ، یا غوربەتیٚ باریٚ بشکێنین**
**هەر مونتەزیرە (نالی) ئەگەر مرد و ئەگەر ما**

ئەو شێوە تێگەیشتنن و تێگەیاندنانە دەبنە رێوگەیەك بۆ درککردنی ئەو زمانەی شرۆڤەی هەقیقەتەکەی پێدەکات. چونکە (زمان) وشەیەکی مەزن و پڕمانایە. باڵای زمان هێندەی باڵای هەموو شت و بابەتێکە. خاوەن توانایەکی گەورەی ئەوتۆیە کە مرۆڤ دەگەیەنێت بە کرۆکی مانای ئەو درك و تێگەیشتنە. هەر لەو مانایانەوە بونیادی نویٚ و بۆچوونی بەڵگەیی و وێناکردنە مادی و بۆچوونە هزرییەکان بەرجەستەدەبن.

هەستیارترین بابەتی زمان لە شرۆڤەکردنی بیر و مێژوودا بە پەیوەندییەکانی شیعر و فەلسەفەی زمانەوە دەردەکەون. تێڕوانینی شیعر تاوەکو ئەم سەردەمە لە روانگەی خەیاڵ و ویژدانەوەیە. لەهەمانکاتدا خەڵکی وەك هزر و بیرکردنەوە لە فەلسەفە دەڕوانن. ئەم هۆکارە وایکردووە چەندین شێوە تەمومژ و نادیاری لە پەیوەندی نێوان شیعر و فەلسەفەدا کاڵببنەوە. زۆرجار راوبۆچوون و تێڕوانینیی شاعیرانی وەك: نالی، مەحوی، پیرەمێرد، گۆران، مەولەوی.. هتد بەفەلسەفەوە دەلکێنرێت . ئەم پێکەوەلکانە کرۆکی مانای شیعرەکە تاڕادەیەك بەلاوەدەنێت. ئەو شێوە تێڕوانینە فەلسەفییانەیە لە دارِشتن و شرۆڤەی شیعری کوردیدا بوونەتە هۆکارێك بۆ دانان و جیاکردنەوەی زمانی شیعر لە خانەی فەلسەفە و حیکمەتدا تاوەکو ئێستا بەدەگمەن نەبێت وەك لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی و دەروونی و کۆمەلآیەتی لێیاننەکۆڵراوەتەوە، بەلاّم ئەو لێکۆڵینەوە و باسە زمانەوانییانەشی بوونیان هەیە، ئەوە پڕۆژەی پڕبایەخن و ئاراستەیکی گونجاویان بۆ تێگەیشتنی ئەم شێوە تێڕوانینە وەرگرتووە. تێگەیشتن لە شیعر سەنگی مەحەکە بۆ چۆنیەتی بەکارهێنانی زمان و ئەو بیرکردنەوە بورکاناوییانەی مانای شیعرەکان دەگەیەنن. لە لاپەرە ٢٣٦ی دیوانەکەیدا دەڵێت:

**جێی زوبان گرتن و دڵڕۆشنی و سووتانە**

**موقتەدا شەمعە کە خامۆش نییە ئەمما نییە باس**

شێوازی نووسینی باو لەفەلسەفەدا لە شرۆڤەی واقیعەکەدا ئاشکرا و دیارە کە جۆری وشە و دارِشتنەکەی هاوکاریی بەرجەستەبوونی ئەو شێوە راڤەکردنانە دەکەن. زمان تێیدا دەبێتە برەرێکی جیاکەرەوەی دادپەروەر لە سنووری پەیوەندی نێوان شیعر و فەلسەفەدا. زمان شیعر دەکاتە ئەو سیستەمەی کە بنەماکانی زمانەوانی لەخۆیدا شاردبێتەوە یاخود خەرمانێك بەرهەمی بەردەوامی مانادار لەخۆیدا پەنگدەدات. کاتێك ئەم بابەتە بە مانای تێگەیشتن و تێڕوانینی هزرەوە دەلکێت پرسیارێك دروستدەبێت: ئاخۆ

کیٚ بتوانێت مانای راستەقینە لەو سیستەم و شەپۆلە سەرکەشانە بەرهەمبهێنێت کە بە زمانی شایستە ئاودێری بیروبۆچوون و تێڕوانینی هزر بکات؟ ئەم پرسیارە تێڕوانینی مانادار و بێمانا لەیەکتری دەترازێنێت.

چۆنیەتی خوێندنەوە و تەنانەت نووسینی بەرهەمی شیعری کە ئارکۆن ناویناوە هزری چوونیەك[1]. مەبەستی ئارکۆن لەوەدایە کە توێژینەوە لە دەقی نووسینێکی شیعری لە راوانگەی سەردەم و شوێن و زمانێکدا مانای بەرجەستەبوونی دەقەکە خۆیەتی. ئەو سیٚ بوارە خۆیان خەسلەتی مانادار و بەرهەمی بیر و تێڕوانینەکە تۆکمەتردەکەن و مێژووییەکی بە بنەما دادەڕێژن. لێرەوە هیچ جۆرە پێگەیەکی لێکۆڵینەوە و لێدوان و پابەندبوون ناتوانێت چۆکی بێمانایی و تۆمەتی هۆنینەوە و مانای شوێنکەوتەیی بە نووسینی راستەقینەی مانادار دابدات ببێتە هۆی ئەوەی کە کرۆکی پێشکەوتنی مێژوو لەبەرهەمەکەدا گیربکرێت وەك چۆن سۆنگەی هوشیاری لەفەلسەفەدا دەبێتە رەوتی گۆڕانکاری زۆر بواری مادی و مرۆڤایەتی دنیا و لە رەوالەتی مامەڵە و هەڵسوکەوتەوە دەستدەخاتەسەر ئەو گۆڕانکارییانەی کرۆکی پێشکەوتنی مێژووی مرۆڤایەتی بەرجەستەدەکەن. من باوەڕم بەوەهەیە کە لە خوێندنەوەی وردی چەند جارەی شیعردا، وەك نموونەیەك بۆئەم باسە لە یەکێك لە شیعرەکانی نالیدا دەتوانرێت مەبەست و مانای نویٚ لەم روانگەیەوە بدۆزرێتەوە، چونکە نالی خۆی هەستی بەم رەوشە کردووە. لەخۆیەوە نییە کە لە لاپەرە ٤٨٢دا دەفەرموێت:

بەحری غەزەلم پڕ لە دووڕ و گەوهەرە ئەمما
غەواسی دەویٚ، یەعنی بە تەعمیقی بزانە

نکۆڵی لەوەناکرێت کە هەموو باتەیێکی هزر و بیر و هەست و ویژدان و سۆز لەڕێگەی زمانەوە بە مرۆڤ دەگەن. نالی زۆر هزرمەندانە درکی بەم لایەنەکردووە. ئەوەتا لەشیعرێکدا مانای کێشی شیعرەکەی کردووە بە ئامرازێك یاخود هۆکارێك و دوای چەند

بابەتێکی جیاوازی ماناداری خستوون. وێنایەیەکی راستەقینەی هەست و هوشیاری مرۆڤی پێبەخشیوون. وەك هەر وێناکردنێکیتر وان کە وەزیفە راستەقینەکەی لە مانا زمانەوانی و فەلسەفییەکانیەوە نەبێت دەرنەکەون. ئەمە مانای هەوڵدانە بۆ گواستنەوەی ئەو هەستە بەرەو هزر، لە نموونەیەکی دەگمەنی پڕمانادا نالی مەزن لە لاپەرە ١٢٢ـ١٢٤ی دیوانەکەدا دەفەرموێت:

**جینانی وەک جینان کردم بە ماوا**
**حـــەبیبەی مـاڵیاوا ماڵی ئــــاوا**
**حـەلاڵی بێنیکاحی حــۆری عەینم**
**بە جووتیٚ نازیری شـــەرع و فـەتاوا**
**زەفـافەتگاهی پەردەی ئاڵی چاوم**
**موبارەک لە حەجلەبیٚ بۆ بووک و زاوا**
**سیداقی روونما و وەسلی شاهید**
**لەگەڵ شـــاییکەران بێدەنگ و داوا**
**ویسـالی بێکەم و کەیفی حوزوری**
**لە (نــالی) گەر دەپـرسـی یەعنی ئاوا**

زۆرجار لەناو شاکارێکی لەمجۆرەدا، کە بۆ مانا بگەڕێین ناچاردەبیین ماناکان لەگەڵ ئاستە دەروونی و کۆمەلاٚیەتییەکاندا بەراوردبکەین و بکەوینەناو دەریای فەلسەفەوە. ئەم شاکارەی نالی زۆرجۆر بەراورد دەگرێتەخۆی و شایانی زۆر زیاترە. ئەوەندەی لەم شاکارە بڕوانین گەلێك مانا و مەبەستی گەرەی شیعر و داڕشتنی پەخشان ئاسای پڕبایەخی تیادادەبینرێتەوە. چۆن؟ چونکە خوێندنەوەی ورد لەشیعردا مانا و مەبەست و تێڕوانینی نویٚ لە رەوالەت و ناوەڕۆکی ماناوە دەخەنەڕوو. لە خوێندنەوەی ئەم شاکارەدا خوێنەر تێبینی ئەوەدەکات کە مرۆڤ زۆرجار ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بووە خەمۆکی

یەخەیدەگرێت و کپیدەکات، بەلاّم مرۆڤێك کە خاوەن هەست و هۆشێکی ئەدەبی یاخود هونەری بێت کە لەهزرەوە سەرچاوەیگرتبێت، ئەو خەمۆکییە سەرەونوخندەکات . وەك ئاسودەیی و چێژ مامەلەی لەگەلّدادەکات.

زۆرجار لە شیعری شاعیرەکاندا هەست بە خەمۆکی و گڕی دەروون دەکەین، لە ژیانی کۆمەلاّیەتیدا بەهۆکاری جیاواز کلّپەیان لە شاعیرەکە هەلّساندووە، بەلاّم توانا و بەرفراوانی تێڕوانینیان، وەك لەو نموونەیەی لای نالیدا ئاشکرایە کە خۆی خاوەنی بووە توانیویەتی زۆر بەکارامانە دایانبمرکێنێتەوە. جوانی و ئاسودەییەکی پڕمانای ئەوتۆی پێبەخشیوون کە بوونەتە هۆی رەوینەوەی ئەو خەمۆکییانەی کە تەنانەت زەفەر بە خوێنەرەکەشی دەهێنێت. ئەم شاکارە یەکێکە لەو شاکارە جوان و پڕمانایانە، ترۆپکی ئاسودەیی لێبەرجەستەکردووە. کەسێکی رەشبین و خومۆکی وێناکردووە و حەبیبە بووەتە مژدەبەخشی ئاسودەیی و لەو تانهاییە خۆیی دەربازکردووە. بەوەشەوە نەوەستاوە بۆ بەردەوامی ئەو ئاسودەییە تێگەیشتن و تێگەیاندنی راستی رەوشەکە پەلی یەکێکیان گرتووە و هەردووکیان چوونەتەسەر ئەو کانیاوەی کە یاساکانی سەرزەمین و شەریعەتە ئاسمانییەکان بەربەستیان بۆ دانەناون.

ئەمە نهێنی بیرکردنەوەی رەوالەتی دلّنیاییە کە کە گومان لەسەر خالّی هەنگاوەکانی تێگەیشتن ئاشکرادەکات بۆ بەشوێندا گەڕان. ئەوکاتانەی دەکەوێتە گەڕان بەدوای ئاسودەییدا لە ئاسمانێکی تەماوی پڕ هەورە بروسکە و لێزمە بارانەوە هەولّی رامالّینیان دەدات و پەردەی پەلکەزێڕینەی رەنگاوڕەنگ بە ئاسمانی ئەو دنیایەدا هەلّدەواسێ و بڕیاری دروستکردنی مێژووی تیادادەدات. هەرچی پەلەی رەش و رەشبینی هەبێت بە بای بیری هزرمەندانە رایاندەمالّێت. دەروون و جەستەی بە ئاسمانی ساف و بێگەردەوە بالەفڕێدەکەن. کاتی راستگۆیی و بینینی خود روونتردەکاتەوە.

نالی ئەم شاکارەی لە داڕشتنی پەخشانێکی پڕمانای جوانەوە لێوانلێوکردووە لە کێشی ئاوەدانی و لە هونەری شیعردا کورتیکردوونەتەوە. هاوسەنگییەکی شایستەی لەنێوان بابەت و ئاماژە و دەنگی زمانەوانیدا دروستکردووە. کەمکەس لەو سەردەمەدا

توانیویەتی بەوشێوە تێڕوانینە بدوێ. لە سیستەمێکی پڕمانادا کێش و ئاوازی ئاوەدانی جەستە و دەروونی داونەتێ و ڕێزی پێودانگە ئایینی و کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتییەکانی بەلاوەنەناوە. بەرزنرخاندوونی. کردارە نەریتییەکەی تیاداجوانترکردووە. بەهەر پێودانگێکی زمانەوانی یاخود بیری فەلسەفی تەماشابکرێت گەمەیەکی شارەزایانەیە کە هاوسەنگی نێوان دەنگ و ترپەی دڵ و ئاماژە و مانای کردارەکەی کاراترکردووە. ئاماژەی پڕمەبەستی بەهەموو وشەکان بەخشیووە. ئەوە چەندین سەدەیە لەهەمان مەبەست و بۆ هەمان بۆنە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی پارێزگاری لەو شێوە دەستبەندییە نەریتییە دەکات، کەچی ئەم مەزنە مەبەستێتی خۆیی لێدەربازبکات و مانا و کرۆکە مرۆڤایەتییەکە بەرزتر بنرخێنێت.

زۆر شارەزایانە پێکهێنانی وشەکانی لە دوو ئاستەوە بە ڕستەی راستەقینەی هزرەوە بەستووەتەوە: یەکەمیان ئاستی ئاماژەی سایکۆلۆژی و دووەمیان لەئاستی ڕێزمانەوە. هەردووکیانی بە کۆمەڵێك وشەو دەستەواژەی کردارەکەوە لکاندووە. لەچەندین سۆنگەی جیاوازەوە بابەتی ناو کردارەکەی کۆکردوونەتەوە و مانای ئاشکرای پێداوون. ڕەوشێکی پێوروژاندووە کە خاوەن بنە و بنچینەیەکی تایبەتییە و ئەو شاکارە جوانەیان بەرجەستەکردووە. لەئاستی ترپەی دڵ و دەنگی حەزەوە جوانترین ئاوازی هەقیقەتی ئاوەدانی تیادابەدیدەکرێت. هەڵوێستەی گونجاوی تەمەنی جیاوازی پێوەدیارە، چونکە چەندین ڕوونکردنەوە و پرسیار و مانای جیاوازی لەیەککاتدا ئاشکراکردووە. لەو روانگەیەوە بەبەرزکردنەوەی دەنگی پرسیارێك کۆتاییهێناوە. ئەو کۆتاییە لەو شێوە ئاماژە و مانا و هەڵوێستەوە جارێکیتر بەهۆشێکی پڕبایەخەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتا و بەردەوامبوون و بەمشێوەیە (یەعنی ئاوا). خۆی وتەنی جارێك و چەند جارێکیتریش ئاوەدان. مەبەست ئەوەیە کە نالی بابەتەکەی لە چپەی دەنگ و ئاماژە و مانای شایستەی زمانەوە ئالاندووە. تاوەکو بتوانێت هەستی کردەوەیی بجوولێنێت. ئەم کردارە دروستنابێت ئەگەر زمانەوانی کارامە و بەتوانا جەمسەرەکانی نەگرێت و هاوسەنگینەکات. هەر بەیتێکی ئەم شاکارە مانایەکی تایبەتی خۆیی هەیە و وابەستەیە بە مانای پاش خۆیەوە هەمووشیانی وەك مانایەکی هەستپێکراوی مادی و مرۆڤایەتی لەناو ژیانی کۆمەڵایەتیدا

کۆکردووەتەوە و مانایەکی روونی گشتگیری داونەتیّ.

بابەتی زمانی شیعر شرۆڤەی جیاواز و بۆچوون و تیّڕوانینی جیاواز بەدوایخۆیدا کیّشدەکات. هەر زمانە کە کرۆکی مانای جیاواز و چوونیەك لەچەندین بواری فەلەسەفی و سایکۆلۆژی و سۆسیۆلۆژیادا ئاشکرادەکات و هەقیقەتی تیّگەیشتن و تیّگەیاندنی سەردەم و بیر و میّژووی مادی و مرۆڤایەتی دیاریدەکات.

●●●

**سەرچاوەکان:**

١. دیوانی نالی، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٦.
٢. نحن و التراث، قراءات معاصرة في تراثنا الفلسفي، م. الجابري، دارالطليعة، بيروت، ١٩٨٠

# توندوتیژی و ئایینداری

ن: د. عەبدولکەریم سروش
و: ئــەرســـەلان تـۆفیق

وەك ئەحمەدی شاملو دەڵێت (روزگار غریبی است نازنین!) ئێمە لە ژیانێکی سەیردا دەژین، ئایینداران و ئایینەکان تۆمەتبارن بە بەرهەمهێنانی توندوتیژی، رۆژگارێکە لە دارودیوار، لە زانست و پیشەسازی و تەکنۆلۆژیاکەیدا، لەسەرمایەدارییەکەیدا، توندوتیژی دەبارێت، ئاییندارن و ئەوانەی کە پابەندی ئایینین، دەبێت تاوانباربن، لەهەموو جێگەیەکیشدا لەسەنگەری بەرگریدابن و سەرقاڵی پاساوهێنانەوەبن بۆ ئەوانیتر کە ئەو توندوتیژییەی لەجیهاندا بلاوەیکردووەو پەرەیسەندووە و جیهانی پڕکردوە، بەشێوەیەکی گشتی رەگوڕیشەی ئەم توندوتیژییە لە شوێنیترەوە سەرچاوەیگرتووە، ئەگەر کەسانی شایەنیش رۆڵێکیان هەبێت – کە هەیانە- ئەوا (کەمینە)ن، ئەگەر لە بیری چارەسەری (توندوتیژی)یشدا بین، ئەوا دەبێت چارەسەری لایەنی ئەندێشەی بنەڕەتی و قووڵ و رادیکاڵییانە بێت.

ئێمە گومانمان لەوەنییە کە لەتەواوی مێژووی ئایینەکاندا، لە سەردەمی سەرکەوتن و دەستڕۆیشتن و حکومەتداری و دەسەڵاتی ئایینەکاندا توندوتیژی کەمنەکراوە، بەناوی خوداوە، بەناوی ئایینەوە، لەڕێگەی دروستکردنی چینی کۆمەڵایەتی بەخواست و بەبێئاگایی، بێباوەڕ و باوەڕدار، هەڵگەڕاوە-مورتەد-، دووڕوو- موناق-، بیدعەچی و چەندین ناوناتۆرەیتر، ئێمە کون و کەلەبەری گەورە لەنێو کۆمەڵگە و مێژوودا دەبینین، دڵنیادەبین کە ئەو کەلەبەرانە بە دروستکردنی ئاریشە و رووبەڕووبوونەوەی خۆێنین کۆتاییانهاتووە. هەڵبەتە ئەمەش قوتابخانەکان (چی قوتابخانە مرۆییەکان یان قوتابخانە ئایینییەکان) ئەم دۆخەیان لەنێو خەڵکیدا روستکردووە، جیاوازی و کەلەبەر دروستدەکەن، ئەو قوتابخانانە لەم رێگەیانەوە پەرەیانسەندووە بۆیە نەیانتوانیوە خۆیانی لێبەدووربگرن.

رووی راستەقینەی ئەم بابەتەش بریتییەلەوەی کە یەکەم مرۆڤ ئامادەگییەکی تێدایە بۆ دەسەلاَت بەدەستەوەگرتن، بۆئەوەی ئەوانیتر بخاتە خزمەتی خۆیەوە، بۆئەوەی زۆر بلێن، بۆ دروستکردنی هێزی بێسەروبەر و بەلّتەجی، بۆ فراوانکردنی بازنەی دەسەلاَت و فتوحات و خستنەژێر رکێفی خۆیانەوە، لەلایەکیتریشەوە، بیرکردنەوە بەشێکی دانەبڕاوی مرۆڤەکانە، مرۆڤ ناتوانێت بە مێشك و هزرێکی بەتاڵەوە بژی، بۆیە بەناچاری پێویستی بە هزر و بیرکردنەوەیەك هەردەبێت، لەڕێگەی ئەم یان ئەو قوتابخانەیەوە شوناسی خۆی ئاشکرادەکات و بەناچاری خۆی دەخزێنێتەنێو جەنگێکەوە، وەك یەکێك لە مێژوونووسەکان دەڵێت: تەواوی مێژوو بریتییەلە ئاگربەستێك لەنێوان جەنگەکاندایە. واتە حەقیقەت بریتییەلەوەی بەرلەوەی ئێمە ئارامی و ئاسایشمان هەبێت جەنگمان هەیە، ئەم جەنگانەش بێگومان مرۆڤەکان کردوویانە، بەناوی حۆراوجۆر، بە بیانووی جۆراوجۆر، هەندێکجار بە بیانووی ئایینی، جارێکیتریش بە بیانووی قوتابخانە نائایینیەکان، جارێکیتریش بە بیانووی داگیرکردنی زەوی ئەوانیتر، جارێکیتریش لەسەر ماڵ و سامان، جارێکیتریش لەسەر کەلوپەل و هەروەها بە بڕوبیانوی جۆراوجۆریتر.

ئەڵبەتە ئێستە ئێمە لە ماوەیەکی مێژویی تایبەتیدا دەژین کە توندوتیژی زۆر جیاوازتر لەوانەی پێش لە ئێمە، ئەمڕۆ بەهۆی ئەوەی کە (میدیا) بوونی هەیە و لەبەرئەوەی دەتوانێت لە (کا) (کێو)ێك دروستبکات و لەبەرئەوەی هەموو میدیاکانی دونیا بەدەستی خەڵکانی بێدین و عەلمانییەوەیە و ئەوانیش باوەڕدانیان خۆشناوێت، هەروەها لەبەرئەوەی ئاییندارانێك پەیدابوون کە بەدوای شوناسی پاکوپوختی دینەوەن و لەبەرئەوەش توندوتیژی ئەنجامدەدەن، ئەمانە بوونەتە هۆی ئەوەی تێڕوانینی ئێمە پەیوەستبێت بە زەمینەیەکەوە کە پەیوەندی بە ئاییندارانەوە هەیە. دوای ئەوەش کۆمەڵە کەسانێك بێنەپێشەوە کە زۆر نامەردانە هاربکەن: هەموو توندوتیژییەکان،هەموو کێشە و فەرتەنەکان، لەئاییندارانەوەیە، ئەگەر باوەڕداران لەسەر لاپەڕەی رۆژگار بسڕینەوە، جیهان دەبێتە گولستان و ئێمە لەسەرزەمینێکدا ژیان دەگوزەرێنین کە وەك بەهەشت دەبێت.

بەڵام ئەوان بێئاگان لەوەی کە ئەو جیهانەیتر، ئەو ئەوروپایە لە سەدەی بیستەمدا دوو جەنگی گەورەی جیهانییان هەڵگیرساند، وەك ئەوەی چەند جاریتریش باسمکردووە، ئەو جەنگانە رووی سەرجەم جەنگەکانی مێژوویان سپیکردووە،بریندار و کوژراوەکانی لەسەرجەم بریندار و کوژراوەکانی سەرجەم شەڕەکانیتر زۆرترن، وێرانی گەورەیان دوای خۆیان بەجێهێشت، ئەوانە جەنگی ئایینی نەبوون، بەڵکو جەنگی عەلمانیەت و سیکۆلارەکان بوو، لەنێوان کەسانێکدا بوو کە لەبەر دەسەلآت، سامان، زەوی و سەرمایە لەگەڵ یەکتری شەڕیانکرد و ئەو هەموو ماڵوێرانیەیان هێنایەکایەوە.

من بەباشی بیرمدێتەوە کە لە یەکیك لەم دانیشتانەدا لە بابەتی داعش و داعشییەکاندا چیمگوتووە، قسەکانی من لەوبارەیەوە بوو ئەو کەسانەی کەوەك داعش بیردەکەنەوە لەناو ئێمەی ئێرانیشدا ژمارەیان کەمنییە، ئەوان بەدوای ئیسلامێکی بێخەوشدا دەگەڕێن، ئەوان باوەڕیانوایە شتێك کە ناوی شەرعییەت یان حەقیقەت بێت دەستیاندەکەوێت کە بەداخەوە لەئەمڕۆدا تێکەڵاو و ئالودەبووە، ئێمە لەڕێگەی لابردنی ئەو ئالودەبوونەوە دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ ئەو ئیسلامەی کە لەسەرەتاوە پێغەمبەری ئیسلام هێناویەتی، من پێشتر گوتوومە لەسەرەتاوە کۆچکردوو ئیمام خومەینی هەمان بیرکردنەوەی هەبوو، چەندینجار دروشمی (ئیسلام ناب محمد) واتە (ئیسلامی پاکی محەممەدی) بەرزکردووەتەوە. من بەپێی ئەو تێزەی کە خۆم باوەڕمپێیەتی بۆ هاوڕێ و دۆستانی خۆمم باسکردووە (ئەو شێری خودایە هەرگیز دروستنەبووە) ئیسلامی پاك و بێخەوش هەرگیزنەبووە و ناشبێت، ئەمڕۆش پەدانابێت، شوێنکەوتنی ئەو بیرۆکەیەش رۆشتنە بەداوی شتێکی نادیار و هەوڵێکی مایەپووچانەیە.

ئیسلام و هەموو ئایینێکیتر کاتێك لەدایکدەبێت وەك بارانێك وایە کە بەر زەوی دەکەوێت، ئەم نموونەیەش جوانترین نموونەیە کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەیپێداوە، باران تا لە ئاسمان بێت و لەناو هەوردا بێت پاکوخاوێن و بێلەکەیە و ئالوودەنەبووە، بەڵام کاتێك دەگاتە زەوی و تێکەڵاوی خاك و خاشاك دەبێت، کاتێکیش پێغەمبەری ئیسلام داری ئەم ئایینەی لەزەویدا ناشت، ئەم ئایینە ئیتر لەنێو دۆخی خاك و مێژوو کۆمەڵگە و ئاووهەوای چوداردەریدا گەشەیکرد،خولیای گەڕانەوە بۆ سەرەتاکانی ئەم

تۆوە کە لەناوخاکدا و لەنێو مێژویەکدا چێنراوە، خولیایەکی بێهودە و پڕوپووچە و مایەپووچ و خوازراونییە، ئەگەر ئێوە بتانەوێت بڕیارێکی نەگونجاو یان نەکراو ئەنجام بدەن، ئەوا توندوتیژی بەرهەمدەهێنیت، کارێك کە هەمووان دەتوانن بیکەن، هەمووان دەتوانن ئەو ڕێگەیە بدۆزنەوە، ئەگەر سووربیت لەسەر ئەوەی کارێکی مەحاڵ ئەنجامبدەیت ئەو کارە بە مەحاڵ ناونابرێت، ئامانجی دیارنییە، ڕێگەی خۆی نییە، بۆیە لەکۆتاییدا دەبێت پەنابەیت بۆ بەکارهێنانی توندوتیژی.

ئەم نموونانەی کە دەکرێت لەم بوارەدا بهێنرێنەوە، سەلەفییەکان ئەڵبەتە زۆرینەیان لەوانەن کە بێبەشن لە ئازادی، ئەوان نایانەوێت لەڕێگەی بەکارهێنانی هێز ئیسلام بهێنێتەدی، بەڵام من گوماندەکەم ئەوان بەدوای کارێکی بێئەنجامەوەن و هەموو تواناکانیان بەفیڕۆدەچێت.

مرۆڤ ئەگەر ئایین وەك مەعریفە و مێژوو نەناسرێت، واتە نازانێت لەچی سەرزەمینێك و لەچی حاڵەتێکی مێژووییدا لەدایکبووە و ناشزانێت چۆن گەشەدەسەنێت و چی کاریگەرییەك بەجێدەهێڵێت و دەیگەیەنێتە کام وێستگە و ئالوودەی چی چارەنووسێك دەبێت، لێرەدایە کە مرۆڤ ناتوانێت بزانێت چی لەم ئایینە بکرێت یان چۆن ڕووبەڕووی ببێتەوە، هەربۆیە دەبینین جارێك بەلایەکدا دەڕوات و جارێکیتر بەلایەکیتردا، بەراست و چەپدا وزە و تواناکانی سەرفدەکات یاخو پەنا بۆ کارێکی مەحاڵ دەبات.

مارکس لەومیانەیەدا قسەیەکی جوانی هەیە کە هەمیشە لە گوێی مندا دەزرنگێتەوە (زانست واتە سووربوون لەسەر ئەو شتانەی کە دەکرێت، هونەری دۆزینەوەی کێشە و چارەسەرکردنیەتی، پاشان هەوڵدان بۆ گەیشتن بەچارەسەر).

جارێکیتریش لەبارەی (بەهرە و نیعمەت)ی نەتوانایی لەچەند شوێنێکیتر قسەمکردووە، ئێمەی موسڵمان و ڕۆژهەڵاتی بەهرەی نەتواناییمان زۆرە، شیعرێکی سەعدی شیرازیتان لەبیرە (چۆن سوپاس گوزاری خودا بکەم، کە هێزی ئازاردانی مرۆڤی پێنەداوم) ئێمە هێزمان نییە، هێزەکەمان ئەوەندە کەمە کە تووشی نەتوانایی کردووین، هێزی ڕۆژئاواییەکان کە ئەمڕۆ هەیانە، هی (٢-٣) سەدەی لەمەوپێشە، ئەو هێزەش زانستی پێبەخشیون، تەکنۆلۆژیا و پیشەسازی و سەرمایەداری خستووەتە بەردەستیان، ئێمە نەمانبووە، باشە ئێمە

دەزانین ئەمە کەلێن و نەنگییە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم کەمییە بۆ ئێمە بووەتە بەرەکەت و چاکە، لەکاتێکدا ئێمە بەکەمی پەنامانبردووەتەبەر توندوتیژی. ئێمە بۆمبی ئەتۆمیمان دروستنەکردووە و نەمانبووە، ئێمە هێزی داگیرکاریمان نەبووە و هیچ نەتەوە و خاکێکیشمان داگیرنەکردووە، ئێمە چەکی کیمیایمان دروستنەکردووە، ئێمە چەند ملیۆن جوولەکەمان نەسووزاندووە، ئێمە (دادگای پشکنین)مان دانەناوە بۆ سووتاندنی بیروباوەڕکان، ئێمە خۆشحاڵین کە ئەو شتانەمان نەبووە و نییە، لەوانەیە ئەگەر هێزمان هەبوایە ئەو شتانەمان بکردایە، خۆشحاڵین کە بواری خراپەکاریمان بۆ نەهاتووەتەپێشەوە.

بەمەبەستی ئاماژەدان بەو توێژینەوەی ئەنجامداوە لەبارەی توندوتیژی، دۆستانی ئێمە خوێندوویانەتەوە یان گوێیانلێگرتوە یان لەو شوێنە ئامادەبوون کاتێك ئیمام خومەینی لە ساڵی (١٣٦٠ – ١٩٨٢) (جەبهەی میللی)ی وەك مورتەد و لەدینهەڵگەڕاوە ناساند و (موسەدەق)ی وەك موسڵمان ناوهێنا، ئەمەش لەبەرئەوەی ئەوان باسیانلەوەکردبوو کە ئەحکامەکانی ئیسلام وەك بڕینی دەست و بەردباران و جەڵدەلێدان یان وەك کاری دژە مرۆڤایەتی هێنابوو، بەیاننامەیەکیان دەرکرد و گوتیان ئەم رەفتارانە پێچەوانەن لەگەڵ مافەکانی مرۆڤ، هەموو ئاماژەکان باسیانلەوەدەکرد کە ئیمام خومەینی هەلەکەی قۆستەوە بۆئەوەی هەرچییەکی بوێت لەبەرامبەر (جەبهەی میللی)دا ئەنجامی بدات تا لە سەرشانۆی سیاسەت دووریانبخاتەوە، ئیمام خومەینی ئەوەی بەهەلزانی و ئەو بەرەیە و موسەددقی بە ناموسڵمان ناوبرد و سەرجەم بنکە و بارەگاکانیانی پێچایەوە و داخست.

ئیمام خومەینی فەقیە و موفتییەك بوو، پلەی فەتوای بۆ خۆی بڕیاردا، هەرچەندە لەبارەی ناموسڵمانێتی (موسەدەق)ەوە پەلەیتێداکراوە، من گومانموابوو توندڕەوی تێدابوو زیادەڕۆیی تێداکرابوو، بۆ ئەو مەبەستە ئێمە کۆبونەوەیەکمان لەگەڵ کرد یەکێك لە دۆستەکانمان پێیگوت: (بەچی بەڵگەیەك گوتووتانە موسەدەق موسڵمان نەبووە؟) تەنها بەڵگەیەك کە ئیمام خومەینی هێنایەوە ئەوەبوو کە گوتی: (من بیستوومە موسەدەق لەکۆبوونەوەیەکدا کە دۆست و خۆشەویستانی ئێمەش لەوێبوون هەستابوونەوە بۆ نوێژکردن، موسەدەق نەیزانیبوو نوێژی نیوەڕۆ و عەسر چەند رکاتن؟) تەنها بەڵگەی ئیمام خومەینی لە مورتەدبوونی موسەدەقدا ئەو بەڵگەیە بوو لەکاتێکدا ئێمە و سەرجەم موسڵمانان باش دەزانین

که بەتەنها نەزانینی ژمارەی رکاتەکانی نوێژی (نیوەڕۆ و عەسر) مرۆڤ ناکاتە مورتەد و لەدینهەڵگەڕاوە یان نابێتە بەڵگەی ناموسڵمانبوونی کەسێك. ئەگەر ئێوە نەزانن نوێژی نیوەڕۆ و عەسر چەندج رکاتە یان بەدرێژایی تەمەنتان نوێژی (نیوەڕۆ و عەسر)یش نەخوێنن، لە بازنەی ئیسلام ناچنەدەرەوە، لەوانەیە ببنە موسڵمانێکی گوناهبار، بەڵام نابنە مرۆڤێکی لەئایینهەڵگەڕاوە. بەتەواوی مانا دەزانرێت کە ئەو بڕیارەی خومەینی بڕیارێکی سیاسییانە بوو و دەیویست یەکێك لە نەیارە سیاسییەکانی خۆی لە شانۆکەی بکاتە دەرەوە... من کارم بەسەر لایەنە سیاسییەکەی ئەم بابەتەوە نییە، ئەمەم بۆئەوە گوت بۆئەوەی خالێك لەبارەی سیاسەتی دینی و دینی سیاسی ئیسلام شتێك روونببێتەوە.

قسە راستەقینەکە لێرەدا ئەوەیە: ئایا بڕیارە سزاییەکان (احکام جزائی)ی ئیسلام نامرۆڤانەیە؟ یانی توندوتیژن؟ ئایا ئەگەر کەسێك شتێکی وابڵێت دەبێتە ناموسڵمان؟ ئایا دەبێتە مورتەد و لەدینهەڵگەڕاوە؟ لەو پێگەیەدا ئەم ئاوازانە، ئەو دەنگە نەبیستراو دەبوو یان دەبوونە بانگەوازێکی کز و لاواز لە ولاتی ئێمەدا و هەموو جیهانی ئیسلامی و کەمتر دەگەشتە گوێچکەکان، بەڵام ئەمڕۆ ٣٥ ساڵ بەسەر قەدەغەکردنی جەبهەی میللیدا تێدەپەڕێت و تائێستەش قسەیان لەبارەوە دەکرێت لەهەموو جیهانی ئیسلامیدا، ئەم دەنگە بەرز و بڵندە، ژمارەیەکی زۆر لە رۆشنبیرانی ئایینی لەمبارەیەوە مشتومڕ و گفتوگۆیان هەیە، ئەمە تۆمەتێك بوو کە ئاراستەی سەرجەم موسڵمانان کراوە، ئایینی ئیسلامی خستووەتەبەردەم هێرش و پرسیاری زۆرەوە، لەبەرئەوەی فەقیهەکان کە فەتوا دەردەکەن یان بەداوی وەڵامی پرسیارێکدا دەگەڕێت، بەداخەوە ناتوانن وەڵامی تەواوەتی و وەك خۆی بدەنەوە.

فیقهی ئیسلامی لەئەمڕۆدا، بووەتە جێگەی پرسیاری خودی موسڵمانان، بووەتە جێگەی بەرگری لەخۆکردن و تۆمەتلێدراوی، من لێرەدا بەئاشکرا بۆچوونەکانی خۆم دەخەمەڕوو.

بە بڕوای من هەموو ئەو بڕیارانەی (بەردبارانکردن، دەستبڕین)و ئەوانیتر بڕیاری توندوتیژە، بەهیچ پێوانە و پێوەرێك بە بڕیاری نەرم دانانرێت، ئەوەی کە ئەمڕۆ مرۆڤەکان بە توندوتیژی ناویدێنن هەرئەوانەن. لەگەڵ ئەوەشدا باش دەزانین کە زۆرینەی ولاتانی ئیسلامیش ئەم فەرمانە جێبەجێناکەن، لەنێو سەرجەم ولاتانی ئیسلامیدا تەنها (٢-٣) ولات ئەم

بڕیارەیان لەناو یاساکانی خۆیاندا جێکردووەتەوە و هەوڵدەدەن بیخەنە بواری جێبەجێکردنەوە. لە ئێرانەکەی ئێمەدا بەداخەوە بەشێك لەو بڕیارانە بەیاساکراوە و هەندێکیشی جێبەجێدەکرێت.

کاتێك تۆ لەگەڵ کەسێکدا لەبارەی موسڵمانێتییەوە و ئیسلامەوە قسەدەکەیت، دێتەوە بیری یان بیری تۆی دەخاتەوە کە ئەو دینەی تۆ باسیدەکەیت هەمان ئەو دینەیە کە دەڵێت (دەبێت مرۆڤەکان بەردبارانبکرێن، هەمان ئەو ئایینەیە کە دەڵێت دەبێت دەستی دز ببڕێت، ئەگەر کەسێك چاوی کەسێك دەربهێنێت دەبێت چاوی دەربهێنرێتەوە، بەندەداری قبوڵدەکات) ئەڵبەتە درۆشناکەن، تۆمەتیشمان بۆ هەڵنابەستن، هەموو ئەمانە راستین، هەموو ئەوانە لە کتێبە فیقهییەکاندا نووسراون، ئەو کتێبانە لە قوتابخانە ئایینییەکان و حەوزە عیلمییەکانی ئێمەدا دەخوێنرێن، هیچ کەسێك بە فەقیە و شەرعزان دانانرێت تا ئەو کتێبانە نەخوێنێت و بیانزانێت و بەپێی ئەوانەش فەتوابدات. ئیتر ئەمە پیلان و کەڵەگایی رۆژئاوا نییە.

تا ئێمە خۆمان لەگەڵ ئەو جۆرە فیقهە یەکلاییبنەکەینەوە (کە تائێستە نەمانکردووە و ئەو بەڕێزانە تەنها خەریکی پینەکردنن) ناتوانین وەڵامی ئەو هەموو دژوارییانە بدەینەوە. ئێمە دەبێت ئەمە بکەینە بنەما: هەموو ئەو شتانەی کە لە فیقهی ئیسلامیدا هەیە، کاتییە، مەگەر ئەوکاتانەی هەمیشەیی بوونیان بسەلمێنرێت، فەقیهەکانی ئێمە بەپێچەوانەی ئەمەوە وانەکانیان دەڵێنەوە، ئەوان بە ئێمە دەڵێن: هەموو ئەو شتانەی کە لە فیقهی ئیسلامیدا هاتوون هەمیشەین مەگەر پێچەوانەی ئەمە دەربکەوێت و بسەلمێنرێت، بۆیە دەبینین دووجۆرە بیرکردنەوەی جیاوازمان هەیە، کاتێك دەبینین کە فەقیهێك مێژووکردە، واتە پەیوەستە بە کات و ساتێکەوە کە خۆی تێداژیاوە، بۆیە ناتوانێت بەجیا لە کات و شوێنەکەی خۆی بیربکاتەوە ناتوانێت شوێن و کاتەکانیتر و زەمانەکانیتر هەستبکات، دەستی بەسەر ئەوانەدا بڕوات و بتوانێت گەمارۆی تەواوی شتەکان بدات.

ئەگەر، تا ئەم رۆژگارەی ئێمەی تێداین بگەڕێینەوە بۆ سەدەیەك پێش لەئێستە ئەم قسانە نەکران یان ئەمجۆرە هەستە پەیدانەبوو، ئەوا دەبێت بگوترێت فیقهی ئێمە توندوتیژە و جێگەی پارچەیەك لەبیرکردنەویتری تێدانەبویەوە، ئەوا دەبێت بگوترێت کۆمەڵگەی ئێمە هەمان کۆمەڵگەی ١٢٠٠ ساڵ پێش ئێستەیە، کۆمەڵگەکەمان گۆڕانی بەسەردانەهاتووە،

مێژووی ئێمە وەك خۆیەتی و نەگۆڕاوە، ئەو فیقهەش بەتەواوی توانای جێبەجێکردنی دەبێت.

بەڵام ئەمڕۆ ئێمە زۆر بەباشی دەتوانین ئەم خاڵە دەرکبکەین چ دۆخێك هاتووەتەپێشەوە و چ ڕەوشێکی نوێمان هەیە، چ جۆرە فیقهێك بدۆزنەوە بۆئەوەی خۆیانی تێدابیننەوە و جێبەجێیبکەن. لە فیقهی ئێمەدا کە(**توضیح المسائل**)ەو تائێستەش بەدەست موسڵمانانەوەیە لە وڵاتی ئێراندا، تێداهاتووە (بەشێك لە خۆشبەختییەکانی پیاو ئەوەیە کە کچەکەی پێش ئەوەی بگات بە نۆ ساڵی و پێش ئەوەی سووڕی مانگانە ببینێ بیدات بەمێرد) کام لە ئێمەی دایکان و باوکان ئەم کارە دەکەین؟ یان ئەم قسەیەمان قبوڵە؟ لەوانەیە ئەم کارە رۆژگارێك کرابێت، لەوانەیە خەڵکی لەڕابوردودا ئەم حاڵەتەیان قبوڵکردبێت.

ئەگەر ئەمڕۆ کەسێك بڵێت ئەم بڕیارە فیقهییە توندوتیژە یان نامرۆڤانییە، مەبەستی ئەوەنییە -خوانەخواستە- دادگایی خودا یان پێغەمبەرەکەی بکات، لەڕاستیدا دادگایی فەقیهەکان دەکات، ئەوان بە فەقیهەکان دەڵێن ئێوە ناتوانن مافی (فیقە) وەك خۆی بەرجەستەبکەن. ئێوە دیدگا و هەڵێنجانی موفتی و فەقیهیتان تێدانییە. ئێوە لەوە تێنەگەشتوون کە (فیقە) مێژووکردە، ئێوە نازانن کە بەشێکی گەورە لە فەقیهە گەورەکانی ئێمە موجتەهید بوون، ئەوان زۆر بەباشی لە ئامانجی ئیجتیهاد تێگەشتبوون، لەبەرئەوەی لە (اصول)و بنەماکاندا فەتوایاندەدات و ئیجتیهادیاندەکرد نەك لە (فروع)و شتە لاوەکییەکاندا. ئێوە بگەڕێنەوە بۆ بنەما و ریشەی شتەکان، کاتێك گۆڕانکاری لەبنەماکاندا ریاندا دوایی دەستببەن بۆ شتە لاوەکی و لقەکان.

ئێمە لەناو کەشوهەوایەکدا دەژین کە پڕیەتی لە توندوتیژی، ئەم توندوتیژییە هەموو سەرچاوەکەی لەئایینەوە نییە، لەڕاستیدا ئایین رۆڵی کەمینەی هەیە لەو توندوتیژیانەی کە لەم سەردەمەی ئێمەدا بوونیان هەیە، ئایا توندوتیژی ئایینی چەند لەسەدی ئەو توندوتیژییانە پێکدەهێنێت کە جیهانی ئەمڕۆی ئێمەی گیرۆدەکردووە. چەند لەسەدی ئەو توندوتیژییانە پێکدەهێنێت کە مێژووی مرۆڤایەتی بە چاوی خۆی بینیویەتی؟

ئەگەر ئاماژەیەك بەم خاڵە بکەم، لەهەمانکاتدا توندوتیژی حاڵەتێکی مێژووییە، بەو مانایەی ئێمە وتمان فیقە مێژووکردە، بەڵام توندوتیژیش هەروایە، لەڕاستیدا هەموو ڕەفتارەکانی مرۆڤ مێژووکردە، بەو مانایەی، بەپێی سووڕانەوەی مێژوو، حوکم و بڕیارەکانیان

گۆڕانی بەسەرداهاتووە، هەندێك شتیان کردووە کە لەوانەیە ئەمڕۆ ئێمە بە توندوتیژی ناویبهێنین، بەڵام پێشینەکان و ئەوانەی پێشی ئێمە بە توندوتیژییان نەزانیوە و ناویاننەبردووە یان بەپێچەوانەوە، لەمێژوودا یەك یاسا حوکمینەکردووە، بەم هۆیەوە کە ئێمە دەڵێین (بەردباران)کردن ڕۆژانێك هەبووە بە تاوان ئەژمارنەکراوە، هەربۆیە هەموو بیرمەند و ژیرەکانی نەتەوەکان قبوڵیانکردووە، (ابن سینا)؟ هیچی لەبارەیەوە نەگوتووە، فەخری رازی دەنگی لێوەنەهاتووە، غەزالی و مەولەوی لەوبارەیەوە نارەزایەتییان دەرنەبڕیوە، ئەمانە هەموویان ژیر و بیرمەندەکانی میللەت بوون کەچی ئەم بڕیارنەیان بە توندوتیژی ناونەهێناوە. بەوشێوەیە نییە ئەو حوکمانە لە ڕۆژی یەکەمیانەوە بە توندوتیژ ناسرابن یان پێچەوانەی مافەکانی مرۆڤ، بەڵکو توندوتیژیش چەمکێکی مێژووییە و بەپێی سەردەم و گۆڕانکارییەکان ئەویش گۆڕانی بەسەرداهاتووە.

خودای فەقیهەکان خودایەکی جیاوازە، لەڕاستیدا خوداکان جۆرێکن لەو تێگەیشتنەی کە ئێمە بۆ خودا هەمانە، ئەو خودایە دینی ئێمە دروستدەکات و دەستکاری ڕەفتاری دینی ئێمە دەکات و ئەو وێناکانیمان پێدەبەخشێت. ئەگەر ئێمە خودایەکی توندوتیژ بپەرستین، توندوتیژی ڕێگەپێدراو دەبێت، خۆ ئەگەر خودایەکی ناتوندوتیژ بپەرستین توندوتیژی ڕێگەپێنەدرێت، کەواتە دەکەوێتەسەر ئێمە کە چی سیفەتێك یان تێڕوانینمان و چۆن بانگیبکەین و چۆن لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندییەکان لەگەڵ مرۆڤەکاندا چۆنە. خودای (عاریف)ەکانی ئێمە لەگەڵ خودای (فەقیه)ەکان جیاوازییان زۆرە، ئیتر ئێوەش خۆتان سەرپشکن. خودای عاریفەکان خودایەکی خۆشویستراوە، ئەڵبەتە خۆشەویستێکی بەرێز و موحتەشیم، خوای عاریفەکان خاوەنی سێ سیفەتی سەرەکییە، لەلایەك ئەوەندە جوانە کە مرۆڤەکان شەیدای خۆی دەکات، موحتەشیمە واتە بەبەزەیی و میهرەبانە و سێیەمیش بەخشندەیە لەبەرئەوەی کەریمبوونی یەکێکە لە سیفەتە دانەبڕاوەکانی زاتی خۆی. کەریمییەکەی ئەوەندە بەهێزە کە بێمننەت و چاوەڕێی ئەوەناکات خەڵکی پاداشتی بداتەوە. ئەمە خودای عاریفانی ئێمەیە هەندێکجار زۆر بەپاکی دەیبینین و هەندێکجاریتریش بە لێڵی و شتیتری تێوەدەگلێنین و تێکەڵیدەکەین.

خودای فەقیهەکانی ئێمە جیاوازی خۆی هەیە، خودای فەقیھ و موتەکەلیمەکان خودایەکی زۆر رەق و سەختگیرە، لەسەر وردودرشت دەدوێ، بچووکترین خاڵ دەبینێ، ترسناکە، قەمچی بەدەستە، تۆڵەسێنە، رەفتار توندە، رق ئەستوور و تۆڵەسێنەرەوەیە، روخساری وەها خودایەك کە لای فەقیھ و موتەکەلیمەکان دەبینرێت بریتییەلەوەی کە چاوەڕێدەکات تا هەڵەیەك ئەنجامبدەیت بۆئەوەی تۆڵەت لێبسەنێتەوە، کۆڵتلێنادات و زۆر بەهێزە، جەبارە و هێزی لەبننەهاتووە و بێسنوورە، من و تۆ و مرۆڤە لاوازەکان لوولدەکات و چی بوێت پێماندەکات و هیچ پەنا و پەسێوێکیشمان نییە، بۆیە هیچکەس لەبەرامەر هێز و دەسەڵاتی خودادا کەس ناتوانێت پەنای کەسێك بدات و شەفاعەتی بۆبکات.

پەرستنی خودای توندوتیژ، رەوایەتیدەدات بە توندوتیژی، خودایەکی خۆشەویست و موحەتەشەم و کەریم، تۆ دەکاتە مرۆڤێکیدیکە، پەرستنی خودایەك کە هەمیشە گوێبیستە، بیستوومانە کە دۆزەخی هەیە و پرپەتی لە مرۆڤ، خودایەکی توندوتیژی لەوشێوەیە شایانی پەرستن نییە، چونکە پەرستن سیفات و مەرجی خۆی هەیە.

ئێمە ئەگەر لەبارەی توندوتیژی و ئایینداریییەوە قسەدەکەین، کارمان دەگاتە ئەو شوێنەی کە ئە و خوادیەی ئێمە دەیپەرستین چ جۆرە حودایەکە؟ ئەو خودایە لە دونیابینی و هزری ئێمەدا چۆن شکڵیگرتووە، ئاخۆ باشترین عیبادەت لای ئێمە ئەمەیە (یەك کاتژمێر بیرکردنەوە باشترە لە چلساڵ عیبادەت و پەرستنی خودا) ئەگەر ئێوە بە یەك کاتژمێر بیرکرنەوە، دەرك و هەست و بۆچوونەکانتان لەخوداییەوە راستبکەنەوە، دوای تەواوکردنی عیبادەتەکانتان، کەواتە ئێوە خودایەکی واقیعیتان پەرستووە.

قسەی تەواو و بێپێچوپەنای من ئەوەیە، توندوتیژی لەفیقهیشدا بوونی نییە، ئەوەی هەیە رواڵەتی کارەکەیە، توندوتیژی لەجۆری خوداناسیندایە، لێرەدا سەرەوخوار دەبێتەوە و دێتەخوارەوە، هەرکات توانیتان سەرچاوەکە دروستبکەن، ئەوکاتە ئاوی زوڵاڵ و رۆشنتان پێدەگات، سەرزەمینی رۆحی ئێوەش دەبێتە بەهەشت و گوڵستانێك و لەو رێگەیەشەوە کۆمەڵگەش دەکاتە ئەو بەهەشت و گوڵستانە.

●●●

## لە بارەی داعش و بونیادگەراییەوە

# ئایندەی سەلەفیگەری پەڕگیر

ن: سەید سادق حەقیقەت
و: هـەڵکەوت هـــەورامی

داعش یان دەوڵەتی ئیسلامی عێراق و شام بە ناونیشانی دیاردەیەکی نوێ نیگا هەمووانی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە، ئەم پرسیارە دەخاتە ناو زەین و مێشکەوە، ئەویش ئەوەیە، چ ئایندەیەکی لە بەردەمدایە؟ وە ئایا ئەم چارەنووسە لە گرووپە سەلەفیەکانی تری جیا دەکاتەوە؟ ئەم ووتارە دەیەوێت بە جیاکردنەوەی سەلەفیگەری مام ناوەند و میانەڕەو لە سەلەفیگەری ڕۆچوو، ئایندەیان وێنا بکێشێت و وێنایان هەریەکەیان بکێشێت و شتێك لەم روەوە بخاتەڕوو.

مانای زاراوەی "سەلەف" لەو داهێنانەوە رەگ و ریشەی هەیە کە (ئیبن تەیمیە) لە سەدەی حەوتەمدا کردی، سەلەفیگەری لە مانا زاراوەییەکەیدا بە مانای گەڕانەوەیە بۆ ئایندە و تەقیلیکردنەوە و چاولێگەری کەسانی رابردوو، بەلاّم لە مانا زاراوەییدا دەدرێتە پاڵ ئەو گروپەی کە ئامانجەکانی خۆیان بە پەیڕەویکردن لە سەلەفی ساڵح و گەڕانەوە بۆ کاروکردەوەکانیان، رەفتار و بیروباوەڕی پێغەمبەری ئیسلام "ص"، هاوڕییان و شوێنکەوتوانی دەزانن. دیدگای سەلەفیەکان لەبارەی سەلەفەوە بۆتە هۆی ئەوەی مەزهەبێکی نوێ بە ناوی سەلەفیگەرییەوە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا دروست ببێت.

سەلەفیە نوێکان کردەوەی هاوڕێیان "صحابە" بە ناونیشانی سەرچاوەی تەشریع قبوڵ دەکەن. بە باوەڕی سەلەفییەکان، ئەندێشە و کرداری ئیسلامی بە درێژایی سەردەم و کات تووشی لادان بووە و دەبێت بۆ سەرچاوەکەی بگەڕێینەوە. ئەو کەسانەی باوەڕییان بە سەلەفی ساڵح هەیە، بیروباوەڕی خۆیان دەدەنە پاڵ (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل)، ئەم پیاوە

فەرمووده‌ناسێکی سوننەتی و دژی فوقاهەت و ئیجتیهاد بوو و بە پشتی بە بۆچوون نەدەبەست، واتە لە خۆی لە پشت بەستن بە بۆچوونی ئەوانیتر خۆی دوور دەخستەوە و ئەو کەسانەی لەگەڵ سوننەتدا نەبوون بە "ئەهلی هەواو و بیدعە"ناوی دەبردن. هەرچەندە (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل) زیاتر لە (١٥٠٩ ساڵ پێشەوای بیروباوەڕی سوننەتی سەلەفی بوو، بەڵام رووکەشبوون لە رەونەق و جوانی مەزهەبەکەی کەم کردەوە. لە کۆتاییەکانی سەدەی حەوتەم، (ئەحمەد بن تەیمیە) و پاشان قوتابیەکانی (ئیبن قەیمی جەوزی)، بیروباوەڕی حەنبەلییەکانیان بە جۆرێکی پەڕگیرتر و رۆچووتر زیندووکردەوە، پاش ئەو، سەلەفیگەری تاکو سەدەی دوانزەهەم تاکو رادەیەکی زۆر فەرامۆشکرا، تاکو ئەو کاتەی (موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب) نەجدی بە تەرحکردنی سەرلەنوێی بانگەشەی گەڕانەوە بۆ ئیسلامی بنەڕەتی دەرکەوت و بە هۆی سەرکوتکردنەوە لە لایەن (موحەممەد عەلی پاشا)، خدێوی میسر، پەیڕەوانی بەسەر نەجد و حیجازدا زاڵ بوون و دەوڵەتی ئێستای سعودییەیان پێکهێنا. هەڵبەتە لە نێوان وەهابیەکاندا دوو رووگە لە بەرامبەر یەکتردا وەستان، ئەو وەهابیانەی لە دەوروبەری (عەبدلوەهاب)دا مانەوە هەروەها وەهابیەتی شۆرشگێڕانە یان جیهادیی کە ئەندێشە و کرداری رادیکاڵیان هەیە.

هەرچەندە مومکینە سەلەفیگەری بەرامبەری وەهابیەت "یان چەمکی تر" بەکاردێت، بەڵام چەمکی "سەلەفیگەری" زیاتر لە چەمکی "وەهابی"، "تەکفیری" و "جیهادی"ی بەکاردێت، چونکە هەندێك لە سەلەفیەکان میانەڕەون و بە جیهادی و تەکفیری حیساب ناکرێن. هەموو سەلەفیەکان مەرج نیە، وەهابی بن. لە راستیدا جیهادییەکان بە جۆرێك لە سەلەفیەکان دەژمێردرێن و هەر لەبەر ئەمەش، بە "سەلەفی جیهادی"یەکان ناودەبرێن.

ئەگەر توخمی سەرەکی و بنەڕەتی بونیادگەرایی بە بەرامبەری نوێگەری دابنێین، دەبێت بڵێین لە نێوان سەلەفیەت و بونیادگەراییدا، گشت و تایبەت بوونی هەیە، چونکە هەمو سەلەفیەکان بونیادگەران، بەڵام زۆرێك لە بونیادگەراکان، سەلەفی یان تەنانەت موسوڵمان نین. بونیادگەرایی لە دژایەتی لەگەڵچ نوێگەریدا دروستبووە و ناتوانرێ بەبێ

ئەو شتەی رەدی دەکاتەوە، لەبەرچاو بگیرێت.

ئەم تایبەتمەندییەی بونیادگەرایی دژیەکی لەگەڵ سوود وەرگرتن لە لایەنەکانی ئامرازی نوێی، یان هاوشێوە سازی چەمکە مۆدێرنەکان لە لایەن ئەمانەوە بوونی نیە.

ئەمانە چەمککگەلی هاوشێوە و هاو واتای دیموکراسیی و نموونەی ئەمەیان بۆ خۆیان لەبەرچاو گرتووە. بەم شێوەیە، بەراورد و پەیوەندی نیوان سەلەفیگەری و ئیسلامگەراییش گشتی و تایبەتی رەها "موتڵەق" دەبێت. هەروەها لە نێوان دوو چەمکی "سەلەفی" و "تیرۆریست"دا گشت و تایبەت لە روویەکەوە "وەکو دوو بازنەی ناو یەك" بوونی هەیە.

مەرج نیە سەلەفی نەقڵگەرا و رادیکاڵ بێت. سەلەفیگەری ئامانجی گەڕانەوەی بۆ رابردوو هەیە، ئیدی ئەم ئامانجە بە نەقڵگەرایی و توندوتیژی بێـە دی یان بە عەقڵگەرایی و لێکبوردن. بۆ نموونە، (موحومەد عەبدە) بە ناونیشانی روخسارێکی سەلەفی، عەقڵگەرا و باوەڕی بە لێکبوردن هەبوو. کەاوتە دەتوانرێ بوترێ لەبەرئەوەی گەڕانەوە بۆ سەلەفیەت بەشێکە لە گوتەزاکانی سەلەفیەت و نەقڵگەرایی و رادیکالیزم لە نیشانە جیاوازەکانی دەژمێردرێت، بۆیە توانای جیایی چەمکی سەلەفیەت لە توندوتیژی و نەقڵگەرایی هەمیشە بوونی هەیە.

سەلەفیگەری شەبەنگێکی زۆر لە لایەنە سوونەتیەکان و مام ناوەندەکان تاکو دەگاتە سەلەفیگەرە پەڕگیرەکان لە خۆدەگرێت. گروپە سەلەفیەکان کە گەلێ زۆرن و بە ناونیشانی وەکو "جیهادی"، "تەکفیری" و "سەلەفی" باسیان لێوە دەکرێ، بە درۆوشمی گەڕانەوە بۆ سەلەفی ساڵی خوازیاری گەڕانەوە بۆ بنەڕەتی ئایین و ئامراز و رێگە و شێوازی ئەوەش "هەستان بە شمشێر" یان "جیهاد" دەزانن.

گروپە سەلەفیەکانی ئەمڕۆ، جۆراوجۆر و تەنانەت دژیەکی جۆراوجۆریان پەیدا کردوە. بۆ نموونە: جیاوازی سەرەکی "جیش الاسلام" و "القاعد" ئەوەیە کە ئامانجی کۆمەڵی یەکەم تەنها رزگاربوونە لە سیستەم و حکومەتی بەشار ئەسەد، لە کاتێکدا "قاعدە" خەونی درووستکردنی دەوڵەتی ئیسلامی لەسەریدا پەروەردە دەکات، هەروەها "النصرە" و "داعش" لە جەنگی سوریادا لە بەرامبەر یەکتر وەستاون.

لە یەك دوو دەیەی کۆتاییدا سەلەفیگەری بە بەڵگەی جۆراوجۆر گەشەیەکی شێوە قارچکی هەبووە، تاکو ئەو جێگەی هەندێك باوەڕیان وایە نزیکەی (٤٠) گروپی تەکفیری پڕچەك لە قاڵبی پێکهاتەیەك بە ناوی "جەیشی ئیسلام" لەگەڵ دەسەلاَتی سوریا لە جەنگدا بوون. ئەم گروپە هاوشانی "النصرە" لە بەرامبەر سەلەفیگەری قاعیدە بوونیان هەیە. سەلەفیگەری بوونە هۆی ناشیرینکردنی ئیسلام و زیانگەیاندن بە سوود و بەرژەوەندییەکانی موسولْمانان و روخسارێکی گرژ و نالۆژیکی لەم ئایینە روونەی خستۆتەڕوو. سەلەفیگەری لەم دوو دەیەی کۆتاییدا بۆ چەندین گروپ و لایەنگری زۆر دابەشبووە، بە شێوەیەك ناتوانرێ زەمینە سیاسیی و کۆمەلاَیەتیەکان لەم نێوەندەدا بە هەند وەرنەگیرێن.

لە ماوەی ساڵەکانی جیهاد دژی رووسیا، (بن لادن) بە مەبەستی ئامارکردن لە کوشتنەکان و بریندارانی موجاهیدینە، نوسینگەی خزمەت و "بیت الانصار"ی دروستکردکە دواتر ناوی گۆڕا بە (القاعدە)، "بە مانای دامەزراوەی گەیاندنی زانیاری" و بە تێپەڕبوونی کات لە هەموو وولاَتەکان بلاَوبوویەوە. لە لایەکی ترەوە لە ساڵی (١٣٩٢) ، (١٤) گروپی پڕچەکیان لە (حەڵەب) راگەیاند، ئەوانە دەیانەوێ گروپێکی نوێ بە ناوی "حکومەتی ئیسلامی"یەوە دروست بکەن و ئامادە نین لەگەڵ هاوپەیمانی یەکبگرن. ئەم گروپ و کۆمەلاَنەش بریتین لەمانە: جبهة النصر، لواء التوحید، کتائب احرار شام، احرار سوریة، کتیبة السلطان محمد، لواء حلب، الشهباء اسلامی، حرکة الفجر الاسلامیة، درع الامة، لواء عدنان، کتائب الاسلام، لواء النصر، کتیبة الباز و لواء درع الاسلام.

سێ گروپی جبهە النصر "کە لە ساڵی ٢٠١٢ خۆیان راگەیاند"، لواو التوحید" کە لە ساڵی ٢٠١٢ دروستبوو و لەگەڵ داعش شەڕی دەکرد" و هەروەها کەتیبەکانی احرار شام" کە لە ساڵی ٢٠١١ بۆ جەنگکردن لەگەڵ هێزی سووریا دروستبوو" لە هەموویان گرنگتر دادەنرێن. هەواڵگری سەنتەری رێگرتن لە تیرۆریزم لە ئەمریکا بانگەشەی ئەوەی کرد سێ هۆکار بوونەتە هۆی زیادکردنی رۆڵی (جبهە النصر) لە سوریادا ئەوانیش: کاریگەری توندوتیژییەکانی دەوڵەتی سوریا بوو بەرامبەر بە خەڵکی ئەم وولاَتە، بە

توانایی سیستەمەکانی ئەم گروپە و دەرگیربوون لەگەڵ گروپە ناوچەییەکان و پاڵپشتکردنی زانا سەلەفییەکان.

قاعیدەی عێراق "رێکخراوی قاعیدەی جیهاد لە بلاد الرافیدین" لە لایەن (ئەبو موسعەب زەرقاوی) و پاشان (ئەبو عومەر بەغدادی) رێبەرایەتی دەکرا. چالاکی بەربلاوی داعش "دەوڵەتی ئیسلامی لە عێراق و شام- ناوی مێژوویی سوریا-" لە ساڵی (١٣٩٣) و کەوتنەژێر دەستی شاری موسڵ، گرنگی مەترسی ئەم گروپە توندڕەوانەی زیاتر دەرخست. ئەم گروپە بە هۆی چەند کەسێکەوە لە ئیسلامگەرا توندڕەوەکان لە ساڵی (٢٠٠٤)ی زایینی بە هۆی "ئەبوموسعەب زەرقاوی، ئەبو حەمزەی موهاجیر و ئەبو عومەری بەغدادی و ئەبوبەکر بەغداد" لە شاری (بەعقوبەی عێراق و رەقەی سوریا" دامەزرا. بەڵام رەگ و ریشەی داعش بۆ نیوەی دووەمی دەیەی نەوەدی زایینی دەگەڕێتەوە. (زەرقاوی) لە ساڵی (١٩٩٥)ی زایینیدا لە ریزی هێزە جیهادییەکاندا لە ئەفغانستان ئامادەگی هەبوو و لەگەڵ هێزە ئەمریکیەکان لەم وولاتەدا خەباتی دەکرد.

گروپە سەلەفیە رادیکاڵەکان لە چەند دەیەی کۆتاییدا بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر گەشەیان کرد. لە قۆناغێکدا جیهانیبوون، نوێگەری و دێی جیهانی دەخرێتەڕوو، جێگەی ئەم پرسیارە دەمێنێتەوە کە بۆچی دەبێت ئەو گروپانەی دژی نوێگەری لەم سنوورە فراوانەدا گەشە بکەن. یەکێك لە بەڵگەکانی سەرکەوتنی ئەمجۆرە گروپانە پشت بەستنە بە دەقە رەسەن و دروشمی گەڕانەوە بۆ سەلەفی ساڵح. یەکێ:ی تر لە هۆکارەکانی و هۆیەکانی هێزی راکێشان ئەم گروپە تیرۆرستیانە ئەوەیە مە خودی رێبەرانیشیان باوەڕیان بەم رێگە ناهەق و ناراستەیان هەیە و هەندێکیش ئامادەن لەم رێگەیەدا بکوژرێن. بەڵام ئەوەی لێرەدا زیاتر لە دەق گرنگی هەیە، زەمینە سیاسیی و کۆمەڵایەتییەکانە. لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانرێ ئاماژە بە سوود وەرگرتن لە رێگە و شێوازە نادیار و رانەگەێنراوەکان لە جەنگدا -هەروەك جەنگی نایەکسان و نابەرامبەر- بکرێت.

گروپە سەلەفییە پەرگیرەکان بە خراپ سوودیان لە زەمینەی نارازایبوون و رەزامەندنەبوون لە وولاتە ئیسلامیەکانی وەك "موصلّ و تکریت" وەرگرت. بۆ نموونە

یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکانی بلاّوبوونەوەی خێرای داعش یان دەولّەتی ئیسلامی عێراق و شام کە دواتر ناوی خۆی نا (الخلافة الاسلامية) لەم خالّەدا شاردراوەتەوە کە بە خراپ سوودی لە شەپۆلی نارازیبوونی خەلّکی هەندێك لە پارێزگاکانی عێراق وەرگرت. ئەوان زۆرباش سوودیان لە رۆلّی پروپاگەندەو و دەروونناسیی جەنگ کرد و پروپاگەندەی ئەویان کرد کە بە زوویی هەموو عێراق و وولاّتەکانی تر دەخەنە ژێر دەسەلاّتی خۆیانەوە. گروپە سەلەفیەکان بە شێوەیەکی زۆر و فراوان بە خراپ سوود لەم خێزانانە وەردەگرن کە لە جەنگی کۆتایی و ئەم دواییەدا خۆشەویستانی خۆیان لە دەستدەدەن. بۆ نموونە ئەو خێزانانەی لە جەنگی سوریادا پرسەیان هەبوو، لە رووی دەروووناسییەوە بە دوای تۆلّەوەن و تەنانەت ئامادەن گیانی خۆیان لەم روەوە ببەخشن و بەم شێوەیە دەبنە نێچیری ئەم گروپ و دەستەو تاقمانە.

لەسەر بنەمای تیۆریای گوتار، حەقیقەتی سەروو کاتی و سەروو شوێنی بوونی نیە، شوناسیی هەر گوتارێکیش لە ئەویتر سازی و دروستکردنی ئەویتردا لەگەلّ گوتاری دەژەکەیدا دروست دەبێت. پێکهاتە شکیٚ‌ی یان بونیاد شکێنی (Deconstruction) بە دەربڕینێك توانادانە بە بزوتن و گەڕانی مانا یان جۆراوجۆریەتی مانایی لە قەلّەمڕەوی دەقدا، واتە کردنە دەرەوەی دەق لەو مانا سنورداره و دیاریکراوەی کە مومکینە بە تەواوی بە پشت بەستن بە نیگاو روانینیکی سادە یان روانینێکی تایبەت، دروست بوو بێت. لەسەر بنەمای پێکهاتە شکێنی، ئەگەر شتە دوانییە دژەکان ( binary oppositions) لە دەقەوە بهێنینە دەرەوە، حەقیقەتێکی بۆ نامێنێتەوە.

شوناسی سەلەفیەکان تاکو ئەندازەیەکی زۆر لەسەر بنەمای ئەویتر سازی و دروستکردنی ئەویتر لەگەلّ نوێگەری و پڕوپاگەندە دروستبوو و گەشەی خێراشیان پێدەچێت قەرزاری زەمینە سیاسیی - کۆمەلاّیەتییەکان بێت. ئەگەر ئەو شتانەی دوانەی بێگانەیی و دوالیزمەی دژن لە روونکردنەوە و بابەتەکانیاندا بهێنینە دەرەوە، دەبینین حەقیقەتێك لە پشتیانەوە نەشاردراوەتەوە. سەلەفیەکان بانگەشەکەری "حەق" بەرامبەر "ناهەق"، هەولّ و تێکۆشان و جیهاد لە بەرامبەر ئەوانەی دانیشتوون، گەڕانەوە و سەلەفیگەری لە

بەرامبەر نوێگەری خوازی و نموونەی ئەمانەن، لە کاتێکدا ئەگەر لایەنی بەرامبەر و "ئەویتر"ی ئەوان لابەرین، دەبینین خودی خۆیان حەقیقەتێکیان لەگەڵدا نیە.

توانای پێشبینی لەو تیۆریانەی تیۆریایی سەلماندنیان پێ دەڵێن و لەو تیۆریایانەی رەخنەگری سەلماندنن کێشەدار دیارە. بە سەرنجدان لەم بنەمایە، بە سەختی دەتوانرێ لەبارەی ئایندەی سەلەفیەوە بە شێوەیەکی تەواو و دوا قسە قسە بکرێت. بڵاوبوونەوەی هێز و دەسەڵاتی سەلەفیەکان و بە تایبەت داعش لە ساڵی (٢٠١٤)دا ئەوەی پیشاندا ئەمانە توانای زیادییان بۆ راکێشانی چین و توێژە موسوڵمانەکان –بە لایەنی کەمەوە لە ماوەیەکی کەمدا- هەیە. لە هەمانکاتدا، چەند خاڵێك بوونیان هەیە ك ئایندەی سەلەفی لە ئایندەیەکی دووردا، قەیراناوی و تاریك پێشبینی دەکات: یەکەم لەبەرئەوەی نوێگەری رووگەیەکی قبوڵنەکراو و و گەڕانەوەی بۆ نیە، بۆیە ئایندەش بە سوودی سەلەفیگەری نابێت.

بابەتی دووەم، نەبوونی بنەمای تیۆری بەرگری لێناکرێ. بابەتێکی تر کە پاڵپشتی بەڵگەی پێشووە، بۆ توندوتیژی و دەمارگیری بێ بنەما و چۆنیەتی ئاستی زانستی هێزە سەلەفیەکان دەگەڕێتەوە. لەسەرووی ئەوەشەوە گەشەی سەلەفیگەری لە دوو دەیەی کۆتاییدا بە هۆی زەمینەی تایبەتی نێودەوڵەتیەوە بووە و دیاریش نیە داخوازی لەجۆرە لە ئایندەشدا بوونی هەبێت. لە راستیدا ئەم بابەتەی چوارەم لە رەگەزی بابەتە نێودەوڵەتیەکانە کە کاریگەری لەسەر چیەتی "ماهیت" چالاکی ئەم جۆرە گروپانە دادەنێت.

بابەتی پێنجەم، بریتیە لەوەی سەلەفیگەرایان خاوەنی رێبەرێکی سیاسیی نین و بە شێوەیەکی تێکەڵ و رێکنەخراو لە هەمانکاتدا خۆیان لەگەڵ چەندین کەسی بەرامبەر و بۆچوونی پێچەوانەی خۆیاندا دەرگیر دەکەن. سەلەفیە پەرگێرەکان ئەوەیان پیشاندا ئامادەن لە هەمانکاتدا لەگەڵ ئێرانی شیعی، رۆژئاوا و تەنانەت هەندێك لە وڵاتە عەرەبیەکان دەرگیر بن. ئەگەر کۆراییەك و یەك بۆچوون لە لایەن ئەم دەوڵەت و نەتەوانەوە دژی سەلەفیگەری دروست ببێت، ئەوا ئایندە بە سوودی سەلەفیگەری رادیکاڵ نابێت. هەڵبەتە

دوو جۆری تری سەلەفیگەری ئەم پێشبینیە نایگرێتەوە، ئەوانیش سەلەفیگەری میانەڕەو و مام ناوەند کە لە هەوڵی ئەوەدایە خوێندنەوەیەك لەمەڕ ئایین بەدەستەوە بدات کە تەنانەت بە پێی توانا لەگەڵ داخوازییەکانی عەقڵی مرۆیی و دیموکراسیی سازگار بێت "وەکو هەندێك لە لایەنگرییەکانی کۆمەڵەی برایان" و سەلەفیگەری دەربار و نزیك لە دەسەڵات، "هەروەك سەلەفیەکانی دەرباری سعودیە".

●●●

**سەرچاوە:**

شەرق، سایتی فەرهەنگی نیلوفەر، بەرواری بڵاوبوونەوە ١٣٩٣.

# لە سەلەفییەتی دەقەوە بۆ سەلەفییەتی جیهادی

حەبیب محەممەد دەروێش

لە مێژووی ئیسلامدا و تەنانەت لە دەقەکانی قورئان و سوونەتدا، دەستەواژەی (سەلەفی-سەلەفییەت) نەهاتووە، بەو مانایەی گوفتار و رەفتاری پێشینەکان بکرێتە سەنگی مەحەك بۆ پاشینەکان، تەنانەت لە هیچ فەرمودەیەکیشدا ئاماژەی پێنەدراوە. وەك ئاماژەیەك بۆ کۆمەڵێك کە رێگای راستی ئیسلام دەگرن و پەیرەو لە رێگا و رچەی سەردەمە زێرینەکانی ئیسلام دەکەن، بەپێچەوانەوە لە قورئان و سونەتدا دەستەواژەیتر هاتووە بۆ ئەو کۆمەڵ و گروپانەی کە پەسندەکرێن بەوەی کەسانی بۆخواسوڵحا و و پەیرەوکاری ئیسلامن.

چەند دەستەواژەیەکیتر هاتووە لەوانە (حزب الله) خوا دەفەرموێ (الا ان حزب الله هم المفلحون) یان دەستەواژەی (انصارالله- نحن انصار الله و احباؤە) یان لە حەدیسدا چەند ناوێك بۆ ئەو کۆمەڵ و گروپانە هاتووە کە بە (الفرقه الناجیه) ناسراو وەکو لەم فەرمودەیەدا هاتووە (تفترق أمتي على ثلاث وسبعين فرقة كلها فى النار إلا واحدة، قالوا من هي يا رسول الله؟ قال: ما أنا عليه وأصحابي اليوم قال في المقاصد حسن صحيح وروى عن أبي هريرة و سعد وابن عمر وأنس وجابر وغيرهم)، بەلاّم وشەی سەلەفییەت وەکو ناوێك بۆ کۆمەڵێك یان گروپێك لە سەردەمەکاندا بەکارهاتبێت، نەهاتووە، تەنیا یەك حەدیس وشەی (سەلەف)ی تیاهاتووە کە پێغەمبەر درودی خوای لەسەربێت بە فاتمەی کچی دەڵێت: (خواپەرستبە و ئارامبگرە من باشترین کەسی پێشینم بۆ تۆ (اتقى الله واصبرى فانى نعم السلف انا لك) رواه البخاری.

ئەڵبەتە ئەمە بۆ فاتمەیە، بەلاّم وشەی (سەلەف) لەقورئاندا زۆرجار هاتووە وەك دەستەواژەیەك بۆ کارێك یان رەفتارێك بۆ خەڵکێك لەرابردوودا ئەنجامیدابیت و نەگەرێتەوە بۆی وەك دەوترێت (عفا الله عما سلف) یان.. ئەمەش بە مانایەکی نێگەتیڤ (سلبی) بەکارهاتووە واتە ئەوەی رابورد وازیلێبێنن و نەگەرێنەوە سەری واتە هەرچەندە ئەوەی

لەڕابوردودا ئەنجامدراوە رەفتارێکی خراپبووە، بەڵام خوا لە رابوردووتان خۆشبوو، بەلام گەڕانەوە بۆی تاوان و لادانە و سزای هەیە، بۆیە لاپەڕەیەکی نویٚ لە ژیانتان هەڵبدەنەوە، هەروەها ئەم ئایەتە وەکو پەندیش بەکاردێت. دوای دروستبوونی کێشە و ئاریشەکان دەوتریت واز لەوە بێنن لەوەی لەڕابوردوودا روویداوە و لاپەڕەیەکی نویٚ لە پەیوەندی هەڵبدەنەوە.

لە مێژووی سیاسی و زانستی ئیسلامدا هیچ گروپێکی سیاسی یان زانستی فیقهی یان هیچ مەدرەسەیەکی حەدیس وشەی سەلەفی یان سەلەفییەتی نەکردووە بە ناو بۆ خۆی، هەر لە دەرکەوتنی مەزهەبە ئیسلامییەکانەوە تادەگاتە رێبازە خواناسییەکان، لە سەردەمی زێڕینی گەشەی زانستی و ئیجتیهادی ئیسلامیدا تا سەدەی چوارەمی کۆچی بەردەوامبوو کە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەرکەوت وەك رابەری مەدرەسەی حەدیس کە بە (امام اهل سنە) ناسرا، هەندێك لە زانایانی ئیسلام ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیان تا ئاستی پلەی پێغەمبەران بەرزکردووەتەوە لەوانە (الشبر الحارث) دەڵێت: ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە شوێنی پێغەمبەرانە (مناقب احمد ص ١٤٨).

سەرەتای دروستبوونی مەدرەسەی حەدیس کە سەلەفییەت خۆی بەمیراتگری دەزانیٚ دەگەڕێتەوە بۆ ئیمامی ئەحمەد، ئیمامی ئەحمەدیش بەهۆی رووداوی (فیتنە) تاقیکردنەوەکەی بەوەی لەلایەن مەئمونەوە دەستگیرکرا و ئەشکەنجەدرا بەهۆی مەسەلەی خەلقی قورئانەوە (ئایا قورئان مەخلوقە و دروستکراوە؟ یان سیفەتی خوایە و مەخلوق نییە؟). ئەم رووداوە کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر ناوبانگی ئیمامی ئەحمەد و بەهێزبوون و بڵاوبوونەوەی مەدرەسەی حەدیس.

پاشان، ئەم مەدرەسەیە لە سەردەمی مەغۆلەکاندا زیندووکرایەوە لەلایەن ئیبن تەیمییەوە (٦٦١-٧٢٨ ك)، ئیبن تەیمییە، کوردێکی حەڕانی کوردستانی سوریایە. دەرگای ئیجتیهادی کردەوە و مەدرەسەیەکی گەورەی دامەزراند کە دوای خۆی (ئیبن قەیم)ی خوێندکاری درێژەپێدەری ئەم مەدرەسەیەبوو، ئیبن تەیمییە لە سەردەمی شەڕ و داگیرکاری مەغۆلەکان پەیدابووە، بۆیە هەردوو مەدرەسەی سەلەفی، زانستی (مەدخەلی)و سەلەفی جیهادی دەیکەنە یەکێك لە مەرجەعە گرنگەکانی خویان، بەڵام سەلەفییە جیهادییەکان زۆرتر پشتی پێدەبەستن بەهۆی ئەوەی ئیبن تەیمییە خۆی لە سەردەمی جیهادا ژیاوە و خۆیشی

بەشداری جیهادی مەغولەکانی کردووە و واقیعی جەنگی بینیوە و سەدەها لاپەڕەشی لەسەر جیهاد و ئەحکامی جیهاد و ئەو رەفتارانەی دروستە لە کاری جیهادیدا پیادەبکرێت و چەندین فەتوای بۆ ئیدارەدانی کاری جیهادی داوە. ئەو فەتوا و نووسینانەی ئیبن تەیمییە دەرهاویشتەی رەفتاری رۆژانە و ئەو کێشانە بووە لە کاری رۆژانەی جەنگدا هاتووەتە بەردەمیان، بەلاّم ئەوەی مایەی سەرنجە و کارەساتی خولّقاندووە گواستنەوەی فەتواکانی ئیبن تەیمییەیە وەك خۆی و جێبەجێکردنیەتی لە واقیعی ئێستای کاری گروپە جیهادییەکاندا، بەڵکو لە روانگەی قسە و فەتواکانی ئیبن تەیمییە هەندێ لە موفتییەکانی سەلەفییە جیهادییەکان فتوای توند و خراپتریان دەرکردووە سەبارەت بە نەهێشتنی هیچ بەربەستێکی شەرعی لە کاری جیهادییاندا بەو مانایەی نەهێشتنی یاسا و و رێساکانی جەنگ و دەرهێنانی ئەخلاق و ئادابی جوولآنەوەیە لەگەڵ بەرامبەردا لەکاتی جەنگدا. ئەم جوولآنەوەی ئیبن تەیمییە کە لەڕووی فیقهی و شەرعییەوە مەدرەسەیەکی تایبەت بەخۆیە و دوای خۆیشی خوێندکارەکەی (ئیبن قیم الجوزیە) درێژەپێدەری رێبازەکەی بووە.

ئیبن تەیمییە زانایەکی بەتوانابووە و راوبۆچوونیشی لەسەر تایفە و ئاین و ئایینزاکانیتر جیاوازە لە سەلەفییەتی جیهادی ئیستا، بۆ نموونە ئیبن تەیمییە لەنامەیەکدا بۆ شوێنکەوتووانی عودەی کوڕی موسافیر زۆر بەڕێزەوە باسی دەکات وەکو پیرێکی موسڵمان ناویدەبات و دەڵێ: (من احمد ابن تيمية الى من يصل اليه هذا الكتاب من المسلمين المنتسبين الى السنة والجماعة المنتمين الى جماعة الشيخ بالعارف القدوة ابى البركات عدى بن مسافر الاموي رحمة الله نحوهم ووفقهم الله لسلوك سبيله واعانهم على طاعته وطاعة رسوله صلى الله عليه وسلم وجعلهم معتصمين بحبله المتين مهتدين لصراط الدين انعم الله عليهم من النبيين والصديقين والشهداء والصالحين و جنبهم طريق الضلال والاعوجاج الخارجين عما بعث الله به رسوله صلى الله عليه وسلم من الشرعة والمنهاج حتى يكونوا ممن اعظم الله عليهم المنة بمتابعة الكتاب والسنة سلام عليكم ورحمة الله وبركاته).

پاشان باسی شێخ حەسەنی کوڕی عودەی دووەم دەکات بە وەلی ناودەبات، بەلاّم دەڵێ دوای ئەو لادان روویداوە لەو رێبازەی شێخ عودەی لەسەربووە.

ويروون عن الشيخ حسن بن عدى الثانى انه كان كذا وكذا وكذا وليا.. وفى زمن الشيخ حسن زادوا اشياء باطلة نظما ونثرا وغلوا فى الشيخ عدى.

لێرەدا ئیبن تەیمییە وەك تایفەیەکی موسڵمان مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات خوێن و سەروماڵیان حەلاڵناکات، بەپێچەوانەی سەلەفییە جیهادییەکان کە داعش و خەلافەتەکەی ئەبو بەکر بەغدادی نوێنەرایەتی دەکات کە سەروماڵی یەزیدیانی وەك غەنیمەت سەیرکرد و دابەشیکرد بەسەر موجاهیدەکاندا، هەروەها ئیبن تەیمییە راوبۆچوونی لەسەر تەسەوف و عیرفان جیاوازە لە سەلەفییەکان بە سەلەفی زانستی (مەدخەلی)و سەلەفی جیهادی بۆ نموونە ئیبن تەیمییە سەبارەت بە یەکێك لە سەرۆکی رێبازەکانی سۆفیگەری کە عەبدولقادری گەیلانییە دەڵێ: (والشيخ عبد القادر الجيلاني رحمه الله تعالى ونحوه من أعظم مشائخ زمانهم أمراً بالتزام الشرع والامر والنهي وتقديمه على الذوق والقدر، ومن أعظم المشائخ أمراً بترك الهوى والإرادة النفسية، فإن الخطأ في الإرادة من حيث هي إرادة إنما تقع من هذه الجهة، فهو يأمر السالك أن لا تكون له إرادة من جهته هو أصلاً " بل يريد ما يريد الربُّ عزوجل " إما إرادة شرعية إن تبين له ذلك، وإلا جرى مع الإرادة القدرية، فهو إما مع أمر الرب وإما مع خلقه وهو سبحانه له الخلق والأمر. وهذه طريقة شرعية صحيحة). (مجموع فتاوى أحمد بن تيمية ج١٠. ص٤٨٨ـ٤٨٩).

هەروەها سەبارەت بە یەکێك لە مورشیدەکانی حەلاج کە زۆرێك لە زانا سەلەفییەکان بە گومڕای دەزانن ئەویش جونەیدی بەغدادییە دەڵێ: (ولهذا كان الجنيد رضي الله عنه سيد الطائفة إمام هدى، فكان قد عرف ما يعرض لبعض السالكين، فلما سئل عن التوحيد قال: التوحيد إفراد الحدوث عن القدم). (والجنيد وامثاله ائمة هدى، ومن خافه في ذلك فهو ضال، وكذلك غير الجنيد من الشيوخ تكلموا فيما يعرض للسالكين وفيما يرونه في قلوبهم من الانوار وغير ذلك وحذروهم ان يظنوا ان ذلك هو ذات الله تعالى). مجموع فتاوى ابن تيمية ج٥ ص٣٢١.

هەروەها لە پەرەگرافێکیتردا بەگشتی ناوی زۆربەی عاریفە سۆفییەکان دەهێنێ و پەسنیاندەکات بە رێبوارانی رێگای راستیان دەزانێ و بە ئیمامی ئەهلی سەلەفیان دەزانێ و دەڵێ: (فأما المستقيمون من السالكين كجمهور مشائخ السلف مثل الفضيل بن عياض،

وإبراهيم بن أدم، وأبي سليمان الداراني، ومعروف الكرخي، والسري السقطي، والجنيد بن محمد، وغيرهم من المتقدمين، ومثل الشيخ عبدالقادر الجيلاني، والشيخ حماد، والشيخ أبي البيان، وغيرهم من المتأخرين، فهم لا يسوِّغون للسالك ولو طار في الهواء، أو مشى على الماء، أن يخرج عن الأمر والنهي الشرعيين، بل عليه أن يفعل المأمور، ويدع المحظور إلى أن يموت. وهذا هو الحق الذي دل علي الكتاب والسنة وإجماع السلف وهذا كثير في كلامهم).

بەلاَم ئیبن تیمییە سوفییەکان دابەشدەکات بەچەند شێوەیەك هەندێکیان بەگومڕا و لەدیندەرچوو و ئەهلی بیدعە و زەندەقە لە شەریعەت لەوانە حەلاج (وقد انتسب إليهم طوائف من اهل البدع والزندقة، ولكن عند المحققين من اهل التصوف ليسوا منهم: كالحلاج مثلا، فإن أكثر مشائخ الطريق أنكروه وأخرجوه عن الطريق مثل: الجنيد بن محمد سيد الطائفة وغيره كما ذكر ذلك الشيخ أبو عبد الرحمن السلمي" في "طبقات الصوفية" وذكره الحافظ أبوبكر الخطيب في تاريخ بغداد).

لێرەوە دەردەکەوێت ئیبن تەیمییە کۆمەڵێ فەتوا و رای فیقهی توندی هەیە لە مەسەلە جیهادییەکاندا، هەروەها کتێبێکی تایبەتی هەیە بەناوی (منهج السنة النبوية) کە زۆر بەتوندی راوبۆچونی خۆی بەرامبەر بە شیعەکان دەردەبڕێ و بە (رافچە)و دەرچوو لەدین باسیاندەکات و بەخراپتریان دەزانێ لە یەهود و نەسرانی (جوولەکە و مەسیح) کە ئەمەش رۆڵی گەورەی هەبووە لە دروستکردنی فیکری توندڕەوی داعش بەرامبەر شیعەکان کە بەلایانەوە عەوامی شیعەش رەوایە بکوژرێن، بۆیە داعش چەندەها کاری خۆکوژی گەورەی لە شوێنە گشتییەکاندا ئەنجامداوە و هاوولاَتی ئاسایی شیعەی کردووەتە ئامانج و هەزارەها هاوولاَتی مەدەنی بوون بە قوربانی و ئەمەش یەکێك لە خاڵە ناکۆکەکانی نێوان ئوسامە بنلادن و سەرکردایەتی (القاعدة)و (ابو مصعب الزرقاوی)یە کە ئەوەی دواییان بەشەرعیی دەزانی هاوولاَتی ئاسایی شیعە کۆمەڵکوژی بکرێت، بەڵکو ئوسامە پێیوابوو تەنیا دەبێت سەرانی شیعە بکرێتە ئامانج، کەواتە ئیبن تەیمییە ئەو زانا سەلەفییەیە کە هەمیشە سەلەفییە جیهادییەکان بۆی دەگەڕێنەوە بۆ شەرعیەتدان بە کردەوە تیرۆریستییەکانیان تارادەی ئەوەی قسە و فەتواکانی راڤە و تەئویلی زیاتری بۆدەکەن و زۆر کردەوەیتر کە ئیبن تەیمییە باسیلێوەنەکردووە، قیاسی کراوەتەسەر بۆ کردەیەکیتر. ئەمەش بووە هۆکاری

دروستبوونی جیاوازی فیکری لەنێوان سەرکردە و موفتییە جیهادییەکان کە یەکێك لەوانە (عبدالقادر بن عبدالعزیز) کە ناوی راستەقینەی (سید امام عبدالعزیز) کە دادەنریت بە یەکیك لە کەسایەتییە جیهادییەکانی جیهان بە تیوریسین و موفتییەکی گەورە دادەنریت کە جیهادییەکان پشت بە فەتواکانی دەبەستن و خاوەنی کتێبی (العمدة فی اعداد العدة للجهاد فی سبیل الله) ئەم کتێبەش دادەنرێت بە مانیفێستی جیهادی سەلەفی کە تیایدا شەرعییەت بەهەموو کردەوە جیهادییەکان دەدات کە ئەمرۆ ئەو رێکخراوانە پیادەیدەکەن وەك (خۆکوشتن، تیرۆر و ئینقیلاب و کوشتنی بەکۆمەڵ.. هتد)، بەلاّم ئەم موفتییە لە کۆتایی نەوەدەکاندا راوبۆچونی گۆڕانی بەسەرداهات و لە بەشێك لە فەتواکانی پەشیمانبوویەوە و کتێبێکی نوێی دانا بەناوی (وثیقة ترشیدالعمل الجیهادی) کە دادەنرێت بە موراجەعاتی ناوبراو بە کاری جیهادی رابردوو و پیاچوونەوە بەهەموو ئەو فەتوایانەی پیشتر دەریکردبون لە ئیدارەدانی کاری جیهادی سەلەفیدا کە تیایدا رەخنەی راستەوخۆبوو لەکردەوەکانی ریکخراوی (القاعده)، کتێبەکەی (سید امام) دادەنریت بە خاڵی وەرچەرخان لە مێژووی بزووتنەوە جیهادییەکان، ئەمەش وایکرد لە ئەیمەن زەواهیری بە کتێبێك رەدی بداتەوە بەناوی (التبرئة ـ تبرئة أمة السیف والقلم من منقصة تهمة الخور والضعف) تیایدا ناوبراوی تۆمەتبارکرد بەوەی لە رێبازی ئیسلام لایداوە و کەوتووەتە کۆشی جوولەکە و خاچپەرستەکانەوە، دواتر عەبدولقادر بن عەبدولعەزیز بە کتێبێتر رەدی زەواهیری دایەوە بەناوی (مذکرة التعریة لکتاب التبرئة) کە رۆژنامەی ئەلشەرقولئەسەت مافی بلاّوکردنەوەکەی بەدەستهێنا و بلاّویکردەوە.

دوای ئیبن تەیمییە لە سەدەی (١٨) لەسەردەمی حوکمی عوسمانیەکان کەسێکیتر دەرکەوت بەناوی (محمەد کوڕی عبدالوەهاب ١١١٥-١٢٠٦ ك) لە عوینییە لە نەجد کە دەکاتە رۆژهەلاّتی ئیستای شانشینی سعودییە، بزووتنەوەیەکی سەلەفی دادەمەزرێنیٚ بەناوی (التوحید) ئەم بزووتنەوەیە کە دواتر بە وەهابییەکان ناوبانگیان رۆشتووە، خۆیان بە ئەهلی تەوحید- یەکتاپەرستەکان ناوزەد دەکەن. ناونانیان بە وەهابی لەوەوەهاتووە کە تەنیا کەسێك کە (محەممەد کوڕی عەبدولوەهاب) خاوەنی ئەم بزووتنەوەیەیە و توانا و هەوڵی ئەو کەوتە سەرپێی خۆی و گەشەیکرد و بەزوویی لەو ناوچەیە بلاّوبویەوە، محەممەد کوڕی عەبدولوەهاب و بزووتنەوەکەی دادەنرێت بە میراتگری ئیبن تەیمییە بەتایبەتی کوڕی عەبدولوەهاب بەوەناسراوە

کە لەژێر کاریگەری نووسینەکانی ئیبن تەیمییە و ئیبن قەییمدایە لە دژایەتیکردنی دیاردە شیرکییەکان و گەڕانەوە بۆ یەکتاپەرستی راستەقینە و دژایەتی شیعە و ڕێبازی تەسەوف و عیرفان، بەلاّم ئەم توندتربوو لە ئیبن تەیمییە بەتایبەتی لە دژایەتی شیعە و سۆفییەکاندا، ئەوەی ئیبن تەیمییە و محەممەد کوڕی عەبدولوەهاب لەیەکجیادەکاتەوە، ئیبن تەیمییە زانایەکی گەورەیە و خاوەنی چەندین کتێبە و دەیەها موجەلەد فەتوای هەیە کە بە (الفتاوی الکبری) ناسراوە و مەرجعێکی گەورەشە لەهەموو زانستە ئیسلامییەکاندا، بەلاّم محەممەد کوڕی عەبدولوەهاب چەند کتێبێکی کەم و بچووکی هەیە بەتایبەتی لەبواری تەوحیدا، ئەو کتێبانەش لە نامیلکەوە نزیکن و ناوەڕۆکەکەشی تەنیا بریتییەلە کۆکردنەوەی ئەو حەدیسانەی لەوبارەیەوە وتراون، بەبێ هیچ راڤە و لێکدانەوەیەك، بەلاّم دواتر لەلایەن چەند زانا و نووسەرێکی سعودییە و سەر بە ڕێبازەکەی محەممەد کوڕی عەبدولوەهاب ئەو کتێبانە لێکۆڵینەوەی درێژی لەبارەوە کراوە و راڤە و لێکدانەوە بۆ حەدیسەکان کراوە.

پێدەچێت محەممەد کوڕی عەبدولوەهاب زیاتر کەسێکی عەمەلی بووبێت، وردبووبێت لە ڕێکخستنی کارەکانیدا و لە بەڕێوەبردنی بزووتنەوەکەی، بۆیە توانی لە عوینییە پشتگیری حاکمەکەی عوسمان بن محەممەد بەدەستبهێنێت کە بووە هۆی بلاّوبوونەوەی بزووتنەوەکەی، بەلاّم دواتر لەژێر کاریگەری و فشاری هەندێك لە سەرۆك خێڵەکان حاکمی عوینییە ناچاربوو دەستبەرداری محەممەد کوڕی عبدولوەهاب بێت، ئەویش ناچاربوو رووبکاتە (الدرعیە) کە محەممەد بن سعود باپیرە گەورەی ئال سعود حاکمی بوو کە ئامادەی دەربڕی بۆ پشتگیری و پەیوەندییەکی خێزانیش لەنێوانیادا دروستبوو.

هاوکات هەماهەنگی نێوانیان سەرەتایەکی نوێی دەستپێکردن بوو بۆ دامەزراندن و راگەیاندنی دەوڵەتی سعودی لە ١٧٤٦ بەشێوەیەکی فەرمی و ئەم دەوڵەتە توانی شەرعییەتی دینی لە بزووتنەوەی وەهابییەوە وەربگرێت و رۆڵێکی گەورەی بینی لە پایەدارکردنی دەسەلاّتی ئال سعود بەدرێژایی مێژوو.

دوای پشتگیری ئال سعود لە وەهابییەکان، ئەم رێکخراوە زۆر بەهێزبوو و کۆمەلێ پەلاماری دەستپێکرد بو کۆنترۆکردنی خێڵەکانی نەجد و حیجاز و هەروەها پەلاماری تایف و ریازی دا و خەڵکێکی زۆر لەم جەنگانەدا کوژرا و لە ساڵی ١٨٠٣ پەلامارەکانیان

بەرفراوانکرد بۆ دەرەوی نەجد وحیجاز و لە مانگی موحەڕەمدا ولە وەرزی کۆبوونەوەی شیعەکان لە یادی مەراسیمی کوژرانی ئیمام حسێندا هیرشیانکردەسەر کەربەلا و بەپێی گێڕانەوەی مێژوونووسان سی هەزار کەسی تیاداکوژراوە.

لێرەوە دەردەکەوێت بزووتنەوەی وەهابییەکان کە ئەمرۆ سەلەفییەتی زانستی (مەدخەلی) نوێنەرایەتیدەکات، خاوەنی مێژویەکی خوێناوین و دامەزراندنی شانشینی سعودی بەزەبری هێزی ئەوان و رژاندنی خوێنی نەیارەکانیان دامزراوە، سەردەمێك ئەم بزووتنەوەیە لە جەنگێکی خوێناویدا بووە لە نیوەدوورگەی عەرببیدا و بەزەبری هێز و بەبێسلەمینەوە لە خولقاندنی چەندین جەنگی خوێناوی ئەم شانشینە سەلەفییەی دامەزراندووە.

### ئاوێتەبوونێکی نوێ

لە ئاوێتەبوونی فکری ئیبن تەیمییە کە فکرێکی کراوە و فراوانە لەڕووی عەقیدە و موعامەلاتی ئەحکامی ئیسلامەوە وتوند و پەرگیرە لەڕووی سیاسی و جیهادییەوە و بەگەیشتنی زانستی سیاسی سەردەمی مۆدێرنەی ئەوروپی و شێوازی دروستکردنی پەیکەری رێکخستنی حیزب و جۆری پەیوەندی ئۆرگانەکان و گەیشتنی ئەزموونی حیزبە چەپ و مارکسییەکان و هەروەها بەسودوەرگرتن لە ئەزموونی کاری جیدی و توندی نازییەت و فاشییەت، دوای هەڵوەشاندنەوەی خەلافەتی ئیسلامی عوسمانی ١٩٢٢، رێکخراوێکی نوێ لەدایکبوو ئەویش سەرهەڵدانی بزووتنەوە ئیسلامییەکانە و سەرمەشقی ئەو بزووتنەوانەش (برایانی موسڵمان، ئیخوان مسلمین) بوون، برایانی موسڵمان کاردانەوەی هەڵوەشاندنەوەی خەلافەتی عوسمانی بوو. ئەم رێکخراوە لەسەرەتاوە رێکخراویکی بەرفراوانبوو، لەڕوی پەروەردەیی و بانگخوازی و کاری سیاسی و ئەمنیەوە کە هەموو جومگەکانی لە دەستی حەسەن بەننادا بوو ١٩٠٦- ١٩٤٩، ئەم حیزبە لە سەردەمی کۆماری جەمال عەبدولناسر تووشی گرتن و کوشتن و راونان بوویەوە، زۆربەی بانگخواز و کادرە پێشکەوتووەکانیان لە زینداندا توندکرد و رووبەڕووی ئەشکەنجەدانێکی دڕندانە بوونەوە کە مامەڵەی دەوڵەت لەگەڵ ئیخوانەکان کاردانەوەی سیاسی و فیکری گەورەی بەدوای خۆیدا هێنا. یەکێك لە بیرمەندە

گەورەکانی ئیخوان سەیید قوتب بوو. سەیید قوتب پێش ئەوەی ببێت بە ئیخوان یەکێك بوو لە ئەدیب و رەخنەگرە گەورەکانی میسر، چەندین لێکۆڵینەوەی ورد و جۆراوجۆری لەسەر کۆمەڵگەی عەرەب و کۆمەڵگەی میسری بەتایبەتی هەیە. هەر ئەویش بوو رۆماننووسی بەناوبانگی میسری خاوەن خەلاتی نۆبلی کەشفکرد. یەکەم کەسبوو کە کۆدی رۆمانەکانی (نەجیب مەحفوز)ی کردەوە. دوای ئەو ئیتر وەك رۆماننوسێکی گەورە دەرکەوت. سەیید قوتب لەزینداندا رووبەڕووی ئەشکەنجەدان بوویەوە، قۆناغی زیندانی سەیید گۆڕانی گەورەی بەسەر بیرکردنەوەیدا هێنا لەزینداندا، بەشی زۆری کتێبی مەشخەلاتی ریَ (معالم فی الطریق) ی لەزینداندا نووسی کە لەو کتێبەدا و لە پێشەکی تەفسیری سورەتی التوبە و الانفال نەخشە رێگایەکی نوێی خستەڕوو بۆ بزووتنەوەی ئیسلامی کە پێکهاتبوو لە دروستکردنی تاقمێك کە جیاوازبێت لە کۆمەڵگەی ئیسلامی و خەڵکە ئاساییەکەی ناو جیهانی ئیسلامی بەتەواوی دابڕاوبێت لەو کۆمەڵگایەی کە دابڕاوە لە ئیسلام و گەڕاوەتەوە بۆ سەر نەریتی جاهیلی، کۆمەڵگایەك هەموو مەرجەکانی جەهلبوونی تیادا هاتووەتەدی دەبێت ئەم تاقمە دابڕێت لەو کۆمەڵگەیە و ئەرکی گەڕانەوەی شەریعەت بێت بۆ سەر شانۆی جیهان. وهەموو شەریعەتە جاهیلییەکانیش کۆتاییپێبێنیت لێرەوە سەیید قوتب زاراوەیەکی نوێی داهێنا ئەویش (کۆمەڵگەی جاهیلییە) کە سەرەتایەك بوو بۆ کافرکردنی کۆمەڵگە. ئەو زمانەش سەیید قوتب پێیدەنوسی زمانێکی ئەدەبی رەوان و سەرنجڕاکێش بوو کە بەپێی بیردۆزەکەی خۆی لە سەردەمی جاهیلیدا فێریبوبوو کاتێك کە رەخنەگریکی ئەدەبی بوو، وهم زمانە ئەدەبیە رەوانە کاریگەرییەکی گەورەی کردەسەر دڵ و دەروونی گەنجانی نێو بزووتنەوە ئیسلامییەکان کە بەهۆیەوە چەندەها رێکخراوی ئیسلامی جیهادی دروستبوون، کە بوون بە ناوك و قاعیدەی جیهاد لە جیهانی ئیسلامیدا، دوای داگیرکردنی ئەفغانستان لەلایەن یەکێتی سۆڤیەتەوە لەساڵی ١٩٧٩و دەستپێکردنی شەڕێکی بەوەکالەت لەنێوان سۆڤیەت و ئەمریکا لە ئەفغانستان زەمینەیەکی شەرعی و رەسمی بۆ ئەو بزووتنەوانە خولقاند، بۆ بانگەوازکردن بۆ جیهادێکی راستەقینە کە هەموو زانایانی جیهانی ئیسلامی پشتگیرییان لێدەکرد و فتوای جیهادیان بۆ دەردەکرد چ زانایانی سەر بە ئەزهەر و چ زانایانی کەنداوی عەرەبی بەتایبەتی زانایانی ئیسلامی سعودی.

لە ململانێی ئەفغانستاندا راستەوخۆ دەوڵەتی سعودییە و پاکستان نوێنەرایەتی بەرەی ئەمریکایان دەکرد، چەندەها رێکخراوی خێرخوازی لە سعودییە دامەزرا بۆ کۆکردنەوەی هاوکاری بۆ جیهادی ئەفغانی و هاندانی گەنجان بۆ رۆشتن بۆ سەرزەمینی جیهادی ئەفغانی. یەکێك لەو بنەمالانەی کە نزیك بوو لە بنەماڵەی شاهانەی ئال سعود و بەشداری کاریگەری هەبوو لە جیهادی ئەفغانی بنەماڵەی بنلادن بوو، ئەرکی پشگیری جیهادی ئەفغانی سپێردرا بە کوڕە ناوەنجییەکەیان کە ئوسامە بوو. هەڵبەتە ئەو گەنجانەی لە سعودییەوە دەڕۆشتن بۆ جیهادی ئەفغانی هەڵگری فیکری سەلەفی و وەهابی بوون، لەبەرئەوەی ئەمانە زۆرینەی عەرەبە ئەفغانەکانی جیهادی ئەفغانیان پێیکهێنا و لەڕووی زانستی شەرعییەوە سەر بە مەدرەسەی وەهابی بوون و لەڕووی مادییەوە منەتیان بەسەر ئەو جیهادەوە هەبوو، بۆیە ئەمانە بوونە تاقمێکی زاڵ لەنێو جیهادی ئەفغانیدا، توانییان رەوتێکی نوێ دروستبکەن کە ئاوێتەیەك بێت لە فیکر و عەقیدەی سەلەفی و بەکردەوەش جیهاد، بە یەگرتنی سەلەفییەتە زانستییە سعودییەکە و جیهادییە عەمەلییەکە رەوتەکە ناسرا بە سەلەفی جیهادی.

●●●

## سەرچاوەکان:


١. التبرئة زز تبرئة امة السيف والقلم من منقصة تقمة الخور والسيف. د.ايمن الظواهری.
https://archive.org/details/altabr٢a٠٠
٢. الفتاوی الكبری. تقی الدين ابوالعباس احمد بن عبدالحليم بن عبدالسلام بن عبدالله بن ابی القاسم ابن تيمية الحرانی. دارالكتب العلمية. الطبعة الاولی ١٩٨٧.
٣. مذكرة التعرية لكتاب التبرئة جريدة الشرق الاوسط.
http://archive.aawsat.com/files.asp
٤. وثيقة ترشيد العمل الجهادی سيد امام (دكتور فضل).
www.jihadica.com/wp-content/uploads/208/5/tarshid-al-jihad.pdf
٥. الوهابية. د. حامد الكار- ترجمة د. عباس خضير عباس- منشورات الجمل - كولونيا (المانيا)- بغداد- الطبعة الاولی ٢٠٠٦.
٦. الحركة الوهابية. الدكتور محمد خليل هراس. دار الكتاب العربی. بدون تاريخ النشر بيروت.
٧. رسالة العمدة فی اعداد العدة للجهاد فی سبيل الله. عبدالقادر بن عبدالعزيز
www.m5zn.com/newuploads/2015/02/18/pdf/4f2fb076fd7.pdf
٨. الوصية الكبری. احمد بن عبد الحليم بن عبدالسلام بن تيمية الحراتی، تحقيق محمّمد عبدالله نمر- جمعة عثمان ضميرية، مكتبة الصديق. الطايف ١٩٨٧.
٩. فی ظلال القران. سيد قطب ابراهيم حسين الشاربی. دار الشروق - الطبعة الثانية والثلاثون - بيروت ٢٠٠٣.

# نەوەی دواتری سەلەفییەتی جیهادی حاییم مەلکا و ویلیەم

ن: حاییم مەلکا و ویلیەم لۆرەنس
و: حەسەن حسێن

**پوختە**

شۆڕشە جەماوەرییەکانی باکووری ئەفریقا دەرفەتی بۆ شەپۆلێکی نوێی سەلەفییەتی جیهادیی رەخساندووە کە بەرەو ئەوەدەچێت ببێتە رەوتێکی بالادەست و ئامانجییەتی نەوەی نوێی چالاکوانەکان بۆ خۆی راکێشێت. پێشتر رێکخراوی ئەلقاعیدە هانی گەنجانی دەدا بۆ چەکهەلگرتن لە دژی ئەو حکومەتانەی لەلایەن رۆژئاواوە پشتیوانیدەکران و شەڕکردن لە چوارچێوەی جیهادی نێودەوڵەتیدا، بەڵام نەیتوانی ژمارەیەکی زۆریان بەرەو ئەو ئاراستەیە ببزوێنێت .

لەکاتێکدا تاکتیکی سەرەکی ئەم توندڕەوییە تازەیە، پەنابردنەبەر بڵاوبوونەوە و چالاکی کۆمەڵایەتییە، هەڕەشەیشە بۆ لاوازکردنی حکومەتە بێهێزەکان و بڵاوکردنەوەی توندڕەوییش لەناو کۆمەڵگە پەرتبووەکاندا. وەڵامی ئەوکاتەی دەوڵەت بەرامبەر بە ئەلقاعیدە زیاتر سەرنجخستنەسەر تەکتیکی جۆروجۆری دژەتیرۆربوو. بەڵام چارەسەرکردنی ئەم توندڕەوییە گەشەکردووە ئالۆزترە و پێویستە گشت کایە کۆمەڵایەتی، ئابووری، ئایینی و سیاسییەکان بگرێتەوە. دواجار ئەم شەپۆلە بەربڵاوە یا سەلەفییەتە جیهادییە میللییە ئەگەرچی لە ئەلقاعیدە درامیتر نابێت، بەڵام بەشێوەیەکی زۆر فراوانتر کاردەکاتەسەر ئایندەی ناوچەکە.

لە ماوەی دوو دەیەدا تەقالاکانی رێکخراوی ئەلقاعیدە لە باکووری ئەفریقیا، بەزۆری لەسەر ئەو گروپانە چڕبووەوە کە لە دەیان چەکدار پێکهاتبوون و هەوڵیاندەدا بە

توندوتیژیی ئەو حکومەتانە بڕووخێنن کە لەلایەن ڕۆژئاواوە پشتیوانیدەکران. هەرچەندە ئەوان بانگەشەی ئەوەیاندەکرد کە سەلەفین و خەریکی جەنگێکی پیرۆز یا جیهادن لەپێناو ئیسلامدا، بەڵام ئەو تاکتیك و ئایدۆلۆژیایانەی کە پەیڕەویان لێدەکرد، دەریخست ئەمان جیاوازن لە سەلەفییەتی ئۆرسەدۆکسی توندڕەو کە بەلای ئەوەدا دەچێت لە ئاراستە سیاسییەکانیدا نەرمتربێت. هەرچەندە گروپە سەلەفییە جیهادییەکانی[1] سەربە ئەلقاعیدە لەچاو زۆربەی گروپەکاندا سەرباسی هەواڵەکان بوو، بەڵام شەپۆلی گروپە سەلەفییەکان بەهێمنی زۆرترین ژمارەی شوێنکەوتووی بۆ خۆی بەدەستهێنا.

شۆڕشەکانی جیهانی عەرەبی کە ساڵی ٢٠١١ بەرپابوون، زەمینەیان بۆ دەرکەوتنی شەپۆلێکی نوێی سەلەفییەتی جیهادیی خۆشکرد و دەرفەتێکیش بوون بۆئەوەی ئەم گروپانە زیاتر و زیاتر باڵادەست و جەماوەریتربن. لایەنگرانی ئەم گروپانەیش ئامانج و جیهانبینییەکانیان لەگەڵ ئەلقاعیدەدا بەشکرد، بەڵام لە هەڵبژاردنی شێوازەکانی توندوتیژیدا واوەتر ڕۆیشتوون. ئاخر ئەوان چالاکی کۆمەڵایەتی و بانگخوازییان لێکهەڵپێکاوە، گەرموگوڕییەکی زیاتریشیان هەیە بۆ ناکۆکییە خوێناوییەکانی گشت جیهان، بەتایبەت لەمکاتەدا بۆ شەڕکردن لەگەڵ ڕژێمی ئەسەد لە سوریا. زۆرجاریش گەنجە سەلەفییە جیهادییەکان ڕێز و شکۆیەکی زیاتر دەدەن بەو کەسانەی لە چوارچێوەی جیهادی سوریدا شەڕدەکەن، هەروا ئەو کەسانەیش کە پێشتر لە ئەفغانستان، عێراق و وڵاتانیتردا شەڕیانکردووە.

لەگەڵ ئەوەیشدا لەجیاتی ئەوەی بەشێوەیەکی بنەڕەتی سەرنجیان بخەنەسەر ڕاکێشانی گەنجان و پیاوانی بێبەش و پەراوێزخراوی کۆمەڵگە بۆ ڕۆیشتن بەرەو کەمپەکانی مەشقکردن لە سوریا یا لەبیابانەکاندا، بەشێوەیەکی روولەزیاد، لەرێگەی کاری ڕاستەوخۆوە، هەوڵی گۆڕینی ئاراستەی کۆمەڵگە لەناوەوە دەدەن. لەبەرئەوەی دەتوانن خەڵکانێکی زۆر هەڵخڕێنن تا خۆپیشاندان لەبەردەم باڵیۆزخانەیەکدا سازبکەن یا هێرشبکەنەسەر پیشانگایەکی هونەری یا نارەزایی لە دژی هەندێك سیاسەت دەربڕن کە پێیانوایە هێرشبەرانەیە.

ئیدی نە ئامانجی سەرەکی ئەم سەلەفییەتە جیهادییە نوێیە و نە شێوازی کارکردنیشی ئەوە نییە، دیمەنی توندوتیژیی دژبە دەوڵەت یا ئامانجە رۆژئاواییەکان دروستبکات، لە نموونەی ئەو هێرشەی کە لە کانونی دووەمی ٢٠١٣دا بۆ سەر دامەزراوەی گاز لە ناوچەی (عەین ئەمیناس) لە جەزائیر روویدا کە هەرچەندە سەرنجراکێشبوو، بەڵام مەبەستی بەدەستهێنانی پشتیوانیی دانیشتووان نەبوو، بەڵکو لەجیاتی ئەوە، هەندێکجار پەنادەبەنەبەر کاری راستەوخۆی ئامانجدار هەڵبەتە لەنێویشیدا ئەنجامدانی توندوتیژی، سەلەفییە جیهادییە نوێیەکان هەوڵی ریشەیی و ستراتیژیتر دەدەن بۆ ئیسلامیزەکردنی کۆمەڵگە و بەدیهێنانی ئامانجەکانیان.(٢)

گەشەکردنی ئەم جووڵانەوە سەلەفییە جیهادییە نوێیە، هەڕەشەیە بۆ لاوازکردنی حکومەتە فشۆڵەکان و بڵاوکردنەوەی توندڕەوی لەنێو کۆمەڵانی خەڵکدا کە بەهۆی قەیرانە ئابوورییەکان و دابەشبوونە کەلتووری، کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانەوە زیاتر و زیاتر پەرتدەبن.

بۆ نموونە گروپێکی گەورە و جێگیر لە لایەنگران، کە هەندێکجار پەنادەباتە بەر توندوتیژیی، زیاتر دەبێتەهۆی ناسەقامگیریی وڵات، لەچاو گروپێکی سەختگیری پێکهاتوو لە دەیان یا سەدان چەکدار کە لە چیاکان یا ناو بیابانەکاندا خۆیان حەشاردابێت. لەکاتێکدا دەوڵەت لەوەڵامدانەوەی ئەلقاعیدەدا زیاتر سەرنجی خستبووەسەر تاکتیکی دژەتیرۆر، بەڵام پێویستە چارەسەری دژە توندڕەویی فرەلایەنتر بێت و گشت ئاستەکانی کۆمەڵایەتی، ئابووری، ئایینی و سیاسیی بگرێتەوە.

هەرچەندە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لەڕێگەی پەرەپێدانی ئابووری، تەوافوقی سیاسی و هاریکاریی ئەمنییەوە، هێشتا پشتیوانیی لە سەقامگیریی ناوچەی باکووری ئەفریقا دەکات. بەڵام سەلەفییەتی جیهادیی کاردەکاتەسەر ئەم هەوڵانە. ئەمەیش لەڕێگەی دەرکەوتنی بەرەنگاریی نوێیەوە کە بەرەو رووی بەشداریکردنی ئەمریکا لەناوچەکەدا دەبێتەوە. دواجار، سەلەفییەتی جیهادیی میللی دیمەنێکی میدیایی کەمتری دەبێت لەوەی پەلامارە خوێناوییەکانی ئەلقاعیدە و رێکخراوەکانی سەربەو، هەیانبوو،

بەڵام سەرکەوتن یا شکستی ئەم بزووتنەوەیە کاریگەریی زیاتری دەبێت بۆسەر ئاراستە و سیاسەتەکانی چەند ساڵی داهاتووی ئەم کۆمەڵگایانە.

جیاکردنەوەی نەوەی نوێی سەلەفییە جیهادییەکان لە نەوەی کۆن، خۆی لەخۆیدا تەنگژەیەکە، ئەمەیش لەبەرئەوەی دابەشبوونی نەوەکان زیاتر نزیکەییە وەك لەوەی پۆلینکردن (categorical) بێت، بەڵام ئیدی ئەوەیش زیاتر ڕووندەبێتەوە کە لایەنیکەم لەئێستادا، ئەو توندوتیژییەی نەوەی نوێ ئەنجامیدەدەن حیسابی وردی بۆکراوە و باشتر بیری لێکراوەتەوە وەك لەوەی شتێکی بێئەندازەبێت. ئاخر لەجیاتی ئەوەی بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکان بەشێوەیەکی سەرەکیی پشتبەکردەوەی چەکداری ببەسترێت، لەلای ئەم نەوە نوێیە چالاکی کۆمەڵایەتی و سیاسی، ئامڕازێکی گرنگترە.

لێکهەڵپێکانی کاری کۆمەڵایەتی و توندوتیژیی فاکتەرێکی بەهێزە و توێژێکی کۆمەڵایەتی زۆر گەورەتر دەگرێتەوە لەو توێژەی کە ئەلقاعیدە بەدرێژایی مێژووی خۆی پەلی بۆهاویشت، هەروەها سەردەکێشێت بۆ نەشونماکردنی ناڕوونییەکی نوێ دەربارەی بەکارهێنانی توندوتیژی چ لەسەر ئاستی گوتار و چ لەسەر ئاستی ڕەفتار. ئەمەیش دەبێتە هۆی زیادبوونی بەرەنگارییەکانی بەردەم خاوەن بڕیاری سیاسی و شرۆڤەکاران کە دەیانەوێت ئاڵۆگۆڕییەکان دەستنیشان و چارەسەربکەن.

بەوەشدا کە پۆلێن و پێناسەی سەلەفییە جیهادییەکانی پێشوو پەیوەندییان بە ژینگەی کۆمەڵایەتی و سیاسیی باوی باکووری ئەفریقیاوە نەماوە، هەربۆیە تێگەیشتنێکی نوێی ئەم بزووتنەوەیە، چلە کاریگەرییەکەیەوە لەسەر کۆمەڵگەکانی ناوچەکە و چ لەچۆنێتی ڕووبەڕوبوونەوەی، بوونەتە شتگەلی چارهەڵنەگر.

### پێناسە و سنوورەکانی پۆلێنکردن

سەلەفییە جیهادییەکان بەشێکن لەبزووتنەوەیەکی سەلەفیی فراوانتر کە لەڕێگەی باوەڕ و هەڵسوکەوتەکانیانەوە دەیانەوێت چاو لە هەڵسوکەوتی موسڵمانەکانی پێشینانیان بکەن.(٣)

سەلەفییە هاوچەرخەکان دەیانهەوێت دەقاودەق بەگوێرەی قورئان و سوننەت بجووڵێنەوە و سوننەتیان کردووەتە ڕێبەرێك بۆ ژیانی ڕۆژانەیان. ئەوان لەڕوانینیاندا کۆنەپارێزن و لە سرووتە ئایینییەکانیشیاندا توندن، لە ژیانی ڕۆژانەشیاندا پێداگریی زۆر لەسەر حەلاڵ و حەرام دەکەن، هەروەها تێدەکۆشن بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئایینیی لەسەر بنەمای شەریعەتی ئیسلامیی، بەڵام لەبەدیهێنانی ئەو ئامانجەدا جیاوازن.

ئەم سەلەفییانە بەگشتی بەسەر سێ تایپی جیاواز و لەهەمانکاتدا بەیەکداچوو دابەشدەبن کە ئەمانەن: کتێبییەکان (فیقهییەکان ـ و.ك) یا ئەوانەی تەنها پشت بە قورئان دەبەستن و بەشێوەیەکی سەرەکی سەرنجیان لەسەر روانینی ڕۆحانیی و زەکات و فێرکردنە، سەلەفییە سیاسییەکان کە لە سیاسەتی هاوچەرخدا لەنوێنەرایەتیکردندا بەشدارن و سێیەمیشیان سەلەفییە جیهادییەکان.(٤)

تا ئەم دواییانەیش، شرۆڤە و شیکارییەکانی ڕۆژئاواییەکان، بەشێوەیەکی سەرەکی بایەخی بە سەلەفییە جیهادییەکان دەدا. ئەم دەستەواژەیەش بۆ ئەو سەلەفییانە بەکارهێنرا کە بڕوایان بە توندوتیژیی هەیە بۆ ڕووخاندنی حکومەتە" گەندەڵ"ەکانیان ئەوانەی ڕۆژئاوا پشتیوانییاندەکات و دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی(٥). لە باکووری ئەفریقیا و لە ساڵانی نەوەدەکاندا(٦) ژمارەیەکی زۆری گروپی سەلەفیی جیهادیی، لەدوای سەرکوتکردنیان لەلایەن دەوڵەتەوە سەریانهەڵدا. لە ساڵی ٢٠٠٠یشدا هەندێك گروپ بەیعەتیان دا بە ئوسانە بنلادن و بە "ناوەندی ئەلقاعیدە" ناسران و هەندێك گروپیتریش لەگەڵ سەرکردایەتی ئەلقاعیدەدا کەوتنە راوێژکردن.

شیاوی باسە ڕێکخراوی ئەلقاعیدە لە وڵاتی مەغریبی ئیسلامی بەناوبانگترین گروپی سەلەفیی جیهادییە کە لە ساڵی ٢٠٠٧دا لە گروپی سەلەفیی بۆ بانگخوازی و

جەنگ (الجماعة السلفية للدعوة و القتال)ەوە و لەپاش چەند ساڵێك لە گفتوگۆی نێوان هەردوو ڕێکخراوەکەدا، داکەوتن.(٧)

بزاوتە سەلەفییە جیهادییەکان ئامانجێکی هاوبەشیان هەیە کە خۆی لەقڵپکردنەوەی حکومەتە هەڵگەڕاوەکان (مرتد)دا دەبینێتەوە، بەڵام ئەو هەوڵانەیان بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکەیان بەگشتی بە کارەسات بۆ ئەم بزووتنەوانە و چەکدارەکانیان کۆتاییدەهات. ئاخرهەزاران ئەندامیان یا هەڵاتن یا دەستگیرکران یا بەدەستی هێزەکانی ئاسایش کوژران، هەرچی ئەوانەیشە کە مانەوە، گەڕانەوە بۆ وشیارکردنەوەی ئایینیی ناسیاسی و بەنهێنی کاریاندەکرد یا پەنایانبردەبەر کاری سیاسی، بەتایبەت لە مەغریب و جەزائیر.(٨)

ئەوەی نەوەکانی پێشووی سەلەفییە جیهادییەکانی لە سەلەفییەکانیدیکەی جیادەکردەوە، ڕەتکردنەوەی بانگخوازی و سیاسەت وەکو ئامرازی سەرەکی بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیان بوو لەبەرامبەر پەنابردنی ڕاستەوخۆ بەرەو جیهاد لە چوارچێوەی توندوتیژییدا. لەگەڵ ئەوەیشدا ڕێکخراوی ئەلقاعیدە لە وڵاتی مەغریبی ئیسلامی و ڕێکخراوەکانی پێش خۆی و گروپەکانی سەربەو لە باکووری مالی و جەزائیر، لەڕێگەی دروستکردنی تۆڕێك لە پەیوەندیی ئابووری لەگەڵ خێڵە لۆکاڵییەکاندا یەکیانگرت، بەڵام تەنانەت لەلایەن ئەو دانیشتووانەیشەوە کە وادیارە لەدەست حکومەتەکانیان و ڕۆژئاوایش هەراسانبوون، پشتیوانییەکی بەرچاوی لێنەکرا. هۆکاری ئەمەیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو توندوتیژییە هەڕەمەکییەی کە بەگشتی لەوەدەچێت زۆر دڕندانەتر بێت لەوەی ئایدۆلۆژی بێت. بێگومان مۆدیلە کۆنەکەی جیهادگەرایی تائێستایش هەرماوە، ئاخر هەردوو ڕووداوی کۆنترۆڵکردنی باکووری مالی لەلایەن میلیشیا هاوپەیمانەکانی ئەلقاعیدە لە ساڵی ٢٠١٢ و پەلاماردانی دامەزراوەی گاز لەنزیکی عەین ئەمیناس لە جەزائیر لە کانونی دووەمی ٢٠١٣، بەڕوونی دەریدەخەن سەلەفییەتی جیهادیی کە کۆپی ئەلقاعیدەن هێشتایش هەڕەشەن بۆ سەر ئامانجە ناوخۆیی و جیهانییەکانیش. سەرباری ئەوەیش پێکهەڵپڕژانەکانی ناو تونس لەگەڵ کەتیبەی عەقبە بن نافیع لە چیای شعانبی لەسەر سنووری نێوان تونس و جەزائیر و سوودوەرگرتن لە ناوچە یاخیبووەکانی باشووری لیبیا،

بەردەوامبوونی چالاکییەکانی سەلەفییەتی جیهادیی نەریتگەرا (ترادیسونالیست) نیشاندەدات. سەرباری هێرش و پەلامارە تیرۆریستی و درامییەکانیان، هێشتایش سەلەفییە جیهادییەکانی کۆپیی ئەلقاعیدە وەك دیاردەیەکی پەراوێزخراو مانەوە و نەیاتوانی جەماوەرێکی زۆر بجوولێنن.

ئەمڕۆ هەرچەندە جیهادییەکانی سەر بە ئەلقاعیدە ڕەنگە بتوانن سەدان و بگرە هەزاران کەس لەناوچەکەدا بۆ شەڕکردن لە سوریا راکێشن یان وایان لێبکەن پەیوەندیبکەن بە گروپە چەکدارە تەریککەوتووەکانەوە، بەڵام هێشتا ناتوانن ببنە سەرچاوەیەك بۆ دەیان هەزار کەس کە حکومەتی پێبڕووخێت.

جێیباسە لە سەرهەڵدانی شۆڕشەکانی وڵاتانی عەرەبییەوە لە ساڵی ٢٠١١ نەوەیەکی نوێی سەلەفییە جیهادییەکان سەریانهەڵدا. ئەم نەوە نوێیە چالاکیی دوژمنکارانە لەناو جەرگەی کۆمەڵدا، لەگەڵ کاری راستەوخۆ و توندوتیژییان بەلاوە باشە. ئاخر ئەوان کۆکەرەوەی پەیامی سەلەفییە فیقهییەکان (ئەوانەی پەیوەستن بەقورئانەوە)و خواستی سەلەفییە سیاسییەکانن بۆ فەرمانڕەوایی، سەرەڕای دەستگرتن بە گوتارێکی هاوشێوەی سەلەفییە جیهادییەکانی ئەلقاعیدە و بگرە توندوتیژتر. شایانی باسە دروستبوونی گروپگەلی نوێی چالاك لەسەر ئاستی مەدەنی کە لایەنیکەم وەك پرەنسیپێك کاری راستەوخۆی سیاسی رەتناکاتەوە، بووە هۆی دەرکەوتن و زاڵبوونی شەپۆلێك لە سەلەفییەتی زۆر توندوتیژتر.

لەگەڵ ئەوەیشدا پێناسە و پۆلێنکردنی روونی سەلەفییەتی جیهادیی هاوچەرخ هەر قورسبوو، چونکە گوتار و رەفتارەکانیش بەیەکداچوون. هەر لەم چوارچێوەیەشدا (ویل ماك کانتس) پێیوایە کە "ئەم سەلەفییانەی پەنادەبەنەبەر توندوتیژیی دوورنین لەو سەلەفییانەی توندوتیژنین، ئاخر ئەوانیش هاتوچۆی هەمان مزگەوت دەکەن، پەیڕەوی لەهەمان زانای ئایینیی دەکەن و دەچنە هەمان زانکۆیش. بەگرێمانەی کانتس ئەوەی کە گۆڕاوە کۆنتێکستە سیاسییەکەیە واتە "ئەوەی سەلەفییەکان ناچاردەکات بەسەرلەنوێ هەڵسەنگاندنەوەی میتۆدەکانیان". (٩)

تۆماس هیگهامەر ڕێگەیەك بۆ پۆلێنکردنی سەلەفییە جیهادییەکان پێشنیازدەکات، ئەو پۆلینکارییەك لەسەر بنەمای بەباشتردانان بۆ تێگەشتنێکی فراوانترو هەمەلایەنەی ئیسلامییەکان دەخاتەڕوو. ئەو پێنج پاڵنەری گروپە ئیسلامییەکان دیاریدەکات کە دەشێت ئاراستانەکانیان رووەو حکومەت یا وڵات یا گەل یا ئاکار یا خێڵ بن. پاشان دواتر گروپەکان، هەریەکە و بەپێی دیاردە توندوتیژی و ناتوندوتیژییەکان، دابەشدەکات. ئەو پێیوایە پاڵنەری زۆری ئەو ئیسلامییانەی کە پەنادەبەنەبەر توندوتیژیی سەرچاوەکەی ئەم ئەجینداپانە یان هەرهەموویان پێکەوەیە. لەگەڵ ئەوەیشدا بەگشتی ئەجینداپەکیان لەوانیتر بەهێزترە، یەکێکیان ستراتیژیی و کارە سەرەکییەکان دیاریدەکات و زۆرجاریش هەرئەمە ئاراستە فۆرمی توندوتیژییەکە دیاریدەکات.[١٠]

هەرچی مۆنیکا مارکسە کە توێژینەوەیەکی مەیدانی لەنێو سەلەفییەکانی تونسدا ئەنجامداوە، پێیوایە شوناس فاکتەری یەکەمە لە دیاردیکردنی ئەوەی کەسێك دەبێتە سەلەفی و چ جۆرە سەلەفییەکیشیان، لەگەڵ هەڵوێستی لەمەڕ توندوتیژیی. بەگوێرەی بۆچوونی مۆنیکا "ئەم گەنجە سەلەفییانە کە هێمنی سەلەفییەتی فیقهی (زانایانی ئایینی کە پەیڕەوی لە قورئان دەکەن)و سیاسەتی حزبیی سەلەفییە سیاسییەکان ڕەتدەکەنەوە، زۆرینەی ڕەهایان شوێن سەلەفییەتی جیهادیی دەکەون".[١١]

نەوەی نوێیی سەلەفییە جیهادییەکان زۆربەی گروپ و پێناسەکان پشتگوێدەخەن، لەبەرئەوەی ئەندامەکانیان، بەگوێرەی جیاوازیی بارودۆخی ناوچەکان، تەکتیکی جیاواز لە کۆنتێکستی جیاوازدا بەکاردەهێنن. هەر لەم چوارچێوەیەیشدا ئەو ژینگە سیاسییەی لە شۆڕشە عەرەبییەکانەوە سەریهەڵدا، هەلی نوێ، بەپێی هەلومەرجی تایبەتیی خۆیان بۆ گەنجە سەلەفییەکان دەستەبەردەکات. شیاوی باسە ئەم پۆلینکردنانە تاڕادەیەك زۆر روونین، چونکە سەلەفییەکان خۆشیان دەیانەوێت دەستبەرداربن.

هەڵکشانی شەپۆلی گروپە سەلەفییە جیهادییە نوێیەکان زیاترە لەوەی گۆڕانکارییەك بێت لە نیشانەی (مارکە) بازرگانیی بنلادن کە ئەو لە بەرگریکارە هەرە بەناوبانگەکانی بوو. لەڕاستیدا ئەم شەپۆلە بەهۆی شکستی ئەو ئایدۆلۆژیایەوە پێکدێت.

لە دەیەی رابردوودا جیهادییەکان لە باکووری ئەفریقیا بە پاساوی رووخاندنی حکومەتەکان، کوشتن و تۆقاندنێکی زۆریان ئەنجامدا. لەگەڵ ئەوەی ئەو توندوتیژییە مشتومڕێکی بەهێزیان دروستکرد لەبارەی ئەوەی داخۆ ئامانجێکی رەوایە. بەڵام ئەنجامی ئەو کوشتارە زۆرەی لە پەلامارە تیرۆریستییەکانەوە کەوتەوە، ئەوەبوو هەڵوێستی دانیشتووانی مەغریب کە زەنگی پەیامی ئیسلامییەکان لەنێویاندا بەبەردەوامی زایەڵەی دەهات، لە دژی گروپە هەڵگەڕاوەکان گۆڕانی بەسەرداهات.(۱۲)

## سەلەفییەتی جیهادیی دەستبەرداری رەوتی باوەبێت

هەر لەسەرەتاوە شۆڕشە جەماوەرییەکانی ساڵی ۲۰۱۱ی باکووری ئەفریقیا بانگەوازی سەلەفییەتی، وەك بزوێنەرێکی سەرەکی گۆڕینی کۆمەڵایەتی و سیاسی، کردە دووهێندە. هەرچەندە گەنجە سەلەفییەکان، بەشدارییانکرد، بەڵام ئەوان رابەرایەتیی ئەو شۆڕشانەیان نەکرد. شۆڕشەکانیش پەیامێکی روونیان بەگەنجەکاندا بەوەی ئەوان رێبازی جودا لە شۆڕشی چەکداری دەگرنەبەر. لەو رێبازانەیش خۆپیشاندانی ناتوندوتیژانە دژ بە سیستمە فەرمانڕەواکان. سەلەفییەت لەنێو ئەم ناڕەزاییانە و هەلومەرجە بزۆزەیش کە رێخۆشکەری ناڕەزاییەکان بوو، نەك هەرنەبوو بە هەڵم، بەڵکو لەگەڵیاندا خۆی گونجاند.

لەخۆگونجاندنە ئاشکراکانی ئەم بزواتە سەلەفییەش پەیوەستبوونیانە بەو شەپۆلە ناڕازییانەوە. ئەمەیش لەگەڵ سەلەفییە جیهادییەکانی ئەلقاعیدە کە لەڕووی جوگرافی و کۆمەڵایەتییەوە لە پەراوێزی کۆمەڵدا بوون، ناکۆکە.

ئەو ژینگە سیاسییەش کە لەشۆڕشەکانەوە خەملی، بووە هۆی دروستبوونی رووبەرێك بۆ گروپی سەلەفی جیهادیی نوێی وەك ئەنسارولشەریعە کە بانگەشەی جیهادیان لە دژی فەرمانڕەوا زۆردارەکان یا ئەو حکومەتانەی کە رۆژئاوا پشتیوانییاندەکات، راگەیاند. سەرنجیشیان خستەسەر چالاکیی کۆمەڵایەتی و سیاسی وەك ئامرازێکی سەرەکی بۆ بەئیسلامیکردنی کۆمەڵگە و لەکۆتاییشدا دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئیسلامی.(۱۳)

لەڕاستیدا ئەو ئازادییانەی کە شۆڕشەکانی تونس و لیبیا هێنایانەئارا، رووبەرێکی نوێیان بە سەلەفییە جیهادییەکان بەخشی تا بە کۆتوبەندی کەمترەوە پەیامەکەیان بڵاوبکەنەوە، هەروەك دەرفەتی بۆ گروپەکان رەخساند تاوەك بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی و سیاسیی دەربکەون.[١٤] ئەوان لە پەیوەند بە رێوڕەسمە ئایینییەکانیان و پشتیوانیکردنی ئاشکرایشیان لەئەلقاعیدەدا کراوەن. هاوکات بەبەردەوامی دژی نەریت و کەلتوورە "بۆگەن"ەکانی تایبەت بە رۆژئاوان. ئاخر ئەوان بەوە لە سەلەفییەکانیتر جیادەکرێنەوە کە لەکارەکانیاندا زۆر چاونەترسن و ئامادەیشن لەپێناو بەرگریکردن لە هەڵوێستی گشتیدا هێز بەکاربهێنن وەك ئەو نارەزایی و مانگرتنانەی بوونە هۆی داخستنی زانکۆی مەنوبە لە تونس لە ساڵی ٢٠١١.[١٥]

گەنجە سەلەفییە جیهادییەکان رێز لە نەوەی پێشووی جیهادییەکان دەگرن و سەرسامن بەمانە کە شەڕیان لە سوریا و عێراق و چەندین وڵاتیدیکە هەڵایساند. ئەمان بەگشتی ئەزموونە هاوچەرخەکانی دیموکراسییەتی نوێنەرایەتی رەتدەکەنەوە و نەك هەرپێیانوایە هێزە رۆژئاواییەکان بەدرێژایی مێژوو رژێمە زۆردارەکانیان هێناوەتەسەر تەخت و پشتیوانیانکردوون و سەرلەنوێ دایان مەزراندوونەتەوە، بەڵکو بۆچوونیشیانوایە کە ئامانجی رژێمە زۆردارەکانی پێشوو ئەوەیە جڵەوی ناوچەکە بگرنەوەدەست.

لەکاتێکدا ئەوان لایەنگری جیهادی توندوتیژن لە سوریا یا بەرەنگاربوونەوەی هێزە ئەمریکایی و رۆژئاواییەکان، بەڵام ئەوان بەگشتی بانگهێشتی جیهادیان لە دژی ئەو حکومەتانە نەکرد کە لەدوای شۆڕشەکانی جیهانی عەرەبییەوە هاتنە سەرکار،[١٦] هەرچەندە ئەوان پاڵپشتیی هەندێك چالاکی و تەکتیکی توندوتیژیی دەکەن.

ئەم گروپە سەلەفی - جیهادییە جەماوەرییە نوێیانە ئەنجامدانی توندوتیژییان وەك ئامرازێکی رەوا بۆ بەدیهێنانی کۆمەڵێك ئامانج، پەسەندکرد. ئاخر ئاراستەی ئەمان پەنابردنەبەر توندوتیژییەکی وریایانەیە لە دژی خەڵکی و ماڵ و حاڵیان، لەجیاتی رووبەڕووبوونەوەی راستەوخۆی هێزەکانی ئاسایش یا سەرانی وڵات. بۆنموونە لایەنگرەکانی ئەم گروپانە بەشێوەیەکی ئاشکرا هێرشدەکەنەسەر کەسانی مەست و سەرخۆش یا ئەوانەی

خەریکی بازرگانیی ئەکهولن، بەڵام بەشێوەیەکی رێکخراوتر، گروپەکان لە هەریەکە لە تونس ولیبیا دەیان ئارامگا و نزرگەیان وێرانکرد کە لەناو خەڵکە موسڵمانەکەدا، پیرۆزن و تەرخانکراون بۆ پیاوە ئایینییەکان. ئەمەیش وەك هەنگاوی یەکەمی پرۆسەی پاککردنەوەی کۆمەڵگەکانیان لە کاریگەری هەزار ساڵەی ئەو نەریتانەی ئیسلامیان تێکداوە.(١٧)

وامەزەندەدەکرێت کە ژمارەی ئەو شوێنانەی لە لیبیا وێرانکراون لە شەست بۆ دووسەد شوێنی پیرۆزبێت، زۆرترین سەرنجیش لەسەر ناوچەکانی تەرابلوس و بەنغازی بووە. هەندێکجار ئەو کاولکارییانەیش بەدەستتێکەڵاوکردن لەگەڵ بەرپرسانی ئاسایشدا ئەنجام دراون.(١٨)

بەڵام هەندێك رێوشوێنیش کە گیراونەتەبەر زۆر دوژمنکارانەتر بووە و دەرهاویشتەی خراپتری هەبووە. هەر بۆنموونە لەو دۆخەدا کە لەدوای فیلمی "پاکێتی موسڵمانان"ەوە دروستبوو، لە رۆژی ١٤ی ئەیلولی ٢٠١٢ هێرشکرایەسەر باڵێۆزخانەی ئەمریکا و ئەنساولشەریعەی تونس بەئەنجامدانی ئەو هێرشە تۆمەتبارکرا، بەڵام سەرکردەکەیان ئەبو ئەیادی تونسی کە خۆی شاردبووەوە، رەتیکردەوە گروپەکەی ئەو کارەی ئەنجامدابێت. ئەمە لەکاتێکدایە کە ئەنساروولشەریعە لە بەنغازی نکوڵی لەوەدەکەن باڵیۆزی ئەمریکی"کریس ستیفینز"و سێ ئەمریکاییتریان بەشێوەیەکی بەرنامە بۆرێژراو کوشتبێت، بەڵام بەکردەوەیش بەشدارییکردنی ئەندامەکانیان لە پەلاماردانی کونسوڵخانەی ئەمریکیدا رەتنەکردەوە. لەوانەیە هێرشەکان بەسەرکردایەتی ئەنساروولشەریعە روویان نەدابێت، بەڵام ژمارەیەکی بەرچاویشیان لە هەردوو پەلامارەکەدا بەشدارییانکرد.(١٩)

گەنجە سەلەفییە جیهادییەکان هەمانهەستی توورەیی و نائومێدییان هەیە کە گەنجانی شۆڕشگێری ناسەلەفی هەیانە. وەك ئەوانیش هەوڵدەدەن بۆ بەدیهێنانی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی و ئابووری و بەزۆریش هاوهەڵوێستی خۆیانبەوە رووندەکەنەوە کە فەلسەفە ئابوورییەکانی سۆسیالیزم و سەرمایەداری فەلسەفەگەلی مایەپووچن. وەك

هەوڵێك بۆ خۆجیاکردنەوەی تەواو لەو جیهانەی کە تیایدادەژین، گەنجە سەلەفییە جیهادییەکان شێوازەکانی ژیانی جیهادییان کردووەتە فۆرمێك بۆ خۆیان، نیشانە جەستەییەکانی وەك ریش و شەروالّی پانوپۆڕ و حیجاب و نیقاب، ئەمە جگەلە جیاکردنەوەی پیاوان لە ژنان. مۆنیکا مارکس پێیوایە ئەم نەوە نوێیە "کەلتوورێکی لاوەکییە کە فۆرمێکی جێگرەوەیە بۆ فۆرمەکانی نارەزایی سیاسی و شێوازی ژیان" جیاوازە لەوەی بەسەر شۆڕشە عەرەبییەکانی ساڵی ٢٠١١ دا زاڵ بوو.[٢٠]

پاش ئەوەی بوونە رەوتێکی زاڵ، ئیدی ئەم گروپە سەلەفییە جیهادییانەلەرێگەی رێکخراو و تۆڕگەلی نوێوە کە دەروازەن بۆ تێکەڵاوبوون لەگەڵ گەنجانیدیکەی ناوچە لۆکاڵییەکان، بەشێوەیەکی ئاشکرا تایبەتمەندێتییەکی دامەزراوەییان بەخشییە ئەو پەیامە جیهادییانەی ئاراستەی خەڵکیان دەکرد. هەرچەندە هەندێك هانی گەنجان دەدەن تا کۆمەڵگەکانی خۆیان بەجێبهێڵن و بەرەو بەرەکانی سوریا بڕۆن، بەڵام ئەم جووڵانەوە نوێیانە بە پلەی یەکەم هەوڵ بۆ بەدەستهێنانی هەلی جیهادیی لەناوخۆدا دەدەن، خۆدیارە ئەمەیش لە دژی داگیرکەری بیانی یا رێکخراوێکی "کافر" نییە.

ئەبو محەمەدی مەقدسیش بەناوبانگترین تیرۆریستی ئەم جیهادە نوێیەیە کە را و بۆچوونەکانی کاریگەریی لەسەر چەندین گروپی ئەنسارولشەریعە هەیە، ئەوانەی وابانگەشە بۆ توندوتیژییەکی رێکخراو و مەبەستدار دەکەن. ئەمەیش یاریدەدەرە بۆ ئەو گروپە جیهادییانە تا لەجیاتی توندوتیژی "تاکتیکی"ی کورتماوە کە دەشێت ئەنجامی پێچەوانەی هەبێت، هەژموونی خۆیان قایمتربکەن.[٢١]

بەمپێیە گەنجە سەلەفییە جیهادییەکان ناوی "جیهادی" لەخۆیاندەنێن، بەڵام مەیلیان بەلای ئەوەدایە کە لەگەڵ گروپە توندوتیژەکانیدیکە خۆیان جیابکەنەوە.[٢٢] لەکاتێکیشدا ئەوان وەکو باوەڕ توندوتیژیی رەتناکەنەوە، بەڵام هەوڵدەدەن لەڕێگەی ئامۆژگاری و باوەڕپێهێنانەوە بەهاکانیان پتەوتربکەن. ئەمان هەر وەکو سەلەفییە فیقهییەکان ئامانجی کۆتاییان چەسپاندنی نموونەیەکی زۆر توندی شەریعەتی ئیسلامییە لە دەوڵەتێکی ئیسلامیدا.

خاڵی جیاکەرەوەی ئەم گروپانە لە گروپە چەکدارەکانی سەر بە ئەلقاعیدە کە دواجار مەترسییە ستراتیژییەکانیشیان زیاتردەکات، ئەوەیە ئەمان بەفراوانی تێکەڵاوی کۆمەڵگە بوون.[٢٣] بۆنموونە رابەران و چالاکوانەکانیان، دوکاندار، مامۆستا و کرێکاری بیناسازین. ( زۆرجاریش) لایەنی کاریگەر و خاوەن تۆڕی گەورەن لە کەرتی ئابووریی ناحکومیدا. کەوایە بوونیان لەناو کۆمەڵ و تۆڕی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا یارمەتیدەرە بۆ هەڵخراندن و جۆشدانی کەسانیتر.

بەپێچەوانەی سەلەفییە جیهادییەکانی سەر بە ئەلقاعیدەیشەوە کە لەناو کۆمەڵگەدا بەشاراوەیی شەڕی جیهاد دەکەن، نەوەی نوێ لەتوانایدایە شەڕی جیهاد بکات و بەشێکیش بێت لە کۆمەڵ. ئەمە ئەو شتەیە بواریان پێدەدات بەشێوەیەکی راستەوخۆ لەگەڵ جەماوەرێکی فراوانتر لەوەی ئەلقاعیدە دەستپێیدەگەیشت، کارلێکبکەن و کاریشی تێبکەن.

هەندێك سەرکردەی سەلەفییە جیهادییە نوێیەکان ستراتیژییەتی ئەلقاعیدەیان گرتبووەبەر، بەڵام ئێستا هانی گەنجە شوێنکەوتووەکانیان دەدەن لەبەکارهێنانی توندوتیژییدا وریابن، ئەگەریش بۆیانگونجا شێوازیی ئاشتییانەتر بۆ گۆڕینی کۆمەڵگە بەکاربێنن. ئەم گۆڕانکارییە ستراتیژییە بەشێوەیەکی سەرەکی پەیوەستە بەو بارودۆخەوە کە لەسەرهەڵدانی شۆڕشە عەرەبییەکانەوە لەگۆڕاندایە، وەك چۆن پەیوەندی بەئاستی سەرکوتی دەوڵەت و بەگۆڕانی گروپەکانەوە هەیە لە دوو دەیەی رابردوودا.

لە لیبیا، لێدان لە ئیسلامییەکان لەلایەن دەوڵەتەوە توندوتیژترین سەرکوتبوو لە باکووری ئەفریقیا، ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٩٠ هەموو چالاکوانە ئیسلامییەکان لەوڵاتدا دوورخرانەوە یا دەستگیرکران. زەینولعابدین بنعەلیش بە توندی ئیسلامییەکانی سەرکوتکرد، بۆیە دوای رووخاندنی دەسەڵاتەکەی، ئیسلامییەکان سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەستهێنا.سەبارەت بە جەزائیر کە لە ١٩٩٠ەوە بەململانێیەکی زۆر توند دەستپێیکرد و بەدرێژایی دوو دەیە بەردەوامبوو، لەدوای ئەزموونە دیموکراسییەکەیەوە، ئاشتەوایی نیشتیمانیی لەگەڵ چەکداراندا پتەوکرد و توانی هەندێك لە ئیسلامییەکان بخاتەناو

بونیادە سیاسییە فەرمییەکانەوە. مەغریبیش بەهەمانشێوە توانی رووبەرێکی سیاسیی بۆ هەندێك لە ئیسلامییەکان بکاتەوە تا لە چوارچێوەی ئاڵوگۆڕیی لەسەرخۆی دیموکراسیدا رای خۆیان دەربڕن.

سەکردەکانی لیوای ئەنسارولشەریعە لە بەنغازی، بەتایبەت شێخ محەممەد ئەلزەهاوی، ساڵانێکی لەناو زیندانەکانی موعەمەر ئەلقەزافیدا بەسەربرد. لە شاری دەڕنەیش، گروپی ئەنسارولشەریعە لەژێر سەرکردایەتی ئەبو سوفیان بن قەمودان کە پێشتر لە گوانتانامۆ زیندانیکرابوو. لەدوای ساڵی ٢٠١١یشەوە هیچکام لەم گروپانە لەگەڵ ئەو توندوتیژییانەدا نەبوون کە دژی دەوڵەتی شۆڕشی لیبی ئەنجامدەدران. لەڕاستیدا گروپی بنغازی ئاسایشی گەڕاندەوە بۆ نەخۆشخانە و دامەزراوە حکومییەکان، بەڵام دواتر هەندێك لە ئەندامەکانی بەشدارییان لە پەلامارەکانی بنغازیدا کرد.

ئەبو ئەیاد ئەلتونسیش کە سەرکردەی ئەنسارولشەریعەیە لە تونس، سەربووردەیەکی نموونەیی لەدوورخستنەوەی تەواوەوە بۆ گەڕانەوە هەیە. لە کۆتاییەکانی ١٩٩٠ەوە تاسەرەتای ٢٠٠٠ بەرلەوەی لە سەردەمی بنعەلیدا دەستگیربکرێت، سەرکردایەتی گروپێکی چەکداریی تونسی لە ئەفغانستان دەکرد. ئێستایش لەکاتێکدا کە بەدوای پەلاماردانی باڵیۆزخانەی ئەمریکی لە تونس لە ئەیلولی ٢٠١٢، خۆی شاردووەتەوە لەهەمانکاتدا حکومەتی تونسی و گەنجانی شوێنکەوتووی خۆی هاندەدات تادەستبەرداری توندوتیژیی بن لەبەرامبەر یەکتر. لەلێدوانێکیشدا لە ٥ی ئابی ٢٠١٣دا داوای لە دەسەڵاتدارانی تونس کرد لەئەگەری هەرتوندوتیژییەکدا بەهۆی کوشتنی محەممەد ئیبراهیمییەوە کە ســەرکردەیەکی سیاسیی عەلمانی بوو، گەنجە سەلەفییەکان "بپارێزێت". [٢٤] تەنانەت جیهادییە سەلەفییە هەرە نەریتخوازەکانیش لەو زنجیرە رووبەڕووبوونەوانەی کە لە مانگی ئایاری ٢٠١٣دا روویاندا، داوایان لە ئەنسارولشەریعە کرد خۆیان بپارێزن لە پێکهەڵپڕژان لەگەڵ هێزەکانی ئاسایشدا.

هێشتا زوویشە بۆ زانینی ئەوەی داخۆ گرتنەخۆی توندوتیژیی لەگەڵ کەمکردنەوەی ئەنجامدانی، ئاڵوگۆڕییەکە لەئایدۆلۆژیادا یا هەرتاکتیکێکە بەمەبەستی خۆلادان لە

پێکهەڵپژان لەگەڵ هێزەکانی ئاسایشدا. بۆنموونە ئەبو یەحیای شەنقیتی ئەندامی لیژنەی شەریعەت لە رێکخراوی ئەلقاعیدە لە وڵاتی مەغریبی ئیسلامی، لایەنیکەم لەبۆنەیەکدا، هانی گەنجانی داوە بۆ دانبەخۆداگرتن. دەشگووترێت لەرێگەی تۆڕی کۆمەڵایەتی تویتەرەوە جریوەیەکی کردووە و بەشێوەی ئامۆژگاریکردن گووتویەتی: "وریابن بەهیچ شێوەیەك سیاسەتە دڕندانەکانی رژێم تووشی هەڵچوونتان نەکات، نەبادا کاری هەڵەشە ئەنجامبدەن کە ببێتە هۆی لەدەستدانی ئەو پشتیوانییە جەماوەرییەی خوا پێیبەخشیوون". [٢٥] ئاخر پێکهەڵپژانی راستەوخۆ و بەردەوام دەرفەتێکە بۆ سەلەفییەکان تا لەپێناو بە دەستهێنانی پشتیوانیی میللییدا خۆیان وەکو قوربانی نیشانبدەن، بەڵام لەهەمانکاتدا دەشێت کەمتر چاوپۆشی لە چالاکییە فراوانەکانیان بکرێت.

## وەستانەوە بەرووی سەلەفییەتی جیهادیی نوێدا

بەوەدا کە سەلەفییەتی جیهادیی نوێ بەلای توندوتیژیی ئاشکرا لە دژی حکومەتەکانیان و ئامانجە رۆژئاواییەکاندا ناچن، بۆیە بەرەنگاربوونەوەی ئایدۆلۆژیاکەیان هەروا سانانییە. حکومەتەکانی باکووری ئەفریقیا ستراتیژیی جۆراوجۆریان تاوتوێکردووە بۆ راکێشانی ئەم گروپانە بەلای خۆیاندا، بەڵام ئەم هەوڵانە بێئاکام ماونەتەوە. هەر بۆنموونە پەیوەندی نێوان پارتی نەهزەی تونسی لەگەڵ ئەنسارولشەریعە لەماوەی کەمتر لە دوو ساڵدا لەلێبووردەییەوە گۆڕدرا بۆ بەرەنگاربوونەوە. سەرەتا پارتی نەهزە لەگەڵ ئەنسارولشەریعە و سەلەفییەکانیدیکەدا، تەنانەت لەکاتێکدا ئەمانە سنوورەکانی توندوتیژیی و گوتاری توندوتیژییان تێپەڕاندبوو، بیری لەوەدەکردەوە دیالۆگیان لەگەڵ بکات.

بەڵام لێبووردەیی پارتی نەهزە، بەدوای پەلامارەکەی ئەیلولی ٢٠١٢ بۆ سەر باڵیۆزخانەی ئەمریکی لە تونس، بەرەو کەمبوونەوە چوو. حکومەت لە مانگی ئایاری ٢٠١٣دا کۆنگرەی نیشتیمانیی ئەنسارولشەریعەی قەدەغەکرد، ئەمەش بووەهۆی پێکهەڵپژانی هێزەکانی ئاسایش و چالاکوانە سەلەفییەکان. [٢٦] لەپاش ئەوە لە ٢٧ی ئابی

۲۰۱۳دا حکومەتی تونسی بەهۆی پەیوەندیی نێوان ئەنسارولشەریعە لەگەڵ کەتیبەی عەقبە بن نافع و کارە تیرۆریستییەکانی لە دژی هەردوو کەسایەتی سیاسی چەپ (شوکری بلعید و محەممەد ئیبراهیمی)، رایگەیاند کە وا ئەنسارولشەریعە رێکخراوێکی تیرۆریستییە، [27] چونکە ئەم کارە تیرۆریستییانە قەیرانی سیاسیی لە تونس قووڵترکردەوە.[28]

وەرچەرخانیش بەرەو قەدەغەکردنی ئەنسارولشەریعە هەلێکی بەخشییە پارتی نەهزە بۆ خۆدوورخستنەوە و خۆجیاکردنەوە لە ئیسلامییە توندڕەوەکان، ئەم هەنگاوەیش تائێستا بەتەواوی سوودی لێوەرنەگیراوە، چونکە لەجیاتی چارەسەرکردنی قەیرانی سیاسیی تونس، ئەگەری ئەوە هەیە لە ئاییندەیەکی نزیکدا سەلەفییەکان زیاتر بەرەو نهێنکاری بچن و ئەگەری سەرهەڵدانەوەی پەلامار و توندوتیژییش زیاتردەبێت.

بەڵام لە جەزائیر حکومەت داوای سەلەفییەکانی بۆ بەشداریی سیاسی رەتکردەوە لەبەرئەوەی ئەمە دەبێتە دانپیانان بە بەرەی رزگاریی ئیسلامی کە لە ساڵی ۱۹۸۹ دا ئەم هەڵەیە کرا. لەکاتێکدا لە مەغریب لێبووردن بۆ دەیان سەلەفیی جیهادیی پێشووتر دەرچوو و بوارپانپێدرا تێکەڵ بە کۆمەڵگە ببنەوە. هەندێك لەوانەیش، وەکو محەممەد ئەلفەزازی، ئەمەی بە گرنگ وەرگرت و پارتێکی سیاسیی دامەزراند.[29] لە ساڵی ۲۰۰۳ ئەلفەزازی بەهۆی ئەوەی دەستی لە تەقینەوەکانی دارولبەیزادا هەبوو، بە سی ساڵ حوکمدرا، بەڵام لە سەرەتاکانی ۲۰۱۱دا ئازادکرا. لە ساڵی ۲۰۰۹دا نامەیەکی کراوەی ئاراستەی کچەکەی کە لە ئەڵمانیا دەژێت، کرد و تیایدا هەوڵیدا خۆی لەو رابردووەی کە پربوو لە توندوتیژیی و توندڕەوی، دابڕێت.[30] لەحوزەیرانیشدا سێ سەلەفیی مەغریبی رایانگەیاند کە لەرێگەی پارتێکی سیاسییەوە، هەوڵی بەشداریکردن لە ژیانی سیاسییدا دەدەن،[31] بەڵام ئەزموونی شۆڕش لە تونس و میسر، ئاراستەکردنی نەوەی نوێی سەلەفییە جیهادییەکان بەرەو سەلەفییەتێکی تەواو هێمن و سیاسیی، قورستردەکات.

شکستی پارتی نەهزە لە پتەوکردنی ئەجێندایەکی ئایینیی خۆپارێزتر و قەدەغەکردنی ئەنسارولشەریعە، هۆکارن بۆ هەندێك لە سەلەفییە جیهادییەکان تا سووربن لەسەر ترسییان لە پرۆسەی سیاسیی، بەوەی ئەم پرۆسەیە ناچاریاندەکات سازش لەسەر

بیروباوەڕەکانیان بکەن. جگەلەوەیش کۆدیتا سەربازییەکەی مانگی ئاب کە بەسەر حکومەتەکەی ئیخوان موسلیمین لە میسردا کرا، دڵنیایاندەکاتەوە کە هەموو کاتێك ڕێز لە ئەنجامی هەڵبژاردنەکان ناگیرێت. ئێ سەلەفییەکانیش وەکو ڕێژەیەکی زۆری گەنجان، بەڕاستی بەگومانن لە دەوڵەت و سیاسەتی دیموکراسی. ڕووداوەکانی ئەم دواییانەیش ئەم گومانانە بەهێزتردەکەن.

لێرەوە زۆربەی سەلەفییە جیهادییەکان لە پرۆسەی هەڵبژاردن دووردەکەونەوە، چونکە ئەمە بژاردەیەکە بۆ ئەوان ئازادیی زۆرتر و فشاری کەمتری بۆ سازشکردن تێدایە. ئاخر ئەوان بەمانەوەیان لە دەرەوی سیستمی سیاسی توانای پاراستنی بیروباوەڕ و دۆخە تەمومژاوییەکەی خۆیانیان هەیە، چونکە ئەم ناڕوونییە دواجار سات‌وسەوداکردن لەگەڵیاندا قورستردەکات، نەخواسمە لەلایەن حکومەتە لاواز و کۆمەڵگە پەرتبووەکانی کە لەبەردەم توندوتیژییدان. چەندە ئەوە گرنگە کە سەلەفییە جیهادییەکان هانبدرێن بۆ دەستبەرداربوونی توندوتیژیی و ڕووکردنە کاری سیاسی، ئەوەندەیش ئەوە جێیبایەخە کە ڕێیان لێبگیرێت لەوەی سنوورەکان بەرەو جیهادی هەمە لایەنە لە دژی دەوڵەت ببەزێنن و لە ڕکابەری سیاسیی ناوخۆییەوە بەرەو ناکۆکی ناوخۆیی و دروستکردنی ناسەقامگیریی بچن.

لەو سۆنگەیەیشەوە کە نەوەی نوێ ئەو تەکتیکانەی وا سەلەفییەکانی پێشوو بەکاریاندەهێنان وەکو خۆگونجاندن لەگەڵ دەسەڵات، مەیلی زۆریان بۆ توندوتیژیی سنووردار و حیساب بۆکراو، ڕەتدەکەنەوە، بۆیە جێبەجێکردنی ستراتیژییە باوەکان بۆ ئاراستەکردنی سەلەفییە جیهادییەکان بەرەو هێمنی و سەلەفییەتێکی سیاسی قورستردەبێت.

## روانین بۆ پێشەوە

سەلەفییە جیهادییەکان دەستیان بەسەر شۆڕشەکانی وڵاتانی عەرەبی لە باکووری ئەفریقیادا نەگرت، بەڵام کەڵك لەم شۆڕشانە وەردەگرن. ئاخر ئەو گۆڕانکاری و ململانێ سیاسییە کراوەیە دەرفەتێك دەدات بە سەلەفییە جیهادییەکان بۆ بڵاوکردنەوەی پەیامەکەیان و سازدانی شوێنکەوتووانیان. مەترسی و هەڕەشەی ئەم گروپە نوێیانە، بەهۆی سەرسامبوونیان بە ڕێکخراوی ئەلقاعیدە و بەکارهێنانی توندوتیژیی دژ بە تاك و ڕێکخراوەکان و دەوڵەتان، بەرەو زیادبوون دەچێت.

بەمەبەستی بەرەنگاربوونەوەی ئەم هەڕەشە روو لەسەرە، هەردەبێت توانایی حکومەت لەو دەوڵەتانەی کە بە قۆناغی گواستنەوەدا تێدەپەڕن، وەك تونس و لیبیا، باشتربکرێت و شەفافییەت لەگشت ناوچەکەدا زیاتربکرێت، هەروەك پێویستە پشتیوانیی لە دەستپێشخەرییە ئابوورییەکان بکرێت کە هاندەرن بۆ گەشەی هەمەلایەنە و سەردەکێشن بۆ سەرهەڵدان و دابینکردنی هەلی کاری نوێ بۆ گەنجان، ئەمەیش لەپێناوی فراوانکردنەوەی سنوورەکانی سەقامگیریی. ئەو سیاسەتەیش کە بەشێوەیەکی توند سەرنجی لەسەر رەهەندی ئاسایشە زیاتر بەرەو ئەوەدەچێت ئەنجامی پێچەوانەی لێبکەوێتەوە.. کەوابوو پێویستە حکومەتەکان سەرنج بخەنەسەر سێ فاکتەری بنەڕەتی کە بە چاکسازی کەرتی ئاسایش (بەجڵەوکردنی هێزەکانی ئاسایشیشەوە کە بەرەو زیادبوون دەچن) دەستپێدەکات و چاکسازی کەرتی دادوەریدا (کە دادپەروەریی قۆناغی گواستنەوە و دیالۆگی نیشتیمانیش دەگرێتەوە) تێدەپەڕێت تادەگاتە چاکسازیی کەرتی ئابووری.

جالێرەدا چارەسەرە هەمەلایەنەکان بەخێرایی دەرناکەون، لەبەرئەوەی ئەرکەکان زۆر قورسن، بەڵام حکومەتەکان دەتوانن بەڕوونی ئەو ئاماژەیە بدەنە دانیشتووانەکانیان کە سەروەری یاسا گرنگترین پرەنسیپە، ئامانجە پڕبایەخەکانیش خۆیان لە تواناسازی (empowerment) ئابووری، شەفافییەت و نوێنەرایەتی سیاسییدا دەبیننەوە، هەروەها توندڕەوانیش بەردەوامدەبن لە چالاکی و راکێشانی ژمارەیەك لە شوێنکەوتووانیان تا لە سەردەمی نەمانی یەقینی نیشتیمانیدا هەندێك راستی

دڵنیاکەرەوەیان بۆ دابینبکەن.

بەرەنگاربوونەوەی ئاییندەش بریتییەلە گەیشتن بەتێگەیشتنێکی باشتری ئەو بارودۆخەی وا لەسایەیدا ئەم نەوە نوێیەی سەلەفی جیهادیی پەنادەبەنەبەر توندوتیژییەکی بەرفراوان لە دژی نەیارە سیاسییەکانیان و لە دژی دەوڵەتیش.

هەروەها هەندێك شتیتریش زۆر گرنگە و نابێت فەرامۆشبکرێن، وەکو جیاکردنەوەی ئەم نەوە نوێیە لەو دەرکەوتنە توندوتیژترەی سەلەفییەتی جیهادیی کە رێکخراوی ئەلقاعیدە لە وڵاتی مەغریبی ئیسلامی نوێنەرایەتیدەکات رێگریکردن لەسنووربەزاندن و بەکارهێنانی راستەوخۆی توندوتیژی و چالاکیی جیهادییانە.

پێویستە پرۆگرامی هاندانی میانڕەوی و چاکسازی دامەزراوەی ئیسلامی کە دەوڵەت رێبەرایەتیدەکات، لەم هەوڵانەدا رۆڵ و کاریگەرییان هەبێت، چونکە گرنگە دەسەڵاتی ئایینی بیروبۆچوونە جێگرەوەکانی ئیسلام کە لە بایەخی گووتاری سەلەفی کەمدەکەنەوە، رابگەیەنێت و جەخت لەسەر پرۆژەی چاککردنی کۆمەڵگە لەخوارەوە بۆسەرەوە و بەپێچەوانەیشەوە، بکاتەوە.

پێویستیشە ئاماژەبکەین بەوەی مەغریب و مۆریتانیا ستراتیژییەکی هەمەلایەنەیان بۆ بەهێزکردنی راڤەکردنێکی ئیسلام داناوە کە لەوەی ئیسلامییەکان زیاتر لەگەڵ مێژوو و کەلتووری نیشتیمانیدا دەگونجێت. ئەم پرۆگرامی هاندانی میانڕەوییە لەرێگەی میدیا، سیستمی خوێندن، گرتووخانەکان و سوپاوە دەیەوێت هەندێك کاریگەریی دابنێت.

لەکاتێکدا دەکرێت ئەم هەوڵانە بەشێکبن لە ستراتیژییەکی فراوانتر، بەڵام جێبەجێبوونیان بەتەنها لە سنووری گۆڕانە سیاسییەکان یا دۆخە شۆڕشگێرییەکاندا دەمێنێتەوە، کاریگەرییەکەیشی لەسەر سەلەفییەکان کەمترە. لەبەرئەوەی ئەوان بە سروشتی خۆیان دژایەتی دەوڵەت دەکەن و بەگومانیشن لەو گەمە مێژوویییەی دەوڵەت کە بەئیسلامی فەرمی و بەشدارییپێکردنی پارتە ئیسلامییەکان لەسیاسەتدا دەیکات. لە ئاییندەیەکی نزیکدا گروپە سەلەفییە جیهادییەکان بەردەوامدەبن لە تەگەرەخستنە بەردەم

ئاڵوگۆڕە فشۆڵە سیاسییەکان و سوودوەرگرتن لەو پەشێوییانەی کە لە ناسەقامگیریی سیاسی و لاوازی حکومەتەکانەوە دروستدەبن.

بەوپێیەی ژمارەیەکی زۆری گەنجان لەناوچەکەدا لەسەر ئەو باوەڕەن کە توندوتیژیی ئامرازێکی سیاسیی پەسەندە، بەوەشدا لە سۆنگەی ئەم باوەڕەوە هەزار و یەك ڕێگە دەگرنەبەر، بۆیە توندڕەوی بەردەوامدەبێت لە بنکەنکردنی ئامانجەکانی شۆڕشە عەرەبییەکان. ئەو ڕێژە کەمە لە توندوتیژیی ئامانجدار کە سەلەفییە جیهادییەکان ئەنجامیدەدەن، لەگەڵ ئەو توندوتیژییە تۆقێنەرەی ئەلقاعیدەدا بەراوردناکرێت، هەربۆیە سەرنجێکی کەمتر بۆ خۆی رادەکێشێت، بەڵام لەگەڵ نەوەی داهاتوودا، کاریگەریی سەلەفییەتی جیهادیی میللی زۆر بەرفراوانتردەبێت.

***

**لە بارەی هەردوو نووسەرەکەوە:**

**١. حاییم مەلکا:**

جێگری بەڕێوەبەر و ئەندامی باڵای پرۆگرامی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە لە سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژیی و نێودەوڵەتی، لەو پرۆگرامەیشدا سەرپەرشتیاری دۆسیەی وڵاتانی مەغریبی عەرەبییە بوارە سەرەکییەکانیدیکەیش کە توێژینەوەی تیادەکات بریتییەلە: ئەو کارەکتەرە ناحکومییانەی کە پەنادەبەنەبەر توندوتیژیی، ئیسلامی سیاسی و ناکۆکییەکانی عەرەب – ئیسرائیل. بەرلەوەی لە ساڵی ٢٠٠٥دا ببێتە ئەندام لە سەنتەری ستراتیژیی دەولی، لە سەنتەری سابانی سەر بە پەیمانگای برۆکنگز شیکەرەوەی سیاسەتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بووە، بەتایبەت سەرنجی خستبووەسەر سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. مەلکا شەش ساڵ لە ئۆرشەلیم بەرهەمهێنەری پرۆگرامی تەلەفزیۆنی بوو و لەنێو چاپەمەنییەکان و رادیۆ و تەلەفزیۆنیشدا شرۆڤەکارێکی بەردەوامبوو. مەلکا یەکێکە لە نووسەرانی لێکۆڵینەوەی "ریفۆرمی عەرەبی و هاوکارییە دەرەکییەکان: چەند وانەیەك لەمەغریبەوە" (سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژیی و دەولی

٢٠٠٦)، دانەری کتێبی (دوورێیانەکان: ئاییندەی هاوبەشیی ستراتیژیی نێوان ئەمریکا و ئیسرائیل ٢٠١١). بەکالۆریۆسی لە زانکۆی واشنتۆن لە سیاتل هێناوە و ماستەریشی لە کۆلیژی کاروباری نێودەوڵەتی و گشتیی لە زانکۆی کۆڵۆمبیا هێناوە.

**٢. ویلیام لۆرنس:**

پرۆفیسۆری وانەبێژە لە زانستی سیاسەت و کاروباری نێودەوڵەتی لە زانکۆی جۆرج واشنتۆن. لە ساڵی ٢٠١١ تا ٢٠١٣ لە گروپی قەیرانە نێودەوڵەتییەکان بەڕێوەبەری پرۆژەی باکووری ئەفریقیا بوو. بەرلەوەیش چەندین پلە و پۆستی لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا وەرگرتووە لەوانەیش گەورە راوێژکاری بەشداریی جیهانی لە نوسینگەی ئۆقیانووسەکان و کاروباری ژینگەیی و زانستیی نێودەوڵەتی Oceans and InternationalEnvironmental and Scientific Affairs (OES،

هەروەها لە باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە تەرابلوسی رۆژئاوا وەکو ئەفسەری بەرپرس لە کاروباری تونس ولیبیا و یاریدەدەری تایبەتی وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری هەواڵگری و لێکۆڵینەوە کاریکردووە. لۆرنس ١٢ ساڵ لە باکووری ئەفریقیا ژیاوە و دکتۆرای لە سکوڵی فلیچەری تایبەت بە یاسا و دیبلۆماسی وەرگرتووە.

●●●

**پەراوێزەکان:**

١. ئەکادیمیستی فەرەنسی گیلیس کیپیل یەکەمین کەس بوو دەستەواژەی سەلەفییەتی جیهادیی بەکارهێنا. بڕوانە گڵیس کیپیل، جیهاد: کاریگەریی ئیسلامی سیاسی (کامبریج، لە بڵاوکراوەکانی زانکۆی هارڤارد، ٢٠٠٢) ١٩ – ٢١٨.

٢. هەندێك لە سەلەفییە هێمنەکان لەڕووی تیۆرییەوە هانی توندوتیژیی دەدەن و پشتیوانیی گروپە توندوتیژەکان دەکەن، لەگەڵ ئەوەیشدا خۆیان دەپارێزن لە دەربڕینی ئاشکرای بۆچوونەکانیان.

٣. سەلەفییەکان بەتایبەتی هەوڵدەدەن لاسایی هاوەڵان (الصحابە)و نەوەکانی دوای ئەوان بکەنەوە.

سەلەفییەکانی کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە سەرنجیان لەسەر نزیککردنەوەیەکی هاوچەرخانە بوو بۆ پتەوکردنی گەلانی عەرەبی و ئیسلامی. جەمالەدین ئەفغانی و محەممەد عەبدەیش ئەمەیان روونکردەوە و لە سەدەی بیستدا دەستیاندایە بڵاوکردنەوەی کۆپییەکی کۆنەپارێزی رێنماییە ئیسلامییەکان کە ئەمە دەچێتەنێو خانەی "سەلەفییەتەوە"و یاریدەدەرە بۆ لێکدانەوەی هۆکاری سەرنجی بەردەوامی چەندین سەلەفی لەسەر فێرکردن و بڵاوکردنەوە.

٤. سەلەفییەتی فیقهی یا سەلەفییەتی پەیوەست بەقورئانەوە بەپلەی یەکەم سەرنج دەخاتەسەر ئاییندارى و خواپەرستیی کەسی و بانگخوازی. بەگشتیش شوێنکەوتووانیان خۆیان لە سیاسەت بەدووردەگرن لەبەرئەوەی بەلایانەوە خراپە و کاریگەریی خراپی هەیە، هەروەك پێ لەسەر بانگخوازی یا وشیارکردنەوە و زەکات و فێربوون دادەگرن. ئەوان باوەڕیانوایە کە بەر لە دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی دەبێت کۆمەڵگە بگەڕێتەوە بۆ ئیسلام. سیاسەت و هەڵبژاردنیش بەتەنها لە چوارچێوەی وەها دەوڵەتێکدا بەدروستی بەڕێوەدەچن. هەرچی سەلەفییە سیاسییەکانە ئەوانەن کە بۆ بەدیهێنانی هەمان پرۆژەی کۆمەڵایەتی و بەرگریکردن لێیبەشداری لە سیاسەتی هاوچەرخدا دەکەن. شۆڕشە عەرەبییەکان و ئاڵوگۆڕە سیاسییەکانی کە بەشوێنیدا هاتن، هەلی زێڕینی بۆ سەلەفییە سیاسییەکان رەخساند تا پۆست و پلە لۆکاڵی و سەرتاسەرییەکان رێکبخەن و خۆیانی بۆ بپاڵێون. ئاراستەی هەردوو ئەم رەوتە سەلەفییە، کە یەکێکیان سیاسەت ناکات و ئەویدیکەیان بەشداری لەسیاسەتدا دەکات، ئەوەیە لێکچوونێك لەگەڵ سەلەفییە بەتەمەنەکاندا بخەنەڕوو. لەکاتێکدا دەشێت هەریەکێك لەو دوو گروپە لەگەڵ بیرۆکەی جیهاد لە دژی ئامانجە رۆژئاواییەکان هاوسۆزبن، بەڵام بەگشتی بەرهەڵستی توندوتیژیی لە دژی حکومەتە موسڵمانەکان دەکەن. بۆ بەدەستهێنانی وەسفێکی وردی سەلەفییەت بڕوانە کۆنتین ڤیکتۆرۆفیچ "توێکاریی جووڵانەوەی سەلەفی"، لێکۆڵینەوە لە ململانێ و تیرۆریزم ٢٩(٢٠٠٦):٣٩ - ٢٠٩.

٥. هەمان سەرچاوە.

٦. گروپی چەکداری ئیسلامیی لیبی لەلایەن جەنگاوەرە دێرینەکانی ئەفغانەوە دروستکرا و وەکو گەورەترین گروپی سەلەفی جیهادیی لە لیبیا دەرکەوت. هەروەك گروپی چەکداری ئیسلامیی مەغریبی و دەستەی جەنگاوەری تونسی لە نەوەدەکان دروستبوون بۆ بەئاگابوون لە بنەچەی گروپە جیهادییەکان لە باکووری ئەفریقیا و رێکخراوی ئەلقاعیدە و پەیوەندییەکانی نێوانیان، بڕوانە کەمیل ئەلتەویل، "ئەلقاعیدە و خوشکەکانی: سەربووردەی عەرەبە جیهادییەکان" (دارئەلساقی: لەندەن ٢٠١٠)،٣٣.

٧. ساڵی ١٩٩٢ لەدوای ئەوەی سوپای جەزائیری ئەو هەڵبژاردنەی هەڵوەشاندەوە کە پارتێکی ئیسلامی تیایدا سەرکەوت، چەندین گروپی جیهادیی بچووك لە ساڵی ١٩٩٣و ١٩٩٤ یەکیانگرت و گروپێکی ئیسلامیی چەکداریان پێکهێنا. ماوەیەك لەدوای ئەوەیش گروپی چەکداریی ئیسلامی پەرەیسەند و ڕێکخراوی ئەلقاعیدەی لە وڵاتی مەغریبی ئیسلامی پێکهێنا. ئەمە کاردانەوەیەکی توندبوو بەرامبەر بەو هێرشە دڕندانانەی گروپی چەکداری ئیسلامی لە دژی خەڵکی سڤیل ئەنجامیاندەدا. ڕێکخراوی ئەلقاعیدە و گروپە سەرمەشقەکانی لە وڵاتی مەغریبی ئیسلامی و لقەکانیدیکەیشی، هەوڵیاندا هاوسەنگییەك لەدەستنیشانکردنی ئامانجە جیهانی یا ڕۆژئاواییەکان و ئامانجە ناوخۆییەکانیان، بەتایبەت جەزائیرییەکاندا بکەن و ئەوەش دیاریبکەن کە کامە ئامانجی مەدەنییە و کامەیش حکومی و شەرعییە. لقی بیابانی گەورە کە سەر بە ڕێکخراوی ئەلقاعیدە لە وڵاتی مەغریبی ئیسلامییە، لقێکی زۆر چالاکە، بەشێوەیەکی بەرفراوانیش لە باکووری مالی چالاکی ئەنجامدەدا، بەڵام لە هەڵخراندنی (تجنيد) گەنجانی باکووری ئەفریقیا بۆ ناو ریزەکانی خۆی ، هەندێك کۆسپی هاتەبەردەم. چەند گروپێکیشی لێجیابووەوە وەکو بزووتنەوەی تەوحید و جیهاد لە ڕۆژئاوای ئەفریقیا.

٨. دوای ئەو دارِمانە گەورانەی کە جەزائیر و تونس لە ساڵانی نەوەدەکاندا دووچاری هاتن، بانگخوازیی سەلەفی بەشێوەیەکی بەرفراوان بەرەو نهێنکاری ڕۆییشت، بەڵام بەشێوەیەکی یەکجارەکی نا. بۆنموونە لە تونس بزاڤەکانی تەبلیغ، لێبووردەییەکی سنووردرایان بۆ پەیامی ئامۆژگارییە سەلەفییەکان، تائەوکاتەی ئەنجامدەرانی لەسیاسەتەوە دووربن، نیشاندا. لە مەغریب و جەزائیر، ئاستێکی باڵای لێبووردەیی بەرامبەر بەو ئیسلامییانەی کە ئامادەبوون دووربن لەسیاسەتەوە یا ئەوانەی ئامادە بوون بەشداربن لە دامەزراندنی سیستمی سیاسیدا، دەرکەوت. بەتایبەت لەدوای ساڵی ١٩٩٩(دەرکەوتنی شا محەممەدی شەشەم پاشای مەغریب و ئاشتەوایی مەدەنی و سازانی نیشتیمانی لە جەزائیر.

٩. ویل ماك کانتس، "سیاسەتگەلی سەلەفییەتی نوێ"، ١٢ی تشرینی یەکەم/ ئۆکتۆبەر، ٢٠١٢.

١٠. تۆماس هێگهامەر، "سەلەفییە جیهادییەکان یا شۆڕشگێرەکان؟" لەبارەی سەلەفییەتی جیهانییەوە، خانەی وەشاندنی ڕۆیل میخر (نیویۆرك: لە بڵاوکراوەکانی زانکۆی کۆڵۆمبیا، ٢٠٠٩).

١١. مۆنیکا مارکس، "سیاسەتەکانی گەنجان و سەلەفییەتی تونسی: تێگەیشتن لە جیهادگەرایی ئێستا" سیاسەتی دەریای سپیی ناوەڕاست ١٨، ژمارە ١(٢٠١٣): ١٠٩. لە سایکۆلۆژیای کەلتووریی و ئیسلامیی تاك، هەروەها بنوارە کارەکانی گاری گریگ، بەتایبەت نوێنەرایەتیکردنی

خود: چەند لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی سەربووردەکانی ژیانەوە لەبارەی شوناس و ئایدۆلۆژیا ( نیویۆرك: لە بڵاوکراوەکانی گرین ود، ۱۹۹۱)و کەلتوور و شوناس لە کۆمەڵگەیەکی موسڵماندا (نیویۆرك: لە بڵاوکراوەکانی زانکۆی ئۆکسفۆرد، ۲۰۰۷).

۱۲. وادیارە ئاوارتە کردن بە ئاسمانی مالی و رووبەرێکی فراوانی بیابانی گەورەوە دەدرەوشێتەوە، چونکە گروپە جیهادییەکان بەپاڵ تاوانکارییەکانیانەوە چالاکی ئابووریی قازانجهێنەر ئەکەن کە بووەهۆی سەرهەڵدانی تۆڕگەلی پشتیوانیی سەربەخۆ لەگەڵ دانیشتووانی ناوچە لۆکاڵییەکان و خێڵەکانی ئەو ناوچانە.

۱۳. بۆ بەئاگابوون لە لێکۆڵینەوەیەکی تەواو لەبارەی سەلەفییەتی تونسی و گەنجانەوە، بڕوانە مارکس، " سیاسەتی گەنجان و سەلەفییەتی تونسی" ۱۰۷ - ۱۱٤. بۆ بەئاگابوون لە لێکۆڵینەوە لە بارەی سەلەفییە گەنجەکانەوە لەجیهاندا، سەیری فابیۆ میرۆن بکە، "سەلەفییەت لە تونس: چاوپێکەوتنێك لەگەڵ ئەندامی ئەنسارولشەریعە"، ماڵپەڕی جەدەلییە، نیسانی ۲۰۱۳.

۱٤. بڕوانە ستیفانۆ م. تۆریلی، فابیۆ میرۆن و فرانسیسکۆ کافاتورتا،" سەلەفییەت لە تونس: بەرەنگاری و دەرفەتەکانی دامەزراندنی دیموکراسی"، سیاسەتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ۱۹ ، ژ ٤ ( ۲۰۱۲): ۱٤۰ - ۱٥٤.

۱٥. لە تشرینی دووەمی ۲۰۱۱ خوێندکارە سەلەفییەکان لە زانکۆی منوبە لەنزیکی تونس زنجیرەیەك نارەزایی و مانگرتنیان رێکخست، جگەلە مانگرتن لە خواردن ئەمەیش لەدوای ئەوەی ئەندامانی لیژنەی وانەوتنەوە رازینەبوون بەوەی خوێندکارە کچەکان نیقاب لەپۆلدا بپۆشن، روو بە روو بوونەوەکانیش لە نێوان سەلەفییەکان و ئەندامانی لیژنەی وانە وتنەوە بۆ چەند مانگێك بەردەوامبوو.

۱٦. بڕوانە رافێل لۆڤیڤێر "رووداوەکانی ئەم دواییانەی باکووری ئەفریقیا" رۆژنامەی لێکۆڵینەوەی باکووری ئەفریقیا ۱۷، ژمارە ٥(۲۰۱۲): ۹۲٥.

۱۷. ئەمشێوازە لە پەلاماردانی ئیسلامی بۆ خراپیی "بێگیان"، مێژوویەکی دێرینی لە نیمچە دوورگەی عەرەبی هەیە، بەڵام لە باکووری ئەفریقیا تاڕادەیەك تازەیە کە چەندین سەدەیە مەزهەبی مالیکی لەگەڵ سرووتە کەلتوورییە باوەکاندا، وەکو رێزگرتن لە ئەولیاکان خۆی گونجاندووە. کاولکردن و تێکدانی ئەو شوێنانەی سەردانیاندەکرێت و پەرستشی تێدادەکرێت لەلایەن هەندێك لە لیبی و تونسییەکانەوە لەبەرئەوەیە کە "تاوانێکە بە بێ قوربانی" لەبەرئەوەی قوربانییەکە مرۆڤ نییە، بەڵکو نەریتی باو و "خراپ"ی ئیسلامە.

۱۸. هاوڵاتییەکی لیبی پۆلیسی ئاگادارکردەوە کە لەنزیك شوێنی کارەکەی خوێندنگەیەکی ئیسلامیی وێراندەکرێت، وەڵامیاندایەوە: "ئەوا پۆلیس گەیشتووەتە شوێنەکە". دواتر روونبووەوە "پۆلیس" چەند لیوایەکی سەر بە وەزارەتی ناوخۆن کە فەرمانیکردووە بە سەلەفییە تاڵانچییەکان بەوەی بینایەکە بەتەواوی نەڕووخێنن، بەڵام رێیپێداون گشت کەلوپەلەکانی بشکێنن. ئەو هەمەجییانە هەندێك گۆڕیان وێرانکردبوو کە تەمەنی ٤٠٠ ساڵ بووە و ئەو بەردانەشیان شکاندبوو کە ئایەتی قورئانی لەسەر نووسرابوو. چاوپێکەوتن لەگەڵ ویلیەم لۆرنس، ئەیلولی ۲۰۱۲، تەرابلوس ، لیبیا.

۱۹. ئەگەری ئەوەیش هەیە کە سەلەفییەکان لە رۆژی ۲۰ی ئەیلولی ۲۰۱۳، شێخ مستەفا رەجەب مەحجوبی کە رابەری سۆفییەکان بوو لە شاری دەرنە تیرۆرکردبێت، بڕوانە عەبدولوەهاب و هادی فەرناجی،" کوژرانی رابەرێکی سۆفی لە دەرنە" لیبیا هیرالد، ۲۲ ی ئەیلول/۲۰۱۳.

۲۰. مارکس "سیاسەتی گەنجان و سەلەفییەتی تونسی" ۱۱۳. ئەم جێگرەوەیە (ئەڵتەرناتیڤ) بۆ گشت فۆرمەکانیدیکەی ناڕەزایی سیاسییە بە سۆسیالیزم، مارکسیزم و لیبراڵیزم، فیمینیزم، ناسیونالیزم و ئیسلامی میانڕەویشەوە.

۲۱. بڕوانە ئارۆن زیلین "پەیڕەوانی مەقدسی لە لیبیا و تونس"، سیاسەتی دەرەوە، ١٤ ی تشرینی دووەم ۲۰۱۲.

۲۲. میرۆن " سەلەفییەت لەتونس".

۲۳. بۆ ماوەیەکی درێژ چالاکی کۆمەڵایەتی و خێرخوازی لە پرۆژەی ئیسلامی و جەماوەرییبوونی ئیسلامییەکاندا، رەگەزێکی سەرەکیبوو. رێکخراوە ئیسلامییەکان لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باکووری ئەفریقیا، جائاراستەیەکی سۆفیگەرییان هەبووبێت یا سەلەفی یا ئۆپۆزسیۆن، توانییان بۆ چەندین دەیە هەردوو لایەنی توندڕەوی و چالاکی کۆمەڵایەتی پێکەوە بەکاربهێنن. بۆنموونە هەرچەندە حەماس و حیزبوڵڵا و گەلێك رێکخراویتر لە سیاقی جیاوازدا دەرکەوتن، بەڵام سەرکەوتووبوون لەبەکارهێنانی ئەم تێکەڵەیە بە بەرژەوەندی خۆیان. هۆیەکی ئەمەیش دەگەڕێتەوە بۆ لاوازیی ژێرخانی سیاسیی ناوچەکانی فەلەستین و ناوچەکانی لوبنان کە شەڕ وێرانیکردوون. لەهەموو حاڵەتەکانیشدا، سەرەتا دانیشتووانی ئەو ناوچانە چاوپۆشییان لەو چالاکییە کۆمەڵایەتییانە کردووە و بەشداربوون تیایدا و تەنانەت پشتیشیان پێبەستووە.

۲٤. بۆنموونە بڕوانە "ئەبو ئەیاد داوای پشتیوانیکردنی گەنجە سەلەفییەکان دەکات" مۆزاییك ئیف ئێم.

٢٥. گروپی هەواڵگریی نێودەوڵەتی بۆ توێژینەوە لە ڕێکخراوە تیرۆریستییەکان (SITE) ڕێکخراوی ئەلقاعیدە سەلەفییەکانی تونس ئاگاداردەکاتەوە سیاسەتەکانی حکومەت بۆ دەمارگرتنیانە" ئاژانسی فرانس پرێس، ١٩ی ئایاری ٢٠١٣.

٢٦. بۆ ئاگاداربوون لە لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی ستراتیژییەتی پارتی نەهزە بەرامبەر بە سەلەفییەکان، بڕوانە کیڤن کاسی" ستراتیژی دارماوی سەلەفییەت" صدی، ٢١ی ئابی ٢٠١٣.

٢٧. هێزەکانی ئاسایشی تونس بەشدارییان لەو پێکهەڵپژانانەدا کرد کە لە کانونی دووەمی ٢٠١٣دا بەدرێژایی سنووری جەزائیر لە چیای ئەلشعانبی لەگەڵ جیهادییە چەکدارەکاندا ڕوویدا. لە ئابی ٢٠١٣یشدا و لە کارە توندوتیژییەکانی پەیوەست بە لیوای عەقبە بن نافیع لایەنیکەم ١٠ سەربازی تونسی کوژران و ٢٤ سەربازیش برینداربوون، ئەو گروپە پەیوەندییان بە ڕێکخراوی ئەلقاعیدە لە وڵاتی مەغریبی ئیسلامییەوە هەیە و دەشگووترێت ئەمە جەزائیرییەکان و تونسییەکان دەگرێتەوە. بۆ ئاگاداربوون لە هەبوونی پەیوەندی لەنێوان ئەنسارولشەریعە و کەتیبەکانی عەقبە بن نافیع، بڕوانە ئەندرۆ لۆبۆفیچ "بەرەو ڕووبوونەوەی جیهادییەکان لە تونس" سیاسەتی دەرەوە، ١٦ی ئایاری ٢٠١٣.

٢٨. سەرەکوەزیرانی تونس عەلی ئەلعەریز ڕایگەیاند کە ئەگەر بەدەستلەکارکێشانەوەی ئەو، کێشەی جیهادییەکان کە هەڕەشەن بۆ سەقامگیریی حکومەت، چارەسەردەبێت ئەوا ئامادەیە وازبهێنێت و حکومەتێکی کاتی دروستبکرێت.

٢٩. ئەلفەزازی پێشەوایەکی لایەنگری سەلەفییەتی جیهادییە لە مەغریب.

٣٠. بۆ بەئاگابوون لە دەقی نامەکە، بڕوانە "نامەی محەمەد ئەلفەزازی: ئەڵمانیا ناوچەی شەڕ نییە"، دێر شبیگڵ، ٢٩ تشرینی یەکەمی ٢٠٠٩.

٣١. بڕوانە سوهام عەلی،" سەلەفییەکان لە مەغریب دەست بەسەر سیاسەتدا دەگرن" ماڵپەڕی ئەلمەغریبیە، ١٤ ی حوزەیرانی ٢٠١٣.

**

**سەرچاوە:**

www.csis.org/mideast
Center for strategic and international studies/ Middle East program

# ڕێکخراوی دەوڵەتی ئیسلامی (داعش) .. خوێندنەوەیەکی سۆسیۆمێژوویی

ئیبراهیم حاجی زەڵمی

داعش ئەو ڕێکخراوە تیرۆریستییەی کە ئیمڕۆ بووەتە فاکتەری کێشە و تەنگوچەڵەمەکانی ڕۆژهەلاتی ناوین، لێووردبوونەوە و قسەلەسەرکردن و هەوڵی ناسینی و تێگەیشتن لەو ئایدیۆلۆژیا ئایینییەی لەپشتییەتی و کاری لەسەردەکات، لەڕاستیدا تەنها نەبووەتە بابەتی ڕاگەیاندنەکان و سیاسییەکان و لێکۆڵەرەوانی سیاسی، بەڵکو دەروونناسان و کۆمەڵناسان و ئابووریناسان و ئایینناسەکانیش وەك بابەتێکی لێتوێژینەوە و جێگەی مشتومڕهەڵگری فرەدا و هەروەها وەك ڕەگەز و بەرهەمێکی ناسازی مرۆیی کە سەروساختی لەگەڵ هیچ بنەما و پرانسیپە تاکیی و کۆمەڵیی و بەهایی و ئایینییەکاندا نابیەتەوە، چاویان خستووەتەسەری.

لێرەدا ئێمەش گەر کۆمەڵناسیانە وەك دیاردەیەکی ناسازی ئایینی و بەهایی و مرۆیی قسەی لەسەربکەین، پێمانوایە زیادەڕەوی ناکەین بەتایبەت وەك دیاردەیەك و ئەوەی لە کار و ئایدیا و دونیابینی و هەگبەی سیاسی وئایینی ئەودایە بیهێنینەبەرباس، بۆیە ئەم نووسینەمان دەکەینە سەرەتەقێیەکی سۆسیۆلۆژی مێژووی بیری داعش لەنێو بزاڤی ئیسلامی و بزاڤی سیاسی ئایینی لەم ڕۆژهەلاتی ناوینە. لێرەوە بەکورتی لە سێ دەرگاوە دەچینە شیکارییەکەمانەوە:

### دەرگای یەکەم: شوناسی داعش

گەر لە شوناسی روخساریانەی ئەم ڕێکخراوە بڕوانین (داعش) ڕێکخراوێکی سیاسی ئایینی و خاوەن هێزێکی چەکدار و بە هەگبەیەکی ناڕۆشن و بێمەودا لە جیهانی ئابووری، بێشوناس لەبواری جوگرافیای سیاسی، ناتەواو و نامۆ لە گەڵ پەیوەندییە ئەقلیمی و

نێودەوڵەتییەکان و کار ئەکتەرێکی شێواو و نەگونجاو لەگەڵ پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان و بەرکارێکی نەفام و نەزان لەڕووی مامەڵەکردنی لەگەڵ بەها ئایینی و کۆمەڵایەتییەکان و هەبوویەکی دومەڵی لەسەر جەستەی مرۆڤایەتی دێتەهەژمار.

داعش بەرهەم و باربوویەکی نێو بزاڤی ئیسلامی جیهادی رۆژهەلاتی ناوینە، ئەو بزاڤە ئیسلامییەی کە بەدرێژایی سەدەی بیست و هەوڵی بەردەوامیدا و هیچ هەنگاوێکی نەگەیشتە بارگەی کۆتا و هەناسەیەکی ئۆخەی سەرکەوتنی بەخۆوەنەدی، داعش داچۆڕاوی دوو بیر و قوتابخانەی جیاوازە کە ئەو دوو قوتابخانەیە لەدەستبردنیان بۆ دین و دەقەکان و شێوازی کارکردنیان زۆر جیاوازبوو ئەوانیش دوو قوتابخانەی سەلەفییە و کۆمەڵی ئیخوان موسلیمینە.

## یەکەم: داعش و قوتابخانەی سەلەفییەتی عەبدولوەهابی:

دیارە قوتابخانەی سەلەفییەت قوتابخانەیەکی جیهادی رێچکەگرتوو لەسەر دوو بنەمای فیکری عەبدولوەهابییەتی محەممەد کوڕی عەبدلعەبدولوەهاب و فیکری خێلایەتی بەدەوی خێڵە نەجدییە پاپەتییەکانی سەدەی هەژدەییەمی زایینی. فیکرەی محەممەدی کوڕی عەبدولعەبدولوەهاب درێژکراوەی ئەو روخسارگەراییەی خەواریجەکانە کە ئایین و دەقەکان لە مەقاسیدی شەرعی و بیری ئینسانییەت و داماڵینی پیرۆزیی و بەهای مرۆڤ و وابەستەکردنی بە کۆمەڵێك دەقەوە کە تەنها روخسارییانە تەماشا بکرێ و ئەودیوی خواستی ئایین و دەقە ئایینەکان نەخوێنرێنـەوە و مەرامی ئایین و ئاکار لە خزمەت ژیان و بەختەوەری ئینسانی و کەرامەتی ئینسانیدا لەبەرچاونەگیرێت.

تێگەیشتنێك بۆ دین کە تەنها لە کار و چوارچێوەی کار و رەفتار و روخساردا ببینرێتـەوە و لە شێوە و دەروەی مرۆڤ وەك هێشتنەوەی ریش و قۆڵهەڵکردن و سمێڵتاشین و لەبەرکردنێکی ئامێرانەی وەك کۆمپیوتەری قورئان و فەرموودە و کردنە سەرچاوەی بیروباوەڕی شێخ و موفتییەکانی وەك ئایدیۆلۆژیا مامەڵە لەگەڵکردنی، خۆناساندن بە (کۆمەڵی رزگار بوو- الطائفة المنصورة)و کردنەدەرەوەی هەموانیتر بە ئاییندار هاوشێوە و غەیرەوە بۆ دەرەوەی تاقمەکەی خۆیان، بە کافر و نەفام نەناسینی هەموانیتر و فتوای

بتپەرست و موشریك بەسەریاندادا سەپاندن و ماڵومولْك حەلالْكردنیان. ئەمەو چەندین نموونەی خراپتری لەم شێوە كە لەژێر پەردەی بیروباوەڕ و عەقیدەوە ئیتر بەسانایی بێگوناهترین كەسی تەنانەت موسڵمانیش لە بازنەی ئیمان و موسڵمانی دەیكەنە دەرەوە و بەسانایی دەتوانن ملی لە جەستەی جوێبكەنەوە. ئەم قوتابخانەی عەبدولوەهابییەتە كاتێك ئیتر گەشەیسەند و لە بازنەی ئایدیۆلۆژیاییەكی ئایینی بەناوی سەلەفییەت خۆی نواند كاتێك محەممەدی كوڕی عەبدولعەبدولوەهاب بەهۆی بیركردنەوەكانیەوە ناوچەی هۆزی (حریملەی) شوێنی نیشتەجێبوونی خۆی و باوكی بەجێهێشت چوو بۆ ناوچەی (عەینییە) كە عوسمانی كوڕی موعەممەر سەرۆكی ئەو هۆزەی دەكرد لەو ناوچەیە.. پەیوەندی لەگەڵ عوسمان موعەممەر پتەوكرد و خوشكەكەی خواست و توانی پەیوەندی ئاین و دەسەلاْت بۆ بەرپابكات و بیری عەبدولوەهابییەتی سەلەفی ببەستێتەوە بە سیاسەت و جیهادەوە، وەك ئایدیۆلۆژیایەكی سیاسی مامەڵەی لەگەڵ بكات و بزووتنەوەكەی بانگەوازی جیهاد بكات بەبیانووی رووخاندنی قەبر و شوێنگە پیرۆزەكانی ناوچەكە كە بوونە شوێنگەی پەرستش هۆزەكانیتر و میرنشینەكانیتر بخاتەوەژێر ركێفی خۆی و توانی لەم هەنگاوەیدا سەربكەوێت و دوو مەزارگەی براكانی ئیمامی عومەر بەتایبەت گۆڕ و مەزاری یەزیدی كوڕی خەتتاب برای عومەری كوڕی خەتتاب رووخاند و كاولیكرد و ئەم كارەشی وایكرد كە نێوانی عوسمانی ژن برای سەرۆك هۆزی (حورەیملە)و محەممەدی كوڕی عەبدولعەبدولوەهاب تێكبچێت ئەوەش كاتێك سولەیمان ئەلحومەیدی میری قەتیف و ئەحسا كە بەهێزتربوو لە میری عەینییە و فەرمانی بەسەر عوسماندا و هەڕەشەیكرد ئەگەر محەممەدی كوڕی عەبدولوەهاب دەرنەكات شەڕی لەگەڵ دەكات، بۆیە محەممەدی كوڕی عەبدولوەهاب لای میری عەینییە دەركرا و رووەو میرنشینی دەرعییە رۆیشت لەوێ پەیوەندی خۆی گرێدا لەگەڵ محەممەدی كوڕی سعود باپیری ئەم بنەماڵەیەی پاشایەتی سعودییە. لێرەوە هەوڵی خستنەژێر ركێفی هەموو ئیمارەت و خێڵەكان بە فتواكانی محەممەدی كوڕی عەبدولوەهاب و داگیركردن و تالاْنكردنی مولْك و ماڵو ژن و منالْی خێڵەكانیتر موسادەرەكردنی هەمووی پاش گرتنیان درا و لێرەوە بنەماڵەی سعودییە بەپاڵپشتی سەلەفییەتی عەبدولوەهابی بەناوی درووستكردنی خەلافەت و بەرەنگاربوونەوەی ئەهلی شیرك و بتپەرست و قەبرپەرستەكان دەستیپێكرد و توانییان

بێبەزەییانە بەربنە گیانی هەموو ئەو تیرانە و دەربەدەرکردنیان و خوێنحەلاڵکردنیان لەگەڵ لەناوبردنی هەرچی پاشماوەی شارستانی هەیە بەناوی بت و پاشماوەی بتپەرستییەوە کاول و وێرانکرا تەنانەت بەرەنگاربوونەوەی خۆیان دژی دەوڵەتی عوسمانی راگەیاند و هەرزوو جیهاد دژی عوسمانییە موشریکەکان کەوتەسەر زاری شوێنکەوتووانیان و حەلاڵکردنی موڵکوماڵیان وەك غەنائیم هەژمارکردنی فتوای بۆدرا. لێرەوە میرنشێنێکیان بەناوی دەوڵەتی خەلافەوە راگەیاند کە لەسەر بنەمای کوشتوبڕ و کاولکاری و ترس و تۆقاندن بونیاتنرابوو کە توانی سنوورەکەی ئەوکات بگاتە دیمەشق لای باکووری و عەمان لەلای باشوورەوە، بەلاّم دیارە محەممەد عەلی پاشای میسر و کوڕەکەی ئەم میرنشینەیان تێکوپێکداو بنەماڵەی سعود و عەبدولوەهابییەکانیان لە نەجد و حیجاز وەدەرنان، بەلاّم دیارە ئەم بزووتنەوەیە لە سنووری کوەیت و بەپاڵشتی هەندێ خێڵ و هاوکاری ولاّتانی وەك بەریتانیا نەیانهێشت ئەم بزووتنەوەیە کۆتاییبێت.. بە بچووکی لە سنووری هۆزاییەتیدا هەرمایەوە، لە سەروبەندی کۆتاییهاتنی عوسمانییەکاندا و بێهێزبوونیان و لایەنگیری شەریفی مەکە بۆ خۆرئاوا بەتایبەت پاش کۆتاییهاتنی دەوڵەتی عوسمانی سەرلەنوێ ئەم بنەماڵەی شای سعودییەیە زیندووبوونەوە و ناوچەی حیجازیان پێبەخشرایەوە و دەوڵەتی سعودییەی ئێستەیان دروستکرد، بۆیە دەبینین نزیکی و هاتنەوەیەکی تەواوی کارەکانی داعش لەگەڵ بیری سەلەفی عەبدولوەهابی و مێژووی ئەم خەلافەتەی عەبدولوەهابییەکان و ئال سعوود تەربیبیەك هەیە و دەتوانیین بەدرێژکراوەی هەمان بیری بزانین. . لێرەوە جیهانبینی و تێگەیشتنی داعش بە جیاوازی سوود وەرگرتن لە میکانیزمەکانی مۆدێرنە هەمان جیهانبینی و تێگەیشتنی عەبدولوەهابییەکانی سەدەی هەژدەیەمە و هەمان قەتیسکردنی خواستی ئایینە بە روخساروەرگرتنی دەقەکان و تێکەڵکردنی لەگەڵ عەقڵی بەدەوی خەڵتان بە ئارەزووی غەریزەی سێکس و خۆسەپاندن و جیهانی مادییانەی بیری عەرەبییە، هەوڵی بێگیانکردن و دەرهێنانی رووحی مەعنەوی و بوونگەرایی عاشق بەبوون و ژیان و بەختەوەری مرۆڤایەتی و پێچەوانەبوونەوە لەگەڵ ئایەتی "رحمە للعالمین" ئایینی ئیسلامە.

**دووەم: داعش و کۆمەڵی ئیخوانولموسلیمین:**

وەك پێشتر هێنامان داعش سوودی وەرگرتووە لەو عەقڵە سیاسییەی کە کۆمەڵی ئیخوانولموسلیمین هێنایەئاراوە، ئیخوانێك کە بیر و تێفکرینەکانی دەگەڕێنەوە بۆ ناو بۆتە رەنگاڵەکانی جەمالەدینی ئەفغانی و شێخ محەممەد عەبدە و هاوشانبوونی زەمەنی بیری عروبەی کەواکبی و پاشان ساتیع ئەلحەسری و ئالوسی. ئیخوانێك کە بیری خۆرئاوا و پێشکەوتنەکانی ئەوروپا و مۆدێرنە کاریگەری تەواویان لەسەر چۆنییەتی دارشتنەوەی بیری ئایینی و سیاسی و رۆشنبیری عەرەبی دانابوو، ئێخوانێك کە سەرکردەکانی مێشکیان پڕبووبوو بە قێزلێبوونەوە لە کلاسیکییەت و شێوازی دەعەوی مەشیخەی ئەزهەر، ئەو ئەزهەرەی کە وەك کەهەنووتێك پیاوانی مەشیخەکەی بەناوی ئایینەوە دەستیان بەسەر بریار و ماڵ و سامان و عەقڵی نەتەوەیەکی وەك میسردا گرتبوو، لێرەوە ئایین بوو بە میکانیزمێکی کەهەنووتی و درووستکەری پیاوانێك لە چینی ئەشرافی ئایینی کە لەگەڵ چینی دەسەلاتداری قەسری پاشاییەتی و پاشەواتەکانی کۆمەڵگەی میسری خوێنخۆری زۆرینەی هەژار و سەپانی گەلی میسری بوون. لێرەوە خەونی پێشکەوتن وەك ئەوروپا و سەرسام بوون بەو رێچکەگرتنەی عەقڵی مۆدێرنە و کاریگەری نواندنی رۆشنگەری و شۆڕشی پیشەسازی لەسەر کۆمەڵگەی ئەوروپا، بابەتانێك بوون کە لای کەسانی رۆشنبیری وەك جەمالەدینی ئەفغانی و محەممەد عەبدە و قاسم ئەمین و دەیانیتر بووبوونە جێگەی تێڕامان و شوێنگەی تێفکرینی سەردەمییانەی ئەوان. لێرەوە خەونی گەیشتن بە ئەوروپا و زاڵی و لاوازی پیاوە نەخۆشەکەی ئاستانەی بەناو خەلافەتی عوسمانی و نەفامی عەقڵی عەرەبی و باوەشکردنەوەی پیاوانی ئایینی و مەشایخی ئیسلامی بۆ پارە و سامان و دەسەلات لەو گرێیانە بوون کە بۆ ئەمان نەدەکرانەوە و لەو بەرگرانە بوون کە تەمەن و هەوڵی ئەوانی لە چوارچێوەی بیر و وتاردا قەتیسکرد، دواتر بە نەمانی خەلافەتی ئیسلامی و پارچەپارچەبوونی ولاتانی ژێردەستی پیاوە نەخۆشەکە (خەلافەتی عوسمانی) راستەوخۆ هاتنی دەستی مۆدێرنە و گواستنەوەی بۆ ناو ئەم ولاتە داگیرکراوانە لەسەردەستی بەریتانیا و فەرەنسا بەتایبەت، ئیتر هەنگاوێتر خەمە جەمالی و عەبدەییەکان بیرمەندانی ئیسلامی نزیکبوونەوە، لەسەردەستی "حەسەن بەننا" هەوڵی درووستکردنەوەی کۆمەڵگەییەکی

ئیسلامی لەژێر چەتری پێشکەوتن و عەقڵ و پاککردنەوەی لە بیری کەهەنووتییانەی مەشیخە و تەسەوف و دەروێش و پاشەواتەکان، بەلاّم لێرەشدا خواستی ئیستیعمار و بەرامبەربوونەوە لەگەڵ بیری ئیستیعماری و زووبونە کۆیلەی بیری مادیی و قەتیسکردنی ئیسلام تەنها لە چوارچێوەی بیری سیاسی و دەسەلاّتداری و بە ئایدیۆلۆژیاناساندنی ئیسلام پاردۆکسییانە رێکخستن و ئامادەکردن و پەروەردەکردنی تاکەکانی بەوەی کە بە خەونی ئەوروپییانە تەعامولکردن لەگەڵ رێکخستن و چۆنییەتی دابەزاندن و خواستدا بۆ دەسەلاّت و لەهەمانکاتدا چۆنییەتی پەیوەستبوونی تاکەکانی کۆمەڵی ئیخوان لەگەڵ یەك و کۆکردنەوەیان لەناو بۆتەیەکی جیهانی و بەزاندنی سنووری نیشتمانی. لێرەوە خەونی ویستی خەلافەت و تەنها مامەڵەی مادییانە و سیاسییانە لەگەڵ دەقی ئایین و فراوانی بازنەکانی کارکردن.. وایکرد ئیتر ئەو رێکخراوە بێتە هێلانەییەکی ململانێکان لەگەڵ ویستی و ئەو واقیعەی تیایدا دەیوست کاری تیابکات. لێرەوە ئەم رێکخراوە لەنێو ململانێکاندا گەوزا و عومری درێژی نزیکەی  سەدساڵەیی بوویە ئامادەکاری کەسانی پلەدوو غەریبی نێوکۆمەڵگەکان و ئازار و ئەشکەنجەکێشی نێو زیندانەکان، تاوای لێهات کە ببێتە خانەخوێیەکی دەزگا ئیستیخباراتە جیهانییەکان بەتایبەتی ئەمریکا کە بتوانێت لەپەنجاکانەوە وەك ئایدیۆلۆژیایەکی ئەنتی شیوعی و چەپ دژی هەموو رەوتێکی چەپی رۆژهەلاّتی ناوین و نەیارەکانی بەکاریانببات. بەدرێژایی مێژوو ئیخوانموسلیمین ئەوەندەی داشەهارەی ئەنتی شیوعییەکی نێو یارییەکانی سۆڤیەت و ئەمریکا بووە، نیوئەوەندە بۆ خۆی و ئیسلام کاری نەکردووە، ئەوەندە لەهەموو ولاّتاندا بیری شیوعییەتی قێزەونکردووە و تاکەکانی ئامادەکردووە بیانێرێت بۆ ئەفغان و بۆ چیچان و دەوڵەتانی ئەنتی ئەمریکی، نیوئەوەندە لە پرۆژە ئایینی و مەعنەوییەکەی ئیسلامدا کارینەکردووە.بەردەوام ویستوویەتی پەرە بەو بیرە جیهانییەی بدات و لە خواستی نیشتمانی و ناوچەیی دووربیخاتەوە تادواجار ئیخوان بۆ خۆی نەتوانێت ١٠٠مەتر زەوی کە خەونی سیاسییانە و مادییانەی ئەوبوو کە خەلافەتی تیادرووستبکات بۆینەکرا، بەڵکو هەردەم ملکەچ و زەلیل و نەیاری دەسەلاّتەکان بیت.

**دەرگای دووەم: داعش و گەمە سیاسییەکانی ئیمڕۆ:**

دیارە سەرهەڵدانی داعش لەم سەدەی بیست و یەکە و لەم سەردەمی تەکنەلۆجیا و بەجیهانیبوونە، لەکاتێکدا کۆمەڵگەکان بەرەو کۆمەڵگەی مەعریفەیی هەنگاوهەڵدەگرن و ژمارەکان دەبنە بێژەر و قسەکەر و رێکخەری پەیوەندییەکان، لەم سەروبەندەدا گروپی ئیسلامی توندڕەو بە عەقڵی بەربەرییەت و بە دروشمی پاکیزەیی ئایینەوە سەر لە جیهان دەشێوێنیێ، وەك مۆتەکەیەك لە رۆژهەلاّتی ناوین خۆی قوتدەکاتەوە. ئەوەی ئارامی و ئاسایشە و ئەوەی مانای ژیان و گوزەرانی ئینسانییانەیە لە ساباتی ژیانی خەڵکی دەیتۆرێنێت و کوشت و کوشتار و سەبایاکردنی کچ و ماڵوێرانی و دەربەدەری و کۆمەڵکوژی دەکات بە بەری ژیانی ناوچەکەدا بەتەنهاش ناتوانرێت بوترێت کە (دەوڵەتی ئیسلامی-داعش) بەرهەمی بەزیویی ئیخوان و دەسخەڕۆی ناعەقلاّنییەتی بەدەوی وەهابییەتە، بەڵکو مۆدێرنە و بانگەشە درۆزنەکانی جیهانی سەرمایەداری بە ئایدیۆلۆژیا و سیستمە دووفاقەییەکەیەوە بۆخۆیان بەشداری سەرەکی درووستکردن و بەرهەمهێنانی داعشن، لەکاتێکدا حاشاش لەوەناکەین کە کە داعش و سەلەفییەت سەرەداوی گرێدراوی ئەم سەدەیەن، بەهەماهەنگی و بەتێکەڵی و لەسەر سکەڕۆیشتنی جیهانی مۆدێرنە، مۆدێرنەیەك کە رەنگرێژە بە باوبۆران و تەپوتۆزاوی عەولەمە کە پشتی بە پاوانخوازی و هەیمەنەکردن و شۆردنەوەی ناسنامە بێهێزەکان و بە چۆپیکێشی داشەهارەکانی نێو جیهانگیری ئابووری و سیاسی و سەربازی و عەقڵی ئیمپراتۆرییەت و ئیمپریالیستی سەرمایەداری رۆژئاوا کە خواستی خۆی لەلا گەروەتر و بەڕێزتر و کەنارخستنی خواست و کوشتنی ئەوانیتری لەلا سەرچاوەیە، مۆدێرنەییەك لەگەڵ ئەو هەموو پێشکەوتنانەی کە بەبیانووی پێشکەوتن و پەرەسەندنی کۆمەڵگاکانەوە گۆڕەپانەکان سازدەکات و بوارەکان دەدۆزێتەوە بۆ پاوانکردنی خاك و خواست و ئازادییەکانی ئەوانیتر کە ئەوەی مەعنەوییەت و ئەوەی ژیانی رۆحی و بوونگەراییە لە ناخی کۆمەڵگادا دەیخاتەدەرەوە و تاکەکان و کۆمەڵگەکان سەرقاڵی برقوباقی پێشکەوتنەکانی تەکنەلۆجیا دەکات و ژینگە و خۆشیی ژیانی ئاسوودەیی رۆحەکان بەبادەدات تەنها ماتریالییەت دەکاتە پێوەری بەختەوەری و بەهاکانی مرۆڤایەتی پێکێشانە دەکات، بۆیە سەرهەڵدان و قوتبوونەوەی ئەم ئەم دومەڵە و ئەم دیاردە ناسازە و لەم

ساتەوەختەدا دەتوانین هۆکاریکیتریشی بگەڕێنینیەوە بۆ ئەو دەرەنجامە سیاسی و ئابوورییانەی لە جیهان کەوتنەوە پاش ئەوەی بلۆکی ئیشتراکی بەرامبەر جیهانی سەرمایەداری رۆژئاوا چۆکی دادا و نەوی، ولأتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا هەژموونی تاکجەمسەرانەی خۆی پەرەپێدا و رۆژهەلأتی ناوین بوویە شوێنگەی یەکلاکردنەوەی کێشە و خستنەڕووی توانا جۆربەجۆرەکانی بەرامبەر نەیارە دۆڕاوەکان و پاشماوەکانیتری و وەك هەولێك بۆ ملکەچپێکردنی ئەو هێز و دەولەتانەی وەك ئەوەی ئەو دەیویست نەدەهاتنەژێر رکێفی، بۆ خۆی شوێنگەی تێڕامان و شایستەی لێووردبوونەوەیە.

هەر ئەمەشە پێماندەلێت کە رامان لەو گۆڕانە سیاسییە و مانەوەی رۆژئاوا وەك تاکجەمسەر چاومان بخاتەسەر ئەو پەیوەندییە نەگەتیڤانەی ئەو دووجەمسەرەی رابردوو لە سەرهەلدان و قەبەکردن و یارمەتیدانی بزافی ئیسلامی و وەك ئامرازبوونێك لە بەردەس بلۆکی سەرمایەداری و وەك داش بەکارهێنانیان لەلایەن هێزە رۆژئاواییەکانەوە بەتایبەت ئەمریکا و دەزگای هەوالگری ئەمریکا دژی شیوعییەت. بێگومان پاش کەوتنی دیواری بەرلین ئیتر هاوکێشەکان و چۆنیەتی مامەلەکردنی رۆژئاوا گۆڕا، بیرمان نەچێت کە لە کاتوساتی تەواوبوونی شەڕی دووەمی جیهانی ئیتر ئەمریکا و بلۆکی سەرمایەداری هەولی تەواوی خستەگەڕ کە ئیتر رۆژهەلأتی ناوین نەبێتە پارووەیەکی چەور بۆ یەکیەتی سۆڤیەت و پانتاییەك بۆ بلأوکردنەوەی ئایدیۆلۆژیاکەی کە بەجۆرێ لەجۆرەکان دروشمی مەرگی سەرمایەداری هەلگرتبوو پاشان وەك بەرگرێك لەبەردەم خواستە ئیمپریالییەکانی رۆژئاوا لەبەرچاویدەگرت. لێرەوە هەرزوو توانی ولأتانی ئەوکاتی ئێران و پاکستان و تورکیا و پاشان لە سەردەمی ئەنوەر ساداتیشدا بۆ هەمیشەیی میسر، بکاتە دەولەتی تەبەعی و جلەوی دەسەلأتی ئەم ولأتانە ببەستێتەوە بە دەسەلأتی جەنەڕالەکانی سوپاوە، سوپا هەردەم وەك هێزێکی پارێزگاریکەر لەو دەسەلأتە گوێڕایەلەی کە درێژەی بەسیاسەتی تەبەعییەتی ولأت بۆ ئەمریکا و رۆژئاوا دەدا. دەسەلأتێکی فوتێکراوی گەورە و قەبە و لەڕابەدەر بەتوانا لەڕووی کاری ئیستیخباراتی و ئەمنی و تۆکمە لەڕووی سەربازییەوە لەهەمانکاتدا بێهێز و کەمتوانا کە بتوانێت لەسەر پێی خۆی بوەستێت تەنها بازاڕێك بۆ کالأ و شمەکی دەرەکی و پشت بەستوو بە توانا و هێزی ئابووری و سەربازی ودەسەلأتی دەولەتە زلهێزەکەی درێژەی بە

خۆی دەدا و کاریگەردەبوو بە هەر گۆڕانکارییەك لە سیاسەتی ولاّتە زلهێزەکەی، پاشان ئەمریکا لەڕێگەی دەزگا سیخوڕییەکانی ئەم ولاّتە پاشکەوت و تەبەعییانەوە، بەگرتنەبەری سیاسەتی (دوژمنی دوژمنم دۆستمە!) سوودی تەواوی بینی لە بزاڤە ئیسلامییەکان بەتایبەتی تاقم و کۆمەڵی ئیخوانموسلیمین کە سەرۆکایەتییەکەی و نووسینگەی رابەرایەتییەکەی لە میسر بوو، هەروەها بزافی سەلەفی و رەوتە وەهابییەکانی دەوڵەتانی کەنداو بەتایبەتی سەلەفییەتی سعوودییە، هەوڵی دروستکردن و گەشەپێدان و تەمویلکردنی دا، لێرەوە ئیخوان و سەلەفییەکان لەڕێگەی شانەکانیەوە لە ولاّتانی ئیسلامی خەریکی پەروەردەکردنی ئەندامەکانیان بوون دواجار پەروەردەیەکی جیهادییان فێردەکردن و بەرەنگاری بیر و ئایدیۆلۆژیای شیوعییەت و مارکسییەتی پێدەکردنەوە و لە هەوڵی بەردەوامدابوون ئەو دەسەلاّتە کۆمارییانەی کە هەڵگری بیری چەپبوون جۆرێك لە لایەنگیرییان بۆ یەکیەتی سۆڤیەت هەبوو نموونەی وەك عەبدولکەریم قاسم و جەمال عەبدولناسر هەرزوو بەکافرکردنیان و چاندنی بیری دژبوونەوەیان خەریکی جێبەجێکردنی مەرامەکانیان بوون، هەرئەوەش بوو رووبەڕووبوونەوەکان لەو ولاّتانەدا زۆرترینیان لەگەڵ پیاوانی سەربازی و رەوتە ئیسلامییەکان دەبوو. ئەمە بەدەر لەوەی کە لەهەشتاکاندا دوای ئەوەی ئیخوانموسلیمین و بەهۆی ئەوەی پیاوانی کۆڕبەندی رابەرایەتییەکەی کە ناراستەی کۆمەلاّنی ئیخوانی جیهانی دەکرد لە ژێر هەیمەنەی ئیستیخباراتی میصری دا بوو، دواجار ئەویش دەزگاییەکی تەبەعی بوو وەك ولاّتەکەی، کاری لەسەر پەروەردەکردنی تاکی جیهادی ئیخوانی دەکرد و لەولاّتانەوە دەیانناردنە پاکستان و ئەفغانستان و پاشان چیچان و داغستان لەوێ شەڕی شیوعییەت بکەن. لەوێوە دەسەلاّت و هەیمەنەی شیوعییەت کەمبکاتەوە و دەستی لە ئاوەگەرمەکان بەربێ، هەربۆیە بەدرێژایی مێژووی بزاڤە ئیسلامییەکان تا کەوتنی بلۆکی شیوعییەت بەدەر لە بزاڤە ئایینییە شیعەییەکەی رابەری ئێرانی (ئیمام خومەینی) هیچ بزاڤێکیتری ئیسلامی لە گوڵ کاڵتری بە ئەمریکا نەوتووە، هەردەم دوژمنی سەرسەختی چەپ و چەپەکان بوون و وەك ئەوەی کە ئەمانە کاریان و ئامانجی درووست بوونیان بەرەنگاربوونەوەی بیری چەپ بێت، راستەوخۆ جێبەجێکاری خواستی سەرمایەداری و ئامرازێکی دەستی دەزگا ئیستیخباراتییەکان بوون لە بەرەنگاری نەیارەکانیان.

لێرەوە دەبینین بەرهەم و باربوویەك و داكەوتەیەكی وەك رێكخراوی دەوڵەتی ئیسلامی (داعش) لە سەلەفییەت و ئیخوان و مۆدێرنە، نەیتوانیوە لەو بازارەگەرمەی نێودەزگا ئیستیخباراتییەكانی ئەمریكا و رۆژئاوا رزگارییبێت و ئیمڕۆ شەڕی تەواونەبووی جارانە لەگەڵ ئێران و بێچوە بەوەفا و پاشماوەكانی رووسیایە لەم رۆژهەڵاتی ناوینە دەیكات. تەمای دووبارە داڕشتنەوەی نەخشەی رۆژهەڵاتی ناوینە بەبیانووی داعش وەك چۆن بە شەریفی مەككە و بنەماڵەی ئال سعوود لە سەدەی رابردوو كردی. ئاشكراشە كە جیهانی عەرەبی هەر لەكەنداوەوە بۆ رۆژئاوای ئیمڕۆ وڵاتەكانی بە قۆناغێكی زۆر ناڕەحەتدا تێدەپەڕێن، و لە گێرمە و كێشەی سیاسی و ئابووریدا دەتلێنەوە، ئیسلامی سیاسیش نموونەی دیاریان داعشە هۆكاری سەرەكی ئەو گرفت و كێشانەیە و بووەتە فاكتەرێكی پشێوی و دەستكەلایەك بۆ پارچەپارچەكردنی زیاتری دەوڵەتانی عەرەبی، نموونەی عێراق و سوریا و لیبیا و یەمەن و.. هتد، ئیمڕۆ سەرهەڵدانی هێزی نوێ و رێكخراوی تیرۆریستی نوێ بەپاڵپشتی دەزگا هەواڵگیرییە زلهێزەكان، خەریكی جێبەجێكردنی بەرژەوەندی زلهێزەكانن و دواجار بەفیڕۆدانی سەروەت و سامانی ئەم وڵاتانە و كاولكردن و پارچەپارچەكردنیان لەشێوەی میرنشینی بچووك و ناوچەیی، بونیادنانی خودموختاری خۆجێی بێهێزی هەمەجۆر، جا بەفەرمی بێت یان نافەرمی، ئەمە بەدەر لەوەی گیانی تائیفییەت و رەگەزی تەواو زیندووكراوەتەوە و بووەتە فاكتەرێكی كاریگەر لەسەر بەردەوامی كێشەكان و فراوانبوونی جیاوازییەكان و ونبونی گیانی پێكەوەژیانی گەل و نەتەوەكانی ئەم رۆژهەڵاتی ناوینە كە بێگومان ئەمەش دەرەنجامی ناهوشیاری سیاسی و ئایینی لای چینی نوخبەی ئەم وڵاتانەیە و پاشان هەیمەنەی سیاسەت و دەزگا هەواڵگرییەكانی وڵاتانی زلهێزە و گواستنەوەی ململانێكانیانە بۆ ئەم ناوچەیە.

●●●

# کاتێك (داعش) بەناوی ئایینەوە لە مەغۆل خراپتر دەکات، مرۆڤ ناتوانێت نەیەتەگۆ

ئیسماعیل حاجی زەڵمی

گومانی تێدانییە کە ئەوەی داعش و بەرەی نوسرە و دەیان ڕێکخراوی‌تری کە وەك ئەوان وان و بەو شێوازە بیردەکەنەوە و و پێیهەڵدەستن هیچ نییە جگەلە بیانووهێنانەوەیەکی ئایینییانە بە دەقی ئایینی بۆ کار و ڕەفتارە چەپەڵەکانیان و پاشان شتێك نییە جگەلە بوهتان و پڕوپاگەندەیەکی مایەپووچ کە بەناوی دینی ئیسلامی پیرۆزەوە بانگەشەی بۆدەکەن، ئەو ڕێکخراوانە کۆمەڵە کارێك ئەنجامدەدەن دەبێتە خاڵێکی ڕەش بە ناوچاوی مێژووی مرۆڤایەتییەوە بەجۆرێك لەمێژوودا لەگەڵ ئەو هەموو نەزانین و جەهلەدا هاوشێوەی نەبووە مەگەر ئەوەی کە (تەتەر و مەغوۆل) کردی کاتێك لەشکرکێشییان کرد بۆسەر تەخت ودەسەلاتی عەباسییەکان لە بەغداد لە ساڵی ٦٥٦ کۆچی بە سەرکردایەتی جەنگیز خان، ئەگەرچی هەندێك لە ڕەفتارەکانی داعش ئەنجامیدەدات دەتوانی لەهەندێك ڕدووەوە بەراوردیبکەین بەوکارانەی کە نازییەکان لە سەردەمی دەسەلاتداری هیتلەردا کردیان ئەگینا هاوشێوەیان بوونی کەمە، مەغۆل و تەتەرەکان کاتێك هاتن سەرجەم شارستانییەتی ئەم ناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوینە هەبوو لەو سەردەمەدا بەتایبەت لە شوێنەوارەکان روخاندی و کتێبەکانیان فڕێدایە ناو رووباری دیجلەوە و بەبێ هیچ سۆز و بەزەییەك هەزاران لە دانیشتووانی شاری بەغدادیان کوشت.

ئەوەی داعش ئەنجامیدەدات لە تێکدان و کوشتن و وێرانکردن لەناو ئەم ولاتانەدا بەتایبەت لەو شوێنانەی دەستی دەڕوات بەرامبەر سەرجەم نەتەوە و ئایینەکان لەهەردوو ولاتی سوریا و عێراقدا شێوە و رووخساری هەمەجییەت و نەزانی و ڕەگەزپەرستی و دواکەوتوویی رق نەبێت کە بەسەر ڕەفتارەکانیان و دەروونە نەخۆشەکانییان زاڵە هیچیدی

نییە، چونکە بەدڵنیاییەوە ئەوان لەوەتێنەگەشتوون کە سزای کوشتنی مرۆڤێکی بێگوناه کە خودا دروستیکردووە چەندە، بەپێی دینی ئیسلام و بیروباوەڕی موسڵمانان خودای گەورە مرۆڤی دروستکردووە لە نێر و لە مێ و لە نەتەوە هۆزی و جیاواز و بۆ کەسیان نەهاتووە بدات لە ملی ئەویتریان و ئەویتر بکوژێت، بەڵام ئەگەر بهاتایە خودا تەنها هەموومانی لە یەك نەتەوە و یەك هۆز و خێڵ دروستکردبووایە یەك زمان یەك ئایین بووینایە ئەوا دەمانوت نابێت کەس لە ئێمە جیاوازتربێت بەئاسانی بەڵگەمان بۆ کەسانی دەرەوەی خۆمان پێدەبوو، بەڵام ئەوەی کە ئەم گروپ و تاقمانە دەیکەن لە کوشتن و بڕین و خوێنڕشتن و تێکدانی شارستانییەتی و کلتوور و پاشماوە مێژووییەکان و هێرشکردنەسەر دینە جیاوازەکان بەتەواوەتی جەهل و نەزانی گەمژەییان دەسەلمێنێت بەرامبەر مرۆڤایەتی و تەنانەت پەیامی ئایینی ئیسلامی پیرۆز.

چونکە دەوڵەتانی ئیسلامی چ عەباسییەکان و چ ئەمەوییەکان و عوسمانییەکان سەرەڕای ئەو هەموو پرسیارە لەسەر کردەکانیان و لەپاڵ ئەو هەموو توانا و دەسەڵاتە ئەوەندە زاڵەیان کە هەیانبوو هەریەکەیان کە دەسەڵاتی هەبوو بەسەر زۆربەی ناوچەی جوگرافی شەرق و غەربدا لەگەڵ ئەوەشدا نەتەوەکانیتر لەژێر دەسەڵاتی ئەواندا توانیویانە شارستانیەتی خۆیان بنیادبنێن و گەشەپێبدەن و لەسەر ئایین و ڕێبازی ئایینی خۆشیان بمێننەوە، بەپێچەوانەی تێڕوانینی ئێستای داعش شارستانییەتی ئیسلامی سوودی وەرگرتووە لە کلتور و ڕۆشنبیری ئەو نەتەوە جیاوازانە بەتایبەت ئەوانەی کە لەدێرزەمانەوە لەو ناوچانەدا نیشتەجێبوون، ئەگەر لەڕاستیدا داعش بیزانیبا ئاشوورییەکان کێ بوون هەرگیز ئەم کارەی نەدەکرد بەرامبەر سومبلی شارستانییەتی و ئاسەوارە مێژووییەکانیان، چونکە ئەوان بنچینەیان دەگەڕێتەوە بۆ (أشور) کوری (سامی کوری حەزرەتی نوح) وەك زۆربەی بیرمەندان و نووسەرانی بواری مێژوو وتوویانە حەزررەتی نوح درودی خوای لێبێت چوار کوڕی هەبووە کە ئەوانیش ( یافت و سام و حام و کەنعان )، بەڵام ئەوەی کۆتاییان سەرپێچی باوکی کرد و پەنایبردە بەر شاخێك بەمەبەستی خۆپاراستن لە تۆفان، بەڵام دواجار خنکا و کۆتایی بە ژیانی هات، (سام) ی بە باوەگەورەی ( عەرەب و گاور و

جولەکە و فارسەکان دادەنرێت، ئیبن کەسیر دەڵێت: هەرچی مرۆڤ لەسەر ئەم گۆی زەوییە دەژی رەچەڵەکی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سێ کوڕەی حەزرەتی نوح درودی خوای لێبێت، ئاشوورییەکان بەهەبوونی ئەو دەسەڵاتانەی ناومانهێنا توانییان پارێزگاری لە کلتوور و سەلیقە و چۆنیەتی تێگەیشتنی ئەوانیش بۆ ئایینە جیاوازەکان وای نەکرد کە ئەمان بتوێنەوە و شوێنەواریان بفەوتێت، بۆیە ئەو لێتێگەیشتنەی ئەو دەسەلاتانە لەگەڵ ئاشوورییەکان پاریزگاری لێکردن و نەیهێشت هیچ سومبل و ئاسەوارێکیان لەناوبچێت، بەهیچ جۆرێك هیچ موسڵمانە راستەقینەکانی ئەم ناوچانەش لەگەڵ ئەواندا روبەڕوونەبوونەوە بەدرێژایی ئەوماوەیە کە ئایینی ئیسلام گەیشتووەتە ئەم ناوچەیە هەر لە سەردەمی پێغەمبەرەوە درودی خوای لێبێت تاوەك سەردەمی ئەمەوی و عەباسی و فاتیمی و ئەیوبیەکان.. هتد، بەڵکو ئاسەوار و شوێنەوارەکانی وەك ( ئاشوری و فیرعەونی و ئارامی و بیزەنتی و کلدانی و رۆمانی و ئەوانیتریش هەموویان بە پارێزراوی بەبێ دەستێوەردان مانەوە کە ئەمەش نیشانەی رێز و پێزانینی ئیسلام و موسڵمانان بوو بەرامبەر ئایین و رۆشنبیری و شارستانییەتی غەیری ئیسلام، بەمپێیە بێت داعش و هاوشێوەکانی نابێت شارەزاییەکی ئەوتۆییان لە زانستی ئایینی و حوکم و بڕیارەکانی پێشەوایانی ئیسلامدا هەبێت ئەگینا بەمجۆرە رەفتاریاننەدەکرد.

### ئاسەوار و شیوێنەواری شارستانیبوون نەوەك بت و شوێنی پەرستش:

ئەوەی داعش تێکیدەشکێنێت و لەناویدەبات لە عێراق و سوریادا پێکهاتووە لە شوینەوار و ئاسەواری میللەتە دێرینەکان بە سەرمایە و خەزێنەی بە بەهایی مرۆڤایەتی دادەنرێت کە دانیشتووانی ئەم ناوچەیە و سەرجەم مرۆڤایەتی شانازی پێوەدەکات کە هەرکیز بە پارە و هیچ جۆرە دراوێکی سەردەمی ئەمرۆ ناکڕدرێت هەرگیز ناتوانرێت قەرەبووبکرێتەوە، ئەگەرچی ئەم گەمژە و نەزان و جاهیلانە بانگەشەی ئەوەدەکەن ئەمانە بت و بتخانەن پێویستە لەناوببرێن، لیژنەی فتوای وڵاتی میسر بەیانێکی لەوبارەیەوە بڵاو کردەوە کە تیایدا جەختی لەسەرئەوە کردووبوویەوە ئەوەی داعش پشتی پێبەستووە لە دەق

و پاڵپشتی شەرعی بۆ لەناوبردنی ئەو ئاسەوارانە هیچنین جگەلە چەند بیروڕایەکی پەرت و بلاّو کە بنەماکانیان رووننییە، چونکە ئەو شوێنەوار و ئاسەوار و پاشماوە کلتوری و رۆشنبیرییانە لە ساتەوەختی ئازادکردنی ئەو ناوچانە لە سەردەمی ئیسلامدا بوونیان هەبووە، بەهیچ جۆرێك هیچ فەرماندەیەکی ئیسلام و هیچ هاوەڵێکی بەرێزی پێغەمبەر دروودی خوای لێبێت فەرمانیاننەکردووە بەتێکدانی و شێواندن و لەناوبردنی، بەڵکو هەر ریگەشیاننەداوە کەس نزیکیان بێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان ئاشناتربوون بە رەفتار و کرداری پێغەمبەر و شارەزاتربوون لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام و پابەندتربوون بەو پەیمانەی کە بە پێغەمبەری خودایان دابوو، ئەوکاتەش کە هاوەڵە بەرێزەکان وڵاتی میسریان ئازاد و فەتحکرد قوچەك و ئەهرامەکان و پەیکەری (ابوهول) پەیکەرەکانیتریش بوونیان هەبوو، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا هیچ فتوا و بڕیارێك دەرنەکرا بۆئەوەی بەهیچ جۆرێك دەستکاری ئەو شوێنەرار و ئاسەوارانە بکرێت کە مێژوویەکی گەورەی شارستانیەتی مرۆڤ دەردەخەن.

لە مێژووی ئیسلامدا چەندەها نموونەی روون هەیە کە موسڵمانان و هەڵگرانی ئەم ئایینە بەهیچ جۆریك دژی شارستانییەت نەبوون و نابن بۆ نموونە کاتێك موسڵمانەکان بەسەرکردایەتی خالیدی کوڕی وەلید بەئاراستەی وڵاتی شام بەرێکەوتن بۆ روبەڕووبوونەوەی رۆمەکان و لە شەڕی یەرموکدا سەرکەوتن بەسەریاندا، لە شاری بەترادا چەندین پەیکەر و شوێنەواری لێبوو، بەلاّم بەهیچ جۆرێك دەستیان بۆنەبرد و نەیانشێوان، بەهەمان شێوە کاتێك موسڵمانان رۆژهەلاّتی ئاسیایان ئازادکرد و پەیامی ئیسلامیان گەیاندە سنووری (سند) لە وڵاتی هیندستان لەوێدا چەندین پەیکەری (بودا) هەبوون کە هەندێکیان لەناو بەرددا هەڵکۆڵراببوون تەنانەت یەك سەرکردەی موسڵمانان بیری لەوەنەکردەوە ئەو پەیکەر و ئاسەوارانە تێکبدات یەك کەسیش لەوان نەیگوت ئەمان بتن دەبێت لەناوببرێن، لێرە پرسیارەکە ئەوەیە ئایا داعش و گروپە هاوشێوەکانی ئەم تێگەیشتنە و ئەم دژایەتی مێژوو وشارستانییەی مرۆڤەیان لەکوێ هێنا؟؟ بۆیە کاتێك زیاتر لە نیو ملیار موسڵمان لەجیهاندا بوونی هەیە، جێگەی سەرنجە چەند هەزار نەفامی بەدەوی ببێتە نوێنەری ئەو نیو ملیار زیاترەی مرۆڤ بەمکارە چەپەلاّنەی کاری هەمووی

ناوی ئایینەکەیان لەکەداربکات؟!

ئەمرۆ هەموومان بەچاوی خۆمان دەیبینین ئەوەی کە داعش و هاوشێوەکانی دەیکەن بەرامبەر بە ئیسلام و موسڵمانان لەمێژوودا هاوشێوەی نەبووە، بەڕاستی مرۆڤ تووشی شۆك دەبێت کاتێك بێدەنگی زانایانی موسڵمان دەبینێ لەبەرامبەر رەفتارەکانی ئەم گروپە تیرۆریستیەدا کە ئەنجامیدەدەن لە تێکدانی شار و پرد و رێگاوبان و تەقاندنەوەی ماڵان و بیرە نەوت و کارگەکان و مزگەوت و پەرستگا مێژوویەکان، لەڕاستیدا تاوانێك نەماوە لە کوشتن و سوتاندن و وێرانکردن و تێکدان کە ئەم گروپە ئەنجامینەدات، لەکۆتاییدا هەرئەوەندە ماوە بڵێین پێویستە لەسەر هەموو لایەنەکان بەتایبەت موسڵمانان و لایەن ئیسلامییەکان بێدەنگ نەبن بەدەنگێکی بەرز هاواربکەن دژی ئەم گروپە راوەستن بە مرۆڤایەتی رابگەینن ئەوەی ئەمانە و هاوشێوەکانی دەیکەن ئیسلام نییە ئەمان دژی ژیان و ژیاری مرۆڤایەتین، ئەمانە بەرین لە ئیسلام، ئەمانە درووستکراوی دەستی ولاتانن، مەرام و مەبەستی تایبەتییان هەیە، چونکە بێدەنگبوون لەئاستی ئەو تاوانانەی ئەو گروپ تاقمانە ئەنجامیدەدەن واتای پشتگیری و پاڵپشتیان بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ دیت.

●●●